# ڕۆژی پڕشنگدار

ڕوونکردنەوەی (غايةِ الإختِصار)

ناسراو بە

# مَتنُ فَتحِ القَريب

لە تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام
لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعي) رضي الله عنه


داناتی
عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی



بلاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - هەولێر - کوردستان




# ڕۆژی پڕشـــنگـــدار

## ڕوونکردنەوەی (غايَةِ الإخْتِصار)

ناسراو بە

# ﴿ مَتْنِ فَتْحِ الْقَرِيب ﴾

لە تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام

لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعی) ﷺ

دانانی

## عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

### چاپی هەشتەم

ربیع الثانی (١٤٣٠)ی کۆچی
خاکەلێوە (٢٧٠٩)ی کوردی
نیسـان (٢٠٠٩)ی زایینی
دانەر بەخۆی بۆ ئەم چاپە ئامادەی کردوە
*کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی لە هەولێر، چاپی کردۆتەوە*
ژمارەی سپاردنی (٣٥) ساڵی (٢٠٠٦)ز، لە کتێبخانەی گشتی هەولێر، دراوەتێ

ناوی کیتاب: ڕۆژی پرشنگدار، ڕوونکردنەوەی (متن فتح القريب).
بابەت: شەریعەتی ئیسلام.
دانەر: عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی.
نۆبەتی چاپ: هەشتەم.
بەرواری چاپ: (١٤٣٠)کۆچی-(٢٧٠٩)کوردی-(٢٠٠٩)زایینی.
تیراژ: (٣٠٠٠) دانە.
چاپخانە: دار المعرفة بەیرووت
بڵاوکەرەوە: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، لە هەولێر.

---

چاپی یەکەم: (٣٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری/ هەولێر-١٩٩٦.
چاپی دووەم: (٢٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی کریستاڵ/ هەولێر-١٩٩٨.
چاپی سێیەم: (٢٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر-٢٠٠٠.
چاپی چوارەم: (٣٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر-٢٠٠٢.
چاپی پێنجەم: (٣٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی مهارت - تهران / ئێران- ٢٠٠٦.
چاپی شەشەم: (٣٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی مهارت - تهران / ئێران- ٢٠٠٧.
چاپی حەفتەم: (٣٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی مهارت - تهران / ئێران-٢٠٠٨.

*دانراوەکانی تری دانەر:*

١- هۆنراوەی ﴿ئیمان و ئیسلام﴾
٢- ڕوونکردنەوەی ﴿الأربعين النواوية﴾
٣- ﴿عەقیدەی ئیسلامی﴾
٤- ڕوونکردنەوەی ﴿العقيدة الطحاوية﴾
٥- چەند گوڵێك لە ﴿گوڵزاری ئیسلام﴾
٦- ڕوونکردنەوەی ﴿منهاج الطالبين﴾
٧- ڕوونکردنەوەی ﴿قطر العارض فى علم الفرائض﴾
٨- ﴿چۆنیەتی حەج و عومرە﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی دانەر

﴿يا رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلالِ وَجْهِكَ وَلِعَظِيمِ سُـلْطانِكَ لاَ أُحْصِـي ثَنـاءً عَـلَيْكَ أَنْتَ كَما أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ، وَأُصَلِّي وَأُسَلِّمُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ خاتَمِ أَنْبِيائِكَ وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحابِهِ إِلَى يَوْمِ لِقَائِكَ﴾.

له دوای سوپاس بۆ خوداو ناردنی درووود بۆ گیانی پاکی حەزرەتی(محمدالمصطفى)ﷺ بزانە: کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ من ئادەمیزادو جنۆکەم بۆ هیچ دروست نەکردون تەنها بۆ ئەوە نەبێ: کە بمپەرستن‌و تەنها من بە دادوەرو پەروەردگار دابنێن.

مەبەست لێرەدا ئەمەیە: کاروباری ئایینی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رامیاری‌و گشت فەرمانڕەوایی لە ژێر ئەو یاسایە بێ: کە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ لە لای خوداوە بۆی هاتوەو بە ئێمەی ڕاگەیاندوە.

جیاوازی نیە-ئەم یاسایە-ووشەو واتەی لە لای خواوە هاتبێ: وەکو قورئانی پیرۆز، یان تەنها واتەی لە لای خواوە هاتبێ‌و پێغەمبەرﷺ بە زمانە شیرینەکەی خۆی ووشەی بۆ دانابێ: وەکو حەدیس، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى﴾ پێغەمبەرﷺ لەخۆیەوە هیچ نالێ، وە هەرچی بیلێ هەر لە لای خواوە پێی ڕاگەیاندراوە.

کەوابوو: یاسای ئیسلام-لە هەموو بوارێکیەوە-لەو دوو سەرچاوەیە هەڵێنجراوە، جا هەر کەسێك لەو دوو سەرچاوەیە ئاو بخواتەوە، هەرگیز گومڕا نابێ، بەڵام ئاوخواردنەوەش جاری وا هەیە: دۆلچەی پێویستەو ئاودەری پێویستەو کەسێکی وای ئەوێ: شوێنی ئاوەکە بدۆزێتەوەو ئەگەر تێنووەکە پێی نەزانێ دەبی شوێنی کەوێ، جا هەر لە بەر ئەوەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُـونَ﴾ ئێوە پرسیار لە زانایانی قورئان بکەن ئەگەر بە خۆتان نازانن.

شتێکی ئاشکرایە لەم دونیایەدا هەموو کەس خوێندەوار نیەو هەموو خوێندەوارێکیش زانا نیەو هەموو زانایەکیش لەو پلەیە نیە: کە بتوانێ زمانی عەرەبی وەردو شۆ بکا-کە زمانی قورئان‌و حەدیسە- بۆیێ بە ناچاری ئەبی فەرمانی ئەو ئایەتە پیرۆزە جێبەجێ بکەین‌و سوود لەو بەرهەمە وەربگرین: کە زانایانی باوەڕ پێکراو بۆ ئێمەیان

بەجێ‌هێشتوە، ئەو بەرهەمەش ڕوونکردنەوەی قورئان‌و حەدیسە، بەگوێرەی یاسایەکی تایبەتی کە پێی ئەگوترێ: (أُصُولُ الْفِقْه)، واتە: یاساو بنچینەی تێگەیشتن، وە ئەو بەرهەمە بە نرخەش پێی ئەگوترێ: (فِقْه)، واتە: تێگەیشتنی قورئان‌و حەدیس، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ يُرِدِاللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي‌الدِّينِ﴾رواه البخاری ومسلم، هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێ بەختەوەری بکا، لە ئایینی پیرۆز تێی‌ئەگەیەنێ‌و ئەبێتە شەرعزان.

جا بزانە: ئەو جۆرە کەسەی هەوڵ ئەدا ئەو تێگەیشتنە وەدەست بێنێ، پێی ئەگوترێ: (مُجْتَهِدٌ)، واتە: هەوڵدەر، هەم پێی ئەگوترێ: (فَقِيه)، واتە: تێگەیشتوو لە قورئان‌و حەدیس، وە خۆماندووکردنەکەشی پێی ئەگوترێ: (اِجْتِهاد)، وە شێوەی خۆماندووکردنەکەی‌و لێکۆڵینەوەی لە قورئان‌و حەدیس پێی ئەگوترێ: (مَذْهَبْ)، واتە: ڕێگای بۆچوون.

ئینجا کە ئەوەت زانی، ئەمەش بزانە: کە زانایان لە بۆچوون‌و لێکۆڵینەوەی قورئان‌و حەدیسدا جیاوازن، لەبەر ئەو جیاوازی‌یە جیاوازی لە نێوان (مَذْهَب)ەکانی شەریعەتی ئیسلامدا ڕووی‌داوە، بەڵام ئەو جیاوازی‌یە چاکەیەکی خودایە کە بە ئێمەی بەخشیوەو زیان بە ئاین ناگەیەنێ، بەڵگەش ئەم حەدیسە پیرۆزەیە:

﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ‌اللهُ عَنهُما: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قالَ يَوْمَ الْأَحْزابِ: أَلاَ: لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي‌قُرَيْظَةَ، فَأَدْرَكَ بَعْضُهُمُ الْعَصْرَ فِي‌الطَّرِيقِ فَقالَ بَعْضُهُمْ: لاَ نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَها، وَقالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي لَمْ يُرِدْ مِنَّا ذَلِكَ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّﷺ فَلَمْ يُعَنِّفْ واحِداً مِنْهُمْ﴾رواه البخاری ومسلم، پێغەمبەرﷺ لە جەنگی (أَحْزاب)دا فەرمووی: ئاگادار بن: نابێ هیچ کەس نوێژی عەسر بکا تا لە ناو ماڵەکانی (بەنی‌قورەیزە)دا ئەیکا، ئینجا یارەکان کەوتنە ڕێ‌و لە ڕێگەدا کاتی نوێژی(عَصْر) هات، چینێك گوتیان: ئێمە نوێژ ناکەین تا ئەگەینە ناو ماڵەکانی(بەنی‌قورەیزە)، چونکە ووشەی حەدیسەکە وا ئەگەیەنێ، جا ئەو چینە لە دوای مەغریب نوێژی عەسریان کرد؟ چونکە درەنگ گەیشتنە جێ، وە چینەکەی‌تر گوتیان: ئێمە ئێستا نوێژەکەمان ئەکەین، چونکە مەبەستی پێغەمبەرﷺ تەنها پەلەکردنە، نەك دوا خستنی نوێژ، ئینجا کە ئەو ڕووداوەیان بۆ پێغەمبەرﷺ باس کرد، هیچیانی بە بەهەڵەداچوو و تاوانبار دانەنا، چونکە ئەو جیاوازی‌یە لە جیاوازی بۆچووندا ڕووی‌دابو.

جا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست لێرەدا بۆت ئاشکرابو: کە جیاوازی لە نێوان مەزهەبی ئیمام (أبوحنيفة)و ئیمام(مالك)و ئیمامی(الشافعي)و ئیمام(أحمد)دا، هەروەك جیاوازی ئەو دوو چینەسەحابەی پێغەمبەرەوﷺ کارێکی رەوایە، هیچ کەسێکیش ناتوانێ جیاوازی لە بۆچووندا–لەم دونیایەدا–لابباو خەڵکی لە ناو جوغزێکی تەسکدا بەند بکا.

بەڵام بۆ ئەوەی پەرتەوازەیی روو نەداو خەڵکیفێڵبازو لە خوانەترس دەستی خۆی نەخاتە ناو یاسای ئیسلام، زانایانی ئیسلام تەنها دانیان بەو چوار مەزهەبەدا هێناوە، کەوابوو: تەنها ئەو چوار مەزهەبە جێگەی باوەڕن‌و، ئێمە بە ئاماژەی هەر کامیان شوێنکەوتووی قورئان‌و حەدیس بین، خوای گەورە لێمان وەرئەگرێ، چونکە بە فەرمانی ئایەتی ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ جولاوینەوە.

وە هەر لە بەر ئەو ئایەتە، لە سەردەمی ئەو چوار ئیمامانەوە تا ئێستا موسوڵمانان لە سەر ئەو یاسایە ڕۆیشتون‌و هەر یەکەش بۆ خۆی پەیوەندی بە مەزهەبێکەوە کردوە، کەوابوو: ناگونجێ ئەم هەموو خەڵکە بە گومڕا دابندرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ لاَيَجْمَعُ أُمَّتِي عَلَىٰضَلاَلَةٍ وَيَدُاللهِ مَعَ الْجَماعَةِ وَمَنْ شَذَّ، شَذَّ إِلَىَ النَّارِ﴾ رواه الترمذي، خوایگەورە ئوممەتی من لە سەر هیچ گومڕابوونێك کۆ ناکاتەوەو دەستی یارمەتی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە، هەرکەسێك لە کۆمەڵ دەرچێ، ئەوە بەرەو ئاگر ئەڕوا.

ئینجا کە ئەوەت زانی، ئەمەش بزانە: لە هەر چوار مەزهەبەکاندا کتێبی (فِقْه)ی جۆراوجۆر داندراون، بۆ ئەوەی خەڵك سودیان لێوەربگرێ، وە کورتترین کتێب–کە لە مەزهەبی ئیمامی(الشافعي) داندرابێ– (غايَةُ الإِخْتِصارِ) بوو، کە داندراوی زانای بە ناوبانگ: (أبيشجاع)ی ئەسفەهانی‌یە–خوا لێی ڕازی بێ– وە ئەم کتێبە بە نرخە گشت باسەکانی (فِقْه)ی ئیسلامی تێدا کۆ کراونەوەو باسەکانی زۆر بە ڕێکی دابەش کردون، بە شێوەیەکی وەها: کە قوتابی‌و مامۆستا سودی لێوەرئەگرن، خوا پاداشتی دانەرەکەی بداتەوە.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکیتریشەوە ئەبینم لە کوردستانی خۆشەویستماندا لاوەکانی کورد بە زۆری هەستی ئایینییان ئەجوڵێو ڕوو ئەکەنە مزگەوتەکان‌و زۆر سوورن لە سەر ئەوەی کە شارەزای ئایینی ئیسلام بن، جا لە بارەی خواپەرستی، یان ڕامیاری، یان ئابووری، یان کۆمەلایەتی...هتد.

وە ئەم کتێبە کورتەش گشتی تێدا کۆ کرابۆوە، بۆیێ هەڵسام‌و ناوی خوام لێهێناو بە زمانی کوردی وەرم گێڕاو ڕوونم کردەوەو چەند شتی بە نرخم تێدا نووسی‌و، لە قورئانی

پیرۆزو لە حەدیسی پێغەمبەرﷺ بە زۆری بەڵگەم بۆ هێناوەتەوە، ئینجا ئەی موسوڵمانی بەڕێز، بۆ ئەوەی لە حەدیسەکانو لە مەسەلەکانی (فِقْه)ی گومانت نەمێنیو دڵنیا ببی، تەماشای ئەم سەرچاوانە بکە:

١- (تحفةالمحتاج لشرح المنهاج، لإبن حجرالهيتمى) وە (حاشيةالشروانى) کە لەگەڵیدایە.

٢- (الإقناع فِى حَلّ ألفاظ أبىشجاع، للخطيب الشربينى).

بەڵام لەمە ڕەخنەم لێمەگرە: کە ئەبینی تەنها پارچەیەکی ئایەتێك، یان حەدیسێکم نووسیوە، چونکە بۆ کورتی وام کردوە، جا ئەگەر لە کۆتایی حەدیسدا نووسیبوم: (رواه الشيخان)، مەبەستم ئیمامی(البخارى)و ئیمامی(مسلم)ن، وە ئەگەر نووسیبوم: (رواه اصحاب السنن)، مەبەستم ئیمامی(الترمذى)و ئیمامی(أبوداود)و، ئیمامی (النَّسائي)یە، خوا لێیان ڕازی بێ.

ئیتر ئەی موسوڵمانی خۆشەویست، من دڵنیات ئەکەم کە لەو کارەدا هیچ خیانەتم نەکردوەو خوای گەورە چۆن یارمەتی دابم ئەوها خۆم ماندوو کردوەو، دان بەوەدا ئەنێم کە من سواری ئەو مەیدانە نیم، بەڵام تا ئێستا هیچ کتێبێکم بەم شێوەیە نەهاتۆتە بەرچاو: کە بە کوردی داندرابێو لاوی کوردی موسوڵمان بە بەڵگە دڵنیا بکا، کەوابوو: بە ئەرکی سەرشانی خۆمم زانی کە ئەم کتێبە بەم شێوەیە پێشکەش بە جەنابت بکەمو، ناوم نا:

## ﴿ ڕۆژی پڕشنگدار، ڕوونکردنەوەی (غَايَةُالإخْتِصار) ﴾

جا ئەگەر هەڵەیەکت چاو پێکەوت، تکات لێئەکەم ڕاستی بکەرەوەو ئەگەر کەموکوڕی هەبوو، چاوپۆشیم لێبکە. جا بە هەر جۆرێك بێ، لە بەڕێزت چاوەڕوانی دوعام، کەوابوو: دوعام بۆ بکە: خوا ئەم کارەم لێوەربگرێو، لە منو لە ئێوەو لە دایكو باوکمان خۆش بێو لە دۆزەخ ڕزگارمان بکاو بە بەهەشت شادمان بکا، آمین.

عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی

هەولێر - کوردستان

ڕەمەزانی (١٤١٣)ی کۆچی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

اَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعالَمِين وَصَلّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ اَلنَّبِيِّ الْأُمِّيِّ وَآلِهِ الطّاهِرِينَ وَصَحابَتِه أَجْمَعِينَ.

قالَ الْقاضِي أَبُوشُجاعٍ أَحْمَدُ بنُ الْحُسَيْنِ بنُ أَحْمَدَ الْأَصْفَهانِي-رَحِمَهُ اللهُ تَعالى-: سَأَلَنِي

﴿ پێناسەی (أبي شـجاع)ی دانەری کتێبەکە ﴾

بزانـە: ئـەم کتێبـە نـاوی (غايَةُالإِخْتِصـار)ە، هـەم پـێی ئـەگوترێ: (مَـتنُ التَّقرِيـب)، بەڵام لە کوردەواریدا ناسراوە: بە (مَتنِ فَتْحِ الْقَرِيب).

هەروەها: دانەری ئەم کتێبەش بە (أبوشجاع) بە ناوبانگەو ناوی (أحمد) کـوڕی (حسـين) کوڕی (أحمد)ە، خەڵکی شاری ئیسفەهانە: کە شارێکە لە ئێران.

ئەم بەڕێزە پیاوچاکێکی خواپەرستو خێرۆمەند بوو، لـە نـاو موسوڵماناندا بـە زانایـەکی ئاین پەروەرو خواناس بەناوبانگ بوو، یەکەمجار ئەو بەڕێزە (قازی) بوو، ئینجا بووەتـە وەزیر، ئینجا وازی لە دونیا هێناو چووە (مدينـة)ی پـیرۆزو، لـەوێ دەسـتی بـە خزمـەتی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ کرد، ماوەی (١٦٠) سەدو شەست ساڵ ژیاوە، لەگەڵ ئەوەشدا–تا وەفاتی کرد– هیچ ئەندامێکی لە کار نەکەوتبو، لە ساڵی(٤٨٨)ی کۆچی وەفاتی کرد، لـە (مدينة)ی پیرۆز لە نزیك ژوورەکەی گۆڕی پێغەمبەرﷺ نێشتراوە، ڕەحمەتی خوا بڕژێ بە سەر گۆڕیدا، خوای گەورە ئەویشو ئێمەش بە بەهەشت شاد بکا، آمين.

﴿ پێشەکیی (أبي شجاع) ﴾

(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بەناوی خوای بەخشندەومیهرەبان دەست بە دانانی ئـەم کتێبـە ئەکـەم (اَلْحَمْـدُ للهِ رَبِّ الْعـالَمِينَ) سـوپاس بـۆ ئـەو خوایـەی پـەروەردگاری هـەموو دروستکراوێکە (وَصَلَّىاللهُ عَلَىسَيِّدِنا مُحَمَّدٍ) خودا ڕەحمەتی خۆی بڕژێنێ بۆ سەر گەورەو سەرداری ئێمە: حەزرەتی(محمد) پێغەمبەری هەموو جیهانﷺ (وَآلِهِ) هەروەها ڕەحمەتی خۆی بڕژێنێتە سەر خزمەموسوڵمانەکانی پێغەمبەرﷺ (وَصَحْبِهِ) هەروەهارەحمـەتیخۆی بڕژێنێتە سەر یارانی پێغەمبەرﷺ (أَجْمَعِينَ) بە تێکڕایی.

(صَحـابَة): کەسێکە بـە موسـوڵمانی پێغەمبـەریﷺ دیتبـێ، یـان پێغەمبـەرﷺ ئـەوی دیتبێ، هەر بە موسوڵمانیش مردبێ.

(أَمّا بَعْدُ) پاش ئەمە، بزانـە: (قـالَ الْقاضِـي أَبُـو شـجاع) ئـەو (قـازی)یـەی پـێی ئـەڵێن: بـاوکی شـوجاع، نـاوی (أحمـد بـن الحسـين بـن أحمـد الأصـفهاني)یـە، واتـە: خـەڵکی ئیسـفەهانە: کـە شـارێکە لـەئێران، ئەفـەرموێ: (سَـأَلَنِي) داوایـان لـێم کـرد

بَعْضُ الْأَصْدِقاءِ-حَفِظَهُمُ اللهُ تَعالىَ- : أَنْ أَعْمَلَ مُخْتَصَراً فِي الْفِقْهِ عَلَى مَذْهَبِ الْإِمامِ الشَّافِعيِّ-رَحْمَةُ اللهِ تَعالىَ عَلَيْهِ وَرِضْوانُهُ- فِي غايَةِ الْإِخْتِصارِ وَنِهايَةِ الْإِيجازِ لِيَقْرُبَ عَلَى الْمُتَعَلِّمِ دَرْسُهُ وَيَسْهُلَ عَلَى الْمُبْتَدي حِفْظُهُ، وَأَنْ أُكْثِرَ فِيهِ مِنَ التَّقْسِيماتِ وَحَصْرِ الْخِصالِ، فَأَجَبْتُهُ إِلى ذَلِكَ طالِباً لِلثَّوابِ راغِباً إِلى اللهِ تَعالى فِي التَّوْفِيقِ لِلصَّوابِ، إِنَّهُ عَلى مايَشاءُ قَديرٌ وَبِعِبادِهِ لَطِيفٌ خَبِيرٌ.

---

(بَعْضُ الأَصْدِقاءِ) هەندێ لە دۆستانیخۆم-(حَفِظَهُمُ اللهُ تَعالَى) خوای گەورە بیانپارێزێ- (أَنْ أعملَ مُخْتَصَرًا) کە نامیلکەیەکی کورتیان بۆ ڕێك بخەم (فِي الْفِقْهِ) لە تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام.

(**پێناسە**): (فِقْه): تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەرعییە، کە لە قورئانی پیرۆزو لە حەدیسی پێغەمبەرﷺ وەرگیراون بۆ ئەوەی جێبەجێ بکرێن لە لایەن فەرمان پێکراوەکان.

(على مذهب الإمام الشافعي)ﷺ ئەم تێگەیشتنە لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعي) بێ، چونکە هەر یەکە لەو چوار ئیمامە، واتە: ئیمامی (حَنَفِي)و (مَالِكِي)و (شَافِعِي)و (حَنْبَلِي) -خوا لێیان ڕازی بێ-جۆرە بۆ چونێکیان هەیە لە ڕوونکردنەوەو تێگەیشتنی قورئانو حەدیس، جا ئەم تێگەیشتنە پێی ئەگوترێ: (فِقْه)، وە جۆری بۆچوونەکەش پێی ئەگوترێ: (مَذْهَب).

ئینجا ئەم نامیلکەیە وەها دابنێم (فِي غايَةِ الْإِخْتِصارِ) یەکجار کورت بێو دووبارەی تێدا نەبێ (وَنِهايَةِ الْإِيجازِ) لەوپەڕی کورتی بێو درێژەی تێدا نەبێ (لِيَقْرُبَ عَلَى الْمُتَعَلِّمِ) تاکو قوتابی ئایینی بۆی ئاسان بێ (دَرْسُهُ) خوێندنی.

(وَيَسْهُلَ عَلَى الْمُبْتَدِي حِفْظُهُ) هەروەها بۆ ئەوەی ئاسان بێ لەبەرکردنی بۆ ئەو کەسەی تازە دەست پێئەکا (وَأَنْ أُكْثِرَ فِيهِ مِنَ التَّقْسِيماتِ) داوایان لێم کرد: ئەم نامیلکەیە زۆر بەش بەش بکەم و (وَحَصْرِ الْخِصالِ) هەموو شتە باشەکان بگرێتەوە.

(فَأَجَبْتُهُ إِلى ذلِكَ) ئینجا منیش داوایەکەی ئەوانم جێبەجێ کردو بڕیارم دا نامیلکەکە بنوسم (طالِباً لِلثَّوابِ) داوای پاداشتی ئەوە لە خوا ئەکەم (راغِباً إِلى اللهِ تَعالَى) هاوار ئەکەمە لایخوای گەورە (فِي التَّوْفِيقِ) کە توانام بدا (لِلصَّوابِ) بۆ ڕاستی، دورم بخاتەوە لە هەڵە (إِنَّهُ عَلَى ما يَشاءُ قَدِيرٌ) چونکە خوای گەورە توانایە بۆ کردنی هەر شتێکی حەز بکا (وَبِعِبادِهِ لَطِيفٌ) لەگەڵ بەندەکانی خۆی لەسەرخۆیەو گشت نهێنییەکانیشیان ئەزانێ (خَبِيرٌ) لە هەموو کردەوەکانیان ئاگادارە.

* * *

# (كِتَابُ الطَّهارَة)

﴿ كِـتابُ الـطَّهارَةِ: ئەم پەرتوكە باسی پاككردنەوە ئەكا ﴾

واتە: لابردنی پیسیو بێدەستنوێژیی بچوكو گەورە.

﴿پێشەكی﴾ بزانە: چەند زانستێكی بە سود هەنە، پێویستە گشت قوتابییەكی ئایینی بیانزانێ:

**یەكەم:** بڕیارەكانی شەریعەتی ئیسلام-كە وەرگیراون لە (قُرآن)و (حدیث)و (اجماع)، واتە: یەكدەنگی زانایانی ئایین-حەفتن، ئەمەش پێناسەكەیانە:

١- (وَاجِب)، یان (فَرْض)، واتە: پێویست، ئەوەیە بە كردنی پاداشتی بدرێتێو لە سەر نەكردنی سزا بدرێ: وەكو نوێژ كردن.

ئینجا بزانە: (وَاجِبٌ) دوو جۆرە، یەكەمیان: (فَرْضُ الْعَيْن): كە پێویستە هەموو كەسێك بۆ خۆی بیكا، پاداشتو سزاشی هەر بۆ خۆیەتی، واتە: بە كردنی كەسێكیتر تاوانی نەكردنی لە سەر لاناچێ: وەكو نوێژو ڕۆژوو، هتد. دووەمیان: (فَرْضُ الْكِفايَة): كە ئەگەر یەكێك، یان كۆمەڵێك واجبەكە بە تەواوی بكا، خێرەكە بۆ خۆیەتی، سزای نەكردنیش لەسەر موسوڵمانانیتر لائەچێ: وەكو ناشتنی مردوو...هتد

٢- (سُنَّةٌ)، یان (مَنْدُوبٌ)، یان (مُسْتَحَبٌ)، واتە: خێر، ئەوەیە بە كردنی پاداشتی بدرێتێو لە سەر نەكردنی سزا نەدرێ: وەكو سیواك كردن...هتد.

٣- (حَرَامٌ)، واتە: قەدەغەكراو، ئەوەیە لە سەر كردنی سزابدرێو بە واز لێهێنانی پاداشتی بدرێتێ: وەكو دزیو زینا...هتد.

٤- (مَكْرُوهٌ)، واتە: ناپەسند، ئەوەیە لە سەر كردنی سزا نەدرێ و ئەگەر بۆ خوا وازی لێبێنێ پاداشتی بدرێتێ: وەكو خواردن بە دەستی چەپە...هتد.

٥- (حَلاَلٌ)، یان (جائِزٌ)، واتە: ڕێگەدراو، ئەوەیە كردنو نەكردنی یەكسان بێ: وەكو نوستنو خواردن...هتد، بەڵام ئەگەر بە نیازی بەهێزبوون بۆ خواپەرستی بیكا خێری ئەگاتێ: وەكو نوستنی ڕۆژێ بە نیازی شەونوێژ.

٦- (صَحِيحٌ)، واتە: دروستو تەواو، ئەوەیە بڕیارەكانی خواو پێغەمبەریﷺ لێبێنە جێ لەگەڵ ئەو مەرجانەی بۆی داندراون: وەكو نوێژ بە دەستنوێژەوە...هتد.

٧- (باطِلٌ)، یان (فاسِدٌ)، واتە: ناتەواو و نادروست، ئەوەیە مەرجەكانو بڕیارەكانی شەرعی لێنێنە جێ: وەكو نوێژی بێدەستنوێژ...هتد.

**دووەم:** بزانە: ئەو بڕیارانە-لە دوای (قُرآن)-یان لە(حَدِيثٌ صَحِيح)، یان لە(حَدِيثٌ حَسَن) وەرئەگیرێ، چونكە (حديثٌ ضَعیف)-بێهێز بەم شێوەیە:

أَلْمياهُ الَّتِي يَجُوزُ بِهَا التَّطْهِيرُ سَبْعُ مِياهٍ: ماءُ السَّماءِ، وَمــاءُ الْبَحْــرِ، وَمــاءُ النَّهْــرِ، وَمَاءُ الْبِئْرِ، وَماءُ الْعَيْنِ،

---

* ئیمامی (الشافعي) ئەفەرموێ: ئەگەر خەڵك، واتە: زانایانی ئایین بە حەدیسێکی (ضَعیف) ڕازی بونو قبوڵیان کرد، ئەوە ئەبێتە بەڵگەو بۆ بڕیارەکانی شەریعەت بەکار دێ، واتە: چونکە ئەبێتە (إجْماع).

* ئیمام (أحمد) ئەفەرموێ: بەو مەرجە حەدیسی (ضَعیف) بەکار دێ: ئەگەر دژایەتی نەبێ، واتە: لەگەڵ قورئانو حەدیسێکیتری (صَحیح). بڕوانە (الْمَدابِغي).

* ئیمام (النواوي) ئەفەرموێ: زانایان فەرموویانە: دروستە حەدیسی (ضَعیف) بۆ کاری خێرو چاکە بەکار بێ، واتە: بەو مەرجەی زۆر (ضَعیف) نەبێ. بڕوانە (الأذْكار).

**سێیەم:** بزانە: لە (عُلُوم الْحَدیث)دا (قاعَدة)یەك هەیە: ئەگەر (سَنَد)ی حەدیسێك (ضَعیف) بوو، بەڵام (مَتْن)ی حەدیسەکە لەگەڵ (مَتْن)ی حەدیسێکیتری(صحیح) تێکی ئەکردەوە، ئەم حەدیسە (صحیح)ە ئەبێتە (شَاهِد) بۆ حەدیسە (ضَعیف)ەکەو بەرزی ئەکاتەوە بۆ پلەی (حَسَنٌ لِغَيْرِه)و بەکار دێ وەکو حەدیسی (حَسَنٌ لِذاتِه).

کەوابوو: ئاگادار بە: ئەو جۆرە حەدیسانەی لەبەشی دووەمو سێیەمدا باسمان کردن لە کتێبی (فِقْه)-شەریعەتی ئیسلامدا زۆرنو بەکار دێن بەو مەرجانەی باسمان کردن، بەڵام تەنها (مُجْتَهِدْ) ئەتوانێ ئەو کارە بکا، هەروەك لە پێشەکیدا باسمان کرد.

**ئینجا بزانە:** (إجْماع)، واتە: یەکدەنگی زانایانی ئایین، بەڵگەی سێیەمە لە دوای (قُرآن)و (حَدیث)، کەواتە: ئەگەر چینێکی (مُجْتَهِدین)ی ئیسلام یەکدەنگ بون لە سەر بڕیارێکی شەرعی، واجبە ڕەفتاری پێبکرێ، بڕوانە ئایەتی (٥٩) النساء.

## ﴿ باسی ئاوەکان ﴾

(اَلْمِياهُ الَّتِي) ئەو جۆرە ئاوانەی کە (يَجُوزُ) دروستە (بِهَا التَّطْهِيرُ) شتیان پێ پاك بکرێتەوەو دەستنوێژیان پێ بشۆرێ (سَبْعُ مِياهٍ) حەفت جۆرە ئاون:

**یەکەم:** (ماءُ السَّماءِ) ئاوی ئاسمانە، واتە: باران، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ﴾ خوا لە ئاسمانەوە ئاوتان بۆ ئەبارێنێ بۆ ئەوەی پاکتان بکاتەوە بەو بارانە.

**دووەم:** (وَماءُ الْبَحْرِ) ئاوی دەریایە، هەر جۆرێك بێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الْبَحْرِ: هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەریا ئاوەکەی پاککەرەوەیەو مردووەکەشی حەڵاڵە.

**سێیەم:** (وَمـاءُ النَّهْـرِ) ئـاوی ڕووبـارە. **چوارەم:** (وَمـاءُ الْبِئْـرِ) ئـاوی بـیرە. **پێنجەم:** (وَمـاءُ الْعَيْنِ) ئـاوی سەرچـاوەیە، ئـەو سێیانە-وەك یـەك- لـە زەمـین دێنـە

وَماءُ الثَّلْجِ، وَمَــاءُ الْبَــرَد. ثُــمَّ الْمِيــاهُ عَلَــى أَرْبَعَــةِ أَقْسَــام: طَــاهِرٌ مُطَهِّــرٌ غَيْرُ مَكْرُوهٍ إسْتِعْمالُهُ وَهُوَ الْمَــاءُ الْمُطْلَــقُ. وَطَــاهِرٌ مُطَهِّــرٌ مَكْــرُوهٌ إسْــتِعْمالُهُ وَهُوَالْمَاءُ الْمُشَمَّسُ. وَطاهِرٌ غَيْرُ مُطَهِّرٍ وَهُوَ الْمَاءُ الْمُسْتَعْمَلُ،

---

دەرەوە، بەلگە بۆ ھەرسێکیان: ﴿عَنْ أَبِي سَــعِيدالْخُدْرِيِّ ﷺ: قَــالَ النَّبِــيُّ ﷺ فِــي بِئْرِبُضَاعَةَ: إنَّ الْماءَ طَهُــورٌ لايُنَجِّسُــهُ شَــيْءٌ﴾ رواه أصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئاوی ئەو بیرە پاککەرەوەیەو ھیچ شتێك پیسی ناكا.

شەشەم: (وَماءُ الثَّلْجِ) ئاوی بەفرە. حەفتەم: (وَماءُ الْبَرَدِ) ئاوی تەرزەیە. پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: ﴿اَللّٰهُمَّ اغْسِلْ خَطَايايَ بِالْمَاءِ وَالــثَّلْجِ وَالْبَــرَدِ﴾ رواه الشيخان، خوایە تاوانەکانم لێبشۆرێنە بە ئاو و بەفرو تەرزە. ئینجا بە کورتی ئەو حەفت ئاوانە: یان ئـاوی ئاسمانن، یان ئاوی زەمینن.

(ثُمَّ) ئینجـا لـە دوای ئـەوەی جۆرەکـانی ئـاوت زانـی، بزانـە: (الْمِيَـاهُ عَلَى أَرْبَعَـةِ أَقْسـامٍ) ئەو ئاوانە ئەکرێنە چوار بەش:

بەشی یەکەم: (طاهِرٌ) ئاوێکی پاکەو (مُطَهِّرٌ) شت پـاك ئەکاتـەوەو (غَيْـرُ مَكْرُوهٍ اِسْتِعْمالُهُ) بەکارھێنانی ناپەسند نیە (وَهُوَ الْمَاءُ الْمُطْلَقُ) ئەم بەشەیان ئاوی ڕووتی پێئەگوترێ، واتـە: لە ئاوی ئاو بەو لاوە ئاوێکیتری نەبێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: بالَ أَعْرابِيٌّ فِــي الْمَسْــجِدِ، فَتَناوَلَهُ النَّاسُ، فَقالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ: دَعُوهُ وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَــجْلاً مِــنْ مَــاءٍ﴾ رواه الشيخان، پیاوێك میزی لە ناو مزگەوت کرد، خەڵکیش لێیان قیڕاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وازی لێبێنن و دۆلچەیەکی ئاو بڕژێنن بە سەر میزەکەیدا.

بەشـی دووەم: (وَطـاهِرٌ مُطَهِّرٌ) ئـاوێکی پـاكو پاککەرەوەیـە، بـەلام (مَكْرُوهٌ إسْتِعْمالُهُ) بەکارھێنانی ناپەسندە؟ چونکە مەترسی بەڵەکبوونی پێستی لێئەکرێ، ھـەروەك ئیمـامی (عُمَر) ﷺ وای فەرمووە (وَهُوَ الْماءُ الْمُشَمَّسُ) ئەمەشیان ئەو ئاوەیە: کە لە وولاتێکی زۆر گەرم، بە گەرمایی ڕۆژ، لە ناو قاپێکی ئاسندا گەرم ببێ.

بەشی سێیەم: (وَطاهِرٌ) ئاوێکی پاکە (غَيْرُ مُطَهِّرٍ) پاککـەرەوە نیـە، واتـە: ھـیچ شتێکی پـێ پـاك نابێتـەوەو دەستنوێژیشـی پـێناشـۆرێ (وَهُـوَ الْمـاءُ الْمُسْتَعْمَلُ) ئەمەشـیان ئـەو ئاوەیـە کـە جارێـك بـەکار ھـاتبێ بـۆ دەسـتنوێژ، یـان بـۆ شـۆرینی شـتێکیتر، بەڵگـە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ: لايَغْتَسِلْ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ وَهُوَ جُنُبٌ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ لەشتان بە جەنابەت بێ، لە ناو ئـاوێکی کـەمی وەسـتاودا خۆتـان مەشـۆن. واتـە: چـونکە بـەو بەکارھێنانـە بـۆ جـارێکیتر ھێـزی پاککردنەوەی نامێنێ.

**وَالْمُتَغَيِّرُ بِمَا خَالَطَهُ مِنَ الطَّاهِراتِ. وَماءٌ نَجِسٌ وَهُوَ الَّذِى حَلَّتْ فِيهِ نَجاسَةٌ وَهُوَ دُونَ الْقُلَّتَيْنِ أَوْ كانَ قُلَّتَيْنِ فَتَغَيَّرَ. وَالْقُلَّتانِ خَمْسُمِأَةِ رِطْلٍ بَغْدادِيٍّ تَقْرِيباً فِي الأَصَحِّ.**

---

(وَالْمُتَغَيِّرُ) هەروەها وەك بەشی سێیەمە-واتە: پاكە، پاككەرەوە نیە-ئاوێكی گۆڕاو (بِما) بە شتێكی وەها كە(خَالَطَهُ) تێكەڵی بوبێ (مِنَ الطَّاهِراتِ) لەو شتانەی پاكن، ئینجا تامی بگۆڕێ، یان بۆنی، یان ڕەنگی: وەك شەكر، یان ماستی تێكەڵ بكەی، یان چایە...هتد، چونكە بەو تێكەڵبوونە ناوی ئاوی لە سەر لائەچێ‌و شت پاك ناكاتەوە.

ئینجا بزانە: گۆڕانی ئاو بە هۆی زۆر مانەوەی، یان بە هۆی شوێنی وەستانی، یان بە هۆی شوێنی تێپەڕبوونی، یان بە هۆی شێلوبوونی، ئەوانە هیچیان زیانیان نیە.

بەشی چوارەم: (وَماءٌ نَجِسٌ) ئاوێكی پیسە (وَهُوَالَّذِى) ئاوی پیس ئەمەیە: (حَلَّتْ فِيهِ نَجاسَةٌ) شتێكی پیسی تێبكەوێ (وَهُوَ دُونَ الْقُلَّتَيْنِ) ئاوەكەش لە(قوللەتێن) كە متر بێ، جا بگۆڕێ، یان نەگۆڕێ، هەر پیس ئەبێ ﴿عن ابْنِ عُمَرَرَضِيَ اللهُ عَنْهُما: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ﴾ رواه أصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەركاتێك ئاو گەیشتە (قوللەتێن)-بە شتی پیس-پیس نابێ. واتە: ئەگەر لە (قوللەتێن) كەمتر بوو پیس ئەبێ. (أَوْ كانَ قُلَّتَيْنِ) یان ئاوەكە (قوللەتێن) بوو (فَتَغَيَّرَ) بەلام ڕەنگ، یان تام، یان بۆنی گۆڕا، ئەمەشیان هەر پیس ئەبێ، بە بەلگەی (إِجْماع)، واتە: یەكدەنگی زانایانی ئایینی.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئاوی قوللەتێنی پیسبوو، گۆڕانەكەی نەما: بە خۆی، یان بە زیادكردنی، ئەوە پاك ئەبێتەوە.

دیسان بزانە: لە فەرموودەی كۆنی ئیمامی (شافعي)دا‌ﷺ: ئاوی ڕۆیشتوو پیس نابێ بە بێ گۆڕان. وە لە فەرموودەی ئیمام (مالك)دا‌ﷺ: هیچ ئاوێك پیس نابێ تا ئەگۆڕێ.

(وَالْقُلَّتانِ خَمْسُمِأَةِ رِطْلٍ بَغْدادِيٍّ تَقْرِيباً فِي الأَصَحِّ) ئەندازەی (قوللەتێن) نزیكەی پێنج سەد ڕیتلە بە ڕیتلی بەغدا، چونكە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذا بَلَغَ الْماءُ قُلَّتَيْنِ بِقِلالِ هَجَرَ لَمْ يَنْجُسْ﴾ رواه الترمذي والبيهقي، هەركاتێك ئاو بووە (قوللەتێن) بە (قوللەی) هەجەر، پیس نابێ. ئیمامی (شافعي) ئەو حەدیسەی ئەوها لێك دلوەتەوە: كە ئەكاتە پێنج كوندەی ئاو، ئێستا ئەكاتە دوانزە تەنەكە، بە تەنەكەی نەوت، واتە: (١٩٢) لیتر.

﴿پاشكۆ﴾ بزانە: جگە لە سەگو بەراز بە دەم تێنانی هیچ گیانلەبەرێك ئاو پیس نابێ‌و لەكار ناكەوێ ﴿عَنْ جَابِرٍﷺ: سُئِلَ النَّبِيُّﷺ: أَنَتَوَضَّأُ بِمَا أَفْضَلَتِ الْحُمُرُ؟ قالَ: نَعَمْ، وَبِما أَفْضَلَتِ السِّباعُ كُلُّها﴾ رواه البيهقي، پرسیار لە پێغەمبەرﷺ كرا: ئایا بەو ئاوە دەستنوێژ بشۆین كە لە پاش خواردنەوەی كەر ماوەتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، بە بەرماوەی گشت درندەیەك دەستنوێژ بشۆن.

(فَصْلٌ) وَجُلُودُ الْمَيْتَةِ تَطْهُرُ بِالدِّبَاغِ، إِلاَّ جِلْدَالْكَلْبِ وَالْخِنْزِيرِ وَمَا تَوَلَّدَ مِنْهُمَا أَوْ مِنْ أَحَدِهِمَا، وَعَظْمُ الْمَيْتَةِ وَشَعَرُهَا نَجِسٌ إِلاَّ الآدَمِيَّ.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسى پاككردنهوهى پيستهى مرداربوو ﴾

( **پێناسه** ): مردار به ئاژەڵێك، یان به باڵداریك ئەگوترێ: به بێسەربڕینی شەرعی گیانی دەرچوبێ: وەك كەرو هێستر، چونكه شەرع كوشتنەوەی بۆ دانەناوه، ئەگەر به سەربڕینیش گیانی دەرچێ هەر مرداره، یان وەك مەڕو بزنو مریشك، كه بەخۆی مردبێ، یان به بێشەرعی سەری برابێ.

(وَجُلُودُ الْمَيْتَةِ) پيستەی ئاژەڵی مرداربوو (تَطْهُرُ) پاك ئەبێتەوە (بِالدِّبَاغِ) به دەباغ كردنی

( **پێناسه** ): دەباغكردن، واته: خۆشكردن، لابردنی چەورايەتیو زێدە گۆشتی پيستەيه به شتێكی تفتو تاڵ: وەكو گلوان، مازوو، توێكلی هەنار، به جۆرێكی وەها: ئەگەر خرايه ناو ئاو بۆگەن نەبێتەوه ﴿عن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَيُّمَا إِهابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر پيستەيەك دەباغ كرابێ، پاك بۆتەوە.

(إِلاَّ جِلْدَ الْكَلْبِ) تەنها پيستەی سەگ نەبێ (وَالْخِنْزِيرِ) هەروەها پيستەی بەراز نەبێ، چونكه ئەو دووانه به زيندوويش هەر پيسنو گڵاون پيستەيان پاك نابێتەوه به هيچ جۆرێك.

(وَمَا تَوَلَّدَ مِنْهُمَا) هەروەها ئەوەی له نێوان سەگو بەراز له دايك بووە: وەك باوكی له سەگ بێو دايكی له بەراز بێ.

(أَوْ مِنْ أَحَدِهِمَا) يان له يەكێك له سەگو بەراز له دايك بوبێ: وەك باوكی له ئاژەڵێكی پاك بێو دايكی له سەگ بێ، ئەوانه هيچيان پاك نابنەوه.

(وَعَظْمُ الْمَيْتَةِ) ئێسقانی گيانداری مرداربوو، هەم (وَشَعَرُهَا) مووەكانو خوريەكەو پەڕەكانی (نَجِسٌ) گشتی پيسه به هيچ جۆرێك پاك نابنەوه، خوای گەوره فەرموويەتی: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ﴾ حەرام كراوه له سەر ئێوه هەرچی مردار بوبێ. ديارە حەرامكردنی له بەر پيسی‌يه.

(إِلاَّ الآدَمِيَّ) تەنها ئادەميزاد نەبێ: نه لاشەی، نه مووەكانی، نه ئێسقانی پيس نيه، نه به زيندوويی، نه به مردوويی، چونكه خوایگەوره ئەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ به راستی ئێمه ڕێزمان له ئادەميزاد ناوه. واته: ئەگەر پيس بێ هيچ ڕێزی نامێنێ.

﴿**پاشكۆ**﴾: خوریو مووی ئاژەڵێك كه گۆشتی بخورێ، تووكو پەڕی باڵندەيەك كه گۆشتی بخورێ، گشتی پاكه: به زيندوويیو به كوژراوەيی.

بەڵام مووی ئاژەڵێ، يان باڵندەيێ كه گۆشتيان ناخورێ، كه لێی جيابۆوه، پيسه، وەك لاشه مرداربووەكەی.

(فَصْلٌ) وَلاَ يَجُوزُ إسْتِعْمالُ أَواني الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَيَجُوزُ إسْتِعْمَالُ غَيْرِهِمَا مِنَ الأَوانِي.
(فَصْلٌ) وَالسِّواكُ مُسْتَحَبٌّ فِي كُلِّ حَالٍ إلاَّ بَعْدَ الزَّوالِ لِلصَّائِمِ،

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی قاپ و كه‌لوپه‌لی چێشت ﴾

(وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیه: نه بۆ پیاو، نه بۆ ئافره‌ت (إسْتِعْمالُ) به‌كارهێنانی (أَوانِي الذَّهَبِ) قاپی زێڕ و (وَالْفِضَّةِ) قاپی زیو ﴿عَنْ حُذَيْفَةَ‌ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَتَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلاَتَأْكُلُوا فِي صِحافِهِما﴾ رواه الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: له ناو جامی زێڕ و زیودا ئاو مه‌خۆنه‌وه‌و له ناو قاپه‌كانیشیاندا چێشت مه‌خۆن.
جا هه‌روه‌ك خواردن‌و خواردنه‌وه له قاپی زێڕ و زیودا قه‌ده‌غه كراوه، هه‌موو به‌كارهێنانێكی‌تریشیان قه‌ده‌غه‌یه، هه‌روه‌ها بزانه: جیاوازی نیه له نێوان كه‌وچكی زێڕ و زیو و مه‌نجه‌ڵ و ته‌شت و هه‌رشتێكی‌تر: كه بۆ خواردن‌و خواردنه‌وه‌و كارویاری‌تر به‌كار بێ، هه‌روه‌ها هه‌ڵگرتنی كه‌لوپه‌لی خواردن‌وخواردنه‌وه—كه له زێڕ و زیو دروست كرابن—حه‌رامه، جا له ناو جامخانه دایبنێ، یان له تاق‌و دیوار، یان بیشارێته‌وه.
(وَيَحِلُّ) حه‌ڵاڵه (إسْتِعْمَالُ غَيْرِهِما) به‌كارهێنانی قاپ‌و كه‌لوپه‌لی‌تری خواردن‌و خواردنه‌وه (مِنَ الأَوانِي) له هه‌موو جۆرێك: وه‌ك شوشه‌و فه‌خفوری‌و ستیل‌و سفرو فافۆن...هتد، هه‌رچه‌ند زۆر به‌نرخیش بن.
﴿پاشكۆ﴾: پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمانی داوه: كه‌لوپه‌لی خواردن‌و خواردنه‌وه سه‌ری له سه‌ر دابندرێ‌و، له كاتی نوستن ده‌رگا كلیل بدرێ‌و چراو ئاگر بكوژێندرێته‌وه‌و هه‌ر چیه‌كمان له‌وانه كرد بڵێین: بسم الله. (بخاري‌و مسلم‌و ترمذي) گێڕاویه‌تیانه‌وه.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی سیواك كردن ﴾

( پێناسه ) سیواك ئه‌وه‌یه: هه‌ر شتێكی زبر بێ‌و چڵكی سه‌ر ددان لاببا. (وَالسِّواكُ) سیواك كردن (مُسْتَحَبٌّ) زۆرخێره (فِي كُلِّ حالٍ) له هه‌موو كاتێكدا، چونكه زیاتر له سه‌د حه‌دیس ده‌رباره‌ی سیواك هاتوه، جا به داخه‌وه—له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش كه قازانجی دونیاو قیامه‌تی هه‌یه—زۆر له موسوڵمانان به‌كاری ناهێنن.
(إلاَّ بَعْدَ الزَّوالِ) ته‌نها له دوای لادانی ڕۆژ له نیوه‌ڕۆوه سوننه‌ت نیه (لِلصَّائِمِ) بۆ كه‌سێك كه به‌ڕۆژوو بێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ‌ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ﴾ رواه الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: بۆنی ده‌می مرۆڤی به‌ڕۆژوو خۆشتره له لای خوا له بۆنی میسك. واته: به سیواك كردن ئه‌و بۆنه لاناچێ.
به‌ڵام ئیمامی (النواوي)—له (المجموع)دا— ئه‌م ڕایه‌ی هه‌ڵبژاردوه: كه سیواك كردن هیچ كاتێك بۆ مرۆڤی به‌ڕۆژوو (مَكْرُوه) نیه.

وَهُوَ فِــي ثَلاَثَــةِ مَوَاضِــعَ أَشَــدُّ إِسْــتِحْبَاباً: عِنْــدَ تَغَيُّــرِالْفَمِ مِــنْ أَزْمٍ وَغَيْــرِهِ، وَعِنْدَ الْقِيامِ مِنَ النَّوْمِ، وَعِنْدَ الْقِيامِ إِلىَ الصَّلاَةِ.

---

(وَهُوَ) سیواك كردن (فِي ثَلاَثَةِ مَوَاضِعَ) له سێ كاتدا (أَشَدُّ إِسْتِحْبَاباً) هەر زۆر زۆر خێره یەكەم: (عِنْدَ تَغَيُّرِ الْفَمِ) لە كاتی گۆڕانی تامی دەم، چونكه پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿اَلسِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ﴾ رواه البخاری، سیواك كردن پاككەرەوەیە بۆ دەمو هۆی ڕازیبوونی خوایە. (مِنْ أَزْمٍ) جا تامی دەم بگۆڕێ بە ولازمێنانی لە قسەكردن، یان نەخواردن (وَغَيْرِهِ) یان لە بەر خواردنی شتێكی بۆن ناخۆش: وەك سیرو پیاز.

دووەم: (وَعِنْدَالْقِيامِ مِنَ النَّوْمِ) لە كاتی هەڵسان لەخەو ﴿عن حُذَيْفَةَ﴾: كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذا قَامَ لِيَتَهَجَّدَ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەرﷺ كە لە خەو هەڵئەستا بۆ شەونوێژ، سیواكی بە ناو دەمیدا ئەخشاند.

سێیەم: (وَعِنْدَ الْقِيامِ إِلىالصَّلاَةِ) لە كاتی هەڵسان بۆ نوێژكردن ﴿عن أَبِي هُرَيْــرَةَ﴾: عَنِ النَّبِيِّﷺ قَالَ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُــلِّ صَــلاَةٍ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئەگەر لە بەر ئازارو ماندووكردنی ئۆممەتم نەبوایە، فەرمانم ئەدانێ: لەگەڵ هەموو نوێژێكا سیواك بكەن.

﴿پاشكۆ﴾: هەروەها سیواك كردن زۆر خێره: لە پێش دەست پێكردنی دەستنوێژ ﴿عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ﴾: عَنِ النَّبِيِّﷺ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُــلِّ وُضُوءٍ﴾ رواه الامام مالك، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ئەگەر لە بەر ئازارو ماندووكردنی ئۆممەتم نەبوایە فەرمانم ئەدانێ: لەگەڵ هەموو دەستنوێژگرتنێكا سیواك بكەن.

هەروەها سیواك سوننەتە: بۆ خوێندنی قورئانو حەدیسو شەرعو بۆ زیكری خواو، كاتی چوونەوە ناو ماڵ، هەروەها سوننەتە: سیواك لە داری(ئەراك) بێو لە بستێك درێژتر نەبێو بە ئاو تەڕ بكرێو چڵكی پێوە نەبێ، حەزرەتی (عائِشَةَ) خوا لێی ڕازی بێ، ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ سیواكی ئەدا دەستم تاكو بۆی بشۆم. (أبوداود) گێڕاویەتیەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَــاءُ اللِّحْيَــةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْماءِ، وَقَصُّ الأَظْفارِ، وَغَسْلُ الْبَراجِمِ، وَنَتْفُ الأَبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقاصُ الْمــاءِ﴾ رواه الشیخان، دە ڕەوشتی باش هەنە، ڕەوشتی ئایینی ئیسلامن: (١) بەرسمێڵ كردن تا سۆرایی لێوی دەر ئەكەوێ. (٢) ڕیش بەردان. (٣) سیواك كردن. (٤) ئاو لە لوت وەركردن، واتە: پاككردنەوەی لوت. (٥) نینۆك كردن هەموو هەینییەك. (٦) شوشتنی لۆچەكانی دەستو پەنجە. (٧) لادانی مووی بن هەنگڵ، لە چل ڕۆژ جارێك. (٨) لادانی مووی بەر، واتە: پێشو پاش، لە چل ڕۆژ جارێك. (٩) تارەت كردن بە ئاو.

(فَصْلٌ) وَفُرُوضُ الْوُضُوءِ سِتَّةٌ: أَلنِّيَّةُ عِنْدَ غَسْلِ الْوَجْهِ، وغَسْلُ الْوَجْهِ، وَغَسْلُ الْيَدَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَمَسْحُ بَعْضِ الرَّأْسِ، وَغَسْلُ الرِّجْلَيْنِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ،

---

(١٠) ئاو له دەم وەركردن، یان سوننەتكردنی نێر و مێ، چونكە لەكۆتایی حەدیسەكەدا ئەفەرموێ: ﴿وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ﴾.

(**سوودی سیواك**): ڕازیكردنی خوا، پاككردنی دەم، سپیكردنی ددان، بەهێزكردنی پدو، زیرەك بوون، دواخستنی موو سپیبوون. ئینجا سوننەتە: بە دەستی ڕاستە لە لای ڕاستەی دەمەوە دەست بە سیواك كردن بكرێو بە سەرپانایی‌ددانەكان‌و درێژایی‌زوبانی‌دا بێنێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی دەستنوێژگرتن ﴾

(وَفُرُوضُ الْوُضُوءِ) پێویستیەكانی دەستنوێژ (سِتَّةٌ) شەشن:

یەكەم: (أَلنِّيَّةُ) نیەتهێنانە، واتە: نیازی لابردنی بێدەستنوێژی، یان نیازی گرتنی فەرزی دەستنوێژ (عِنْدَ غَسْلِ الْوَجْهِ) ئەبی ئەو نیەتە بهێنێ لە كاتی شۆردنی ڕوخسار، بەلام مەرج نیە بە زمان بگوترێ ﴿عنْ عُمَرَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ: إنَّما الأَعْمالُ بِالنِّيَّاتِ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كردەوەیەكی خواپەرستی بێ، بە نیازی ناو دڵ نەبێ دانامەزرێ.

دووەم: (وغَسْلُ الْوَجْهِ) شۆردنی ڕووخسارە، (سنوری ڕووخسار: لە نێوان هەردوو گوێیە، لەگەڵ كۆتایی مووی پێشە سەر تا كۆتایی چەناگە)، كەوابوو: واجبە هەردوو زولفەكان بشۆردرێن هەر چەند درێژیش بن.

سێیەم: (وَغَسْلُ الْيَدَيْنِ) شۆردنی هەردوو دەستەكانە (إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ) لەگەڵ ئەنیشكەكانی، جا ئەگەر ئەختێكی دەستی بڕابێوە، واجبە: ئەوەندەی ماوە بیشۆرێ، جا ئەگەر لە ئەنیشكەوە بڕابێوە، سەری قۆڵی ئەشۆرێ.

چوارەم: (وَمَسْحُ بَعْضِ الرَّأْسِ) مەسحی بەشێكی سەرە، واتە: هێنانی دەستی-كە دووبارە تەڕ كرابێ- بە سەر ئەختێكی پێستەی سەری، یان ئەختێك مووی سەری: كە لە سنوری سەر دەرنەچوبێ.

پێنجەم: (وَغَسْلُ الرِّجْلَيْنِ) شۆردنی هەردوو قاچەكانە (إِلَى الْكَعْبَيْنِ) لەگەڵ گۆزینگەكانی. بەڵگە: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِذا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرافِقِ وَامْسَحُوا بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾ كاتێك ویستتان هەڵسن نوێژ بكەن ڕووخسارتان بشۆنو دەستتان لەگەڵ ئەنیشكتان بشۆنو سەرتان مەسح بكەنو قاچتان لەگەڵ گۆزینگتان بشۆن.

﴿**ئاگاداری**﴾: شۆردن ئەوەیە: ئاو بە سەر ئەو ئەندامانەدا بڕواو، هیچ شتی وایان لە سەر نەبێ: كە ڕێگا بگرێ ئاو بگاتە پێستە، وەك بنیشتو مۆمو بۆیەو هەویر...هتد.

وَالتَّرْتِيبُ عَلَى مَا ذَكَرْنَاهُ. وَسُنَنُهُ عَشَرَةُ أَشْيَاءَ: اَلتَّسْمِيَةُ، وَغَسْلُ الْكَفَّيْنِ قَبْلَ إِدْخالِهِمَا الْإِنَاءَ، وَالْمَضْمَضَةُ، وَالاسْتِنْشَاقُ، وَمَسْحُ جَمِيعِ الرَّأْسِ، وَمَسْحُ الْأُذُنَيْنِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا بِمَاءٍ جَدِيدٍ، وَتَخْلِيلُ اللِّحْيَةِ الْكَثَّةِ،

---

شەشەم: (وَالتَّرْتِيبُ) بەجیٚهێنانی ئەو ڕیزەیە (عَلَى ما ذَكَرْناهُ) بەو شێوەیەی گوتمان لە ئایەتی پیرۆزدا: یەك لە دوای یەك، چونكە پێغەمبەرﷺ بەو جۆرە دەستنوێژی گرتوە، بڕوانە (البخاري و مسلم).

كەوابوو: ئەگەر كەسێك ئەندامێكی نەشۆرد، یان یەكێكی پێش ئەویتر شۆری، یان نەختێكی تەڕ نەبوبو، ئەبی بگەڕێتەوە دووبارە بیشۆریٚو ئەوەی لە دوای ئەو ئەندامەش شۆرلوە، ئەبی دووبارە بیشۆرێتەوە، تاكو ڕیزەكە تێك نەچیٚ ﴿عَنْ عُمَرَ﴿: أَنَّ رَجُلاً تَوَضَّأَ فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفْرٍ عَلَى قَدَمِهِ فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّﷺ،فَقالَ: إِرْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ پیاوێكی بینی بە ئەندازەی یەك نینۆك قاچی تەڕ نەكردبو، ئینجا پیٚی فەرموو: بگەڕێوە جوان دەستنوێژەكەت بشۆرە.

(وَسُنَنُهُ) سوننەتەكانی دەستنوێژ (عَشَرَةُ أَشْياءَ) دە سوننەتن:

یەكەم: (اَلتَّسْمِيَةُ) گوتنی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، كە دەست بە دەستنوێژ ئەكا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿تَوَضَّئُوا بِاسْمِ اللهِ﴾ رواه النسائي، دەستنوێژ بگرن‌و (بسم الله) بكەن. جا ئەگەر لە یەكەم جار لەبیری چوو و لە ناو دەستنوێژ هاتەوە بیری، با بلیٚ: (بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ).

دووەم: (وَغَسْلُ الْكَفَّيْنِ) شۆردنی هەردوو لەپی دەستە (قَبْلَ إِدْخالِهِما الإِناءَ) پێش ئەوەی بیانخاتە ناو ئاوەكە، ئینجا–لە دوای دەست شۆردن–سیواك بكا وەكو گوتمان.

سیٚیەم: (وَالْمَضْمَضَةُ) ئاو لە دم وەردانە. چوارەم: (والإِسْتِنْشاقُ) ئاو لە لوت وەردانە. بۆ بەلگە: ئیمامی(عوسمان) ئەو سێیانەی كردن و فەرمووی: ﴿رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذا﴾رواه‌الشيخان، پێغەمبەرمﷺ بینی بەو شێوەیەی‌من دەستنوێژی گرت.

پێنجەم: (وَمَسْحُ جَمِيعِ الرَّأْسِ) مەسحكردنی هەموو سەرە. شەشەم: (وَمَسْحُ الأُذُنَيْنِ) مەسحكردنی هەردوو گوێیەكانە (ظاهِرِهِما وَباطِنِهِما) لای دەرەوەو لای ژوورەوە (بِماءٍ جَدِيدٍ) بە ئاوێكی تازە، نەك بە تەڕایەتی مەسحی سەر ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَنَّ النَّبِيَّﷺ مَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ ظاهِرِهِما وَباطِنِهِما﴾ رواه الترمذي وابوداود، پێغەمبەرﷺ سەری مەسح كردو، دەرەوەو ژوورەوەی گوێیەكانی مەسح كرد.

حەفتەم:(وَتَخْلِيلُ اللِّحْيَةِ الْكَثَّةِ) هەلكوشینی ڕیشێكی پڕە بە پەنجەی دەستی، هەروەها چەنگە ئاوێكیش بخاتە ژێر چەناگەی ﴿عَنْ أَنَسٍ﴿: أَنَّ النَّبِيَّﷺ كانَ إِذا تَوَضَّأَ أَخَذَ

وَتَخْلِيلُ أَصَابِعِ الْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ، وَتَقْدِيمُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، وَالطَّهارَةُ ثَلاثاً ثَلاثاً، وَالْمُوالاَةُ.

---

كَفّاً مِنْ ماءٍ فَأَدْخَلَهُ تَحْتَ حَنَكِهِ فَخَلَّلَ بِهِ لِحْيَتَهُ﴾ رواه الترمذي، كه پێغەمبەرﷺ دەستنوێژی ئەگرت، چەنگە ئاوێکی ئەدایە ژێر چەناگەی‌و ڕیشی پیرۆزی پێ هەڵگوشی.

(وَتَخْلِيلُ أَصابِعِ الْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ) هەر وەها دەست تێوەردانی نێوان پەنجەکانی دەست‌و قاچە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِذا تَوَضَّأْتَ فَخَلِّلْ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدَيْكَ وَرِجْلَيْكَ﴾ رواه الترمذي، کاتێ دەستنوێژ ئەشۆی، پەنجە بە نێوان پەنجەکانی‌دەست‌و قاچتدا بهێنە.

هەشتەم: (وَتَقْدِيمُ الْيُمْنَى) پێشخستنی شۆردنی ڕاستەیە (عَلَى الْيُسْرَى) لە سەر لای چەپە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: إِنْ كانَ النَّبِيُّﷺ لَيُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ وَفِي تَرَجُّلِهِ وَفِي انْتِعالِهِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ پێشخستنی لای ڕاستەی پێ خۆش بوو: لە دەستنوێژو غوسل‌و سەر شانەکردن‌و پێڵاو کردنە پێ.

نۆیەم: (وَالطَّهارَةُ ثَلاثاً ثَلاثاً) شۆردن و مەسحکردنی ئەندامەکانە سێ جار سێ جار ﴿جاءَ أَعْرابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّﷺ يَسْأَلُهُ عَنِ الْوُضُوءِ؟ فَأَراهُ ثَلاثاً ثَلاثاً، ثُمَّ قالَ: هَكَذا الْوُضُوءُ، فَمَنْ زادَ عَلَى هَذا فَقَدْ أَساءَ وَتَعَدَّى وَظَلَمَ﴾ رواه النسائي وابوداود، پێغەمبەرﷺ سێ جار سێ جار دەستنوێژی بە پیاوێك گوت‌و فەرمووی: دەستنوێژ ئەوەیە، هەر کەسێك لە سێ جار زیاتر ئەندامەکانی بشۆرێ، ئەوە خراپە‌و ستەم ئەکا.

دەیەم: (وَالْمُوالاَةُ) ئەندامەکانی بە دوای یەکدا بشۆرێنێ بە جۆرێکی‌وەها: یەکەمیان ووشك نەبێتەوە کاتێ دەست بە دووەمیان ئەکا.

﴿پاشکۆ﴾: هەروەها سوننەتە لە ئەندازەی‌واجب زیاتر بشۆردرێ: وەك هەندێك لە قۆڵی‌و لای ژێری گۆزینگی‌و دەرەوەی‌ڕووخساری، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِينَ مِنْ آثارِ الْوُضُوءِ فَمَنِ اسْتَطاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ﴾ رواه الشيخان، ئوممەتی من لە ڕۆژی قیامەت داوا ئەکرێن ڕووخسارو دەست‌و پێیان سپی‌یە لە بەر دەستنوێژ شۆرین، جا هەرکەسێك لە ئێوە ئەتوانێ سپیایی خۆی زیاد بکا با بیکا.

﴿وَعَنْ أَنَسٍ﷛: كانَ النَّبِيُّﷺ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ، وَقالَ: يُجْزِئُ أَحَدَنا الْوُضُوءُ مالَمْ يُحْدِثْ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی ئەشۆردەوە، بەڵام ئێمە دەستنوێژمان هەر دروست بوو تا بێ‌دەستنوێژ ئەبوین. واتە: نوێ‌کردنەوەی دەستنوێژ واجب نیە، بەڵکو سوننەتە‌و هەموو نوێژەکانیش بە یەك دەستنوێژ دروستن.

هەروەها سوننەتە: لە دوای دەستنوێژشۆردن ڕوو لە قیبلە بکەی‌و دەست بەرز بکەیەوەو

(فَصْلٌ) وَالإِسْتِنْجاءُ واجِبٌ مِنَ الْبَوْلِ وَالْغائِطِ، وَالأَفْضَلُ أَنْ يَسْتَنْجِيَ بِالأَحْجارِ ثُمَّ يُتْبِعَهَا بِالْماءِ، وَيَجُوزُ أَنْ يَقْتَصِرَ عَلَى الْماءِ أَوْ عَلَى ثَلاثَةِ أَحْجارٍ يُنقِي بِهِنَّ الْمَحَلَّ، فَإِذا أَرادَ الإِقْتِصارَ عَلَى أَحَدِهِمَا فَالْمَاءُ أَفْضَلُ،

---

ئەم دوعایە بخوێنی: ﴿أَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، اَللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ، سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ﴾ رواه الترمذي والحاكم.

## ﴿ فَصْلٌ: لەباسی تارەتکردن ﴾

واتە: پاککردنەوەی ئەو دوو شوێنانەی لەداوێنیئادەمیزاد پیسایی لێدەرئەچێ. (وَالإِسْتِنْجاءُ) تارەتکردن (واجِبٌ) پێویستە (مِنَ الْبَوْلِ) بە هۆی میزکردن (وَالْغائِطِ) وە بە هۆی پیسایییەکەیتر: کە لە پشتەوە دەرئەچێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدْخُلُ الْخَلاَءَ فَأَحْمِلُ أَنَا وَغُلاَمٌ نَحْوِي إِداوَةً مِنْ ماءٍ وَعَنَزَةً فَيَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ دەچووە ئاودەستخانە، ئینجا منو منداڵێکی وەك خۆم قاپێك ئاومان لەگەڵ دارعەسایەك بە دەستەوە ئەگرتو پێغەمبەرﷺ تارەتی بە ئاوەکە ئەکرد.

(وَالأَفْضَلُ) باشتر ئەوەیە (أَنْ يَسْتَنْجِيَ) تارەت بکا (بِالأَحْجارِ) بە سێ بەرد (ثُمَّ يُتْبِعَها بِالْماءِ) ئینجا لە دوای بەردەکان بە ئاو تارەت بکا، چونکە بەردەکان پیسایەکە لائەبەن، ئاوەکەش بۆنەکە لا ئەبا.

(وَيَجُوزُ) دروستە (أَنْ يَقْتَصِرَ عَلَى الْماءِ) تەنها بە ئاو تارەت بکا، بەڵگە: ئەو حەدیسەی رابردووە (أَوْ عَلَى ثَلاثَةِ أَحْجارٍ) یان تەنها بە سێ بەرد تارەت بکا (يُنقِي بِهِنَّ الْمَحَلَّ) بە مەرجێ شوێنی پیسیەکە پاك بکەنەوە ﴿عَنِ ابْنِ مَسْعودٍ ﷺ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ الْغائِطَ فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلاَثَةِ أَحْجارٍ﴾ رواه البخاري، (ابن مسعود) فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ چوو پیسایی بکاو فەرمانی پێکردم: سێ بەردی بۆ بێنم بۆ تارەتکردن.

ئینجا بزانە: هەر شتێك وشك بێو پیسایەکە لاببا و پاك بێو رێزی نەبێ، ئەگەر لە جیاتی بەرد تارەتی پێبکرێ، دروستە (فَإِذا أَرادَ الإِقْتِصارَ عَلَى أَحَدِهِما) جا هەرکاتێ ویستی تەنها بە یەکێکیان تارەت بکا، ئەوە (فَالْماءُ أَفْضَلُ) ئاو خێری زۆرترە لە سێ بەردەکان، چونکە باشتر پاکی ئەکاتەوە.

## ﴿ باسی چۆنیەتی پیسایی کردن ﴾

هەرکەسێك ویستی بچێتە شوێنی پیساییکردن، سوننەتە بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبائِثِ﴾رواه الشيخان وابن منصور. ئینجا کە هاتە دەرەوە، بڵێ: ﴿غُفْرانَكَ اَلْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنِّي الأَذَى وَعَافانِي﴾ رواه اصحاب السنن وابن ماجه.

وَيَجْتَنِبُ إِسْتِقْبالَ الْقِبْلَةِ وَإِسْتِدْبارَها فِي الصَّحْراءِ، وَيَجْتَنِبُ الْبَوْلَ والْغائِطَ فِي الْماءِالرَّاكِدِ، وَتَحْتَ الشَّجَرَةِالْمُثْمِرَةِ، وَفِي الطَّرِيقِ، وَالظِّلِّ، والثَّقْبِ،

---

وە نابێ قورئان‌و هەر شتێکی‌تر -کە ناوی خواو پێغەمبەری ﷺ لێنوسرابێ- لەگەڵ خۆیا بباتە سەر پیسایی ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: كانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذا دَخَلَ الْخَلاءَ نَزَعَ خاتَمَهُ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ کە دەچووە پیسایی‌کردن، ئەنگوستیلەی خۆی دائەنا، چونکە لە سەری نوسرابو (محمد رسول الله). جا بزانە: ئەگەر بە مەبەستی ڕێزلێگرتن، ئەو ناوانە نەنووسرابێ -وەك ناوی سەر ناسنامە- ئەوە دانانی ناوێ.

(وَيَجْتَنِبُ) ئەبی خۆی بپارێزێ ئەو کەسەی پیسایی ئەکا (إِسْتِقْبالَ الْقِبْلَةِ) ڕوو لە قیبلە نەکا (وَإِسْتِدْبارَها) هەروەها پشتیشی لە قیبلە نەکا (فِيالصَّحْراءِ) ئەگەر لە بیابان بوو، بەڵام ئەگەر ئاودەستخانەکە ڕووبەڕووی قیبلە بوو، یان پشتی لە قیبلە بوو، ئەوە زیانی نیە ﴿عَنْ أَبِيأَيُّوب الأَنْصارِي رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ: إِذا أَتَى أَحَدُكُمُ الْغائِطَ فَلاَ يَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ وَلاَ يَوَلِّها ظَهْرَهُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ چوون پیسایی بکەن، ڕووتان لە قیبلە مەکەن‌و پشتیشی تێمەکەن.

جا بزانە: ئەگەر لە بیابان پیسایی بکا، ئەبی شتێك بخاتە پێشەخۆی بۆ ئەوەی ببێتە پەردە لە نێوان خۆی‌و قیبلە.

(وَيَجْتَنِبُ الْبَوْلَ والْغائِطَ فِيالْماءِ الرَّاكِدِ) با خۆی بپارێزێ: میزو پیسایی لە ناو ئاوی وەستاودا نەکا ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ الَّذِي لاَيَجْرِي﴾ رواهالشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: میز لە ناو ئاوی وەستاودا مەکەن کە ئاوی لە بەر ناڕوا. (وَتَحْتَ الشَّجَرَةِالْمُثْمِرَةِ) لە بن داری بە بەر میزو پیسایی نەکا، چونکە میوەکە پیس ئەبێ.

(وَفِي الطَّرِيقِ) وە لە ڕێگەو (وَالظِّلِّ) لە سێبەر پیسایی‌و میز نەکا ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِتَّقُوااللاَّعِنَيْنِ: اَلَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ ظِلِّهِمْ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بترسن لەو دوو کردەوەی ئەبنە هۆی لەعنەت لێکردنتان: لە بەر پیسایی‌کردن لە ڕێگەی خەڵکی‌و لەو سێبەرەی خەڵك لێی دائەنیشێ. جا بزانە: ئەو شوێنەی لە زستاناندا لێی دائەنیشن، وەك سێبەر وایە.

(والثَّقْبِ) نابێ میزو پیسایی لەناو کون‌و قلیشایی زەمین بکا ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بن سَرْجِسَ رضي الله عنه: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُبالَ فِيالْجُحْرِ﴾ رواه ابوداود، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: میز لە ناو کونی زەمین بکرێ. واتە: نەوەك گیانلەبەرێکی تێدا بێ‌و ئازاری پێ بگا.

وَلاَ يَتَكَلَّمُ عَلَى الْبَوْلِ وَالْغائط، وَلاَ يَسْتَقْبِلُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ، وَلاَ يَسْتَدْبِرُهُما.
(فَصْلٌ) وَالَّذِى يَنْقُضُ الْوُضُوءَ سِتَّةُ أَشْياءَ: مَا خَرَجَ مِنَ السَّبِيلَيْنِ، وَالنَّوْمُ عَلَى غَيْرِ هَيْئَةِ الْمُتَمَكِّنِ،

---

(وَلاَ يَتَكَلَّمُ عَلَى الْبَوْلِ وَالْغائط) نابێ قسه بکا له کاتێ میزو پیسایی‌کردن ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذا تَغَوَّطَ الرَّجُلانِ فَلْيَتَوارَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَنْ صاحِبِهِ وَلاَ يَتَحَدَّثا فَإِنَّ اللهَ يَمْقُتُ عَلَى ذَلِكَ﴾رواه أحمد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر دوو کەس پیسایی بکەن، با خۆیان داپۆشن‌و قسه نەکەن، چونکه خودا زۆر رقی لەوە ئەبێتەوە.
(وَلاَيَسْتَقْبِلُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ) نابێ ڕوو لە ڕۆژو مانگ بکا (وَلاَ يَسْتَدْبِرُهُما) نابێ پشتیشیان تێبکا، بۆئەوەی نەبێتە بێڕێزی‌و بێ‌ئەدەبی.
﴿پاشکۆ﴾: (سَلْمان)-خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرمووێ: ﴿نَهَانَا النَّبِيُّ ﷺ: أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: بە دەستی ڕاسته تارەت بکەین.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی هۆیەکانی بێ‌دەستنوێژی ﴾

(وَالَّذِى يَنْقُضُ الْوُضُوءَ) ئەو شتانەی دەستنوێژ هەڵئەوەشێننەوە، واتە: ئەبنە هۆی بێ‌دەستنوێژی (سِتَّةُ أَشْياءَ) شەش شتن:
یەکەم: (مَا خَرَجَ) شتێکە بێتە دەرەوە (مِنَ السَّبِيلَيْنِ) لە یەکێك لەو دوو کونەی خوارەوە: کەم بێ، یان زۆر بێ، تەڕ بێ، یان ووشك بێ، میزو پیسایی بێ، یان شتێکی‌تر بێ. چونکە خوای‌گەورە ئەفەرمووێ: ﴿أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنكُمْ مِنَ الْغَائِطِ...﴾ تا کۆتای ئایەتەکە، مەبەست ئەوەیە: یان هاتنەوە لە پیسایی کردن. واتە: دەستنوێژ نامێنێ ﴿وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: اَلْحَدَثُ فُساءٌ أَوْ ضُراطٌ﴾ رواه البخاری، بێ‌دەستنوێژی بە هۆی تر، یان فس ڕوو ئەدا. ﴿وَعَنْ عَلِيٍّ كَرَّمَ اللهُ وَجْهَهُ: كُنْتُ رَجُلاً مَذّاءً فَأَمَرْتُ الْمِقْدادَ أَنْ يَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ؟ فَقالَ ﷺ: يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ﴾ رواه‌الشيخان، ئیمامی(علی) فەرمووی: من مەزیم زۆر بوو، میقداد بۆی پرسیار کردم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هینەکەی خۆی ئەشۆرێ‌و دەستنوێژ هەڵئەگرێتەوە.
دووەم: (وَالنَّوْمُ) نوستنه ﴿عَنْ عَلِيٍّ كَرَّمَ اللهُ وَجْهَهُ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ: اَلْعَيْنانِ وِكاءُ السَّهِ فَمَنْ نامَ فَلْيَتَوَضَّأْ﴾ رواه أبوداود وحسنه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاو زاربێنی کونی خوارەوەیە، جا هەر کەسێك نوست با دەستنوێژ بشۆرێتەوە.
(عَلَى غَيْرِ هَيْئَةِ الْمُتَمَكِّنِ) بە مەرجێك نوستنەکە لە سەر شێوەیەکی وابێ: کونەکەی وەها دانەمەزراندبێ: کە هیچ شتێکی لێنێتە دەرەوە، واتە: ئەگەر بەدانیشتوویی نوست‌و قاچی خۆی دانایە ژێر کونەکەی، ئەوە دەستنوێژی ناشکێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: كَانَ أَصْحابُ

وَزَوالُ الْعَقْلِ بِسُكْرٍ أَوْ مَرَضٍ، وَلَمْسُ الرَّجُلِ الْمَرْأَةَ الأَجْنَبِيَّةَ مِنْ غَيْرِحائِلٍ، وَمَسُّ فَرْجِ الآدَمِيِّ بِباطِنِ الْكَفِّ، وَمَسُّ حَلْقَةِ دُبُرِهِ عَلَىالْجَدِيدِ.
(فَصْلٌ) وَالَّذِى يُوجِبُ الْغُسْلَ سِتَّةُ أَشْياءَ: ثَلاثَةٌ تَشْتَرِكُ فِيهَا الرِّجالُ وَالنِّساءُ:

---

رَسُولِ اللهِ ﷺ يَنْتَظِرُونَ الْعِشاءَ حَتَّى تَخْفِقَ رُؤُوسُهُمْ ثُمَّ يُصَلُّونَ وَلاَ يَتَوَضَّأُونَ﴾ رواه أبوداود، (صحابه)كانى پێغەمبەرﷺ چاوەڕوانى نوێژى عیشایان ئەكردو لە بەر نوستن سەریان خوار ئەبۆوەو دەستنوێژیان نەئەشۆردەوەو نوێژیان ئەكرد. واتە: چونكە بە دانیشتوویی نوستبون. هەروەها: بە بۆرژان دەستنوێژ ناشكێ.
سێیەم: (وَزَوالُ الْعَقْلِ) بێهۆشبوونە (بِسُكْرٍ) بە هۆى سەرخۆشى (أَوْ مَرَضٍ) یان بە هۆى نەخۆشى، چونكە بێهۆشى لە نوستن بەهێزترە.
چوارەم: (وَلَمْسُ الرَّجُلِ) گەیشتنى پیستى پیاوە (الْمَرْأَةَ الأَجْنَبِيَّةَ) بە پیستى ئافرەتى بێگانە، واتە: ئەو ئافرەتەى مارەیى لە پیاوەكە بێ: ئێستا، یان لەمەودوا: وەكو خوشكە ژن (مِنْ غَيْرِ حائِلٍ) كە بە بێپەردە بێ، واتە: پیستەى هەردووكیان رووت بێ، خواى گەورە فەرموویەتى: ﴿أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاءَ﴾ یان دەستتان لە ئافرەتان دا. واتە: دەستنوێژتان نامێنێ.
ئینجا بزانە: مندالێك كە نەگەیشتبێتە رادەى حەز بۆچوون دەستنوێژى لێناشكێ، ئیتر ئەگەر دەست لێدانى ژن‌و پیاو بە ویستى خۆیشیان نەبێ، دەستنوێژى هەردووكیان هەر ئەشكێ، بەلام بە دەست لێدانى موو دەستنوێژ ناشكێ.
پێنجەم: (وَمَسُّ فَرْجِ الآدَمِيِّ) دەست لێدانى ئەندامى میزكردنى ئادەمیزادە (بِباطِنِ الْكَفِّ) بە بەرى‌دەستى‌و بە بێپەردە ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ؄: عَنِ النَّبِيِّﷺ قالَ: إِذا أَفْضَى أَحَدُكُمْ بِيَدِهِ إِلَى فَرْجِهِ وَلَيْسَ بَيْنَهُما سِتْرٌ وَلاَ حِجابٌ فَلْيَتَوَضَّأْ﴾ رواه الشافعي وأحمد، پێغەمبەرﷺفەرمووى: هەركاتێ یەكێكتان دەستى دایە ئەندامى‌میزكردنى‌خۆى‌و پەردەش لە نێوانیاندا نەبو، با دەستنوێژ بشۆرێتەوە.
جا بزانە: بۆ دەستنوێژ نەمان جیاوازى نیە: ئەندامەكە هى خۆى بێ، یان هى یەكێكى‌تر بێ، هى گەورە بێ، یان هى بچوك بێ.
شەشەم: (وَمَسُّ حَلْقَةِ دُبُرِهِ عَلَى الْجَدِيدِ) دەست لێدانى كونى‌خوارەوەى ئادەمیزادە لە سەر فەرمودەى نوێى ئیمامى (شافعي)، بەلگەش ئەو حەدیسەى‌رابردووە.
ئینجا بزانە: ئەم بێ دەستنوێژییە پێى ئەگوترێ: (بێدەستنوێژى‌ى بچوك).

﴿ فَصْلٌ: لە باسى ئەو شتانەى ئەبنە هۆى واجیبوونى غوسل ﴾

(وَالَّذِى يُوجِبُ الْغُسْلَ) ئەو شتەى ئەبێتە هۆى واجیبوونى خۆ شۆردنى ئادەمیزاد (سِتَّةُ أَشْياءَ) شەش جۆرە شتن: (ثَلاثَةٌ) سێیان (تَشْتَرِكُ فِيها) یەكسانە لەو سێیانەدا (الرِّجالُ وَالنِّساءُ) پیاو و ئافرەت:

وَهِيَ الْتِقاءُ الْختانَيْنِ، وَإِنْزالُ الْمَنِيِّ،

(وَهِـيَ) يەكـەم: جەنابەتـە، واتـە: لـەش پيسـبوون بـە هـۆى (الْتِقـاءُ الْختـانَيْنِ) بردنـە ژوورەوەى نەختێك لە ئەندامى ميزكردنى نێرينە بۆ ناو كونى پێشـەوەى ئـادەميزاد، يـان پشـتەوەى ئـادەميزاد، يـان ئـاژەڵ، ئينجا جيـاوازى نيـە: ئاويـان بـێ، يـان نـا ﴿عَـنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِها الأَرْبَعِ ثُمَّ اجْتَهَدَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ وَإِنْ لَمْ يُنْزِلْ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فـەرمووى: هـەركاتێك پيـاو لـە نێـوان هەرچوار پەلى ئافرەت دانيشتو سەرى هێنەكەى بردە ژوورەوە، واجبـە خۆيـان بشـۆن هەرچـەند ئاويشيان نەيەتە دەرەوە.

(وَإِنْزالُ الْمَنِيِّ) دووەم: جەنابەتە، واتە: لەش پيسبوون بە هۆى دەرچـوونى(مَنِـي)، واتـە: ئاوى پياو، يان ئاوى ئافرەت، جا لە كاتى خەوتنا بێ، يان لە كاتى هەشيارى، بە دەست خۆى بێ، يان نا، خـواى گـەورە فەرمووويـەتى: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَـاطَّهَّرُوا﴾ ئەگـەر بـە جەنابەت بون خۆتان بشۆن.

هەروەها ئافرەتێك پرسيارى لەپێغەمبەر ﷺ كرد: ﴿هَلْ عَلَى الْمَـرْأَةِ مِـنْ غُسْـلٍ إِذا احْتَلَمَتْ؟ فَقالَ ﷺ: نَعَمْ إِذا رَأَتِ الْماءَ﴾ رواه الشيخان، ئايـا ئەگـەر ئـافرت وەكـو پيـاو خەونى بە كارى نێر و مێـيەتى ببينـێ، واجبـە خـۆى بشـۆرێ؟ پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووى: بەڵێ هەر كاتێك بينى ئاوى هاتوە ئەبى خۆى بشۆرێ.

﴿ئاگادارى﴾ بزانـە: نيشـانەى ئـاو هـاتنى پيـاو، يـان ئـافرەت، ئەوەيـە: ڕەحـەت بـبن و لەزەت ببينن، كەوابوو: ئەگـەر ژن و مێـرد جيماعيـان كـردو هـەردووكيان ڕەحـەت بـون، ئينجـا لـە دواى خۆشـۆردن ئاوەكـە لـە پێشـەوەى ئافرەتەكـە هاتـەوە دەرەوە، واجبـە ئافرەتەكە غوسلەكەى دووبارە بكاتەوە؟ چونكە ئاوەكەى خۆى تێكەڵ بە ئاوى پياوەكـە بـووەو تـازە دێتـە دەرەوە، بـەڵام ئەگـەر ئافرەتەكـە ڕەحـەت نـەبوبێ، ئـەوە نايـەوێ غوسلەكە دووبارە بكاتەوە، چونكە ئاوىخۆى نەهاتوە.

ئينجا بزانە: بە هۆى دەستبازىو دەمارهەڵسـان جـۆرە ئـاوێكى لـيچو زەرد، يـان سـپى دەر ئەكەوێ، پێى ئەگوترێ: (مَذْي)، ئافرەتان زياتر ئەو ئاوەيان دێ، ئەو ئـاوە غوسـل واجب ناكا، بەڵام پيسـە ﴿عَنْ عَلِيٍّ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: عَنِ الْمَذْيِ؟ فَقالَ: يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّـأُ﴾ رواه الشـيخان، پێغەمبـەر ﷺ دەربـارەى (مَـذْي) پرسـيارى لێكرا؟ ئـەويش فەرمووى: زەكەرى خۆى ئەشۆرێو دەستنوێژ ئەگرێ.

هەروەها ئاوێكىترى شێلوو –وەك شير– لە كاتى ميزكردن دێتە دەرەوە پێى ئـەگوترێ: (وَدْي)، ئەمەش پيسە بەڵام غوسل واجب ناكا.

وَالْمَوْتُ. وَثَلاَثَةٌ تَخْتَصُّ بِهَا النِّسَاءُ: وَهِيَ الْحَيْضُ، وَالنِّفَاسُ، وَالْوِلاَدَةُ.
(فَصْلٌ) وَفَرَائِضُ الْغُسْلِ ثَلاَثَةُ أَشْيَاءَ: اَلنِّيَّةُ، وَإِزَالَةُ النَّجَاسَةِ إِنْ كَانَتْ عَلَى بَدَنِهِ، وَإِيصَالُ الْمَاءِ إِلَى جَمِيعِ الشَّعْرِ وَالْبَشَرَةِ.

---

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر لە دوای غوسل كردن لەگەڵ میزكردن ئەو(مَنِی)یەی لە ناو بۆرییەكەدا مابو، هاتە دەرەوە، ئەبی دووبارە خۆی بشۆرێتەوە.
(وَالْمَوْتُ) سێیەم: مردنە، واتە: هەركەسێك بمرێ واجبە بشۆردرێ، هەروەك لە شوێنیخۆیدا باسی ئەكەین، ان شاء الله تعالى.
(وَثَلاَثَةٌ) سێیتریش لەو شەشە (تَخْتَصُّ بِهاالنِّسَاءُ) تایبەتە بە ئافرەتان (وَهِيَ الْحَيْضُ) یەكەمیان: پاكبوونەوەیە لە خوێنی حەیز. (وَالنِّفَاسُ) دووەمیان: پاكبوونەوەیە لە خوێنی پاش منداڵبوون. ئەو دووانە ئەبی بە زووترین كات خۆیان بشۆن لە دوای پاكبوونەوە، وەك لەمەودوا باس ئەكەین، إن شاء الله تعالى.
(وَالْوِلاَدَةُ) سێیەمیان: منداڵبوونە: جا منداڵەكەی لە داوێنی بێتە دەرەوە، یان زگی هەڵبدڕن و بیهێننە دەرەوە، هەر ئەبی خۆی بشۆرێ، هەروەها جیاوازی نیە: منداڵەكەی بە مردوویی ببێ، یان بە زیندوویی، وێنەی كێشرابێ، یان هەر پارچە خوێنێك بێ، بەڵگەش ئەمەیە: منداڵ لە تۆوی پیاو و ئافرەت دروست ئەبێ، ئەویش بە هەر جۆرێ بێتە دەرەوە، غوسل واجب ئەبێ.
ئینجا بزانە: (جَنَابَة) پێی ئەگوترێ: (بێدەستنوێژی گەورە).
هەروەها بزانە: بێ دەستبازی و دەمار هەڵسان-جگە لە (مَذِي)-ئاوێكیتری سپی لە داوێنی ئافرەت دێتە دەرەوە، ئەمەش پاكە، بەڵام دەستنوێژ ئەشكێنێ.

﴿ فَصْلٌ: لەباسی چۆنیەتی خۆشۆردن ﴾

(وَفَرَائِضُ الْغُسْلِ) پێویستیەكانی خۆشۆردن (ثَلاَثَةُ أَشْيَاءَ) سێ شتن: یەكەم: (اَلنِّيَّةُ) نیەتهێنانە، واتە: نیازی لابردنی لەش پیسی، یان جەنابەت، یان نیازی بەجێهێنانی فەرزی غوسل. جا بزانە: ئەو نیەتەیسێیەم بۆ پیاو و ئافرەت هەر وەكو یەك وایە، هەرچەند ئافرەت لە حەیز و نیفاسیش خۆی بشوا، جا كە یەكەم جار ئاو بە خۆت دائەكەی ئەو نیەتە بێنە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ﴾ رواه الشيخان، هەر كردەوەیەكی خواپەرستی بێ، بە نیازی ناو دڵ نەبێ دانامەزرێ.
دووەم: (وَإِزَالَةُ النَّجَاسَةِ) لابردنی شتی پیسە (إِنْ كَانَتْ عَلَىبَدَنِهِ) ئەگەر پیسیەك لە سەر لاشەی هەبێ، هەروەها پێویستە ئەو جۆرە شتانەی رێگای ئاو ئەگرن -كە بكاتە سەر پیستە-لایان ببا: وەك خوێن و بۆیاغ و بنیشت...هتد.
سێیەم: (وَإِيصَالُ الْمَاءِ إِلَىجَمِيعِ الشَّعْرِ وَالْبَشَرَةِ) گەیاندنی ئاوە بۆ ناو هەموو مووەكان و

وَسُنَّتُهُ خَمْسَةُ أَشْيَاءَ: اَلتَّسْمِيَةُ، وَالْوُضُوءُ قَبْلَهُ، وَإِمْرارُ الْيَدِ عَلَى الْجَسَدِ، وَالْمُوالاةُ، وَتَقْديمُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى.
(فَصْلٌ) وَالإِغْتِسالاتُ الْمَسْنُونَةُ سَبْعَةَ عَشَرَ غُسْلاً: غُسْلُ الْجُمُعَةِ، وَالْعِيدَيْنِ،

---

هەموو پیستەی، واتە، ئەبی سەرو ریشو بن هەنگڵو کونەگوێو نێوان هەردوو رانی، هەموویان ئاویان بە سەردا بڕوا.
هەروەها ئەگەر کەزیەکانی سەری ئافرەت توند پێچرابونو ئاویان بۆ نەئەچوو، ئەبی بیانکاتەوە، بەڵام ئەگەر شل بون و ئاویان بۆ ئەچوو، کردنەوەیان ناویێ ﴿عَنْ عَليٍّ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ: مَنْ تَرَكَ مَوْضِعَ شَعَرَةٍ مِنْ جَنابَةٍ لَمْ يَغْسِلْهَا فُعِلَ بِهِ كَذا وَكَذا مِنَ النَّارِ﴾ صححه القرطبي وابن حجرالعسقلاني، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك شوێنی یەك موو نەشۆریێ لە جەنابەت، وەهاو وەهای لێئەکرێ لە ئاگری دۆزەخ.
(وَسُنَّتُهُ) سوننەتەکانی خۆشۆردن (خَمْسَةُ أَشْياءَ) پێنجن (التَّسْمِيَةُ) یەکەم: گوتنی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لەگەڵ دەست پێکردنی خۆشۆردن. (وَالْوُضُوءُ قَبْلَهُ) دووەم: دەستنوێژ شۆردنە لە پێش غوسل کردن. (وَإِمْرارُالْيَدِ عَلَى الْجَسَدِ) سێیەم: هێنانی دەستە بە سەر لاشەکەیدا بۆئەوەی باش تەڕ ببێ. (وَالْمُوالاةُ) چوارەم: بە دوای یەکتردا هەموو لاشەکەی بشوا، ئەو سوننەتانە لەم حەدیسە وەرگیراون:
﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذااغْتَسَلَ مِنَ الْجَنابَةِ يَبْدَأُ فَيَغْسِلُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يُفْرِغُ بِيَمِينِه عَلَى شِمالِه فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وُضُوئَهُ لِلصَّلاةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ الْماءَ فَيُدْخِلُ أَصابِعَهُ فِي أُصُولِ الشَّعْرِ، ثُمَّ حَفَنَ عَلَى رَأْسِه ثَلاثَ حَفَناتٍ، ثُمَّ أَفاضَ عَلَى سائِرِ جَسَدِه، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە جەنابەت خۆی ئەشۆری، دەستەکانی ئەشۆری، ئینجا بە دەستی ڕاستەی ئاوی هەڵئەگرتو ئەیدایە دەستی چەپەیو تارەتی پێئەکرد، ئینجا دەستنوێژیکی‌تەواوی ئەشۆرد، ئینجا ئاوی هەڵئەگرتو پەنجەکانی ئەخستنە ناو مووی سەرییو هەڵێنەگوشیو سێ جار ئاوی ئەکرد بە سەریا، ئینجا لاشەی خۆی ئەشۆرد، ئینجا قاچەکانی ئەشۆردن.
(وَتَقْدِيمُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى) پێنجەم: پێشخستنی شۆردنی لایڕاستەیە لە سەر لایچەپە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِه إِذاتَطَهَّرَ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەر ﷺ پێی خۆشبو لایڕاستەی پێش بخا بۆ دەستنوێژو غوسل کردنی.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی خۆشۆردنی سوننەت ﴾

(وَالإِغْتِسالاتُ الْمَسْنُونَةُ) ئەو خۆشۆردنانەی خێرن (سَبْعَةَعَشَرَ غُسْلاً) حەڤدە غوسلن: (غُسْلُ الْجُمُعَةِ) یەکەم: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینییە. (وَالْعِيدَيْنِ) دووەمو سێیەم: خۆشۆردنە بۆ جەژنی ڕەمەزانو قوربان، ئەو سێیانە لە شوێنی خۆیان باسیان ئەکەین.

وَالإِسْتِسْقَاء، وَالْخُسُوف، وَالْكُسُوف، وَالْغُسْلُ مِنْ غَسْلِ الْمَيِّت، وَالْكَافِرِ إِذَا أَسْلَمَ، وَالْمَجْنُونِ وَالْمُغْمَى عَلَيْهِ إِذَا أَفَاقَا، وَالْغُسْلُ عِنْدَالإِحْرَامِ، وَلِدُخُولِ مَكَّةَ، وَلِلْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ، وَلِلْمَبِيتِ بِمُزْدَلِفَةَ، وَلِرَمْيِ الْجِمَارِالثَّلاَث، وَلِلطَّوَاف، وَلِلسَّعْي، وَلِدُخُولِ مَدِينَةِ رَسُولِ اللهِﷺ.
(فَصْلٌ) وَالْمَسْحُ عَلَىالْخُفَّيْنِ جَائِزٌ بِثَلاَثَةِ شَرَائِطَ:

---

(وَالإِسْتِسْقَاءِ) چوارەم: خۆشۆردنە بۆ نوێژی داواکردنی باران. (وَالْخُسُوفِ) پێنجەم: خۆشۆردنە بۆ نوێژی مانگگیران (وَالْكُسُوفِ) شەشەم: خۆشۆردنە بۆ نوێژی ڕۆژگیران، ئەو سێ نوێژانە بە درێژی لە بەشی نوێژدا باسیان ئەکەین.
(وَالْغُسْلُ مِنْ غَسْلِ الْمَيِّتِ) حەفتەم: خۆشۆردنە لە بەر ئەوەی مردووی شۆردوە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ غَسَّلَ مَيِّتاً فَلْيَغْتَسِلْ﴾ حسنه الترمذي، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك مردووەکی شۆرد با خۆی بشۆرێ.
(وَالْكَافِرِ إِذَا أَسْلَمَ) هەشتەم: خۆشۆردنی کەسێکە کە کافرەو ئەبێتە موسوڵمان ﴿أَسْلَمَ قَيْسُ بِن عاصِمٍ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَنْ يَغْتَسِلَ﴾ رواه اصحاب السنن، (قەیس)ی کوڕی (عاسیم) بووە موسوڵمان، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: خۆت بشۆرە. هەروەها سوننەتە سەریشی بتاشێ.
(وَالْمَجْنُونِ) نۆیەم: خۆشۆردنە لە بەر شێتبوون (وَالْمُغْمَى عَلَيْهِ) دەیەم: خۆشۆردنە لەبەر بێهۆشبوون (إِذَا أَفَاقَا) کاتێ چاك بونەوە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كانَﷺ يُغْمَى عَلَيْهِ مِنْ مَرَضِ مَوْتِهِ ثُمَّ يُفِيقُ فَيَغْتَسِلُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە بەر نەخۆشی وەفاتی بێهۆش دەبو، ئینجا کە دەهاتەوە هۆش خۆی غوسلی دەکرد.
(وَالْغُسْلُ عِنْدَ الإِحْرَامِ) یانزەم: خۆشۆردنە بۆ ئیحرام بەستن بە حەج، یان بە عومرە. (وَلِدُخُولِ مَكَّةَ) دوانزە: خۆشۆردنە بۆ چوونە ناو (مەککە)ی پیرۆز. (وَلِلْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ) سێزدەهەم: خۆشۆردنە بۆ وەستانی عەرەفە. (وَلِلْمَبِيتِ بِمُزْدَلِفَةَ) چواردەهەم: بۆ شەو مانەوە لە موزدەلیفە. (وَلِرَمْيِ الْجِمَارِ الثَّلاَثِ) پانزە هەم: بۆ بەرد لێدانی هەرسێك شەیتانەکان. (وَلِلطَّوَافِ) شانزەهەم: بۆ تەواف کردنی ماڵی خوا. (وَلِلسَّعْيِ) بۆ هاتوچۆی نێوان سەفاو مەروە. (وَلِدُخُولِ مَدِينَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ) حەڤدەهەم: خۆشۆردنە بۆ چوونە مەدینەی پیرۆزو زیارەتی پێغەمبەرﷺ.

## ﴿ فَصْل: لەباسی مەسحی خوف ﴾

**پێناسە:** خوف جووتە گۆرەوییەکە لە پیستە، یان لە شتێکیتر دروست کراوەو ئاوی تێناچێ. (وَالْمَسْحُ) هێنانی دەستی تەڕ (عَلَى الْخُفَّيْنِ) بە سەر جووتە خوفەکە (جَائِزٌ) دروستە لەجیاتی قاچ شۆردن لە دەستنوێژدا (بِثَلاَثَةِ شَرَائِطَ) بە سێ مەرج:

أَنْ يَبْتَدِىءَ لُبْسَهُما بَعْدَ كَمالِ الطَّهارَةِ، وَأَنْ يَكُونا ساتِرَيْنِ لِمَحَلِّ غَسْلِ الْفَرْضِ مِنَ الْقَدَمَيْنِ، وَأَنْ يَكُونا مِمَّا يُمْكِنُ تَتابُعُ الْمَشْيِ عَلَيْهِما. وَيَمْسَحُ الْمُقِيمُ يَوْماً وَلَيْلَةً، وَالْمُسافِرُ ثَلاثَةَ أَيّامٍ بِلَياليهِنَّ، وَابْتِداءُ الْمُدَّةِ مِنْ حِينِ يُحْدِثُ بَعْدَ لُبْسِ الْخُفَّيْنِ، فَإِنْ مَسَحَ فِي الْحَضَرِ ثُمَّ سافَرَ

---

یەکەم: (أَنْ يَبْتَدِىءَ لُبْسَهُما) هەر دووخوففەکان بکاتە پێی (بَعْدَ كَمالِ الطَّهارَةِ) پاش تەواوبوونی دەستنوێژگرتن.

دووەم: (وَأَنْ يَكُونا ساتِرَيْنِ) ئەو دوو خوففە داپۆشەر بن (لِمَحَلِّ غَسْلِ الْفَرْضِ) بۆ ئەو شوێنەی واجبە بشۆری (مِنَ الْقَدَمَيْنِ) لە هەردوو قاچەکان لە کاتی دەستنوێژدا، واتە: قاچەکانی بە گۆزینگەوە داپۆشن.

سێیەم: (وَأَنْ يَكُونا مِمَّا يُمْكِنُ) خوففەکان ئەوەندە توند بن کە بگونجێ (تَتابُعُ الْمَشْيِ عَلَيْهِما) بەدوای یەکدا کاروانچی هاتوچۆیان بە سەردا بکا بۆ کاروباری خۆی لە کاتی دابەزین، هەروەها ئەبی خوففەکان پاك بن، ئەگەر نا: نوێژیان لێنایێ.

جا بزانە: ئیمامی(عَلِي)ﷺ ئەفەرموێ: ﴿رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْهِ﴾ رواهابوداود، پێغەمبەرمﷺ بینی پشتەپێی خوففەکانی مەسح ئەکرد. واتە: مەسحکردنی خوففەکان واجبە لە سەر پشتەپێ بێ.

(وَيَمْسَحُ الْمُقِيمُ) ئەو کەسەی لە ماڵەوەیە مەسحی خوف ئەکا، لەجیاتی قاچ شۆرین (يَوْماً) ڕۆژێکی‌تەولو (وَلَيْلَةً) لەگەڵ شەوێکی‌تەولو (وَالْمُسافِرُ) ئەو کەسەی کە لە ماڵ نیەو ڕێبوارە، سەفەرەکەشی دوو قۆناغە، واتە: (٨٠) هەشتا کیلۆمتر، ئەمەش مەسحی خوف ئەکا (ثَلاثَةَ أَيّامٍ) سێ ڕۆژان (بِلَياليهِنَّ) لەگەڵ سێ شەوەکانیان ﴿عَنْ أَبِي بَكْرَةَﷺ: عَنِ النَّبِيِّﷺ: أَنَّهُ رَخَّصَ لِلْمُسافِرِ ثَلاثَةَ أَيّامٍ وَلَيالِيَهُنَّ وَلِلْمُقِيمِ يَوْماً وَلَيْلَةً، إِذا تَطَهَّرَ فَلَبِسَ خُفَّيْهِ أَنْ يَمْسَحَ عَلَيْهِمَا﴾ أخرجه الدار قطني وصححهُ ابن خزيمة، پێغەمبەرﷺ ماوەی مەسحی خوففی دانا: بۆ ڕێبوار سێ ڕۆژ و سێ شەو، بۆ دانیشتووی ماڵەوەش یەك ڕۆژ و یەك شەو، بە مەرجێ دوای دەستنوێژ شۆرین ئەو دووانە خوففەکانیان بکەنە پێ.

(وَابْتِداءُ الْمُدَّةِ) دەست پێکردنی ماوەی مەسحکردنی خوف بۆ سەفەر و بۆ ماڵەوە (مِنْ حِينِ يُحْدِثُ) لە کاتی بێدەستنوێژبوونەوە دەست پێ ئەکا (بَعْدَ لُبْسِ الْخُفَّيْنِ) ئەو بێدەستنوێژیەی لە دوای دەبەرکردنی خوففەکان ڕوو ئەدا.

(ڕوونکردنەوە): لە کاتژمێری چوار دەستنوێژی گرت و خوففی کردنە پێ، ئینجا لە کاتژمێری پانزە بێدەستنوێژ بوو، ئەوە ماوەکەی لە کاتژمێری پانزەوە دەست پێ ئەکا.

(فَإِنْ مَسَحَ) جا ئەگەر مرۆڤ مەسحی خوففی کرد (فِي الْحَضَرِ) لە ماڵەوە (ثُمَّ سافَرَ) ئینجا

أَوْ مَسَحَ فِي السَّفَرِ ثُمَّ أَقامَ أَتَمَّ مَسْحَ مُقِيمٍ، وَيَبْطُلُ الْمَسْحُ بِثَلاثَةِ أَشْياءَ: بِخَلْعِهِما، وَانْقِضاءِ الْمُدَّةِ، وَما يُوجِبُ الْغُسْلَ.
(فَصْلٌ) وَشَرائِطُ التَّيَمُّمِ خَمْسَةُ أَشْياءَ: وُجُودُ الْعُذْرِ بِسَفَرٍ أَوْ مَرَضٍ،

---

به سه‌فه‌ر چوو، ئه‌وه ئه‌بی هه‌ر شه‌و و ڕۆژێك مه‌سحی خوف بكا، چونكه له بناغه‌كه‌ی به مه‌به‌ستی ماڵه‌وه بووه (أَوْ مَسَحَ فِي السَّفَرِ) یان مه‌سحی خوففی كرد كاتێ كه له سه‌فه‌ر بوو (ثُمَّ أَقامَ) ئینجا هاته‌وه ماڵه‌وه، ئه‌وه‌ش (أَتَمَّ مَسْحَ مُقِيمٍ) هه‌ر ماوه‌ی ماڵه‌وه ته‌واو ئه‌كا، واته: له شه‌و و ڕۆژێك زیاتری بۆ دروست نیه، چونكه سه‌فه‌ره‌كه‌ی كۆتایی هاتوه.
(وَيَبْطُلُ الْمَسْحُ) مه‌سحكردنی خوف تێك ئه‌چێ (بِثَلاثَةِ أَشْياءَ) به سێ شت:
یه‌كه‌م: (بِخَلْعِهِما) به داكه‌ندنی خوففه‌كان مه‌سح تێك ئه‌چێ، جا ئه‌گه‌ر ده‌ستنوێژی هه‌بوو، ئه‌وه ته‌نها قاچه‌كانی ئه‌شۆریته‌وه‌و خوففه‌كان ئه‌كاته‌وه پێی، ئه‌گه‌ر نه‌یبوو، ئه‌وه ده‌ستنوێژێكی‌ته‌واو ئه‌شۆرێ.
دووه‌م: (وَانْقِضاءِ الْمُدَّةِ) به كۆتایی هاتنی ماوه‌ی ماڵه‌وه، یان ماوه‌ی سه‌فه‌ر، مه‌سح تێك ئه‌چێ‌و ئه‌بی دووباره خوففه‌كان دابكه‌نێ‌و ده‌ستنوێژ بشورێته‌وه‌و خوففه‌كان دووباره بكاته‌وه پێی.
سێیه‌م: (وَما يُوجِبُ الْغُسْلَ) هه‌ر شتێك غوسل واجب بكا مه‌سحی خوف تێك ئه‌دلو ئه‌بی نوێی بكاته‌وه ﴿عَنْ صَفْوانَ ﷺ: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْمُرُنا إِذا كُنَّا سَفْراً أَلاَّ نَنْزِعَ خِفافَنا ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيالِيَهُنَّ إِلاَّ مِنْ جَنابَةٍ﴾ رواه الترمذي، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمانی ئه‌داینێ: كاتێ له سه‌فه‌ر بین ماوه‌ی سێ شه‌و و سێ ڕۆژان خوففه‌كانمان دانه‌كه‌نین ته‌نها له به‌ر جه‌نابه‌ت –واته: له‌ش پیسی– نه‌بێ.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی ته‌یه‌مموم ﴾

(**پێناسه**): ته‌یه‌مموم ئه‌وه‌یه له‌جیاتی به‌كارهێنانی ئاو –بۆ ده‌ستنوێژو غوسل– تۆزێكی پاك به ڕووخسار و هه‌ردوو ده‌سته‌كانی دابدا. (وَشَرائِطُ التَّيَمُّمِ) مه‌رجه‌كانی دروستبوونی ته‌یه‌مموم كردن بۆ بێ‌ده‌ستنوێژی‌و بۆ جه‌نابه‌ت (خَمْسَةُ أَشْياءَ) پێنجن:
یه‌كه‌م: (وُجُودُ الْعُذْرِ) نه‌گونجانی به‌كارهێنانی ئاوه (بِسَفَرٍ) به هۆی‌ڕێبواری (أَوْ مَرَضٍ) یان به هۆی نه‌خۆشی، خوای گه‌وره‌ئه‌فه‌رمویێ: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ﴾ إلى آخرالآية، ئه‌گه‌ر نه‌خۆش بون، یان ڕێبوار بون–له كۆتایی‌دا ئه‌فه‌رموێ:–ته‌یه‌مموم بكه‌ن.
جا ئه‌گه‌ر كه‌سێك ئه‌یزانی له‌و شوێنه ئاو نیه، ئه‌بی یه‌كسه‌ر ته‌یه‌مموم بكا، جیاوازی سه‌فه‌ر و ماڵه‌وه نیه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر گومانی هه‌بوو، یان شاره‌زای شوێنه‌كه نه‌بو، ئه‌وه ئه‌بی به ده‌وروبه‌ری خۆی‌دا بگه‌ڕێ‌و بچێته سه‌ر به‌رزاییه‌كان‌و ته‌ماشا بكا، ئینجا ئه‌گه‌ر

وَدُخُولُ وَقْتِ الصَّلَاةِ، وَطَلَبُ الْمَاءِ، وَتَعَذُّرُ إِسْتِعْمالِه، وَإِعْوازُهُ بَعْدَ الطَّلَبِ، وَالتُّرابُ الطَّاهِرُ لَهُ غُبَارٌ،

---

ئاو نەبو، تەيەممومم ئەكاو قەزاكردنەوەی نوێژەكەی لە سەر واجب نیە، بەو مەرجەی سەفەرەكەی تاوانباری نەبێ، هەروەها ئەگەر ئاو بە نۆبەت بێ و بزانێ: لە كاتی نوێژ نۆبەتی ناگاتێ، واجبە تەیەممووم بكاو قەزاكردنەوەی نوێژەكەی لە سەر نیە.

هەروەها ئەگەر كەسێك نەخۆش بێ و ترسی هەبێ: ئەگەر خۆی بە ئاو بشۆرێ، نەخۆشیەكەی زیاتر ببێ، یان درەنگتر چاك ببێتەوە، یان زیانێكیتری پێبگا، ئەمەش با تەیەممووم بكاو قەزاكردنەوەی ئەو نوێژانەی لە سەر نیە، جا لە ماڵەوە بێ، یان لە سەفەر بێ.

دووەم: (وَدُخُولُ وَقْتِ الصَّلَاةِ) كاتی نوێژ هاتبێ ئینجا تەیەممووم بكا، واتە: پێش هاتنی كاتی نوێژ تەیەممووم دروست نیە.

سێیەم: (وَطَلَبُ الْمَاءِ) بە دوای ئاودا بگەڕێ، جا ئەگەر دەستی نەكەوت با تەیەممووم بكا، چونكە خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ ئەگەر ئاوتان دەست نەكەوت، هەوڵی گڵێكی پاك بدەن.

﴿ئاگاداری﴾: هەركەسێك لە بەر نەبوونی ئاو لەو شوێنەدا تەیەمموم بكا: كە بە زۆری ئاوی هەیە، بەڵام جارجارە ڕوو ئەدا ئاوی لێنیە، واجبە نوێژەكەی قەزا بكاتەوە، جیاوازی چۆڵیو ئاوەدانیو ڕێبوارو نیشتەجێ نیە.

چوارەم: (وَتَعَذُّرُ إِسْتِعْمالِه) نەگونجانی بەكارهێنانی ئاوە: یان لە ترسی دوژمن، یان لە بەر دز، یان لە بەر سەرما ﴿عَنْ عَمرو بِن الْعاصِ﷛: أَنَّهُ أَجْنَبَ فَتَيَمَّمَ مِنْ شِدَّةِ الْبَرْدِ وَصَلَّى فَأَقَرَّهُ النَّبِيُّ ﷺ﴾ رواه البخاري، (عەمر)ی كوڕی (عاس) جەنابەتی تووش بوو، لە ترسی سەرما تەیەممومی كردو نوێژی كرد، پێغەمبەرﷺ هیچی پێنەگوت.

جا بزانە: ئەو كەسەی لە ترسی سەرما تەیەمموم ئەكا، واجبە نوێژەكەی قەزا بكاتەوە، جیاوازی ڕێبوارو ماڵەوە نیە، بەڵام لە فەرموودەیەكیتری ئیمام (الشافعي)و ئیمام (أحمد)دا: قەزاكردنەوەیان لە سەر نیە، هەر وەها ئەگەر ئەگونجا ئاوەكە گەرم بكا، واجبە گەرمی بكاو نابێ تەیەمموم بكا، هەرچەند كاتی نوێژیش بەسەر بچێ.

پێنجەم: (وَإِعْوازُهُ) ڕوودانی پێویستییە بۆ ئەم ئاوە (بَعْدَ الطَّلَبِ) دوای دەستكەوتنی ئاوەكە: جا بۆ خۆی بێ، یان بۆ ئادەمیزاێكیتری بەڕێز –واتە: نوێژنەكەر نەبێ و لە گەڵ ئیسلام جەنگ نەكاو لە دین دەرنەچوبێ– كەوابوو: ئاوەكە لەو پێویستیانە بەكار دێنێ و تەیەمموم ئەكاو قەزاكردنەوەی لە سەر نیە، بەو مەرجەی لە سەفەری تاوانباری نەبێ.

(وَالتُّرابُ الطَّاهِرُ) ئەو گڵەی تەیەممومی پێئەكا، مەرجە: ئەبی پاك بێ و (لَهُ غُبَارٌ) ئەبی تۆزی هەبێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ هەوڵی گڵێكی پاك

فَإِنْ خَالَطَهُ جِصٌّ أَوْ رَمْلٌ لَمْ يُجْزِ. وَفَرائِضُهُ أَرْبَعَةُ أَشْيَاءَ: اَلنِّيَّةُ، وَمَسْحُ الْوَجْهِ، وَمَسْحُ الْيَدَيْنِ مَعَ الْمِرْفَقَيْنِ، وَالتَّرْتِيبُ. وَسُنَنُهُ ثَلاَثَةُ أَشْيَاءَ: اَلتَّسْمِيَةُ، وَتَقْدِيمُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، وَالْمُوالاَةُ. وَالَّذِي يُبْطِلُ التَّيَمُّمَ ثَلاَثَةُ أَشْيَاءَ: مَا أَبْطَلَ الْوُضُوءَ، وَرُؤْيَةُ الْمَاءِ فِي غَيْرِ وَقْتِ الصَّلاَةِ،

---

بدەن بۆ تەیەمموم. (فَإِنْ خَالَطَهُ) جا ئەگەر تێکەڵی ئەو گڵە بوبێ (جِصٌ) گەچ (أَوْ رَمْلٌ) یان لیم، ئەوە (لَمْ يُجْزِ) تەیەممومی پێ دروست نیە، چونکە ئەم دووانە گڵ نین، بەلام ئەگەر لیمەکە تۆزی هەبوو، ئەوە تەیەممومی پێ دروستە.

(وَفَرائِضُهُ) پێویستیەکانی تەیەمموم (أَرْبَعَةُ أَشْياءَ) چوارن:

یەکەم: (اَلنِّيَّةُ) نیەتهێنانە. واتە: بە دڵ نیازی ئەوەبێ: کە نوێژکردن حەلاڵ ئەکا؟ چونکە بە تەیەمموم بێدەستنوێژیو جەنابەت لا ناچن ﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اَلصَّعِيدُالطَّيِّبُ وَضُوءُ الْمُسْلِمِ وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ، فَإِذا وَجَدَ الْمَاءَ فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ﴾ رواه أصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆڵی پاکژ دەستنوێژگری موسوڵمانە ئەگەر تا دە ساڵیش ئاوی دەست نەکەوێ، بەلام هەر کاتێ ئاوی دەست کەوت، با خۆی پێ پاکژ بکاتەوە لە بێدەستنوێژی و لەش پیسی.

دووەم: (وَمَسْحُ الْوَجْهِ) هێنانی دەستی بە تۆزە بە سەر ڕووخساریدا.

سێیەم: (وَمَسْحُ الْيَدَيْنِ مَعَ الْمِرْفَقَيْنِ) هێنانی دەستی بە تۆزە بە سەر هەردوو دەستەکانیدا لەگەڵ ئەنیشکەکانی، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ﴾ ڕووخسار و دەستەکانتان بە تۆزی ئەو گڵە پاکە مەسح بکەن. (تەیەمموم وەك دەستنوێژە کە باسی ئەنیشك لەوێدا کراوە).

چوارەم: (وَالتَّرْتِيبُ) بەجێهێنانی ئەو ڕیزەیە کە لە ئایەتی پیرۆزدا گوتراوە.

(وَسُنَنُهُ) سوننەتەکانی تەیەمموم (ثَلاَثَةُ أَشْياءَ) سێنە (اَلتَّسْمِيَةُ) یەکەم: گوتنی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). (وَتَقْدِيمُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى) دووەم: پێشخستنی لای ڕاستەیە لە سەر لای چەپە. (وَالْمُوالاَةُ) سێیەم: لە یەك شوێن بە دوای یەکدا تەیەمموم بکا، هەوەك لە دەستنوێژدا باسی ئەو سوننەتانە کراوە.

(وَالَّذِي يُبْطِلُ التَّيَمُّمَ) ئەو شتەی تەیەمموم هەڵئەوەشێنێتەوە (ثَلاَثَةُ أَشْياءَ) سێ شتن:

یەکەم: (مَا أَبْطَلَ الْوُضُوءَ) ئەو شەش شتانەی دەستنوێژیان هەڵئەوەشاندەوە، تەیەممومیش هەڵئەوەشێننەوە.

دووەم: (وَرُؤْيَةُ الْمَاءِ) دەستکەوتنی ئاوە (فِي غَيْرِ وَقْتِ الصَّلاَةِ) کە هێشتا نوێژی دانەبەستبێ. واتە: ئەگەر دەستی بە نوێژ کردبو، ئینجا ئاو پەیدا بوو، با نوێژەکەی تەولو

وَالرِّدَّةُ. وَصاحِبُ الْجَبائِرِ يَمْسَحُ عَلَيْها وَيَتَيَمَّمُ وَيُصَلِّي وَلاَإِعادَةَ عَلَيْهِ إِنْ كانَ وَضَعَها عَلَى طُهْرٍ، وَيَتَيَمَّمُ لِكُلِّ فَرِيضَةٍ، وَيُصَلِّي بِتَيَمُّمٍ وَاحِدٍ مَاشاءَ مِنَ النَّوافِلِ.

---

بكا، بەلآم ئەگەر نوێژەكەی ببڕێ بۆ ئەوەی دەستنوێژ بگرێو بە دەستنوێژەوە بیكا، ئەوە خێری زۆرترە.

سێیەم: (وَالرِّدَّةُ) كافربوونە، واتە: بە كوفركردنێك تەیەمموم هەڵئەوەشێتەوە.

(وَصاحِبُ الْجَبائِرِ) ئەو كەسەی برینی، یان شكەستی پێچراوەو نەئەگونجا پێچەرەكە لابیا (يَمْسَحُ عَلَيْها) دەستی تەڕ دێنێ بە سەر پێچەرەكەدا، بەلآم ئەبی ئەندامە ساغەكانیتری بە ئاو بشوا، ئینجا كە نۆبەتی زامدارەكە هات، بە ئاو مەسحی بكا (وَيَتَيَمَّمُ) ئینجا كە ئەندامە زامدارەكەی بە ئاو مەسح كرد، تەیەمموم ئەكا بۆ ئەوەی ڕیزەكە تێك نەچێ (وَيُصَلِّي) نوێژ ئەكا (وَلاَ إِعادَةَ عَلَيْهِ) قەزای نوێژەكەی لە سەر نیە (إِنْ كانَ وَضَعَها) بەو مەرجەی كە پێچەرەكەی داناوەتە سەر برینەكە (عَلَى طُهْرٍ) لە سەر بەدەستنوێژی بوبێ، چونكە ئەم پێچەرە وەك خوف وایە-كە باسمان كرد-كەوابوو: ئەگەر لە سەر بێدەستنوێژی پێچەرەكەی دانابو، ئەبی نوێژەكە قەزا بكاتەوە.

هەروەها ئەگەر ئەو پێچەرە لە ئەندامەكانی تەیەمموم بوو: وەك دەست و ڕووخسار، هەر ئەبی نوێژەكەی قەزا بكاتەوە، چونكە-لە بەر پێچەرەكە- نە ئاوی ئەگاتێ و نە تۆز، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ رواه الشيخان، كاتێ فەرمانێكم پێكردن، بەگوێرەی تواناتان بیكەن.

كەوابوو: ئەم جۆرە تەیەممومە بۆ جێبەجێكردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەﷺ، جا ئەگەر لابردنی پێچەرەكە ئەگەنجاو زیانی نەبو، واجبە بۆ دەستنوێژ و بۆ تەیەمموم لای ببا.

(وَيَتَيَمَّمُ) واجبە تەیەمموم بكا (لِكُلِّ فَرِيضَةٍ) بۆ هەموو نوێژێكی واجب، وە بۆ هەر شتێكیتر: كە بە بێدەستنوێژی دروست نەبێ: وەك خوتبەی جومعەو تەواف كردن...هتد ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قالَ: يُتَيَمَّمُ لِكُلِّ فَرِيضَةٍ وَإِنْ لَمْ يُحْدِثْ﴾ رواه البیهقی، (ابْنِ عُمَرَ)-خوا لێیان ڕازی بێ- فەرمووی: بۆ هەموو نوێژێك ئەبی تەیەمموم بكرێ، هەرچەند بێدەستنوێژیش نەبوبێ. (وَيُصَلِّي بِتَيَمُّمٍ وَاحِدٍ) دروستە بە یەك تەیەمموم نوێژ بكا (مَا شاءَ مِنَ النَّوافِلِ) هەر چەند حەز ئەكا لە سوننەتەكان.

﴿ئاگاداری﴾: تەیەمموم بۆ بێدەستنوێژیو بۆ لەش پیسی پیاو، یان ئافرەت: جا بە حەیز، یان بە نیفاس، بۆ زیندوو، یان بۆ مردوو، هەمووی وەكو یەكتری وایە: تەنها ڕووخسارو دەست مەسح ئەكرێن. جا بزانە: ئەگەر مردووێك تەیەمموم كراو نوێژی لە سەر كرا، ئینجا پێش ناشتنی ئاو دەست كەوت، واجبە بشۆرێو دووبارە نوێژی لە سەر بكرێتەوە، بەو شێوەیەی لە باسی مردوودا ڕۆنی دەكەینەوە، إن شاءالله تعالى.

(فَصْلٌ) وَكُلُّ مائِعٍ خَرَجَ مِنَ السَّبِيلَيْنِ نَجِسٌ إلاَّ الْمَنِيَّ، وَغَسْلُ جَمِيعِ الأَبْوالِ وَالأَرْواثِ وَاجِبٌ إلاَّ بَوْلَ الصَّبِيِّ الَّذِي لَمْ يَأْكُلِ الطَّعامَ فَإِنَّهُ يَطْهُرُ بِرَشِّ الْماءِ عَلَيْهِ،

---

﴿پاشكۆ﴾: ئەگەر نە ئاوی دەست كەوت و نە گڵ: جا بێدەستنوێژ بێ، یان لەشی بە جەنابەت بێ، واجبە: نوێژە واجبەكان بكاو دوایێ قەزایان بكاتەوە، جا بەم كەسە ئەگوترێ: (فَاقِدُ الطَّهُورَيْنِ)، واتە: لە دەستچووی هەردوو پاكژكەرەوەكان: كە گڵ و ئاوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی پیسی و لابردنی پیسی ﴾

( پێناســــە ): پیســـی چـــڵكنێكە بـــە شـــەرع نوێـــژی پێـــوە دروســـت نیـــە.

(وكُلُّ مائِعٍ) هەر شتێكی تەڕ بێو (خَرَجَ مِنَ السَّبِيلَيْنِ) بێتە دەرەوە لە یەكێك لە كونی پێشەوە، یان پاشەوە (نَجِسٌ) پیسە، جا لە ئادەمیزاد بێتە دەرەوە، یان لە باڵندە، یان لە ئاژەڵ، گۆشتی بخورێ، یان نا.

(إلاَّ الْمَنِيَّ) تەنها (مەنی) نەبێ، واتە: ئاوی نێر و مێ پاكە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كُنْتُ أَفْرُكُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَيُصَلِّي فِيهِ﴾ رواه مسلم، (عائِشَة) ئەفەرموێ: من بە نینۆك (مەنی)م ئەڕنی لە جلی پێغەمبەر ﷺ جا ئەویش نوێژی پێوە ئەكرد. واتە: پیس نیە بۆیێ نەیئەشۆرد.

(وَغَسْلُ جَمِيعِ الأَبْوالِ) شۆرینی هەموو جۆرە میزێك واجبە، جا هی ئادەمیزاد بێ، یان ئاژەڵ، ئەگەر تەنها یەك پشكیش بێ، لێبووردنی نیە، پیاوێك میزی لە ناو مزگەوت كردو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿دَعُوهُ وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ ماءٍ﴾ رواه الشیخان، وازی لێبێننو دۆلچەیەكی ئاو بڕژێننە سەر میزەكەی.

(وَالأَرْواثِ واجِبٌ) هەروەها شۆرینی هەر پیسایەكی كە لە كونی پاشەوە دەربچێ واجبە، جا هی ئادەمیزاد بێ، یان ئاژەڵ، یان باڵندە، (عبدالله)كوڕی(مسعود)خوا لێی ڕازی بێ، ئەفەرموێ: ﴿أَتَى النَّبِيُّ ﷺ الْغائِطَ فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلاثَةِ أَحْجارٍ، فَأَتَيْتُهُ بِرَوْثَةٍ وَحَجَرَيْنِ، فَأَخَذَهُمَا وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ، وَقالَ: إِنَّها رِكْسٌ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ چووە پیسایی كردنو داوای لێم كرد: سێ بەردی بۆ بێنم تارەتی پێ بكا، منیش دوو بەردو ڕیخێكم بۆ هێنا، ئەویش ڕیخەكەی فڕێداو فەرمووی: ئەوە پیسە. هەروەها بزانە: ڕشانەوەش پیسەو ئەبێ بشۆرێ.

(إلاَّ بَوْلَ الصَّبِيِّ الَّذِي) بەلام واجب نیە شۆرینی میزی كوڕیكی وەها: كە (لَمْ يَأْكُلِ الطَّعامَ) جگە لە شیر هیچیتری نەخواردبێو تەمەنیشی لە دووساڵ زیاتر نەبێ (فَإِنَّهُ) میزی ئەم كوڕە (يَطْهُرُ) پاك ئەبێتەوە (بِرَشِّ الْماءِ عَلَيْهِ) بە ئاو پڕژاندنە سەری، واتە: بە قەد میزەكە بە ئاو تەڕ بكرێ ﴿عَنْ أُمِّ قَيْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّهَا جَاءَتْ بِابْنٍ لَها صَغِيرٍ لَمْ يَأْكُلِ الطَّعامَ فَأَجْلَسَهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي حِجْرِهِ فَبالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعا بِماءٍ فَنَضَحَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ﴾ رواه

وَلاَ يُعْفَى عَنْ شَيْءٍ مِنَ النَّجَسَاتِ إِلاَّ الْيَسِيرَ مِنَ الدَّمِ أَوِالْقَيْحِ، وَما لاَ نَفْسَ لَهُ سائِلَةٌ إِذا وَقَعَ فِي الإِناءِ وَماتَ فِيهِ فَإِنَّهُ لاَ يُنَجِّسُهُ، وَالْحَيْوانُ كُلُّهُ طاهِرٌ

الشيخان، ئافرەتێك كوڕێكی بچوكی -كه خواردنی نەخواردبو- هێنایه خزمەت پێغەمبەرﷺ، ئەویش له كۆشی خۆی دانا، كوڕەكەش میزی به جلی پێغەمبەرﷺدا كرد، پێغەمبەرﷺ داوای ئاوی كردو پرژاندیه سەر میزەكەو نەیشۆرد.

جا ئەگەر منداڵەكه له دوو ساڵ تەمەنی زیاتر بوو، یان خواردنی خواردبو، یان كیژۆڵه بوو، ئەبی میزەكەی بشۆریٚ ﴿عَنْ أَبِي السَّمْحِ: عَنِ النَّبِيِّﷺ: يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْجَارِيَةِ وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلاَمِ﴾ رواه النسائي، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: میزی كیژۆڵه ئەشۆریٚو میزی كوڕ ئاوی به سەردا ئەپرژێندریٚ.

(وَلاَ يُعْفَى) لێنابوردریٚ (عَنْ شَيْءٍ مِنَ النَّجَاسَاتِ) له هیچ جۆره پیسیەك، واته: ئەبی هەموو جۆره پیسیەك بشۆریٚو لێبوردنی نیه (إِلاَّ الْيَسِيرَ) تەنها كەمێك نەبیٚ (مِنَ الدَّمِ) له خوێن: جا خوێنی خۆی بیٚ، یان هی شتێكیتری جگه له سەگو بەراز (وَالْقَيْحِ) یان كەمێك له كێمو خیزاوكی برینو قونێری خۆی، یان هی شتێكیتری جگه له سەگ و بەراز، هەرچەند خوێنو كێمەكەش به ئارەقه بڵاو بوبنەوه، یان خوێنی كێچو ئەسپیٚو پێشوله: كه به جلەكانیەوه بیٚ.

هەروەها لێبوردن هەیه، له پشكه قوڕو چڵكاوی كۆڵانو ڕێگه -له كاتیزستان- كه له ئەژنۆی بەرەوخوارتر بیٚ، هەروەها له دڵۆپەی سەریان له زستاندا.

(وَمالاَ نَفْسَ لَهُ) هەروەها لێبوردن هەیه له گیانلەبەرێكی وەها: كه خوێنێكی وای نەبیٚ (سائِلَةٌ) لیٚی بڕژیٚ له كاتی لێكردنەوەی ئەندامێك: وەك مێشو زەنگەسوورەو قالۆچەو... هتد (إِذا وَقَعَ فِي الإِناءِ) هەركاتیٚ ئەو گیانلەبەره بەخۆی كەوته ناو قاپێك كه شتێكی شلی تیٚدابو (وَماتَ فِيهِ) له ناویدا مرد (فَإِنَّهُ) ئەو گیانلەبەره (لاَ يُنَجِّسُهُ) شته شلەكه پیس ناكا ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قالَ النَّبِيُّﷺ: إِذا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَناحَيْهِ شِفاءً وَفِي الآخَرِ داءً﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كاتێك مێش كەوته ناو خواردنەوەی یەكێكتان با هەمووی نقومی ناو شلەكه بكاو له دواییدا فڕیٚی بدا، چونكه له باڵێكیدا دەرمانەو لەوەیتریدا دەردە. واته: شلەكه پیس نابیٚ.

(وَالْحَيْوانُ كُلُّهُ) هەموو جۆره ئاژەڵێك (طاهِرٌ) پاكه ﴿عَنْ جابِرٍ:سُئِلَ النَّبِيُّﷺ: أَنَتَوَضَّأُ بِما أَفْضَلَتِ الْحُمُرُ؟ قالَ: نَعَمْ، وَبِما أَفْضَلَتِ السِّبَاعُ كُلُّها﴾ رواه البيهقي، پرسیار له پێغەمبەرﷺ كرا: ئایا دەستنوێژ بشۆین به لەبەرماوەی كەر؟ ئەویش فەرمووی: بەڵیٚ، به لەبەرماوەی هەموو دڕندەیەكیش. واته: چونكه دڕنده پاكه ئاو پیس ناكا.

إلاّ الْكَلْبَ وَالْخنْزيرَ وَما تَوَلَّدَ منْهُما أوْ منْ أحَدهما، وَالْمَيْتَةُ كُلُّها نَجسَةٌ إلاّ السَّمَكَ وَالْجَرادَ وَالآدَميَّ، وَيُغَسَّلُ الإناءُ منْ وُلُوغ الْكَلْب وَالْخنْزير سَبْعَ مَرّات إحْداهُنَّ بالتُّراب، وَيُغسَلُ منْ سائر النَجاسَات مَرَّةً يَأْتي عَلَيْه، وَالثَّلاثَةُ أَفْضَلُ،

---

(إلاّ الْكَلْبَ وَالْخنْزيرَ) تەنها سەگو بەراز پاك نینو گلاون (وَما تَوَلَّدَ منْهُما) ئەوەی لە نێوان سەگو بەرازیش بوبێ هەر پاك نیە (أوْ منْ أحَدهما) یان هەر لە یەكێك لە سەگو بەراز بوبێ، هەر پاك نیە. جا بزانە: تولەو تاژی هەر بە سەگ دانەندرێنو گلاون.

(وَالْمَيْتَةُ كُلُّها) هەموو جۆرە مرداربوویێك (نَجسَةٌ) پیسە، خوایگەورە ئەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ﴾ حەرام كراوە لە سەر ئێوە هەرچی مردار بێ.

(إلاّ السَّمَكَ) بەلام ماسی بە مردووییش هەر پاكە (وَالْجَرادَ) هەروەها كلو، ئەویش بە مردوویی پاكە ﴿عَنْ ابْن عُمَرَ رَضيَ اللهُ عَنهُما: عَن النَّبيِّ ﷺ: أُحلَّتْ لَنا مَيْتَتان وَدَمان: فَأَمّا الْمَيْتَتان فَالْحُوتُ وَالْجَرادُ، وأمّا الدَّمان فَالْكَبدُ وَالطِّحالُ﴾ رواه أحمد وغيره، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حەلاڵ كراوە بۆ ئێمە دوو جۆرە مردوو و دوو جۆرە خوێن: ماسیو كلو، جەرگو سپڵە، واتە: پاتەڕەشە.

(وَالآدَميَّ) هەروەها ئادەمیزاد بە مردوویش هەر پاكە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنا بَنيآدَمَ﴾ بە ڕاستی ئێمە ڕێزمان لە ئادەمیزاد ناوە. واتە: لە بەر ڕێزلێنان بە مردن پیس نابێ.

(وَيُغَسَّلُ الإناءُ) واجبە قاپ وكەلوپەلی خواردنو شتیتریش بشۆرێ (منْ وُلُوغ الْكَلْب) لە بەر دەم تێنانی سەگ (وَالْخنْزير) هەروەها بەراز (سَبْعَ مَرّات) حەفت جار (إحْداهُنَّ) جارێكیان لەو حەفت جارە (بالتُّراب) ئەبی بە گڵێكی پاك بێ، كە تێكەڵ بە ئاو بوبێ.

بزانە: سەگو بەراز خۆیان لە هەر شتێك بدەن–جا ئەوان تەڕ بن، یان شتەكە تەڕ بێ– ئەو شتە گڵاو ئەبێ، واتە: بە ئەستووری پیس ئەبێو ئەبی حەفت جار–بەو جۆرە– بشۆرێ، جا بەو جۆرە شۆردنە ئەگوترێ: (گڵاوكردنەوە).

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا وَلَغَ الْكَلْبُ في إناء أحَدكُمْ فَلْيُرقْهُ، ثُمَّ لْيَغْسلْهُ سَبْعَ مَرّات إحْداهُنَّ بالتُّراب﴾ رواه مسلم، كاتێ سەگ دەمی نایە ناو قاپی ئێوە، ئەو شتەی تێدایە بیڕژێننو حەفت جار بیشۆن، با جارێكیان لەو حەفتە بەگڵ و ئاو بێ.

(وَيُغَسَلُ) هەموو شتێك ئەشۆرێ (منْ سائر النَّجاسات) لە هەموو جۆرە پیسیەكیتر (مَرَّةً واحدَةً) یەك جار (يَأْتي عَلَيْه) ئاوەكە بە سەر شتە پیسبووەكەدا بڕوا (وَالثَّلاثَةُ أفْضَلُ) بەلام سێ جار بشۆرێ چاكترە.

﴿ئاگاداری﴾: هەر شتێك كە ئەشۆرێ، ئەبی كەلەشی پیسیەكە لابچێ، ئەگەر لانەچو، یان ڕەنگو بۆنی پیسیەكە بە یەكەوە مابو، ئەوە پاك نەبووەتەوە، بەلام مانەوەی ڕەنگ

وَإِذا تَخَلَّلَت الْخَمْرَةُ بِنَفْسِهَا طَهُرَتْ، وَإِنْ خُلِّلَتْ بِطَرْحِ شَــيْءٍ فِيهَــا لَــمْ تَطْهُــرْ.
(فَصْلٌ) وَيَخْرُجُ مِنَ الْفَرْجِ ثَلاثَةُ دِمَــاء: دَمُ الْحَــيْضِ، وَالنِّفَــاسِ، وَالاسْتِحاضَــة.
فَالْحَيْضُ: هُوَ الدَّمُ الْخَارِجُ مِنْ فَرْجِ الْمَرْأَةِ عَلَى سَبِيلِ الصِّحَّةِ مِنْ غَيْرِ سَبَبِ الْوِلادَةِ، وَلَونُهُ أَسْوَدُ مُحْتَدِمٌ لَذّاعٌ،

---

بــه تــەنها، يــان بــۆن بــه تــەنها-كــه لابردنيــان زەحمــەت بــێ- زيــانی نيــه.
ئینجا بزانه: بۆیێ پێویسته ئاوەكه به سەر پیسبووەكەدا بڕوا-نەك پیسبووەكه بخرێته ناو ئاوەكه-چونكه ئاوەكه پیس ئەبێ.
(وَإِذا تَخَلَّلَتِ الْخَمْرَةُ) هەر كاتێك شەراب-واته: (مەی)-بووه سـركه (بِنَفْسِها) لەخۆيـەوه (طَهُرَت) پاك ئەبێتەوەو خواردنەوەی حەلاڵه.
(وَإِنْ خُلِّلَتْ) بەلام ئەگـەر بـووه سـركه (بِطَـرْحِ شَـيْءٍ فِيهـا) بـه تێهاویشتنی شـتێك بـۆ نـاو (مەی)، ئەوه (لَمْ تَطْهُرْ) پاك نابێتەوەو خواردنەوەی حەرامه ﴿عَنْ أَنسٍ ﷺ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْخَمْرِ تُتَّخَذُ خَلاً؟فَقالَ: لا﴾ رواه مسلم، پرسیار كرا له پێغەمبەر ﷺ ئایا ئەگـەر مـەی به دەستكاریكردن بكرێته سركه پاكه، یان نا؟ فەرمووی: نا.
﴿ئاگاداری﴾: هەر شتێك له بنچینەی خۆیدا پیس بێ، ئەوه به شۆردن پـاك نابێتـەوه، وه ئەو شتەی پیسه: ئەگەر بەخۆی تەڕ بوو، یان ئـەو شـتەی پـێی دەكـەوێ تـەڕ بـوو، ئەوه پیسی ئەكا، بەلام هەر پیسیەكی ووشك بێ، ئەوه شتی ووشك پیس ناكا، هەرچـەند سەگ و بەرازیش بێ.

## ﴿ فَصْلٌ: باسی (حَيْض)و (نِفاس)=بێنوێژی ئافرەتان ﴾

(وَيَخْرُجُ) دێته دەرەوه (مِنَ الْفَرْجِ) له ئەندامی میزكردنی ئافرەت (ثَلاثَةُ دِماءٍ) سێ جـۆره خـوێن (دَمُ الْحَـيْضِ) یەكـەم: خـوێنی حـەیز. (وَالنِّفـاسِ) دووەم: خـوێنی منـداڵبوون. (والإِسْتِحاضَةِ) سێیەم: خوێنی ئیستیحاڵه، واته: خوێنچڕكەی نەخۆشی.
(فَالْحَيْضُ) پێناسەی حەیز ئەمەیه: (هُوَ الدَّمُ الْخَارِجُ) خوێنێكه له منداڵدانەوه دێته دەرەوه له كاتێكی تایبەتیدا (مِنْ فَـرْجِ الْمَرْأَةِ) لـه كونی ئەنـدامی منـداڵبوونی ئافرەتـەوه (عَلَـى سَـبِيلِ الصِّحَّةِ) لەو كاتەی تەندروستی ئافرەتەكه باشه (مِنْ غَيْرِ سَبَبِ الْوِلادَةِ) به هـۆی منـداڵبوونیش نیـه، پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ﴿هَذا شَيْءٌ كَتَبَهُ اللهُ عَلَى بَناتِ آدَمَ﴾ رواه الشیخان، ئـەم حەیزه شتێكه خوای گەوره نووسیویەتی له سەر كیژەكانی باب ئادەم.
(وَلَونُــهُ) ڕەنگــی خــوێنی حــەیز (أَسْــوَدُ) ڕەشــه (مُحْتَــدِمٌ) گەرمــه (لَــذّاعٌ) ئێشــێنێ.
جا بزانـه: ڕەنگی ئەم خوێنه سۆریش هەیه، كاڵیش هەیه، زەردیش هەیه، شێلووش هـەیه، بۆنیشی ناخۆشه.

وَالنِّفاسُ: هُوَ الدَّمُ الْخارِجُ عَقِبَ الْوِلاَدَةِ، وَالاِسْتِحاضَةُ: هُوَ الدَّمُ الْخارِجُ فِي غَيْرِ أَيَّامِ الْحَيْضِ وَالنِّفاسِ، وَأَقَلُّ الْحَيْضِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَأَكْثَرُهُ خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْماً بِلَيَالِيهَا، وَغالِبُهُ سِتٌّ أَوْ سَبْعٌ، وَأَقَلُّ النِّفاسِ لَحْظَةٌ،

---

(**وَالنِّفاسُ**) پێناسەی نیفاس: (هُوَ الدَّمُ الْخارِجُ) خوێنێکە دێتە دەرەوە لە کونی ئەندامی منداڵبوونی ئافرەتەوە (عَقِبَ الْوِلاَدَةِ) لە پاش چۆڵبوونی منداڵدانە: بە دانانی ئەو بارەی تێیدایە، جا ئەو بارە منداڵێکی تەواو بێ، یان هەر پارچە خوێنێك بێ، لە کونەکەی بێتەدەرەوە، یان زگی هەڵبدرێ.

﴿**ئاگاداری**﴾: ئەم خوێنەش هەر خوێنی حەیزە بە هۆی ئاوسبوونی ئافرەت لە ناو منداڵدانەدا کۆ ئەبێتەوە، جاری وا هەیە: ئافرەتی ئاوس ئەم خوێنەی لێدێتە دەرەوەو هەر بە حەیز دائەنرێ ئەگەر مەرجەکانی لێبێنەجێ، بەڵام بە زۆری وا ڕوو ئەدا: کە بارەکەی لە ناو منداڵدانەدا نەما، خوێنەکە دێتە دەرەوە.

(**وَالاِسْتِحاضَةُ**) خوێنچرکە: (هُوَ الدَّمُ الْخارِجُ) خوێنێکی بەردەوامە لە بەر نەخۆشی لە کونی منداڵبوونی ئافرەتەوە دێتە دەرەوە (فِي غَيْرِأَيَّامِ الْحَيْضِ وَالنِّفاسِ) لەو ڕۆژانەی کاتی حەیزو نیفاس نین ﴿عَنْ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْش رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّما هَذِهِ رَكْضَةٌ مِنْ رَكَضاتِ الشَّيْطانِ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم خوێنچرکەیە بە هۆی لێدانێکی شەیتانە، کە دەمارێکی لە منداڵدانەدا پچڕاندوە. کەواتە: ئەم خوێنە بێدەستنوێژیەکی بچوکی بەردەوامەو نوێژو ڕۆژوو قەدەغەناکا.

(وَأَقَلُّ الْحَيْضِ) کەمترین مانەوەی ئافرەت لە خوێنی حەیزدا (يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ) شەوێك و ڕۆژێکە، واتە: بەردەوام تا بیست‌وچوار سەعات تەڕایەتی خوێن هەر هەبێ.

(وَأَكْثَرُهُ) زۆرترین مانەوەی ئافرەت لە حەیزدا (خَمْسَةَعَشَرَ يَوْماً بِلَيالِيها) پانزە شەو و پانزە ڕۆژە، بەڵام مەرج نیە بەردەوام خوێنەکەی بێ، چونکە ئافرەتی وا هەیە بە دوو ڕۆژ جارێك خوێن ئەبینێ، کەواتە: لە شەو و ڕۆژێك بەو لاوە هەرچەندی هەبێ، هەمووی بە حەیز دائەنرێ تا پانزە ڕۆژ، کەوابوو: لەو نێوانەدا ماوەو ئەندازەی دیارکراوی نیە.

(وَغالِبُهُ) بەڵام بە ئەغلەبی کە ئافرەتان لە حەیزدا بن (سِتٌّ أَوْ سَبْعٌ) یان شەش ڕۆژە، یان حەفتە، لەوەشدا مەرج نیە خوێنەکە بەردەوام بێ، پێغەمبەر ﷺ بەو ئافرەتەی فەرموو: ﴿فَتَحَيَّضِي سِتَّةَ أَيَّامٍ أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ ثُمَّ اغْتَسِلِي﴾ رواه اصحاب السنن، لە حەیزدا بمێنەوە: یان شەش، یان حەفت ڕۆژ، ئینجا خۆت بشۆرە.

(وَأَقَلُّ النِّفاسِ) کەمترین ماوەی هاتنی خوێن لە دوای باردانانی ئافرەت (لَحْظَةٌ) چاو چوقانێکە، واتە: ماوەیەکی کەمە، جاری وا هەیە منداڵیشی ئەبێ‌و هیچ خوێن نابینێ، کەوابوو: واجبە یەکسەر خۆی بشواو نوێژ بکا.

وَأَكْثَرُهُ سِتُّونَ يَوْماً، وَغالِبُهُ أَرْبَعُونَ، وَأَقَلُّ الطُّهْرِ بَيْنَ الْحَيْضَتَيْنِ خَمْسَةَعَشَرَ يَوْماً، وَلاَ حَدَّ لأَكْثَرِه،

---

(وَأَكْثَرُهُ) زۆرترین ماوەی هاتنی ئەو خوێنە (سِتُّونَ يَوْماً) شەست ڕۆژە (وَغالِبُهُ) بە ئەغلەبی ماوەی هاتنی ئەو خوێنە (أَرْبَعُونَ يوماً) چل ڕۆژە ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: وَقَّتَ النَّبيُّ ﷺ لِلنُّفَساءِ أَرْبَعِينَ يَوماً إِلاَّ أَنْ تَرَىالطُّهْرَ قَبْلَ ذَلِكَ﴾ رواه ابن ماجه، پێغەمبەر ﷺ ماوەی دانیشتنی ئافرەتی منداڵ لێبووی دیاری کرد بە چل ڕۆژ، مەگەر پێش چل ڕۆژ خوێنی ببڕێ، ئەوە پاك ئەبێتەوە.

کەوا بوو: نیفاس ماوەو ئەندازەی –لە دەمێك تا شەست ڕۆژ– دیاری نەکراوە، چونکە ئافرەتی وا هەیە بە هەفتەیەك پاك ئەبێتەوەو، ئەبی خۆی بشۆرێو نوێژ بکا.

(وَأَقَلُّ الطُّهْرِ) کەمترینی ئەو ماوەیەی کە ئافرەت پاك ببێتەوە (بَيْنَ الْحَيْضَتَيْنِ) لە نێوان دوو حەیزدا (خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْماً) پانزە ڕۆژە، واتە: بە لای کەمی ئەبی پانزە ڕۆژ پاك بێ، ئینجا حەیزێکیتر ببینێ (وَلاَ حَدَّ لأَكْثَرِه) وە هیچ سنورێك دانەندراوە بۆ زۆرترین ماوەی پاکبوونەوە، چونکە ئافرەتی وا هەیە تەنها یەك جار حەیز ئەبینێ.

هەروەها بزانە: تەمەنی ئافرەتو ژیانی ئافرەتو خۆشحاڵیو غەمناکی ئافرەت، هەریەك لەوانە کار ئەکاتە سەر پێشکەوتنو دواکەوتنی حەیز.

## ﴿ باسی خوێنچرکەی نەخۆشی ﴾

گوتمان: خوێنی حەیز لە پانزە شەو و ڕۆژ تێناپەڕێ. جا ئەگەر ئافرەتێك لە پانزە ڕۆژ زیاتر خوێنی هات، ئەوە بەم جۆرە ڕەفتارئەکا:

یەکەم: ئەگەر لە پێشان حەیزو خاوێنیی بینیبو و خوێنەکەی ئێستاشی بە یەك شێوە ئەهات، ئەوە هەر لە سەر عادەتی پێشووی ئەڕواو بە ئەندازەی حەیزەکەی پێشووی بۆی بە حەیز دائەندرێو ئەوەیتر هەمووی خاوێنییە، پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتێکی وەهای فەرموو: ﴿أُمْكُثِي قَدْرَماكانَتْ تَحْبِسُكِ حَيْضَتُكِ ثُمَّ اغْتَسِلِي وَتَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ﴾رواه الشيخان، لە حەیزدا بمێنەوە بەو ئەندازەیەی لە پێشان ئەمایەوە، ئینجا غوسل بکەو دەستنوێژ بشۆرەوە بۆ هەموو نوێژێك.

دووەم: هەر ئافرەتێك بە دوو جۆر، یان زیاتر ئەو خوێنەی ئەبینی، وەك ڕەشو سوور، یان سوورو کاڵ، ئەوە بەهێزەکە بە حەیز دائەندرێو بێهێزەکەش بە خاوێنی، بە مەرجێ: بێهێزەکە لە پانزە ڕۆژ کەمتر نەبێو بەهێزەکەش لە پانزە ڕۆژ زۆرتر نەبێ، پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتێکی لەم بابەتەی فەرموو: ﴿إِنَّ دَمَ الْحَيْضِ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرِفُ، فَإِذا كانَ ذَلِكَ فَأَمْسِكِي عَنِ الصَّلاَةِ وَإِذا كانَ الآخَرُ فَتَوَضَّئِي وَصَلِّي﴾ رواه النسائي، خوێنی حەیز ڕەنگی ڕەشەو بۆنی هەیە، جا ئەگەر ئەمەت بینی نوێژ مەکە، ئەگەر لەمەیان بێهێزترت

بینی لە دوای غوسڵ کردن ئەبی بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بشۆری‌و نوێژ بكەی.
جا ئەگەر ئەو مەرجەی گوتمان نەهاتە جێ، ئەوە ئەبی وەك بەشی یەكەم ڕەفتار بكا.
سێیەم: ئەگەر ئافرەتەكە یەكەمجاری بوو حەیزی ئەبینی: ئەوە ئەگەر ڕەنگی خوێنەكانی لێك جیا ئەكردەوە، ئەوەش وەك بەشی دووەم ڕەفتار ئەكا، ئەگەر نا: ئەوە شەو و ڕۆژێكی بۆ بە حەیز دائەندرێ‌و بیست‌و نۆ ڕۆژی بۆ بە خاوێنی دائەندرێن.
﴿ئاگاداری﴾: لەو ماوەیەی بۆی بە حەیز داندراوە، وەك ئافرەتی خاوەن حەیز ڕەفتار ئەكا، بەڵام لەو ماوەیەی بە خاوێنی داندراوە، ئەبی نوێژ بكاو ڕۆژوو بگرێ‌و، واجبە بۆ هەموو نوێژێك تارەت بكاو پارچە پەمۆیەك بخاتە سەر كونەكەی‌و بیبەستێ‌و دەستنوێژ بشواو نوێژ بكا، هەروەها قورئان خوێندن‌و جیماعكردنیشی دروستن، جا بزانە: جگە لەو سێیە، جۆری‌تریش هەنە لە كتێبە درێژەكاندا باسیان كراوە.
(وَأَقَلُّ زَمَنٍ) كەمترین تەمەن (تَحِيضُ فِيهِ الْمَرْأَةُ) كە بگونجێ ئافرەت بۆ یەكەم جار خوێنی حەیز ببینێ (تِسْعُ سِنِينَ) نۆ ساڵی ئیسلامی‌یە، كە هەر ساڵێك (٣٥٤) سێ‌سەدو پەنجاو چوار ڕۆژە، كەواتە: ئەگەر كیژۆڵەیەك لە تەمەنی نۆ ساڵی‌و بەو لاوەتر خوێنی بینی، ئەوە حەیزەو كیژەكە عەزەب ئەبێ.
هەروەها كوڕیش لە نۆ ساڵی‌و بەو لاوە ئەگونجێ (مَنی)ی بێتە دەرەوەو بلوغی ببێ، جا ئەگەر كیژ خوێنی نەبینی‌و كوڕ (مَنی)ی نەهات، ئەوە هەردووكیان كە تەمەنی پانزە ساڵییان–بە ساڵی ئیسلامی– تەواو كرد، بلوغیان ئەبێ، واتە: لە قۆناغی منداڵی ئەگەنە قۆناغی گەورەیی ﴿عَنْ ابن عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قالَ: عَرَضَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ وَأَنا ابْنُ أَرْبَعَ عَشَرَةَ فَلَمْ يُجِزْنِي، وَعَرَضَنِي يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنا إبْنُ خَمْسَ عَشَرَةَ فَأَجَازَنِي﴾ رواه الشيخان، (ابن عمر) فەرمووی: لە جەنگی (ئوحود) پێغەمبەر ﷺ ڕێگای نەدا بچم بۆ جەنگ چونكە چواردە ساڵان بوم، بەڵام لە جەنگی (خەندەق) ڕێگای دام چونكە پانزە ساڵان بوم‌و گەورە بوبوم.
(وَأَقَلُّ الْحَمْلِ) كەمترین ماوەی مانەوەی كۆرپە لە ناو زگی دایكی‌دا (سِتَّةُ أَشْهُرٍ) شەش مانگە، چونكە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلاثُونَ شَهْرًا﴾ ماوەی مانەوەی كۆرپە لە ناو زگ تا لە شیرخواردن ئەكرێتەوە، سی‌مانگە. لە ئایەتێكی‌تریشدا ئەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾ دایكان دوو ساڵی تەواو منداڵەكانیان شیر ئەدەن.
واتە: ئەم دوو ساڵەی شیردان لەو سی مانگە دەركە، ئەمێنێتەوە شەش مانگ. كەوابوو: ئەگەر ئافرەت بەشەش مانگ منداڵی بوو، نابێ گومانی لێبكەن.

وَأَكْثَرُهُ أَرْبَعُ سِنِينَ، وَغَالِبُهُ تِسْعَةُ أَشْهُرٍ، وَيَحْرُمُ بِالْحَيْضِ وَالنِّفَاسِ ثَمَانِيَةُ أَشْيَاءَ: اَلصَّلاَةُ، وَالصَّوْمُ، وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ، وَمَسُّ الْمُصْحَفِ وَحَمْلُهُ، وَدُخُولُ الْمَسْجِدِ، وَالطَّوَافُ،

---

(وَأَكْثَرُهُ) زۆرترین ماوەی مانەوەی منداڵ لە ناو زگدا (أَرْبَعُ سِنِينَ) چوار ساڵە (وَغَالِبُهُ) بە ئەغلەبی کە منداڵ لە ناو زگدا بمێنێتەوە (تِسْعَةُ أَشْهُرٍ) نۆ مانگە.

### ﴿ ئەو شتانەی بە لەش پیسی حەرامن ﴾

(وَيَحْرُمُ) حەرامە لە سەر ئافرەت (بِالْحَيْضِ وَالنِّفَاسِ) بە هۆی حەیزو نیفاس، واتە: تا خوێنەکەی کۆتایی دێو ئینجا خۆی ئەشۆرێ (ثَمَانِيَةُ أَشْيَاءَ) هەشت شتی لێ حەرامن:

یەکەم: (الصَّلاَةُ) نوێژکردن حەرامە، نابێ قەزاشی بکاتەوە.

دووەم: (وَالصَّوْمُ) ڕۆژوو گرتن حەرامە، بەڵام واجبە قەزای بکاتەوە. ﴿سُئِلَتْ عائشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنها: ما بالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ؟ قَالَتْ: كانَ يُصِيبُنا ذَلِكَ فَنُؤْمَرُ بِقَضاءِ الصَّوْمِ وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضاءِ الصَّلاَةِ﴾ رواه الشيخان، حەزرەتی(عائشَة) خوای لێ ڕازی بێ، فەرمووی: ئێمە ئەو حەیزەمان تووش ئەبو، پێغەمبەرﷺ فەرمانی ئەدا: ڕۆژوو قەزا بکەینەوەو فەرمانی نەئەدا نوێژ قەزا بکەینەوە. واتە: چونکە نوێژ زۆر دووبارە دەبێتەوە، قەزاکردنەوەی بارگرانییە، بەڵام ڕۆژوو ساڵێ یەك جارە.

سێیەم: (وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ) خوێندنی قورئان حەرامە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: عَنِ النَّبِيِّﷺ: لاَ يَقْرَأُ الْجُنُبُ وَلاَ الْحَائِضُ شَيْئاً مِنَ الْقُرْآنِ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نابێ جەنابەتدارو حەیزدار هیچ شتێکی قورئان بخوێنن.

﴿ئاگاداری﴾: لە لای ئیمامی(الكرخي)و ئیمامی(الطحاوي) دروستە: حەیزدار دەرسی قورئان بە قوتابیان بڵێ، بەو مەرجەی ووشەکان جیاجیا فێری قوتابی بکا، واتە: ووشەیەك بڵێ، ئینجا قوتابی بە دوایدا بڵێتەوە.

چوارەم: (وَمَسُّ الْمُصْحَفِ) دەست لێدانی قورئانو (وَحَمْلُهُ) هەروەها هەڵگرتنیشی حەرامە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لاَيَمَسُّهُ إِلاَّالْمُطَهَّرُونَ﴾ نابێ دەست لە قورئان بدەن تەنها بە دەستنوێژەکان نەبێ.

پێنجەم: (وَدُخُولُ الْمَسْجِدِ) چوونە ناو مزگەوت حەرامە﴿عَنْ عائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: عَنِ النَّبِيِّﷺ: إِنِّي لاَ أُحِلُّ الْمَسْجِدَ لِحائِضٍ وَلاَ جُنُبٍ﴾ صححه ابن خزيمه، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چوونە ناو مزگەوت حەڵاڵ ناکەم: نە بۆ لەش بە جەنابەت، نە بۆ ئافرەتی بە حەیز.

شەشەم: (وَالطَّوَافُ) تەواف کردنی ماڵی خوا حەرامە ﴿عَنْ عائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: حِضْتُ، فَقالَ النَّبِيُّﷺ: إِفْعَلِي مايَفْعَلُ الْحَاجُّ غَيْرَ أَلاَّ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ﴾ رواه الشيخان، (عائشَة) فەرمووی: لە سەفەری (حەج) تووشی حەیز بوم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەموو کردەوەکانی حاجیان بکە، بەڵام تەوافی بەیت مەکە.

وَالْوَطْءُ، وَالاسْتِمْتاعُ بِما بَيْنَ السُّرَّةِ وَالرُّكْبَةِ. وَيَحْرُمُ عَلَى الْجُنُبِ خَمْسَةُ أَشْياءَ: اَلصَّلاةُ، وَقِراءَةُ الْقُرْآنِ، وَمَسُّ الْمُصْحَفِ وَحَمْلُهُ، وَالطَّوافُ، وَاللُّبْثُ فِي الْمَسْجِدِ. وَيَحْرُمُ عَلَى الْمُحْدِثِ ثَلاثَةُ أَشْياءَ: اَلصَّلاةُ،

---

حەفتەم: (وَالْوَطْءُ) جیماع کردن حەرامە ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ النِّكاحَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە کاتی حەیزدا هەموو رابواردنێك لەگەڵ ژنەکانتان بکەن جگە لە جیماع کردن.

هەشتەم: (وَالإِسْتِمْتاعُ) لەزەت وەرگرتن حەرامە (بِما بَيْنَ السُّرَّةِ وَالرُّكْبَةِ) بەو شوێنەی نێوان ناوك و ئەژنۆیە: بە ڕووتی، ئەوەك تووشی جیماع ببێ.

بەلام ئەگەر ڕووت نەبو دروستە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَتْ: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ فَيُباشِرُنِي وَأَنا حائِضٌ﴾ رواه الشيخان، (عائشة) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردم: پەشتە ماڵێکم لە نێوان ناوك و ئەژنۆم ئەبەست، ئینجا لەزەتی خۆی وەرئەگرت، منیش لەو کاتەدا لە حەیزدا بووم.

کەوابوو: جگە لە جیماع هەموو رابواردنێك حەلاڵە: وەك ماچ کردن و لەگەڵ نوستن و لەگەڵ خواردن...هتد.

﴿ئاگاداری﴾: لە پاش پاکبوونەوە لە خوێنی حەیز و نیفاس، ئەوشتانە هەر حەرامن تا غوسل ئەکا، بەلام ڕۆژووگرتن پێش غوسل کردن دروستە، هەروەها ئەگەر ئافرەت لە کاتی نوێژی عەسر، یان لە کاتی نوێژی عیشا پاك بۆوە: لە حەیز، یان لە نیفاس، ئەبێ نوێژی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، یان نوێژی مەغریب قەزا بکاتەوە.

(وَيَحْرُمُ عَلَى الْجُنُبِ) حەرامە لە سەر لەشپیس بە جەنابەت: جا پیاو بێ، یان ئافرەت (خَمْسَةُ أَشْياءَ) پێنج شتی لە سەر حەرامن تا خۆی ئەشۆرێ:

یەکەم: (اَلصَّلاةُ) نوێژکردن حەرامە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿لايَقْبَلُ اللهُ صَلاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ﴾ رواه مسلم، بە بێ لەشپاکی لە جەنابەت، خوا نوێژ قبوڵ ناکا.

دووەم: (وَقِراءَةُ الْقُرْآنِ) خوێندنی قورئان حەرامە. سێیەم: (وَمَسُّ الْمُصْحَفِ وَحَمْلُهُ) دەست لێدانی قورئان و هەڵگرتنی حەرامە.

چوارەم: (وَالطَّوافُ) تەواف کردنی ماڵی خوا. پێنجەم: (وَاللُّبْثُ فِي الْمَسْجِدِ) مانەوە لە ناو مزگەوت حەرامە. بەڵگەی ئەمانەش لە بەڵگەی حەیز وەربگرە.

(وَيَحْرُمُ عَلَى الْمُحْدِثِ) حەرامە لە سەر مرۆڤی بێدەستنوێژ (ثَلاثَةُ أَشْياءَ) سێ شت:

یەکەم: (اَلصَّلاةُ) نوێژکردن دروست نیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿لاتُقْبَلُ صَلاةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ﴾ رواه الشيخان، واتە: نوێژی بێدەستنوێژ خوا قبوڵی ناکا.

وَالطَّوافُ، وَمَسُّ الْمُصْحَفِ وَحَمْلُهُ.

دووەم: (وَالطَّوافُ) تەواف كردن دروست نیە ﴿عَنِ ابْنِ عباس رضي الله عنهما: اَلطَّوافُ بِمَنْزِلَةِ الصَّلاَةِ﴾ رواه الحاكم، تەواف وەك نوێژ وایە.

سێیەم: (وَمَسُّ الْمُصْحَفِ وَحَمْلُهُ) دەست لێدانی قورئان و هەڵگرتنی حەرامن، خوا ئەفەرموێ: ﴿لاَيَمَسُّهُ إِلاَّ الْمُطَهَّرُونَ﴾ نابێ دەست لە قورئان بدەن تەنها بە دەستنوێژەوە نەبێ. بەڵام خوێندنی قورئان بە بێدەستنوێژی دروستە.

هەروەها ئەگەر منداڵ بێدەستنوێژ بوو، نابێ قەدەغەی بكەین لە دەست لێدانی قورئان.

جا بزانە: تەختە ڕەشەی قوتابخانە -ئەگەر قورئانی لە سەر نوسرابو- وەك قورئان دەست لێدانی حەرامە.

﴿پاشكۆ﴾: دروستە بۆ ئافرەتی بە حەیزو مرۆڤی بە جەنابەت: زیكرو دوعا بكەن، هەرچەند ئەو زیكرو دوعایە لە ناو قورئانیشدا هەبێ، بەڵام نەك بە مەبەستی قورئان خوێندن، بۆ وێنە: كەسێك پێیان گوت: فلان مرد. ئەویش بڵێ: ﴿إِنَّا لِلَّـهِ وَإِنَّـا إِلَيْـهِ رَاجِعُونَ﴾. یان كە سواری وولاغ، یان ئۆتۆمبێل دەبێ، بڵێ: ﴿سُبْحانَ الَّذِى سَخَّرَ لَنَـا هَذَا وَمَاكُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾. یان گوتنی ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الـرَّحِيمِ﴾ لە كاتی خواردن و خواردنەوە...هتد.

هەروەها دروستە لە ناو یاتاغ و جانتای جلەكانیدا قورئان هەڵبگرێ بە جەنابەت و بە بێدەستنوێژی.

هەروەها سوننەتە لە بەر قورئان و زانای ئاینی هەڵبستێ ﴿وَصَحَّ: أَنَّهُ ﷺ قَامَ لِلتَّوْرَاةِ﴾ نقله في التحفة، حەدیسی سەحیح هەیە: كە پێغەمبەر ﷺ لە بەر تەورات هەڵساوە.

هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِـتُوا﴾ كاتێ قورئان ئەخوێندرێ بێدەنگ بن و گوێی لێرابگرن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿اقْرَأُوا الْقُرْآنَ مَاائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ فَإِذا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ﴾ رواه الشيخان، قورئان بخوێنن تا دڵتان لەگەڵی ئەگونجێ، ئینجا كە دڵتان ماندوو بوو، هەڵسن و مەیخوێنن، واتە: نەوەك تووشی هەڵە بین.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿عُرِضَتْ عَلَيَّ ذُنُوبُ أُمَّتِي فَلَمْ أَرَ ذَنْباً أَعْظَمَ مِـنْ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ أَوْ آيَةٍ أُوتِيهَا رَجُلٌ ثُـمَّ نَسِـيَهَا﴾ رواه الترمذي، واتە: گوناهەكانی ئوممەتی منیان هێنا بەرچاوم، لەو گوناهە گەورەترم نەدیت كە مرۆ سورەتێك، یان ئایەتێكی قورئانی لەبیر بچێتەوە. (خوایە لەبەر خاتری قورئان لە گوناهمان خۆش بە)، آمین.

* * *

## (كِتابُ الصَّلاَة)

اَلصَّلاَةُ الْمَفْرُوضَةُ خَمْسٌ: الظُّهْرُ، وَأَوَّلُ وَقْتِها: زَوالُ الشَّمْسِ، وَآخِرُهُ إِذَا صارَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ بَعْدَ ظِلِّ الزَّوالِ. وَالْعَصْرُ، وَأَوَّلُ وَقْتِها: اَلزِّيادَةُ عَلَى ظِلِّ الْمِثْلِ، وَآخِرُهُ فِي الإِخْتِيارِ إِلَى ظِلِّ الْمِثْلَيْنِ،

---

### ﴿ كِتابُ الصَّلاَة: ئەم پەرتووكە باسی نوێژ ئەكا ﴾

(اَلصَّلاَةُ الْمَفْرُوضَةُ) ئەو نوێژانەی خوای گەورە لە سەر موسوڵمانانی واجب كردون، كە فەرموویەتی: ﴿فَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾ نوێژ بكەن بەڕاستی نوێژ لە سەر خاوەن باوەڕان نوسراوەو كاتی بۆ دانراوە.

(خَمْسٌ) ئەو نوێژە واجبانە پێنجن لە شەو و ڕۆژێكدا ﴿عَنْ مالِكِ بنِ صَعْصَعَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَرَضَ اللهُ عَلَى أُمَّتِي لَيْلَةَ الإِسْرَاءِ خَمْسِينَ صَلاَةً فَلَمْ أَزَلْ أُرَاجِعُهُ وَأَسْأَلُهُ التَّخْفِيفَ حَتَّى جَعَلَها خَمْساً فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شەوی شەوڕۆیی و سەركەوتنم بۆ ئاسمانەكان، خوایگەورە واجبی كرد لە سەر ئۆممەتم: كە پەنجا نوێژ بكەن، بەڵام من هەر پاڕامەوەو داوای سوككردنم لێكرد، تا كردنیە پێنج نوێژ لە هەموو شەو و ڕۆژێكدا.

كەوابوو: نوێژ لە (مَكَّة)ی پیرۆز، لە (٢٧) بیستو حەفتی مانگی(رَجَب)، ساڵێكو نیو پێش كۆچكردن، واجب كراوەو ڕوكنی دووەمی ئیسلامە.

### ﴿ كاتو ناوی نوێژەكان ﴾

خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿فَسُبْحَانَ اللهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ، وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ﴾ خوای گەورە بە پاك بناسنو نوێژی بۆ بكەن: لە كاتی شەوداهاتن نوێژی مەغریبو عیشا بكەن، لە كاتی بەیانی نوێژ بكەن، لە كاتی ئێواران نوێژی عەسر بكەن، لە كاتی نیوەڕۆ نوێژ بكەن.

(اَلظُّهْرُ) نوێژی یەكەم لەو پێنجانە: نوێژی نیوەڕۆیە، ئەمە یەكەم نوێژ بوو كە حەزرەتی (جوبرائیل) فێری پێغەمبەری ﷺ كرد، لە ڕۆژی شەوڕۆیەكە، واتە: نوێژی بەیانیی ئەو ڕۆژە نەكرا (وَأَوَّلُ وَقْتِها) زووترین كاتی نوێژی نیوەڕۆ (زَوالُ الشَّمْسِ) لادانی ڕۆژە لە ناوەندی ئاسمان بەرەو ڕۆژئاوا (وَآخِرُهُ) كۆتایی كاتی نوێژی نیوەڕۆ (إِذَا صارَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ) هەر كاتێ سێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی ڕۆیی (بَعْدَ ظِلِّ الزَّوالِ) لە پاش ئەو سێبەرە كورتەی كاتی ڕۆژ لە ناوەندی ئاسمانە.

(وَالْعَصْرُ) دووەم: نوێژی عەسرە (وَأَوَّلُ وَقْتِها) زووترین كاتی نوێژی عەسر (اَلزِّيادَةُ عَلَى ظِلِّ الْمِثْلِ) ئەمەیە سێبەری هەموو شتێك تۆزێك لە خۆی زیاتر بێ (وَآخِرُهُ) كۆتایی كاتی عەسر (فِي الإِخْتِيارِ) بە كاتی هەڵبژاردە: كە خێری بكاتێ (إِلَى ظِلِّ الْمِثْلَيْنِ) تا سێبەری هەموو

وَفِي الْجَوَازِ إِلَىٰ غُرُوبِ الشَّمْسِ. وَالْمَغْرِبُ، وَوَقْتُها وَاحِدٌ: وَهُوَ غُرُوبُ الشَّمْسِ وَبِمِقْدارِ ما يُؤَذِّنُ وَيَتَوَضَّأُ وَيَسْتُرُالْعَوْرَةَ وَيُقِيمُ الصَّلاةَ وَيُصَلِّي خَمْسَ رَكَعاتٍ. وَالْعِشاءُ، وَأَوَّلُ وَقْتِها: إِذا غابَ الشَّفَقُ الْأَحْمَرُ، وَآخِرُهُ فِي الإِخْتِيارِ إِلَىٰ ثُلُثِ اللَّيْلِ، وَفِي الْجَوازِ إِلَىٰ طُلُوعِ الْفَجْرِالثَّانِي. وَالصُّبْحُ، وَأَوَّلُ وَقْتِها: طُلُوعُ الْفَجْرِالثَّانِي، وَآخِرُهُ فِيالإِخْتِيارِ إِلَىٰالإِسْفارِ، وَفِيالْجَوازِ إِلَىٰ طُلُوعِ الشَّمْسِ.

---

شتێك دوو هەندى خۆى ئەڕوا (وَفِي الْجَوَازِ) وە كۆتایی عەسر بە كاتی دروستبوون بەڵام وەك كاتی پێشتر خێری نەگاتێ (إِلَىٰ غُرُوبِ الشَّمْسِ) تا ڕۆژ ئاوا ئەبێ، هەر ئەمێنێ.

(وَالْمَغْرِبُ) سێیەم: نوێژی مەغریبە-نوێژی شێوان (وَوَقْتُها وَاحِدٌ) كاتی مەغریب یەك كاتە (وَهُوَ) ئەو كاتەش (غُرُوبُ الشَّمْسِ) بە ئاوابوونی ڕۆژ دەست پێ ئەكا (وَبِمِقْدارِ ما يُؤَذِّنُ) بەردەوام ئەبێ تا بانگ ئەداو (وَيَتَوَضَّأُ) دەستنوێژ ئەشواو (وَيَسْتُرُ الْعَوْرَةَ) عەورەتی خۆی دائە پۆشێ و (وَيُقِيمُ الصَّلاةَ) ئیقامەتی نوێژ ئەكاو (وَيُصَلِّي خَمْسَ رَكَعاتٍ) پێنج ڕەكعەت نوێژ ئەكا: سێ ی مەغریبو دووی سوننەت.

جا ئەوە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافعی)یە، بەڵام فەرموودەكەی كۆنی ئاشكراترە -چونكە حەدیسەكەی داهاتوو پاڵپشتیەتی- كە ئەفەرموێ: تا نوێژی عیشا ئەبێ، كاتی مەغریب هەر ئەمێنێ.

(وَالْعِشاءُ) چوارەم: نوێژی عیشایە-خەوتنان (وَأَوَّلُ وَقْتِها) زووترین كاتی ئەو نوێژە (إِذا غابَ الشَّفَقُ الْأَحْمَرُ) ئەو كاتەیە كە ڕۆناكی سوور لە لای ڕۆژئاوا، ئاوا ئەبێ (وَآخِرُهُ فِي الإِخْتِيارِ) كۆتایی كاتی عیشا بە كاتی هەڵبژاردە: كە خێری بگاتێ (إِلَىٰ ثُلُثِ اللَّيْلِ) تا سێیەكی شەو ئەڕوا (وَفِيالْجَوازِ) وە بە كاتی دروستبوونی نوێژ بەڵام وەك كاتی پێشتر خێری نەگاتێ (إِلَىٰ طُلُوعِ الْفَجْرِالثَّانِي) تا ڕۆناكیدووەمی بەیان دەرئەكەوێ هەر ئەمێنێ.

(وَالصُّبْحُ) پێنجەم: نوێژی سبەینەیە (وَأَوَّلُ وَقْتِها) زووترین كاتی نوێژی سبەینە (طُلُوعُ الْفَجْرِالثَّانِي) دەركەوتنی ڕۆناكیدووەمی بەیانە-كە پێی ئەگوترێ: ( الْفَجْرُالصَّادِقُ )-واتە: ڕۆناكیەكە بە پانی بڵاو ئەبێتەوە لە بناری ئاسمانی لای ڕۆژهەڵات، ئینجا بەرە بەرە زیاد ئەبێ، تا ڕۆژ دەر ئەكەوێ:

(وَآخِرُهُ فِيالإِخْتِيارِ) كۆتایی كاتی نوێژی سبەینە بە كاتی هەڵبژاردە: كە خێری بگاتێ (إِلَىٰ الإِسْفارِ) تا دونیا تەواو ڕۆناك ئەبێ (وَفِي الْجَوازِ) وە بە كاتی دروستبوونی نوێژ بەڵام وەك كاتی پێشتر خێری نەگاتێ (إِلَىٰ طُلُوعِ الشَّمْسِ) تا ڕۆژ لە بەرزاییەكان دەر ئەكەوێ -كە پێی ئەڵێن: (گەزنگ)- هەر ئەمێنێ. بەڵگەی پێنج كاتەكان ئەم حەدیسەیە:

﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَقْتُ الظُّهْرِ إِذا زَالَتِ الشَّمْسُ وَكانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ مالَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ، وَوَقْتُ الْعَصْرِ مالَمْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ، وَوَقْتُ صَلاةِ

(فَصْــلٌ) وَشَــرائطُ وُجُــوبِ الصَّــلاَةِ ثَلاَثَــةُ أَشْــياءَ: اَلإِسْــلاَمُ، وَالْبُلُــوغُ، وَالْعَقْلُ وَهُوَ حَدُّ التَّكْلِيفِ.

---

الْمَغْرِبِ مالَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ، وَوَقْتُ صَلاَةِ الْعِشاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الأَوْسَطِ، وَوَقْتُ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ اَلْفَجْرِ مالَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کاتی نیوەڕۆ کە ڕۆژ لایدا تا سێبەری پیاو هەندی خۆی ئەبێ، ئینجا عەسر ئەبێ تا ڕۆژ زەردەی ئەکەوێتێ، ئینجا مەغریب دێو ئەمێنێ تا ڕۆنایی سور ئاوا ئەبێ، ئینجا عیشا ئەبێ تا نیوە شەوییەکەم، وە بە دەرکەوتنی بەیان نوێژی سبەینەیە تا ڕۆژ دەرئەکەوێ.

جا بزانە: پێغەمبەرﷺئەفەرموێ: ﴿أَحَبُّ الأَعْمالِ اَلصَّــلاَةُ فِــي أَوَّلِ وَقْتِهَــا﴾ رواه الشيخان، خۆشەویستترین کردەوەی باش: نوێژکردنە لە زووترین کاتی خۆیدا.

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك یەك ڕەکعەتی نوێژەکەی لە کاتی خۆیدا بکا، هەموو نوێژەکەی دروستە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو کەسانەی نوێژیان لە سەر واجبە ﴾

(وَشَرائِطُ وُجُوبِ الصَّلاَةِ) مەرجەکانی واجببوونی نوێژ (ثَلاَثَــةُ أَشْياءَ) سێ مەرجن: یەکەم: (اَلإِسْلاَمُ) ئیسلامەتییە، چونکە نوێژ ڕوکنی دووەمی ئیسلامە، کەوابوو: کافر نوێژی لە سەر نیە، خوایگەورە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَــا قَدْ سَلَفَ﴾ بە کافرەکان بڵێ: ئەگەر واز بێنن‌و موسوڵمان بن لە ڕابردوویان ئەبوردرێ.

بەڵام ئەو کەسەی لە ئیسلامەتیەوە گەڕابێتەوە، واتە: کافر بوبێ، ئەبی هەموو نوێژو ڕۆژووەکانی قەزا بکاتەوە.

دووەم: (وَالْبُلُــوغُ) بلوغی بوبێ: بەو شێوەیەی باسمان کرد لە حەیزدا.

سێیەم: (وَالْعَقْلُ) عەقڵی هەبێ (وَهُوَ حَدُّ التَّكْلِيفِ) عەقڵ سنوری دلواکردنی خواپەرستییە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْــتَيْقِظَ وَعَــنِ الصَّــبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِــلَ﴾ رواه احمد والنسائي، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نوسینی تاوان لە سەر سێ کەسان هەڵگیراوە: لە سەر نوستوو تا هەشیار ئەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا بلوغی ئەبێ، لە سەر شێت تا چاك ئەبێتەوە.

کەوابوو: قەزاکردنەوەی نوێژ واجب نیە: لە سەر منداڵو شێتو بێهۆشو ئافرەتی خاوەن حەیزو نیفاس.

بەڵام مرۆڤی نووستوو-کە نوێژی نەکردبێ- تەنها تاوانی لە سەر نانووسرێو ئەبی نوێژەکەی قەزا بکاتەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذَا رَقَدَ أَحَــدُكُمْ عَــنِ الصَّلاَةِ أَوْ غَفَلَ عَنْها فَلْيُصَلِّهَا إِذاذَكَرَهَا﴾ رواه مسلم، کاتێ یەکێکتان نوستبو، یان لەبیری چوو نوێژ بکا، با ئەو نوێژە بکا کاتێ هەشیار ئەبێتەوەو دێتەوە بیری.

هەروەها ئەو کەسەی نوێژنەکەر بووە، یان چەند نوێژێکی نەکردبوون، یان نوێژی کردبون، بەڵام نوێژەکانی دروست نەبوبن، واجبە: نوێژەکانیان قەزا بکەنەوە ﴿عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: أَنَّهُ شُغِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ صَلاَةِ الْعَصْرِ يَوْمَ الأَحْزَابِ، ثُمَّ صَلاَّهَا بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی (خەندەق) نوێژی عەسری لەدەست چوو–لە کاتی خۆیدا پێی نەکرا–ئینجا لە نێوان (مَغْرِب)و (عِشاء)دا نوێژەکەی عەسری کرد.

## ﴿ باسی پەروەردەکردنی منداڵ ﴾

بزانە: بۆ ڕاهێنانی منداڵان، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مُرُوا الصَّبِيَّ بِالصَّلاَةِ إِذَا بَلَغَ سَبْعَ سِنِينَ، وَإِذَا بَلَغَ عَشْرَ سِنِينَ فَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ﴾ رواه الترمذي وابوداود، کاتێ منداڵەکانتان تەمەنیان بووە حەفت ساڵان فەرمانیان پێبکەن بۆ نوێژکردن، وە لە تەمەنی دە ساڵی لە سەر نوێژنەکردن لێیان بدەنو جێگەی خەوتنیان لێك جیا بکەنەوە، نەوەك ڕەوشتیان تێك بچێ.

هەروەها ئەبی دایكو باوك لە حەفت ساڵیەوە منداڵەکانیان فێری ڕەوشتی ئیسلامەتی بکەن، فێری ووشەی شادەو ئیمانیان بکەن، فێری ڕوکنی ئیمانو ئیسلامیان بکەن، فێری ناسینی خواو پێغەمبەریان بکەن: کە یەك خودا هەیە ناوی (الله)یە، هەموو بوونەوەرێك ئەو دروستی کردوە.

هەم پێغەمبەر ﷺ ناوی (محمد)ە ﷺ، لە (مکة)ی پیرۆز لە دایك بووە، لە (مدینـة)ی پیرۆز وەفاتی کردوە، لە تەمەنی چل ساڵیدا بووەتە پێغەمبەر، لە شەستوسێ ساڵیدا وەفاتی کردوە، لە دوای وی هیچ پێغەمبەرێك نیە، وەئایینی ئێمە ناوی ئیسلامە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ ئەی خاوەن باوەڕان خۆتانو خزمو کەستان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن.

## ﴿ باسی نوێژەکانی سوننەت ﴾

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: يَقُولُ اللهُ تَعَالَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أُنْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ قَالَ: أَتِمُّوا لِعَبْدِي فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ﴾ رواه أبوداود، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەت کە بەندە لە بەردەستی خوا ئەوەستێو نوێژەکانی ناتەواوە، خوای گەورە بە فریشتەکان ئەفەرموێ: تەماشا بکەن ئایا بەندەی من نوێژی سوننەتی هەنە؟ جا ئەگەر سوننەتی هەبون، ئەفەرموێ: ناتەواوی نوێژە واجبەکانی–کە نەیزانیوە– لەو سوننەتانە بۆی تەواو بکەن. ئینجا بزانە: خێری هەر واجبێك بە قەد حەفتا سوننەتە.

وَالصَّـــلَواتُ الْمَسْـــنُوناتُ خَمْـــسٌ: اَلْعِيـــدانِ، وَالْكُسُـــوفانِ، وَالإسْتِسْـــقاءُ. وَالسُّنَنُ التَّابِعَةُ لِلْفَرائِضِ سَبْعَ عَشَرَةَ رَكْعَةً: رَكْعَتَا الْفَجْرِ، وَأَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَـــانِ بَعْدَهَا، وَأَرْبَعٌ قَبْلَ الْعَصْرِ، وَرَكْعَتانِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ،

---

(وَالصَّلَواتُ الْمَسْنُوناتُ) ئەو نوێژانەی سوننەتن‌و بە جەماعەتیش ئەکرێن (خَمْسٌ) پێنجن: (اَلْعِيدانِ) نوێـژی جـەژنی ڕەمـەزان‌و قوربـان (وَالْكُسُـوفانِ) نوێـژی ڕۆژگـیران‌و مـانگگیران (وَالإسْتِسْقاءُ) نوێژی داواکردنی باران.

(وَالسُّنَنُ) ئـەو سـوننەتانەی بـە جەماعـەت نـاکرێن‌و (التَّابِعَةُ لِلْفَرائِضِ) بەسـتراونەتەوە بە نوێژە واجبەکان (سَبْعَ عَشَرَةَ رَكْعَةً) حەڤدە ڕەکعەتن:

(رَكْعَتا الْفَجْرِ) دوو ڕەکعەتی پێش نوێژی بەیانی: نیـەتی سـوننەتی پـێش نوێـژی بـەیانی لێدێنێ، لە دوای فاتیحە لە ڕەکعەتی‌یەکەم (قُلْ يَاأَيُّهَا الْكَـافِرُونَ)و لـە ڕەکعـەتی‌دووەم (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) ئەخوێنێ ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: رَكْعَتا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيا وَمَا فِيهَا﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو ڕەکعەتی پـێش نوێـژی بـەیانی لە هەموو دونیاو لەوەی لە دونیادایە باشترە.

(وَأَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهْرِ) چوار ڕەکعەت پێشی نوێژی نیوەڕۆ (وَرَكْعَتانِ بَعْدَها) دوو ڕەکعـەت لـە دوای نوێژی نیوەڕۆ ﴿عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ حافَظَ عَلَى أَرْبَعٍ قَبْـلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَها حَرَّمَهُ اللهُ تَعَـالَى عَلَى النَّـارِ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك بەردەوام چوار ڕەکعەت پێش نوێژی نیوەڕۆو چوار ڕەکعەت دوای نوێژی نیـوەڕۆ بکـا، خـوای گـەورە لـە ئـاگری دۆزەخ قەدەغـەی ئـەکا. کـەوابوو: نیـەتی سوننەتی پێش نیوەڕۆو، سوننەتی دوای نیوەڕۆی لێبێنێ.

﴿ئاگاداری﴾: پێش جومعە دوو ڕەکعەت، یان چوار ڕەکعەت سوننەتن، هەروەها لە دوای جومعەش چوار ڕەکعەت سوننەتن.

(وَأَرْبَـعٌ قَبْـلَ الْعَصْـرِ) چـوار ڕەکعـەت پـێش نوێـژی عەسـر سـوننەتن، نیـەتی سـوننەتی پێش عەسری لێدێنێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُما: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: رَحِمَ اللهُ امْرَءً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا ڕەحم بەو کەسە بکا: کە پێش نوێژی عەسر چوار ڕەکعەت سوننەت ئەکا.

جا بزانە: دوو ڕەکعەتیش پێش نوێژی عەسر هەر سـوننەتن ﴿عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ يُصَلِّي قَبْلَ الْعَصْـرِ رَكْعَتَـيْنِ﴾ رواه أبـوداود، پێغەمبـەر ﷺ پـێش نوێـژی عەسـر دوو ڕەکعەتی ئەکردن.

(وَرَكْعَتـانِ بَعْـدَ الْمَغْـرِبِ) دوو ڕەکعـەت لـە دوای نوێـژی مـەغریب سـوننەتن بـە نیـەتی سوننەتی پاش مەغریب.

وَثَلاثٌ بَعْدَ الْعشاء يُوتِرُ بِواحدَة منْهُنَّ. وَثَلاثُ نَوافِلَ مُؤَكَّدات: صَلاةُ اللَّيْلِ،

---

(وَثَلاثٌ بَعْدَ العِشاءِ) سێ رِەكعەت پاش نوێژی عیشا سوننەتن (يُوتِرُ بِواحِدَةٍ مِنْهُنَّ) یەکێکیان لەو سێیانە بە تاك ئەكا (هەر وەك باسی ئەكەین)، دووەكانی‌تریش –كە لە پێش (وتْر) ئەكرێن– نیەتی سوننەتی پاش عیشای لێدێنێ، ئینجا لەو حەقدەیە دەیان پێغەمبەرﷺ بەردەوام كردونی‌و پێیان ئەگوترێ: (مؤكَّدة):

﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِﷺ عَشْرَ رَكَعات: رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَها، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشاءِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ﴾ رواه‌الشيخان، (ابن عمر) خوا لێیان رازی بێ، فەرمووی: دە رِەكعەتی سوننەتم لە پێغەمبەرﷺ وەرگرتون كە بەردەوام ئەیكردن: دوو رِەكعەت پێش نیوەرِۆ و دوو رِەكعەت پاش نیوەرِۆ، دوو رِەكعەت پاش مەغریب لە ماڵەوە، دوو رِەكعەت پاش عیشا لە ماڵەوە، دوو رِەكعەت پێش نوێژی بەیانی.

### ﴿ باسی نوێژی وەتر ﴾

(وَتْر): نوێژێكە لە شەوێدا بە تاك ئەكرێ، لای كەمی یەك رِەكعەتەو لای زۆری یانزە رِەكعەتە، بەڵام وەتری تەواو بە لای كەمی سێ رِەكعەتە: نیەتی نوێژی وەتری لێدێنێ، لە رِەكعەتی یەكەم پاش فاتیحە سورِەتی (سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ) بخوێنێ‌و لە رِەكعەتی دووەم پاش فاتیحە سورِەتی (قُلْ يَاأَيُّهَا الْكَافِرُونَ)، ئینجا سوننەتە پاش تەحیات سەلام بداتەوە، رِەكعەتی سێیەم بە تاك بكاو سورِەتی (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ)و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ)و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) لە پاش فاتیحە بخوێنێ‌و لە پاش تەحیات سەلام بداتەوە.

﴿عَنْ خارِجَةَ؇: قالَ النَّبِيُّﷺ: إِنَّ اللهَ أَمَدَّكُمْ بِصَلاَةٍ هِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ وَهِيَ الْوَتْرُ فِيما بَيْنَ الْعِشاءِ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ﴾ رواه الحاكم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوای گەورە نوێژێكی‌تری داوەتە ئێوە لە ووشتری سوور خێری زۆرترە، ناوی وەترە، كاتەكەی لە نێوان كردنی نوێژی عیشایە تا دەركەوتنی بەیان.

جا بزانە: وەتر بە تەنهایی ئەكرێ، تەنها لە (رِەمەزان)دا سوننەتە بە جەماعەت بكرێ.

﴿پاشكۆ﴾: بزانە: لە پێش نوێژی (مَغْرِب)و پێش نوێژی (عِشاء) دوو رِەكعەت سوننەتن ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ مُغَفَّلٍ؇: قالَ النَّبِيُّﷺ: بَيْنَ كُلِّ أَذانَيْنِ صَلاةٌ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە نێوان گشت بانگو ئیقامەتێكدا نوێژێكی سوننەت هەیە.

### ﴿ باسی شەونوێژ ﴾

(وَثَلاثُ نَوافِلَ) سێ سوننەتی‌تر (مُؤَكَّداتٌ) زۆر خێرن‌و پێغەمبەرﷺ بەردەوام كردونی: یەكەم: (صَلاَةُ اللَّيْلِ) نوێژی شەوێ بە نیەتی شەونوێژ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

﴿أَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْلِ﴾ رواەمسلم، لە هەموو نوێژێك گەورەتر لە دوای نوێژی واجب نوێژی شەوە.

جا ئەگەر ئەو نوێژە لە پێش نوستن بکرێ پێی ئەگوترێ: (شەونوێژ)، وە ئەگەر لە دوای نوستن بکرێ پێی ئەگوترێ: (تَهَجُّد)، جا ئەمەیان لە هەموویان خێرترە، ئینجا لای کەمی شەونوێژ دوو ڕەکعەتە، لای زۆریی دیاری نەکراوە.

جا بزانە: سوننەتە بۆ ئەو کەسەی شەونوێژ ئەکا: نوێژی (وِتْر) بخاتە دوای هەموو نوێژەکان، چونکە پێغەمبەرﷺ وای فەرمووە، هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ خَافَ أَلاَّ يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ فَإِنَّ صَلاَةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ وَذَلِكَ أَفْضَلُ﴾ رواه مسلم، ئەگەر یەکێك ترسا لە کۆتایی شەو لە خەو هەڵنەستێ، با پێش نوستن نوێژی (وِتْر) بکا، وە ئەگەر بە تەمابو هەڵبستێ، با لە کۆتایی شەو هەڵبستێ و نوێژی (وِتْر) بکا، چونکە بۆی ئەبێتە (وِتْر)و (تَهَجُّد)، ئەو شێوەیە خێرترە.

## ﴿ باسی چێشتەنوێژ ﴾

دووەم: (وَصَلاَةُ الضُّحَى) نوێژی چێشتەنگاوە: لای کەمی دوو ڕەکعەتە، لای زۆریی هەشت ڕەکعەتە، کە ڕۆژ بە قەد ڕمێك بەرز بۆوە تا نیوەڕۆ ماوەی هەیە، بەڵام بە لای کەمی تۆ چوار ڕەکعەت هەر بکە ﴿عَنْ نُعَيْمِ بنِ هَمَّارٍ﷛: عَنِ النَّبِيِّﷺ: قَالَ اللهُ تَعالَى: يَاابْنَ آدَمَ لاَ تُعْجِزْنِي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعاتٍ فِي أَوَّلِ نَهَارِكَ أَكْفِكَ آخِرَهُ﴾ رواه احمد والترمذي، خوای گەورە لە حەدیسێکی قودسیدا فەرموویەتی: ئەی ئادەمیزاد لە بیرم مەکە چوار ڕەکعەت نوێژم بۆ بکە لە سەرەتای ڕۆژەکەت، منیش ئەتپارێزم تا کۆتایی ڕۆژەکەت. جا ئەمەشیان نیەتی چێشتەنوێژی لێدێنێ.

## ﴿ باسی نوێژی تەراویح ﴾

سێیەم: (وَصَلاَةُ التَّراوِيحِ) نوێژی تەراویحە، لە شەوانی مانگی ڕەمەزاندا لە دوای نوێژی عیشا تا دەرکەوتنی بەیان ماوەی هەیە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ﷛: قَالَ النَّبِيُّﷺ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيماناً وَاحْتِساباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك لە شەوانی ڕەمەزاندا خواپەرستی بکا، خوا لەگوناهی ڕابردووی خۆش ئەبێ.

ئینجا بزانە: ژمارەی تەراویح لە هەر چوار مەزهەبەکاندا: بیست ڕەکعەتە ﴿عَنْ يَزِيدَ بنِ رُومانَ﷛: كَانَ النَّاسُ فِي زَمَنِ عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ﷛ يَقُومُونَ فِي رَمَضَانَ بِثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ رَكْعَةً﴾ رواه الامام مالك، لە سەردەمی ئیمامی(عمر)دا-خوا لێی ڕازی بێ- موسوڵمانان بیست و سێ

ڕەکعەتیان نوێژ ئەکردن لە شەوانی ڕەمەزاندا–واتە: سێیان (وتر) بون– (سەحابە)ی پێغەمبەریش ﷺ –خوا لێیان ڕازی بێ– هەموویان بەم دانانەی ئیمامی(عومەر) ڕازی بون.

بەلام هەشت ڕەکعەتیش تەراویح دروستەو حەدیسەکەی بەهێزە ﴿عن جابر ﷺ: صَلَّى بِنا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي رَمَضانَ ثَمانَ رَكَعات ثُمَّ أَوْتَرَ﴾ رواه ابنا خزيمة وحبان في صحيحيهما، (جابر) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لە شەوانی ڕەمەزاندا هەشت ڕەکعەت سوننەتی پێ کردین، ئینجا نوێژی وەتری کرد. هەروەها گێڕانەوەی (بخاری)و (مسلم) لە (عائشة) لەو حەدیسە نزیکە.

دیسان بزانە: واجبە لە هەموو دوو ڕەکعەتێك سەلام بدرێتەوە، با نیەتی تەراویحی لێبێنێ، سوننەتە: تەراویح بە جەماعەت بکرێن.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ئەو سوننەتانەی باسمان کردن کاتیان بە سەر چوو و نەکران، سوننەتە قەزا بکرێنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ نامَ عَنِ الْوَتْرِ أَوْ نَسِيَهُ فَلْيُصَلِّ إِذا ذَكَرَ وَإِذا اسْتَيْقَظَ﴾ رواه الترمذي، هەرکەسێك نوستو وەتری نەکرد، یان لەبیری چوو، با بیکا کاتێ هاتەوە بیری‌و بە خەبەر هات.

هەروەها دروستە: سوننەتە پێش نوێژیەکان بخرێنە دوای نوێژەکە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذا فَاتَتْهُ الأَرْبَعُ قَبْلَ الظُّهْرِ صَلاَّهُنَّ بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ﴾ رواه الترمذي، کاتێ پێغەمبەر ﷺ فریا نەکەوتبا چوار ڕەکعەتەکەی پێش نیوەڕۆ بکا، لە دوای ئەو دوو ڕەکعەتە سوننەتەی دوای نیوەڕۆ ئەیکردن.

﴿پاشکۆ﴾: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿صَلاَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهارِ مَثْنَى مَثْنَى﴾ رواه‌ابوداود، سوننەتەکانی شەوی‌و ڕۆژی دوو ڕەکعەت دوو ڕەکعەت ئەکرێن. واتە: لە دوای دوو ڕەکعەت تەحیات ئەخوێنێ‌و سەلام ئەداتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەکانی دروستبوونی نوێژ ﴾

(وَشَرائِطُ الصَّلاَةِ) ئەو مەرجانەی داندراون بۆ دروستبوونی نوێژ (قَبْلَ الدُّخُولِ فِيها) پێش دەست پێکردنی نوێژ تا کۆتای نوێژ (خَمْسَةٌ) پێنج مەرجن:

یەکەم: (طَهارَةُ الأَعْضاءِ) پاکی هەموو ئەندامەکانە (مِنَ الْحَدَثِ) لە بێدەستنوێژی‌ی گەورەو بچوك ﴿عن ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ يَقْبَلُ اللهُ صَلاَةً بِغَيْرِ طُهُورٍ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە بێ لەش پاکی لە بێدەستنوێژی‌ی گەورەو بچوك، خوای گەورە هیچ نوێژێك وەرناگرێ.

جا ئەگەر کەسێك بە بێدەستنوێژی‌ی گەورە، یان بچوك نوێژی کرد، ئەبێ دووبارەی بکاتەوە، هەروەها ئەگەر لە ناو نوێژدا بێدەستنوێژ بو، هەر ئەبێ دووبارەی

وَالنَّجَسِ، وَسَتْرُ الْعَوْرَةَ بلباسٍ طاهرٍ، وَالْوُقُوفُ عَلَى مَكَانٍ طاهرٍ،

بکاتەوە ﴿عن عَلِيِّ بن طَلْقٍ ﷺ: قالَ النَّبيُّ ﷺ: إذافَسَا أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاَةِ فَلْيَنْصَرِفْ وَلْيَتَوضَّأْ وَلْيُعِدِ الصَّلاَةَ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ یەکێك لە ئێوە لە ناو نوێژدا بایەکی لێدەرچوو، با واز لە نوێژەکەی بێنێ و دەستنوێژ بشۆریتەوەو نوێژەکەش دووبارە بکاتەوە.

(وَالنَّجَسِ) هەروەها ئەبی لەش و بەرگی پاك بێ لە هەموو پیسیەك، پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتێکی فەرموو: ﴿إذا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي﴾ رواه الشیخان، کاتێ خوێنی حەیز ڕووی تێکردی واز لە نوێژ بێنەو کاتێ کۆتایی حەیز هات ئەوخوێنەی پرژاوەتە لەش و بەرگت بیشۆرەو نوێژ بکە.

کەوابوو: ئەگەر لە ناو نوێژدا جلی، یان لەشی پیس بو، نوێژەکەی ئەبڕێ و ئەبی دووبارەی بکاتەوە، هەروەها ئەگەر لە پێش نوێژکردن پیسیەکی پێوە بوو، بەڵام نەیزانی و نوێژی کرد، هەر ئەبی دووبارەی بکاتەوە.

دووەم: (وَسَتْرُ الْعَوْرَةِ) عەورەتی داپۆشێ (بِلِباسٍ طاهِرٍ) بە پۆشاکێکی پاك، ڕەنگی پیستەی تێدا دیار نەبێ، جا بزانە: عەورەتی ئافرەت: جگە لە ڕووخسارو لەپەدەستی هەموو لەشی عەورەتە ﴿عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها: أَنَّها سَأَلَتِ النَّبيَّ ﷺ: أَتُصَلِّي الْمَرْأَةُ فِي دِرْعٍ وَخِمارٍ؟ قالَ: إذا كانَ الدِّرْعُ سابِغاً يُغَطِّي ظُهُورَ قَدَمَيْهَا﴾ رواه ابوداود وصححه الحاكم على شرط البخاري، ئایا دروستە ئافرەت نوێژ بکا بە دەستماڵێکەوە کە سەرو گەردەنی داپۆشێ، لەگەڵ کراسێکی درێژ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، بەو مەرجەی کراسەکە ئەوەندە درێژ بێ: پشتە پێی داپۆشێ.

کەوا بوو: هیچ ئەندامێکی ئافرەت—هەتا بەرە پێ و مووەکانی سەریشی— نابێ دیار بێ، چونکە نوێژەکەی دروست نابێ.

وە عەورەتی پیاو نێوان ناوك و ئەژنۆیەتی ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: قالَ النَّبيُّ ﷺ: إذا كانَ الثَّوْبُ واسِعاً فَخالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْهِ، وَإِنْ كانَ ضَيِّقاً فَاتَّزِرْ بِهِ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر جلەکەت بەرین بوو، خۆتی لە ناو بپێچە، وە ئەگەر تەسك بوو—وەك پەشتەماڵ— لای خوارەوەتی پێ داپۆشە. (ئاشکرایە: مەبەست بەپەشتە ماڵی خوارەوە: داپۆشەری نێوان ناوك و ئەژنۆیە).

سێیەم: (وَالْوُقُوفُ عَلَى مَكانٍ طاهِرٍ) ئەو شوێنەی نوێژی لە سەر ئەکا ئەبی پاك بێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: بالَ أَعْرابِيٌّ فِي الْمَسْجِدِ، فَقالَ النَّبيُّ ﷺ: دَعُوهُ وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ ماءٍ﴾ رواه الشیخان، پیاوێك میزی لە ناو مزگەوت کرد، پێغەمبەر ﷺ

وَالْعِلْمُ بِدُخُولِ الْوَقْت، وَاسْتِقْبَالُ الْقِبْلَـةِ. وَيَجُـوزُ تَـرْكُ الْقِبْلَـةِ فِـي حَـالَتَيْن: فِي شِدَّةِ الْخَوْفِ، وَفِي النَّافِلَةِ فِي السَّفَرِ عَلَى الرَّاحِلَةِ.

---

فەرمووی: وازی لێبێنن و تۆلچەیەکی ئاو برژێننە سەر میزەکەی. واتە: چونکە مزگەوت شوێنی نوێژە ئەبی پاك بێ.

چوارەم: (وَالْعِلْمُ بِدُخُولِ الْوَقْتِ) ئـەبی بزانـێ: کـاتی نوێـژ هـاتوە، خـوای گـەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾ بـە راسـتی نوێـژ لـە سـەر خـاوەن بـاوەڕان نووسـراوەو کـاتی بـۆ دانـدراوە. کـەوابوو: دروسـت نیـە پـێش هـاتنی کاتی‌نوێژ، نوێژ بکا.

پێنجەم: (وَاسْتِقْبَالُ الْقِبْلَةِ) رووکردنە قیبلەیە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَالْمَسْجِدِالْحَرَامِ﴾ لە نوێژکردندا رووی‌خۆت بکە لای (الْمَسْجِدِالْحَرَامِ). مەبەست: ماڵی خوایە لە مەککەی پیرۆز.

## ﴿ روو نەکرنە قیبلەو، نوێژی ناو ئۆتومبیل ﴾

(وَيَجُـوزُ) دروسـتە (تَـرْكُ الْقِبْلَـةِ) روو لـە قیبلـە نـەکرێ (فِـي حَـالَتَيْنِ) لـە دوو کاتـدا:

یەکەم: (فِي شِدَّةِ الْخَوْفِ) لەو کاتەی ترس هەیە: جا لە دوژمن، یان لە شتێکی‌تر، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا﴾ ئەگەر کەوتنـە مەترسی نوێژەکـەتان بکەن بە پیادەیی، یان، بە سواری، جا رووتان لە قیبلە بێ، یان نا. کەوابوو: بـە رێگـەی خۆی‌دا راتەکاو نوێژی فەرز ئەکا، جا ئەگەر نەیتوانی ڕوکووع‌و سوجدە ببا، ئاماژەیان بـۆ ئەکاو، دووبارەکردنەوەی نوێژی ناوێ، هەروەك لە نوێژی‌ترسدا باسی ئەکەین.

دووەم: (وَفِـي النَّافِلَـةِ) لـە نوێـژی سـوننەتدا دروسـتە روو لـە قیبلـە نـەکا، هـەر چـەند ترسیشی نەبێ (فِي السَّفَرِ) کە لە سەفەر بێ، واتە: بە رێگەدا بڕواو سوننەت بکا.

هەروەها (عَلَى الرَّاحِلَةِ) بە سواری وولاغیش دروستە رێبوار نوێژی‌سوننەت بکا، هەرچـەند ترسیشی نەبێ‌و وولاغەکەیشی بڕوا، بەڵام ئەگەر ترسی نەبو، نوێژی فەرز بـەم شـێوەیەی دووەم دروست نیە ﴿عن جَابِرٍ ﷺ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَته حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِهِ، فَإِذَا أَرَادَ الْفَرِيضَةَ نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَـةَ﴾ رواەالشیخان، پێغەمبـەر ﷺ لـە سـەر پشـتی وولاغەکەی نوێژی سوننەتی ئەکرد، جا هەر کاتێ ویستبای نوێژی فـەرز بکـا، دائەبـەزی‌و رووی لە قیبلە ئەکرد‌و نوێژەفەرزەکەی ئەکرد.

جا بزانە: رێبواری سوارو رێبواری پیادە، ئەبی بۆ نوێژدابەستن روویان لـە قیبلـە بکـەن، هەروەها رێبواری پیادە ئەبی لـە ڕوکووع‌و سـوجدەش روو لـە قیبلـە بکـاو بـە تـەواویش بیانکا، بەڵام رێبواری سوار هەر ئاماژەیان بۆ بکا دروستەو نایەوێ رووی لە قیبلە بێ.

(فَصْلٌ) وَأَرْكَانُ الصَّلاَةِ ثَمانِيَةَ عَشَرَ رُكْناً: اَلنِّيَّةُ، وَالْقِيامُ مَعَ الْقُدْرَةِ، وَتَكْبِيرَةُ الإِحْرامِ،

﴿پاشكۆ﴾: لەو حەدیسە بۆمان دەركەوت كە كردنی نوێژیفەرز دروستە: لە ناو فڕۆكە، یان كەشتی، یان ئۆتۆمبێل، بەو مەرجەی ڕوو لە قیبلە بكاو سوجدەو ڕوكوع بە تەواوی ببا، جا ئەگەر ئەوانە لە قیبلە لایاندا، واجبە نوێژكەرەكە بە زووترین كات خۆی بسوڕێنێتەوە لایقیبلە، بەلآم ئەگەر نەگونجا ڕوو لە قیبلە بكا، یان ڕوكنەكانی نوێژ تەواو بكا، ئەو كاتە واجبە: دابەزێو نوێژ بكا، جا ئەگەر نەگونجا دابەزێ، دیسان واجبە: بە هەر شێوەیەك هەبێ، نوێژەكەی بكاو دوایێ دووبارەی بكاتەوە ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ...غَيْرَ أَنَّهُ لاَيُصَلِّي عَلَيْهَاالْمَكْتُوبَةَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ بە سواری وولآغ نوێژی سوننەتی ئەكرد، بەلآم نوێژی واجبی لە سەر پشتی وولآغ نەئەكرد. (واتە: چونكە سوجدەو ڕوكووعی لە سەر ناگونجێ).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چۆنیەتیو، ڕوكنەكانی نوێژ ﴾

(وَأَرْكانُ الصَّلاَةِ) ئەو بەشانەی نوێژیان لـێ پێك دێ (ثَمانِيَةَ عَشَرَ رُكْناً) هەژدە بەشن، پێیان ئەگوترێ ڕوكنینوێژ:

یەكەم: (اَلنِّيَّةُ) نیەتهێنانە ﴿عَنْ عُمَرَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّمَا اْلأَعْمالُ بِالنِّيَّـاتِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كردەوەیەكی خواپەرستی بێ، بە نیازی ناو دڵ نەبێ دانامەزرێ.

ئینجا بزانە: پێویستە بەو نیەتە هەموو نوێژێك لە یەكتری جیا بكەینەوە: ئایا فەرزە، یان سوننەتە؟ وە ناوی نوێژەكە چیە؟ بۆ وێنە: بە دڵ بڵێ: (نیازم وەیە فەرزی نوێژی نیوەڕۆ ئەكەم)، یان بڵێ: (سوننەتی پێش نیوەڕۆ ئەكەم). ئیتر نایەوێ بڵێ: ئەوەندە ڕەكعەتەیە، یان بڵێ: بۆ خوا ئەیكەم، بەڵكو سوننەتە، هەروەها سوننەتە پێش (اللهُ أَكبَر): نیەت بە زوبان بگوترێ، بۆ ئەوەی یارمەتی دڵ بدا.

دووەم: (وَالْقِيامُ مَعَ الْقُدْرَةِ) ڕاوەستانە بە پێوە لە نوێژەفەرزەكاندا بۆ فاتیحە خوێندن ئەگەر توانای هەبێ، وەسوننەتە بە قەد یەك بست قاچەكانی لێك دوور بن ﴿عَنْ عِمْرانَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَلِّ قائماً فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقاعِدًا﴾ رواەالبخاری، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژ بە پێوە بكە، جا ئەگەر توانات نەبوو، بە دانیشتوویی بیكە.

سێیەم: (وَتَكْبِيرَةُ الإِحْرامِ) بە گوتنی(اللهُ أكبَر) نوێژ دابەستێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّـرْ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: كاتێ ویستت نوێژ دابەستی، بڵێ: (اللهُ أكبَر).

﴿ئاگـاداری﴾: نیەتی نوێژ ئەبی لەگەڵ گوتنی(اللهُ أكبَر) بێ، بەلآم زۆر لە زانایان فەرموویانە: دروستە لە پێش گوتنی(اللهُ أكبَر) نیەت بێنێ.

وَقِراءَةُ الْفَاتحَة، وَ(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) آيَةٌ مِنْها، وَالرُّكُــوعُ، وَالطُّمَأْنِينَــةُ فِيــهِ، وَالرَّفْعُ وَالإِعْتِدالُ، وَالطُّمَأْنِينَةُ فِيه، والسُّجُودُ، وَالطُّمَأْنِينَةُ فِيه، وَالْجُلُوسُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ،

---

چوارەم: (وَقِراءَةُ الْفَاتحَة) خوێندنی سورەتی فاتیحەیە لە هەموو ڕەکعەتێکدا ﴿عَنْ عُبادَةَ بن الصَّامِتِ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِأُمِّ الْقُرآنِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژی ئەو کەسە دروست نیە کە فاتیحە لە ناو نوێژدا نەخوێنێ.

(وَ) هــەروەها خوێنـدنی(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لـە پـێش فاتیحـە واجبـەو (آيَـةٌ مِنْهـا) ئایـەتێکی فاتیحەیـە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) إِحْـــدَى آياتِهَا﴾ رواه الـدارقطني، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (بِسْـمِ اللهِ الـرَّحْمَنِ الـرَّحِيمِ) ئایەتێکی فاتیحەیە.

پێنجەم: (وَالرُّكُوعُ) ڕوکووع بردنە. شەشەم: (وَالطُّمَأْنِينَةُ فِيهِ) خۆڕاگرتنە لە ڕوکووع، واتە: پشـتو ئەسـتۆی وەك یـەك ڕاسـت بـیٌ و بـە هـەردوو دەسـتەکانی ئەژنۆیـەکانی بگـرێو پەنجەکانی دەستی بەرەو قیبلە بێ. حەفتەم: (وَالرَّفْعُ) هەڵسانەوەیە لە ڕکووع (وَالإِعْتِـدالُ) ئەبی لەو هەڵسانەوەیە ڕاست ڕابوەستێ. هەشتەم: (وَالطُّمَأْنِينَـةُ فِيـهِ) خۆ ڕاگرتنـە لـەو هەڵسانەوەیە: تا هەموو ئێسقانەکانی ئەچنەوە ناو جومگەی خۆیان ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْــرَةَ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعاً ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قائِمًــا﴾ رواه‌الشـيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوای فاتیحەخوێندن ڕکووع ببـەو خـۆت ڕابگـرە لـە ڕکـووع، ئینجـا هەڵسەوە تا بە پێوە ڕاست ڕائەوەستی.

نۆیـەم: (والسُّجُودُ) سـوجدە بردنـە دووجـار لـە هـەموو ڕەکعەتێکدا بـەم جـۆرەی کـە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: عَلَى الْجَبْهَةِ، وَأَشارَ بِيَدِهِ إِلَى أَنْفِهِ، وَالْيَدَيْنِ، وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرافِ الْقَدَمَيْنِ﴾ رواه الشـيخان، فـەرمانم دراوەتـێ: سوجدە ببەم لە سەر حەوت ئێسقان: لە سەر نێوچاوان‌و لوتو هەردوو دەسـتو هـەردوو ئەژنۆ و پەنجەکانی قاچ.

جا بزانـە: ئـەبی سوجدە لە سـەر شـتێکی وابـێ: کـە لەگـەڵی هەڵنەسـتێتەوەو ئـەبی لای خوارەوەی بەرزتر بێ لە لای سەری، واتـە: ئەگـەر پـەڕۆیـەك، یـان مێزەرەکـەی لـە سـەر نێوچاوانی بوو، سوجدەی دروست نیە.

دەیـەم: (وَالطُّمَأْنِينَــةُ فِيــهِ) خۆڕاگرتنــە لــە ســوجدەدا تــا گرانــایی ســەری ئەگاتــە شوێنی سوجدە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: ﴿ثُمَّ اسْــجُدْ حَتَّــى تَطْمَــئِنَّ ســاجِداً﴾ رواه الشـــيخان، ئینجـــا ســـوجدە ببـــەو خـــۆت ڕابگـــرە لـــە ســـوجدەدا.

یـانزەم: (وَالْجُلُــوسُ بَــيْنَ السَّــجْدَتَيْنِ) دانیشــتنە لــە نێــوان هــەردوو ســوجدەکاندا.

وَالطُّمَأْنِينَةُ فِيه، وَالْجُلُوسُ الأَخِيرُ، وَالتَّشَهُّدُ فِيهِ، وَالصَّلاَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِيهِ، وَالتَّسْلِيمَةُ الأُولَى، وَنِيَّةُ الْخُرُوجِ مِنَ الصَّلاَةِ، وَتَرْتِيبُ الأَرْكَانِ عَلَى مَا ذَكَرْنَاهُ.

---

دوانزەم: (وَالطُّمَأْنِينَةُ فِيهِ) خۆڕاگرتنە لەو دانیشتنەدا تا بە تەواوی پشتی ڕاست ئەبێتەوەو دەستەکانی لە سەر ڕانەکانی دائەنێو پەنجەی هەردوو دەستەکانی لە نزیک ئەژنۆیەکانی دائەنێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جالِساً﴾ رواه الشيخان، دوای سوجدە هەڵسەوە تا بە تەواوی دا ئەنیشی.

سێزدەم: (وَالْجُلُوسُ الأَخِيرُ) دانیشتنە بۆ تەحیاتی دوایی.

چواردەم: (وَالتَّشَهُّدُ فِيهِ) خوێندنی تەحیاتی‌دوایی‌یە لەو دانیشتنەدا:

جا ئەمەش دەققی ئەو تەحیاتەیە کە (ابن عباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە: ﴿اَلتَّحِيَّاتُ الْمُبارَكاتُ الصَّلَواتُ الطَّيِّباتُ للهِ، اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ، اَلسَّلاَمُ عَلَيْنا وَعَلَى عِبادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَن لاَّ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اللهِ﴾ رواه مسلم.

پانزەم: (والصَّلاَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ) سەلاوات لێدانە لە سەر پێغەمبەر ﷺ (فيهِ) لە تەحیاتی ئاخیردا، جا بە لای کەمی بڵێ: (أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّد). بەڵام لە دوای تەحیات-پێش سەلامدانەوە- سوننەتە: بە درێژی سەلاوات لێبداو بڵێ: ﴿أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى آلِ مُحَمَّد، كَما صَلَّيْتَ عَلَى إِبْراهِيمَ، وَبارِك عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى آلِ مُحَمَّد كَما بَارَكْتَ عَلَى إِبْراهِيمَ فِي الْعالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ﴾ رواه مسلم عن ابي مسعود ﷺ.

هەروەها لە پاش ئەو سەلاواتە-پێش سەلامدانەوە- سوننەتە ئەم دوعایە بخوێنێ: ﴿أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذابِ جَهَنَّم، وَمِنْ عَذابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ﴾ رواه‌الشيخان.

شانزەم: (وَالتَّسْلِيمَةُ الأُولَى) سەلامدانەوەی یەکەمە بە لای ڕاستەدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿تَحْرِيمُها التَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُها السَّلاَمُ﴾ رواه اصحاب السنن، دابەستنی نوێژ (اللهُ أكبَر) گوتنە، وەدەرچوون لە نوێژ سەلامدانەوەیە. واتە: بڵێ: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ).

حەڤدەهەم: (وَنِيَّةُ الْخُرُوجِ مِنَ الصَّلاَةِ) نیەتی دەرچوونە لە نوێژ، بەڵام فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە: کە ئەو نیەتە پێویست نیە.

هەژدەهەم: (وَتَرْتِيبُ الأَرْكانِ) ڕیزکردنی ئەو ڕوکنانەیە (عَلَى مَا ذَكَرْناهُ) بەو شێوەیەی باسمان کرد: کە لە پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوەو فەرموویەتی: ﴿صَلُّوا كَما رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي﴾ رواه البخاري، نوێژ بکەن بەو شێوەیەی منتان بینیوە نوێژم دەکرد.

جا ئەگەر بە پێچەوانەی ئەو ڕیزە نوێژی کرد: وەك بە قەسدی سوجدە پێش ڕوکووع ببا، ئەوە نوێژەکەی تێك ئەچێ‌و ئەبێ دووبارەی بکاتەوە.

بەڵام ئەگەر -بە قەسدی نەبو- بە هەڵە سوجدەی پیشێ ڕوکووع برد، یان تەحیاتی پێش فاتیحە خوێند، نوێژەکەی تێك ناچێ، بەڵام هەرچی لە دوای ڕیزتێکدانەکە کردویەتی بە بێ سود ئەڕواو ئەبێ بگەڕێتەوە سەر ڕیزەکەی خۆی، جا ئەگەر هەر نەهاتەوە بیری کە ڕیزی تێك داوە، تا گەیشتەوە هەمان ڕوکن -کە نەیکردوە- با هەر بەردەوام بێ‌و ئەو ڕوکنە لە جێی نەکراوەکە ئەژمێردرێ، ئەوەی بە هەڵەش کردبوی، دووبارە ئەیکاتەوە، ئینجا سوننەتە پێش سەلامدانەوە سوجدەی سەهوو ببا.

## ﴿ باسی بانگ‌و ئیقامەت ﴾

(وَسُنَنُها) سوننەتەکانی نوێژ (قَبْلَ الدُّخُولِ فِيها) پێش دابەستنی نوێژ (شَيْئانِ) دوو شتن: سوننەتی یەکەم: (اَلأَذانُ) بانگدانە بۆ هەر پێنج نوێژەفەڕزەکان، جا بە تەنهایی نوێژ بکا، یان بە جەماعەت، لە چۆڵ بێ، یان لە ئاوەدانی، بەو مەرجەی کاتی نوێژ هاتبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ﴾ رواه الشيخان، کاتێ نوێژ بوو، با یەکێك لە ئێوە بۆتان بانگ بدا.

جا بزانە: لە بەر ئەو حەدیسە چەند زانایەك فەرموویانە: بانگ (فَرْضُ الْكِفايَـةِ)یە، واتـە: لە هەر دێیەكو لە هەر گەڕەکێك ئەبێ بانگ بدرێ، ئەگەر نـا: هـەموویان تاوانبـار ئـەبن، وە ئەبێ بانگبێژەکە پیاو بێ‌و موسوڵمان بێ‌و ڕووی لە قیبلە بێ‌و بە پێوە بێ.

ئەمەش دەقی بانگە، کە لە پێغەمبەرﷺ پێمان گەیشتوە: ﴿أَللهُ أَكْبَرْ أَللهُ أَكْبَرْ، أَللهُ أَكْبَرْ أَللهُ أَكْبَرْ، أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداًرَّسولُ اللهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداًرَّسولُ اللهِ، حَيَّ عَلَىالصَّلاَه حَيَّ عَلَىالصَّلاَه، حَيَّ عَلَىٰالفَلاَح حَيَّ عَلَى ٱلفَلاَح... (فَإِنْ كانَ صَلاَةَ الصُّبْحِ)﴾ واتە: ئەگەر بانگەکە بۆ نوێژی بەیانی بوو ﴿قُلْــتَ﴾ لـە دوای (حَيَّ عَلَى ٱلفَـلاَح) بڵـێ: ﴿اَلصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ اَلصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، أَللهُ أَكْبَرْ أَللهُ أَكْبَرْ، لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ﴾ رواه اصحاب السنن عن أبيمحذورة.

سوننەتی دووەم: (وَالإِقامَةُ) ئیقامەتکردنە بۆ هەر پێنج فەڕزەکان: جا بە تـەنهایی نوێژ بکا، یان بە جەماعەت، پێش دابەستنینوێژ ڕووی لە قیبلـە بکـاو بـەم ووشـانە ئیقامـەتی نوێژ بکـا: ﴿أَللهُ أَكْبَرْ أَللهُ أَكْبَرْ، أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداًرَّسولُ اللهِ، حَيَّ عَلَىالصَّلاَه، حَيَّ عَلَىٰالفَلاَح، قَدْ قامَتِ الصَّلاَه، قَدْ قامَتِ الصَّلاَه، أَللهُ أَكْبَرْ أَللهُ أَكْبَرْ، لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ﴾ رواه أصحاب السنن عن عبدالله بن زيد الأنصاري.

وَبَعْدَ الدُّخُولِ فِيها شَيْئان: اَلتَّشَهُّدُ الأَوَّلُ، وَالْقُنُوتُ فِي الصُّبْحِ،

《 باسی وەڵامدانەوەی بانگ 》

هەر کەسێك گوێی لە بانگ، یان لە ئیقامەت بوو، سوننەتە ئەویش وەکو بانگدەر ووشەکان بڵێ، بەلام لە کاتی 《حَيَّ عَلَى الصَّلاَه، حَيَّ عَلَى الْفَلاَح 》 بڵێ: 《لاَحَوْلَ وَلاَقُوَّةَ إِلاَّبِاللهِ》 رواه‌مسلم.

هەروەها لە دوای بانگو لە دوای ئیقامەت سوننەتە بانگدەر و ئەوەی گوێی لێبوە: سەلاوات لێبدەن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: 《إِذا سَمِعْتُمُ النِّداءَ فَقُولُوا مِثْلَ ما يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً صَلَّىاللهُ عَلَيْهِ بِها عَشْراً》 رواه‌مسلم واصحاب السنن، کاتێ گوێتان لە بانگەوازی نوێژ بوو-واتە: بانگو ئیقامەت-ئێوەش وەکو بانگدەرەکە ووشەکان بڵێن، ئینجا لە دوایی‌دا سەلاواتم لە سەر لێبدەن، چونکە هەر کەسێك یەك سەلاواتم لە سەر لێبدا، خوای گەورە دە رەحمەتی بە سەردا ئەبارێنێ.

هەروەها لە دوای بانگو لە دوای ئیقامەت سوننەتە بڵێ: 《أَللّهُمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوَةَ التّامَّةَ وَالصَّلاةِ الْقائِمَةَ آتِ مُحَمَّداً اَلْوَسيلَةَ وَاْلفَضيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقاماً مَحْمُوداً الَّذى وَعَدْتَهُ》 رواه البخاری. 《وَعَنْ أَبي‌هُرَيْرَةَﷺ: أَنَّهُ كانَ-إِذا سمعَ الْمُؤَذِّنَ يُقيمُ الصَّلاَةَ-يَقُولُ: (أَللَّهُمَّ رَبَّ هَذهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةَ وَالصَّلاَةِ الْقائِمَةِ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآتِهِ سُؤْلَهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ)》 رواه ابن السنی، واتە: کە (ابوهريرة) گوێی لە ئیقامەتی نوێژ ئەبو بەم ووشانەی‌رابردوو سەلاواتی لێئەدلو دوعای بۆ پێغەمبەرﷺ ئەکرد.

《 باسی قونووت‌و، سوننەتەکانی‌تری ناو نوێژ 》

ئینجا کە ئیقامەت تەواو بوو هەڵئەستێ‌و نوێژ دائەبەستێ، جا (وَبَعْدَ الدُّخُولِ فِيها) ئەو سوننەتانەی بەشێکن لە نوێژو لە پاش دەست پێکردنی نوێژن (شَيْئانِ) دوو سوننەتن:

سوننەتی‌یەکەم: (اَلتَّشَهُّدُ الأَوَّلُ) تەحیاتی‌یەکەمە تا ئەگاتە (اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ) 《عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ بُحَيْنَةَﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قامَ مِنْ اثْنَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ لَمْ يَجْلِسْ بَيْنَهُما، فَلَمّا قَضَى صَلاَتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ》 رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ دوو رەکعەتی نوێژی نیوەڕۆی کردن و بۆ تەحیاتی‌یەکەم دانەنیشت‌و هەڵساوە، ئینجا کە نوێژی تەواو کرد، دوو سوجدەی سەهووی بردن و سەلامی داوە.

سوننەتی دووەم: (وَالْقُنُوتُ) خوێندنی (قونووتە) لە سێ شوێندا: یەکەم: (فِي الصُّبْحِ) لە نوێژی سبەیناندا کە لە ڕوکوعی ئاخیری هەڵساوە لە دوای (سَمِعَ اللهُ-تا-لَكَ الْحَمْدُ)، 《عَنْ أَنَسٍﷺ: مَازالَ رَسُولُ اللهِﷺ يَقْنُتُ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى فارَقَ الدُّنْيا》 رواه الدارقطني والحاكم، پێغەمبەرﷺ بەردەوام لە نوێژی سبەیناندا قونووتی ئەخوێند تا وەفاتی کرد.

دووهم: ئەگەر بەلایەك هاتە سەر موسوڵمانان، سوننەتە لە هەر پێنج فەرزەكاندا پاش هەڵسانەوە لە ڕوكووعی ئاخیر: قونووت بخوێندرێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كانَ لاَيَقْنُتُ إِلاَّ إِذا دَعا لِقَوْمٍ أَوْ دَعا عَلَى قَوْمٍ﴾ صححه ابن خزيمة، پێغەمبەر ﷺ لە هەموو نوێژەفەرزەكاندا قونووتی نەئەخوێند، مەگەر دوعای بۆ چەوساوان كردبا، یان دوعای لە ستەمكاران كردبا. واتە: تەنها ئەو كاتە قونووتی ئەخوێند.

سێیەم: (وَفِي الْوِتْرِ) لە نوێژی (وِتْر)دا –كە لە ڕوكووعی ئاخیری هەڵساوە– قونووت سوننەتە (فِي النِّصْفِ الثّانِي) لە نیوەی دووەمدا (مِنْ شَهْرِ رَمَضانَ) لە مانگی ڕەمەزان، جیاوازی نیە: تەراویحی كردبێ، یان نا.

﴿ئاگاداری﴾: هەندێك لە زانایانی ئایینی فەرموویانە: بەردەوام قونووت لە نوێژی (وِتْر)دا سووننەتە.

جا بزانە: لە هەموو وشەكانی قونووت خێرتر ئەمەیە: ﴿عَنِ الْحَسَنِ ﷺ: قالَ: عَلَّمَنِي النَّبِيُّ ﷺ كَلِماتٍ أَقُولُهُنَّ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ﴾ حەزرەتی(حسن) كوڕی ئیمامی(علی)رضي الله عنهما فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ چەند وشەیەكی فێر كردم كە لە قونووتی(وِتْر)دا بیانخوێنم، كە ئەمەیە: ﴿أَللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَن هَدَيْتَ، وَعافِنِي فِيمَنْ عافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبارِكْ لِي فِيما أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ ماقَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لاَيَذِلُّ مَنْ وَّالَيْتَ، وَلا يَعِزُّ مَنْ عادَيْتَ، تَبارَكْتَ رَبَّنا وَتَعالَيْتَ، وَصَلَّى اللهُ عَلَى النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ ﷺ﴾ رواه البيهقي والترمذي والنسائي.

هەروەها سوننەتە پێش سەلاوات لێدان لە دوای (وَتَعالَيْتَ) بڵێ: ﴿فَلَكَ الْحَمْدُ عَلَى ماقَضَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ﴾.

هەروەها سوننەتە: هەردوو دەستەكانی بەرز بكاتەوە، وە ئەگەر ئیمام بوو، دەنگی بەرز بكاتەوەو، لەجیاتی‌تاك، بیكا بە كۆمەڵ، واتە: بڵێ: (إِهْدِنا، عافِنا، تَوَلَّنا، بارِكْ لَنا، قِنا). وە ئەگەر مەئموم بوو، بڵێ: (آمين). وە جیاوازی قونووتی سبەینەو بەلاو وەتر نیە.

جا بزانە: لەجیاتی‌قونووت، یان لە دوای قونووت هەر دووعایەكی‌تر بخوێنێ، هەر دروستە.

## ﴿ سوننەتەكانی ناو نوێژ ﴾

(وَهَيْئاتُها) ئەو سوننەتانەی بەشێك نینە لە نوێژ، بەلام نوێژیان پێ جوان ئەبێ (خَمْسَ عَشْرَةَ خَصْلَةً) پانزەنە:

یەكەم: (رَفْعُ الْيَدَيْنِ) بەرزكردنەوەی هەردوو دەستەكانە تا سەری پەنجەكانیان ئەگاتە بەرانبەر سەرەوەی گوێیەكانی، لەپەدەستی بەرانبەر شانەكانی ئەبێ:

عِنْدَ تَكْبِيرَةِ الإِحْرامِ وَعِنْدَ الرُّكُوعِ وَالرَّفْعِ مِنْــهُ، وَوَضْــعُ الْــيَمِينِ عَلَــى الشِّــمالِ، وَالتَّوَجُّهُ، وَالاسْتِعاذَةُ، وَالْجَهْرُ فِي مَوْضِعِه،

---

(عِنْدَ تَكْبِيرَةِ الإِحْرامِ) لە کاتی گوتنی (اللهُ أكبَر)ی نوێژدابەستن و (وَعِنْدَ الرُّكُوعِ) لـە کـاتی چوونە ڕوکووعو (وَالرَّفْعِ مِنْهُ) لە کاتی هەڵسانەوە لە ڕوکووع، هەروەها لە کاتی هەڵسانەوە لە تەحیاتی‌یەکەم بۆ فاتیحەی‌سێیەم ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما قالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ إِفْتَتَحَ التَّكْبِيرَ لِلصَّلاَةِ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ يُكَبِّرُ حَتَّى يَجْعَلَهُما حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَهُ، وَإِذا قالَ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَعَلَ مِثْلَهُ، وَإِذا قامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْــهِ﴾ رواه الشيخان، (ابن عمر) -خوا لێیان ڕازی بێ- فەرمووی: پێغەمبەرم ﷺ بـینی لـە کـاتی (اللهُ أكبَر)ی نوێژدابەستن هەردوو دەستەکانی بەرز دەکردنەوە تا بەرانبەری شانەکانی دەبـوون، کاتێ چووە ڕوکووع هەر بەو شێوەیە دەستی بەرز کردنەوە، کاتێ هەڵساوە لە ڕوکووع هـەر بـەو شێوەیە دەستی بەرز کردنەوە، کـاتێ لـە تـەحیات هەڵساوە بـۆ ڕەکعەتی‌سـێیەم هـەردوو دەستی بەو شێوەیە بەرز کردنەوە.

دووەم: (وَوَضْعُ الْيَمِينِ عَلَى الشِّمالِ) دانانی دەستی ڕاستەیە لـە سـەر دەسـتی چەپە، لـە کاتی فاتیحەخوێندن لە پشتی ناوك لە ژێـر سینگی ﴿عَنْ وَائِلِ بنِ حُجْــرٍ ﷺ: وَضَــعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى ظَهْرِ كَفِّهِ الْيُسْرَى وَالرُّسْــغِ وَالسَّــاعِدِ﴾ رواه أبـوداود والنسائي، پێغەمبەر ﷺ دەستی ڕاستەی دانا سەر پشتە دەستی چەپەی لەگەڵ جومگەی دەستی لەگەڵ بەشێکی باسکی.

سـێیەم: (وَالتَّوَجُّهُ) خوێندنی دوعای (تەوەجوهە) بە نهێنی لە دوای (اللهُ أكبَر)ی نوێـژ دابەسـتن ﴿عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذا قامَ إِلَى الصَّلاَةِ كَبَّــرَ، ثُــمَّ قــالَ:﴾ پێغەمبەر ﷺ کە بۆ نوێژ هەڵئەستا بە (اللهُ أكبَر) نوێژی دائەبەست، ئینجا ئـەم دوعایـەی ئەخوێند: ﴿وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمٰواتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً مُسْلِماً وَما أَنــا مِــنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيايَ وَمَماتِي للهِ رَبِّ الْعالَمِينَ لاَشَرِيكَ لَهُ وَبِــذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنا مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ رواه مسلم.

چوارەم: (وَالإِسْتِعاذَةُ) گوتنی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ) بـە نهێنی، پـێش دەست پێکردنی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ) لـە هـەموو ڕەکعەتێکدا، خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ کاتـێ ویسـتت قورئـان بخوێنی داوا لە خوا بکە بتپارێزێ لە شەیتانی تێهەڵدراو.

پێنجەم: (وَالْجَهْرُ) بە دەنگ خوێندنی فاتیحەو سورەتی‌دوای فاتیحەیە (فِي مَوْضِعِهِ) لـەو شوێنەی ئاشکرای بۆ داندراوە: کە نوێژی بـەیانی‌و جومعـەو ڕەکعـەتی یەکـەم‌و دووەمـی

عیشــاو مــەغریبو هــەردوو جەژنــەکانو مــانگگیران و تــەراویحو وەتری‌رەمەزانــە، بەو مەرجەی–لەوانەدا–مەئمووم نەبێ.

(وَالإِسْرارُ فِي مَوْضِعِه) هەروەها بە نهێنی خوێندنە لەو شوێنەی نهێنیی بۆ دانـدراوە: کـە ڕەواتیبی هەر پێنج نوێژەکانو نوێژی نیـوەڕۆ و عەسـر و ڕەکعـەتی سـێیەمو چوارەمی مەغریبو عیشایە. جا بزانە: لەم پێنجەمەدا جیاوازی ئیمام و نوێژکەری بە تەنهایی نیە.

شەشەم: (وَالتَّأْمِينُ) گوتنی (آمین)ە لە دوای فاتیحە، جا بە تەنهایی بێ، یان بە جەماعـەت ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ‌ﷺ: قالَ النَّبِيُّ‌ﷺ: إذا أَمَّنَ الإمامُ فَأَمِّنوا، فإنَّهُ مَنْ وافَقَ تَأْمِينُـــهُ تَـــأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِه﴾ رواه الشـیخان، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: کاتـێ ئیمـام گـوتی: (آمـین). ئێـوەش بڵـێن: (آمـین). چـونکە هـەر کەسـێك (آمـین)گوتنەکـەی لەگـەڵ (آمین)گوتنی مەلائیکەتان ڕێك بکەوێ، خوایگەورە لە گوناهی‌ڕابردووی خۆش ئەبێ.

حەفتەم: (وَقِراءَةُ السُّورَةِ) خوێندنی سورەتێکە (بَعْدَ الْفاتِحَةِ) لـە پـاش خوێندنی‌فاتیحـە لە ڕەکعـەتی یەکـەمو دووەم، جـا بزانـە: لـەجیاتی سـورەت دروسـتە ئایـەتێکی قورئـان بخوێنێ، بەڵام سورەتێکی‌تەواو لە ئایەتێکی بە ئەندازەی خۆی خێرترە.

جا ئەگەر سورەتی نەخوێند، لای کەمی سێ ئایەت بخوێنـێ ﴿عَـــنْ أَبِي هُرَيْـــرَةَ‌ﷺ: قـــالَ النَّبِيُّ‌ﷺ: ثَلاَثُ آياتٍ يَقْرَأُ بِهِنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِه خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثِ خَلِفاتٍ عِظامٍ سِمانٍ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سێ ئایەتی قورئان یەکێکتان لە نوێژدا بیانخوێنێ لە پاش فاتیحە، خێری زۆرترە لە سێ ووشتری ئاوسی گەورەو قەڵەو.

بەڵام ئەگەر مەئمووم گوێی لە سورەت خوێندنی ئیمام بوو، ئـەبی گـوێی لێبگرێو نـابێ سورەت بخوێنێ ﴿عَنْ عُبادَةَ بنِ الصامتِ‌ﷺ: قالَ النَّبِيُّ‌ﷺ: لَعَلَّكُـــمْ تَقْرَئُـــونَ خَلْـــفَ إمامِكُمْ؟ قُلْنا: نَعَمْ. قالَ: لاَ تَفْعَلُوا إلاَّ بِفاتِحَةِ الْكِتابِ فَإنَّهُ لاَصَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِها﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: وا دیـارە ئێـوە لـە نوێـژی بـە جەماعـەت لـە دوای ئیمام قورئان ئەخوێنن؟ گوتمان: بەڵێ ئەیخوێنین، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وا مەکەن جگـە لە فاتیحە هیچی‌تر مەخوێنن، چونکە هەر کەسێك فاتیحە نەخوێنێ نوێژی دروست نیە.

جا ئەگەر نوێژەکە نهێنی بوو، یان گـوێی لـە خوێنـدنی‌ئیمام نـەبو، ئەوکاتـە بـا بیخـوێنێ.

﴿ئاگاداری﴾: خوێنـدنی ئایـەت، یـان سـورەتی پـاش فاتیحـە سـوننەتە: لـە سـەر ڕیـزی قورئان بێ، سوننەتە: ڕەکعەتی‌یەکەم لـە ڕەکعـەتی‌دووەم درێـژتر بـێ، سـوننەتە: ئیمـام ماوەیەك بـە بێدەنگی قورئـان لـە دوای فاتیحـە بخوێنـێ؟ بـۆ ئـەوەی مەئمومـەکانیش فاتیحەی خۆیان بخوێنن.

وَالتَّكْبِيراتُ عِنْدَ الْخَفْضِ وَالرَّفْعِ، وَقَوْلُ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ، وَالتَّسْبِيحُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، وَوَضْعُ الْيَدَيْنِ عَلَى الْفَخِذَيْنِ فِي الْجُلُوسِ: يَبْسُطُ الْيُسْرَى وَيَقْبِضُ الْيُمْنَى إِلاَّ الْمُسَبِّحَةَ فَإِنَّهُ يُشِيرُ بِها مُتَشَهِّداً،

---

هەشتەم: (وَالتَّكْبِيراتُ) (اَللهُ أكبَر) گوتنە (عِنْدَ الْخَفْضِ) کاتی هاتنە خوار بۆ ڕوکووعو سوجدە (وَالرَّفْعِ) هەروەها کاتی هەڵسانەوە لە سوجدەو تەحیات ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ رضي الله عنه: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ خَفْضٍ وَرَفْعٍ وَقِيَامٍ وَقُعُودٍ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ ئەیگوت: (اَللهُ أكبَر)، بۆ گشت هاتنەخوارەوەو هەڵسانەوەو ڕاوەستان و دانیشتن.

نۆیەم: (وَقَوْلُ) کاتێ لە ڕوکووع هەڵساوە بڵێ: ﴿سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ﴾ رواه الشيخان، جا بزانە: ئیمام بە ئاشکرا (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئەڵێ، ئەوەیتریش بە نهێنی ئەڵێ، هەم سوننەتە لە پاش (رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ) بڵێ: ﴿حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيهِ مِلْءَ السَّمَوات وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ مَابَيْنَهُما وَمِلْءَ مَاشِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ﴾ رواهمسلم.

دەیەم و، یازدەم: (وَالتَّسْبِيحُ) تەسبیحات کردنە (فِي الرُّكُوعِ) لە ڕوکووعدا، وەك سێ جار بڵێ: ﴿سُبْحانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ﴾. هەم (وَالسُّجُودِ) لە سوجدەشدا سێ جار بڵێ: ﴿سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلَى﴾. رواهما الترمذي، هەروەها لە دانیشتنی‌نێوان هەردوو سوجدەدا سوننەتە بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَعافِنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي﴾ رواهابوداود وصححهالحاكم.

دوانزەم: (وَوَضْعُ الْيَدَيْنِ) دانانی هەردوو دەستەکانە (عَلَى الْفَخِذَيْنِ) لە سەر هەردوو ڕانەکانی (فِي الْجُلُوسِ) لە دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەو هەم لە تەحیاتەکاندا بەم شێوەیە: (يَبْسُطُ الْيُسْرَى) پەنجەکانی دەستی چەپەی درێژ بکاتە نزیك ئەژنۆیەکانی (وَيَقْبِضُ الْيُمْنَى) پەنجەکانی دەستی ڕاستەی بنوقێنێ (إِلاَّالْمُسَبِّحَةَ) تەنها پەنجەی شادە نەنوقێنێ (فَإِنَّهُ) پەنجەی شادە (يُشِيرُ بِها) ئامـاژەی پێئەکا (مُتَشَهِّداً) لە کاتی شادە هێنان، کە گوتی: (إِلاَّ اللهُ) بەرزی ئەکاتەوە، بەڵام نایجوڵێنێ ﴿عَنْ ابْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ يُشِيرُ بِالسَّبَّابَةِ وَلاَيُحَرِّكُهَا﴾ رواه احمد وابوداود والنسائی، پێغەمبەر ﷺ بە پەنجەی شادە ئاماژەی ئەکردو نەیئەجوڵاند.

ئینجا تا کۆتایی تەحیات دایناێتەوەو پەنجەی گەورەشی پێوە ئەلکێنێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: كانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذا جَلَسَ فِي الصَّلاَةِ وَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَقَبَضَ أَصابِعَهُ كُلَّها وَأَشارَ بِأُصْبُعِه الَّتِي تَلِي الإِبْهامَ، وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى﴾ رواهمسلم، کە پێغەمبەر ﷺ بۆ تەحیاتی نوێژ دائەنیشت، دەستی ڕاستەی لە سەر ڕانی ڕاستەی دائەناو هەموو پەنجەکانی ئەنوقاندنو ئاماژەی بەو پەنجەیە ئەکرد کە لە لای پەنجەی گەورەیە، وە دەستی چەپەی دائەنا سەر ڕانی چەپەی.

وَالْإِفْتِرَاشُ فِي جَمِيعِ الْجَلَسَاتِ، وَالتَّوَرُّكُ فِي الْجَلْسَةِ الْأَخِيرَةِ، وَالتَّسْلِيمَةُ الثَّانِيَةُ.

---

سیێزدەم: (وَالْإِفْتِرَاشُ) دانیشتنە لە سەر قاچی چەپە (فِي جَمِيعِ الْجَلَسَاتِ) لە هەموو دانیشتنەکانی نێوان سوجدەکانو لە تەحیاتەکاندا-جگە لە تەحیاتی ئاخیر- واتە: لە سەر گۆزینگی قاچی چەپە دائەنیشێ‌و قاچی ڕاستەی لە سەر پەنجەکان دائەچەقێنێ.

چواردەم: (وَالتَّوَرُّكُ) دانانی نەرمەی ڕانیەتی لە سەر زەمین (فِي الْجَلْسَةِ الْأَخِيرَةِ) لەو دانیشتنەی سەلامدانەوەی بە دوادا دێ، واتە: قاچی ڕاستەی دائەچەقێنێ‌و قاچی چەپەی بە لای ڕاستەیدا ئەباتە دەرەوەو نەرمەڕانەکەی‌چەپەی ئەلکێنێ بە زەمین ﴿عَنْ أَبِي حُمَيدالسَّاعدي ﷺ فِي صِفَةِ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى، وَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ کە دوو ڕکعەتی تەواو ئەکردن، بۆ تەحیاتی یەکەم لە سەر قاچی چەپەی دائەنیشتو قاچی ڕاستەی دائەچەقاند، کە بۆ تەحیاتی‌دوایی دائەنیشت، قاچی چەپەی ئەخستە پێش قاچی ڕاستەی‌و قاچی ڕاستەی دائەچەقاندو لە سەر نەرمەی‌ڕانی دائەنیشت.

پانزەم: (وَالتَّسْلِيمَةُ الثَّانِيَةُ) سەلامدانەوەی‌دووەمە ﴿عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ: اَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، وَعَنْ شِمَالِهِ: اَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ﴾ رواه أبوداود، پێغەمبەر ﷺ سەلامی یەکەمی بە لای ڕاستەدا ئەداوەو سەلامی دووەمی بە لای چەپەدا ئەداوە، لە سەلامدانەوەدا ئەیگوت: (اَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ).

**﴿ باسی ئەو زیکرانەی لە پێش نوێژو لە دوای نوێژ ئەگوترێن ﴾**

**١- زیکری پێش نوێژەکان** ﴿عَنْ أُمِّ رَافِعٍ رضي الله عنها: أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَأْجُرُنِي اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ، قَالَ ﷺ: يَا أُمَّ رَافِعٍ إِذَا قُمْتِ إِلَى الصَّلَاةِ فَسَبِّحِي اللهَ تَعَالَى عَشْرًا، وَهَلِّلِيهِ عَشْرًا، وَاحْمَدِيهِ عَشْرًا، وَكَبِّرِيهِ عَشْرًا، وَاسْتَغْفِرِيهِ عَشْرًا﴾ رواه ابن السني، ئەی پێغەمبەری خوا، زیکرێکم پێ بڵێ کە بە گوتنی پاداشتم بدرێتێ لە لای خوای‌گەورە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی (دایکی‌ڕافیع)، کاتێ ویستت هەڵسی نوێژ بکەی، دە جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ)، دە جار بڵێ: (لَاإِلَهَ إِلَّااللهُ)، دە جار بڵێ: (اَلْحَمْدُ لِلهِ)، دە جار بڵێ: (اَللهُ أَكْبَرُ)، دە جار بڵێ: (أَسْتَغْفِرُاللهَ).

**٢- ﴿ زیکری دوای نوێژی بەیانی‌و مەغریب بە تایبەتی ﴾**

کە سەلامت داوە لەو دوو نوێژە، پێش ئەوەی لە شوێنی خۆت لابچی‌و پێش هەموو قسەیەك دە جار بڵێ: ﴿لَاإِلَهَ إِلَّااللهُ وَحْدَهُ لَاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ رواهما الترمذي عن ابي‌ذر وعمارة.

ئینجا سێ جار بڵێ: ﴿رَضِينا بِاللهِ رَبّاً، وَبِالإسْلامِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ رَسُولاً﴾ رواه اصحاب السنن. ئینجا حەفت جار بڵێ: ﴿اَللّهُمَّ أَجِرْني مِنَ النّارِ﴾ رواه ابوداود.

## ٢- ﴿ زیکری هەر پێنج نوێژەکان بە گشتی ﴾

یەکەم: ﴿عَنْ ثَوْبانَ ﷺ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إذا انْصَرَفَ مِنْ صَلاتِهِ إسْتَغْفَرَ اللهَ ثَلاثاً، فَقالَ:﴾ کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەلامی ئەداوە لە نوێژ، سێ جار ئەیفەرموو: (أسْتَغْفِرُالله)، ئینجا ئەیفەرموو: ﴿اَللّهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ، وَمِنْكَ السَّلامُ، تَبارَكْتَ يا ذاالْجَلالِ وَالإكْرامِ﴾ رواەمسلم.

دووەم: ئایەتەلکورسی ﴿عَنْ أَبِي أُمامَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ قَرَأَ آيَةَالْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الْجَنَّةِ إلاّ الْمَوْتُ﴾ صححه ابن حبان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك دوای هەموو نوێژێکی فەرز ئایەتەلکورسی بخوێنێ، هیچ شتێ رێگەی بە هەشتی لێناگرێ تەنها نەمردنی رێگەی نادا.

سێیەم: پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژ ئەیفەرموو: ﴿لآإلَهَ إلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اَللّهُمَّ لا مانِعَ لِما أَعْطَيْتَ وَلا مُعْطِيَ لِما مَنَعْتَ وَلا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ﴾ رواەالشیخان.

چوارەم: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ سَبَّحَ دُبُرَكُلِّ صَلاةٍ ثَلاثاً وَثَلاثِينَ، وَحَمِدَ اللهَ ثَلاثاً وَثَلاثِينَ، وَكَبَّرَ اللهَ ثَلاثاً وَثَلاثِينَ، فَتِلْكَ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ﴾ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك لە دوای هەموو نوێژێك سی‌وسێ جار بڵێ: (سُبْحانَ الله)، سی‌وسێ جار بڵێ: (اَلْحَمْدُ لِلّه)، سی‌وسێ جار بڵێ: (اَللهُ أكْبَر)، ئەوە ئەکاتە نەوەد و نۆ، وەك ژمارەی ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە ﴿وَقالَ تَمامَ الْمأةِ﴾ ئینجا بۆ تەواوکردنی ژمارە سەد، جارێك بڵێ: ﴿لآإلَهَ إلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، بە گوتنی ئەو زیکرانە ﴿غُفِرَتْ خَطاياهُ وَلَوْ كانَ مِثْلَ زَبَدِالْبَحْرِ﴾ رواه مسلم، خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش ئەبێ، هەرچەند وەك کەفی دەریا زۆر بن.

پێنجەم: دە جار بڵێ: ﴿لآإلَهَ إلاّاللهُ﴾ رواه الترمذي.

شەشەم: ﴿عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ رضي الله عنهما: أنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ-حِينَ يَنْصَرِفُ النّاسُ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ-كانَ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ﴾ رواەالشیخان، واتە: دەنگ هەڵێنان بەو زیکرەی دوای نوێژەواجبەکان-کە نوێژ ئەکرا- لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبوو.

ئیمامی (الشافعی) ئەفەرموێ: ئەگەر ئیمام ئەیویست لێی فێرە زیکر ببن، با دەنگ هەڵێنێ تا ئەزانێ: لێی فێر بون، ئینجا دەنگی نزم ئەکاتەوە.

(فَصْلٌ) وَالْمَرْأَةُ تُخالِفُ الرَّجُلَ فِي خَمْسَةِ أَشْياءَ: فَالرَّجُلُ يُجافِي مِرْفَقَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، وَيُقِلُّ بَطْنَهُ عَنْ فَخِذَيْهِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، وَيَجْهَرُ فِي مَوْضِعِ الْجَهْرِ، وَإِذا نابَهُ شَيْءٌ فِي الصَّلاةِ سَبَّحَ،

---

## ﴿ دوعا كردن له دواى نويژمكان ﴾

﴿عَنْ أَبِي أُمامَةَ ﷺ: قِيلَ: يارَسُولَ اللهِ ﷺ أَيُّ الدُّعاءِ أَسْمَعُ؟ قالَ: جَوْفَ اللَّيْلِ الآخِرَ، وَدُبُرَ الصَّلَواتِ الْمَكْتُوباتِ﴾ رواه الترمذي، پرسيار له پيغهمبهر ﷺ كرا: ئايا كام دوعا زوتر قبولّ ئهبيّ؟ فهرمووى: له ناوهندى كۆتاييشهو و له دواى نويژه واجبهكان.

ئينجا بزانه: (اَلْحَمْدُلِلَّه)و سهلاوات ليدان پيش دوعاكردن سوننهته ﴿عَنْ فُضالَةَ ﷺ: دَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَقالَ: اَللَّهُمَّ اغْفِرلِي وَارْحَمْنِي. فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: عَجِلْتَ أَيُّها الْمُصَلِّي، إِذا صَلَّيْتَ فَقَعَدْتَ، فَاحْمَدِاللهَ بِما هُوَ أَهْلُهُ، وَصَلِّ عَلَيَّ، ثُمَّ ادْعُهُ﴾ رواه الترمذي، پياويك هاته مزگهوت نويژى كرد، ئينجا دوعاى كردو گوتى: خوايه ليم خۆش ببهو رهحمم پیّ بكه. ئينجا پيغهمبهر ﷺ فهرمووى: پهلهت كرد ئهى نويژكهر، ههر كاتیّ نويژت كرد، ئينجا دانيشتى، سوپاسى خوا بكه بهو جۆرهى شاياني گهورهييهتى، واته: بلّیّ: (اَلْحَمْدُلِلّه)، وه سهلاوات له سهر من لیّبده، ئينجا دوعابكه.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسى جياوازى پياو و ئافرهت له نويژدا ﴾

(وَالْمَرْأَةُ) ئافرهت (تُخالِفُ الرَّجُلَ) جياوازه له نيرينه، كاتى نويژكردن (فِي خَمْسَةِأَشْياءَ) له پينج شتدا يهكهم: (فَالرَّجُلُ) ههرچى نيرينه بیّ (يُجافِي) سوننهته دوور بخاتهوه (مِرْفَقَيْهِ) ههردوو ئهنيشكهكانى (عَنْ جَنْبَيْهِ) له ههردوو تهنيشتهكانى.

دووهم: (وَيُقِلُّ بَطْنَهُ) زگىخۆى بهرز بكاتهوه (عَنْ فَخِذَيْهِ) له ههردوو رانهكانى، ههروهها ئهژنۆيهكانى به قهد يهك بست ليك دوور بخاتهوه (فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ) له كاتى ركووعو سوجود وهها ئهكا ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ بُحَيْنَةَ ﷺ: كانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ بَياضُ إِبْطَيْهِ﴾ رواه الشيخان، كاتیّ پيغهمبهر ﷺ نويژى ئهكردو سوجدهى ئهبرد، دهستهكانى ئهوهنده له تهنيشتهكانى دوور ئهخستنهوه: تا سپيايى بن ههنگلى دهر ئهكهوت. ﴿وَعَنْ أَنَسٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ وَلايَنْبَسِطْ أَحَدُكُمْ ذِراعَيْهِ إِنْبِساطَ الْكَلْبِ﴾ رواه الشيخان، پيغهمبهر ﷺ فهرمووى: خۆتان راست بكهن له سوجدهدا، وهك سهگ باسكتان دامهنيّنه سهر زهمين.

سیّيهم: (وَيَجْهَرُ) پياو به دهنگ بخوينیّ (فِي مَوْضِعِ الْجَهْرِ) لهو كاتانهى به دهنگ ههلّيّنان نويژيان تیّدا ئهكریّ: كه باسمان كردن له فهسلیرابردودا.

چوارهم: (وَإِذا نابَهُ شَيْءٌ) كاتیّ پياو شتيكى لیّرووئهدا (فِي الصَّلاةِ) له ناو نويژدا: وهك ئاگاداركردنهوهى ئيمام، يان كهسيكىتر (سَبَّحَ) سوننهته بلیّ: (سُبْحانَ اللهِ)،

وَعَوْرَةُ الرَّجُلِ مَا بَيْنَ سُرَّتِه وَرُكْبَتِه. وَالْمَرْأَةُ تَضُمُّ بَعْضَها إِلَىٰ بَعْضٍ، وَتَخفِضُ صَوْتَها بِحَضْرَةِ الرِّجالِ الأَجانِبِ، وَإِذا نابَها شَيْءٌ فِي الصَّلاةِ صَفَّقَتْ، وَجَمِيعُ بَدَنِ الْحُرَّةِ عَوْرَةٌ إِلاَّ وَجْهَها وَكَفَّيْها، وَالأَمَةُ كَالرَّجُلِ.

---

﴿عَنْ سَهْلِ بنِ سَعْدٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ وَإِنَّما التَّصْفِيقُ لِلنِّساءِ﴾ رواه‌الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: هه‌ر كه‌سێك شتێكی لێ‌ڕوودا له‌ ناو نوێژدا: ئه‌گه‌ر پیاو بوو، با بڵێ: (سُبْحانَ اللهِ)، به‌ڵام با ئافره‌ت چه‌پڵه‌ لێبدا، واته‌: به‌ره‌ده‌ستی‌ڕاسته‌ی له‌ پشته‌ده‌ستی‌چه‌په‌ی بدا.

پێنجه‌م: (وَعَوْرَةُ الرَّجُلِ) عه‌وره‌تی‌نێرینه‌ هه‌رچه‌ند منداڵیش بێ (مَا بَيْنَ سُرَّتِه وَرُكْبَتِه) نێوان ناوك‌و ئه‌ژنۆیه‌تی ﴿عَنْ جابِرٍ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذَا كانَ الثَّوْبُ وَاسِعاً فَالْتَحِفْ بِه-يَعْنِي فِي الصَّلاةِ- وَإِنْ كانَ ضَيِّقاً فَاتَّزِرْ بِهِ﴾ رواه‌الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر جله‌كه‌ت به‌رین بوو، خۆتی له‌ ناو بپێچه‌، وه‌ ئه‌گه‌ر ته‌سك بوو، وه‌ك په‌شته‌ماڵ لای خواره‌وه‌ی پێ دابپۆشه‌. واته‌: (إِزار) به‌ په‌شته‌ماڵی نێوان ناوك‌و ئه‌ژنۆ ئه‌گوترێ.

(وَالْمَرْأَةُ) به‌ڵام ئافره‌ت، واته‌: مێینه‌ هه‌رچه‌ند منداڵیش بێ (تَضُمُّ بَعْضَها) ئه‌ندامه‌كانی ئه‌لكێنێ (إِلَىٰ بَعْضٍ) به‌ ئه‌ندامه‌كانی‌تری، واته‌: ئه‌نیشكه‌كانی ئه‌لكێنێ به‌ ته‌نیشته‌كانیه‌وه‌ له‌ ڕوكوع‌و سوجده‌داو زگی ئه‌لكێنێ به‌ ڕانه‌كانیه‌وه‌ له‌ كاتی سوجده‌دا، چونكه‌ وه‌ها باشتر داده‌پۆشرێ، وه‌ له‌ حه‌دیسێكی بێ‌هێزدا هاتوه‌: ﴿مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى امْرَأَتَيْنِ تُصَلِّيانِ، فَقالَ: إِذاسَجَدْتُما فَضُمَّا بَعْضَ اللَّحْمِ إِلَى الأَرْضِ، فَانَّ الْمَرْأَةَ لَيْسَتْ فِي ذَلِكَ كَالرَّجُلِ﴾ رواه أبوداود والبيهقي مرسلاً، پێغه‌مبه‌رﷺ به‌ لای دوو ئافره‌تدا ڕابرد كه‌ نوێژیان ئه‌كرد، فه‌رمووی: كاتێ سوجده‌تان برد ئه‌ختێك خۆتان بلكێنن به‌ زه‌مین، چونكه‌ له‌ سوجده‌دا ئافره‌ت وه‌ك پیاو نیه‌.

(وَتَخْفِضُ صَوْتَها) هه‌روه‌ها ئافره‌ت ده‌نگی خۆی نزم ئه‌كا (بِحَضْرَةِ الرِّجالِ الأَجانِبِ) ئه‌گه‌ر پیاوی بێگانه‌ گوێی له‌ ده‌نگی ئه‌بو، ئه‌وه‌ك شتێكی بێ‌شه‌رعی ڕوو بدا.

(وَإِذا نابَها شَيْءٌ) ئه‌گه‌ر ئافره‌ت شتێكی لێ‌ڕوو بدا (فِي الصَّلاةِ) له‌ ناو نوێژدا (صَفَّقَتْ) با چه‌پڵه‌ لێبدا: به‌و شێوه‌ی باسمان كرد.

(وَجَمِيعُ بَدَنِ الْحُرَّةِ عَوْرَةٌ) هه‌موو لاشه‌ی ئافره‌ت عه‌وره‌ته‌ (إِلاَّ وَجْهَها وَكَفَّيْها) ته‌نها ڕووخسارو له‌په‌ده‌ستی له‌ نوێژدا عه‌وره‌ت نیه‌، خوای گه‌وره‌ ئه‌فه‌رموێ: ﴿وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَاظَهَرَ مِنْهَا﴾ واته‌: نابێ ئافره‌تان جوانی‌خۆیان به‌ ده‌ر بخه‌ن جگه‌ له‌و شوێنانه‌ی له‌ كاتی‌كاركردن به‌ ده‌ر ئه‌كه‌ون: كه‌ ته‌نها له‌په‌ده‌ست و ڕووخساره‌.

(وَالأَمَةُ) (جارية)، واته‌: كۆیله‌ی مێ (كَالرَّجُلِ) وه‌كو پیاوه‌، واته‌: له‌ نوێژدا عه‌وره‌تی نێوان ناوك‌و ئه‌ژنۆیه‌تی.

(فَصْلٌ) وَالَّذِى يُبْطِلُ الصَّلاَةَ أَحَدَ عَشَرَ شَيْئاً: اَلْكَلاَمُ الْعَمْدُ، وَالْعَمَلُ الْكَثِيرُ، وَالْحَدَثُ، وَحُدُوثُ النَّجاسَةِ،

---

﴿ئاگاداری﴾: ئەو عەورەتەی باسمان کرد عەورەتی نوێژ بوو، بەڵام بۆ تەماشاکردنی پیاوی بێگانە، ڕووخسار و دەستو گشت ئەندامەکانیتری ئافرەت عەورەتە، جیاوازی ئافرەتی ئازاد و کۆیلە نیە، هەروەك لە(پەرتووکی ژن مارەکردن)دا باسی ئەکەین،إن شاءالله تعالى.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەوشتانەی نوێژ بەتاڵ ئەکەنەوە ﴾

(وَالَّذِى يُبْطِلُ الصَّلاَةَ) ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ ئەکەنەوە (أَحَدَعَشَرَ شَيْئاً) یانزە شتن: یەکەم: (اَلْكَلاَمُ الْعَمْدُ) قسەکردنی بە قەسدییە، هەرچەند تەنها دوو پیتیش بێ: وەك بڵێ: (ئا)، یان (با)، یان (نەء)، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَذِه الصَّلاَةَ لاَ يَصْلُحُ فِيها شَيْءٌ مِنْ كَلاَمِ النَّاسِ، إِنَّما هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِراءَةُ الْقُرآنِ﴾ رواەمسلم، ناگونجێ لە ناو ئەو نوێژەدا قسەی ئادەمیزادان بکرێ، ئەبێ تەنها تەسبیحاتو تەکبیرو خوێندنی قورئانی تێدا بکرێ.

بەڵام ئەگەر بە دەست خۆی نەبو: ووشەیەك، یان دوو ووشەی لە دەم دەرچوون، یان لە بەر کۆکە، یان پێکەنین، یان گریان-کە دەستەڵاتی بە سەردا نەبێ- دوو ووشە، یان سێی بە دەمدا هاتن، بە ئەوانە نوێژ بە تاڵ نابێ.

دووەم: (وَالْعَمَلُ الْكَثِيرُ) جموجۆڵی زۆرە، بۆ وێنە: دوو ئاقاو، یان دوو جولەیتر-بە هەر ئەندامێك بێ- بە کەم دائەندرێ، بەڵام سێ زۆرەو نوێژ بەتاڵ ئەکەنەوە ئەگەر بە دوای یەکدا بن ﴿عَنْ أَبِي قَتادَةَﷺ: كانَ رَسُولُ اللهِﷺ: يُصَلِّي وَهُوَ حاملٌ أُمامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ، فَإِذا سَجَدَ وَضَعَها وَإِذا قامَ حَمَلَها﴾ رواەالشيخان، پێغەمبەرﷺ لەو کاتەی نوێژی ئەکرد، کیژۆڵەیەکی-کە ناوی ئومامە بوو-هەڵئەگرت، جا کاتێ سوجدەی ئەبرد دایئەنا، کە هەڵئەستاوە هەڵیئەگرتەوە. مەبەست ئەوەیە: ئەو جولەیەی پێغەمبەرﷺ کەم بوو، چونکە بە دوای یەکدا نەکراوە.

سێیەم: (وَالْحَدَثُ) بێدەستنوێژبوونە ﴿عَنْ عَلِيِّ بن طَلْقٍﷺ: قالَ النَّبِيُّﷺ: إِذا فَسا أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاَةِ فَلْيَنْصَرِفْ وَلْيَتَوَضَّأْ وَلْيُعِدِ الصَّلاَةَ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کاتێ یەکێکتان لە ناو نوێژدا بایەکی لێدەرچوو، با بڕوا دەستنوێژ بشواتەوەو نوێژەکەش دووبارە بکاتەوە.

چوارەم: (وَحُدُوثُ النَّجاسَةِ) پەیدابوونی پیسییە لە جلەکانی، یان لە ئەندامەکانی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ جلوبەرگی خۆت پاك بکەوە. ﴿وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّﷺ لاِمْرَأَةٍ: فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي﴾ رواەالشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو خوێنەی پڕژاوەتە جلوبەرگت بیشۆرەو نوێژ بکە.

وَانْكِشافُ الْعَوْرَة، وَتَغْيِيرُ النِّيَّة، وَاسْتِدْبارُ الْقِبْلَة، وَالْأَكْلُ، وَ الشُّرْبُ، وَالْقَهْقَهَةُ، وَالرِّدَّةُ.

پێنجەم: (وَانْكِشافُ العَوْرَةِ) دەرکەوتنی عەورەتە، جا ئەگەر زوو دایبپۆشێتەوە، نوێژی بەتاڵ نابێ (بۆ بەڵگە: بگەڕێوە بۆ مەرجەکانی نوێژ).

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر پیاو، یان ئافرەت هیچیان دەست نەکەوت عەورەتی خۆیان پێ داپۆشن، واجبە: نوێژەکەیان بکەن و دووبارەکردنەوەی ناوێ.

شەشەم: (وَتَغْيِيرُالنِّيَّةِ) گۆڕینی نیەتی ئەم نوێژەیە بۆ نوێژێکیتر، واتە: ئەو نوێژەی نیەتی لە ناودا گۆڕیوە لەگەڵ ئەو نوێژەی نیەتی بۆ هێناوە، هەردووکیان بەتاڵ ئەبن، چونکە هەردووکیان ناتەواون.

حەفتەم: (وَاسْتِدْبارُ الْقِبْلَةِ) لادانە لە ئاستیقیبلە، جا ئەگەر ماوەکە کەم بوو و زوو گەڕاوە لای قیبلە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، بەڵام ئەگەر ماوەکە زۆر بوو، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئەوکاتانەی وازهێنان لە قیبلە نوێژ بەتاڵ ناکا، لە مەرجەکانی نوێژدا باسمان کردن.

هەشتەم: (وَالأَكْلُ) خواردنە بە قەسدی، هەرچەند کەمیش بێ.

نۆیەم: (وَالشُّرْبُ) خواردنەوەیە بە قەسدی، هەرچەند کەمیش بێ. ئینجا بزانە: ئەگەر شتێکی شیرنی خوارد، ئینجا لە ناو نوێژدا شیرینیەکەی قوتدا، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێ، چونکە ئەوانە زۆر دژایەتییان لەگەڵ نوێژ هەیە.

دەیەم: (وَالْقَهْقَهَةُ) پێکەنینی بە دەنگە، چونکە پیتی لەگەڵ دەرئەچێ و ئەبێتە قسەکردن، وەك گوتمان.

یانزەم: (وَالرِّدَّةُ) کافربوونە، چونکە کافربوونیش دژی خواپەرستییە.

﴿پاشکۆ﴾: یەکەم: ڕابردن حەرامە لە پێش کەسێك کە نوێژ ئەکاو سنووری بۆ خۆی داناوە، بەڵام نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لأَنْ يَقِفَ أَحَدُكُمْ مأةَ عامٍ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْ أَخِيهِ وَهُوَ يُصَلِّي﴾ رواه الترمذي، هەر یەکێك لە ئێوە سەد ساڵ بوەستێ باشترە، لەوەك بە پێش برایخۆیدا ڕابرێ کاتێ نوێژ ئەکا.

دووەم: ئاوڕدانەوە مەکروهە، بەڵام نوێژ بە تاڵ ناکا، پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: ﴿لاَيَزالُ اللهُ مُقْبِلاً عَلَىالْعَبْدِ وَهُوَ فِيصَلاَتِه مالَمْ يَلْتَفِتْ، فَإذا الْتَفَتَ إِنْصَرَفَ عَنْهُ﴾ رواه النسائي، بەردەوام خوایگەورە ڕووی لە بەندەی خۆیەتی لە کاتی نوێژکردنی، بەڵام کە ئاوڕی دایەوە لە ناو نوێژدا، خوا وازی لێئەهێنێ.

سێیەم: پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: ﴿لاَصَلاَةَ بِحَضْرَةِ الطَّعامِ وَلاَهُوَ يُدافِعُهُ الأَخْبَثانِ﴾ رواه مسلم، نوێژکردن مەکروهە کاتێك خواردن ئامادە ئەبێ بۆ کەسێك برسی بێ، یان کاتێ میزی بێ، یان پیساییەکەیتر.

(فَصْلٌ) وَرَكَعاتُ الْفَرَائِضِ سَبْعَ عَشْرَةَ رَكْعَةً: فِيهَا أَرْبَعٌ وَثَلاثُونَ سَجْدَةً، وَأَرْبَعٌ وَتِسْعُونَ تَكْبِيرَةً، وَتِسْعُ تَشَهُّداتٍ،

---

چوارەم: سوننەتە کە دەچێتە ناو مزگەوت بڵێ: ﴿أَللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلَى مُحَمَّدٍ، رَبِّ اغْفِرِ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوابَ رَحْمَتِكَ﴾ رواه الترمذي، ئینجا (بِسْمِ اللهِ) بکاو، قاچی ڕاستەی لە پێشان بباتە ژوورەوە، هەروەها پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: ﴿إِذا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلايَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ﴾ رواه‌الشیخان، کاتێ یەکێك لە ئێوە چووە ناو مزگەوت، با دانەنیشێ تا دوو ڕەکعەت نوێژ ئەکا. جا بزانە: بەم دوو ڕەکعەتە ئەگوترێ: (تَحِيَّةُالْمَسْجِدِ).

ئینجا کە لە مزگەوت هاتە دەرەوە، قاچی چەپەی لە پێشان ئەباتە دەرەوەو ئەڵێ: ﴿أَللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلَىمُحَمَّدٍ، رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوابَ فَضْلِكَ﴾ رواه الترمذي عن فاطمة رَضِيَ اللهُ عَنها.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ژمارەی ڕەکعەتەکانی نوێژەکان ﴾

(وَرَكَعاتُ الْفَرائِضِ) هەموو ڕەکعەتەکانی نوێژەواجبەکان (سَبْعَ عَشْرَةَ رَكْعَةً) حەڤدە ڕەکعەتن لە شەو و ڕۆژێکدا، واتە: نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕەکعەتە، عەسر چوار ڕەکعەتە، مەغریب سێ ڕەکعەتە، عیشا چوار ڕەکعەتە، سبەینە دوو ڕەکعەتە، بەلام ئەگەر هەینی بوو، ئەبنەوە پانزە ڕەکعەت، وە ئەگەر لە سەفەر بوو، ئەبنەوە یازدە، هەروەك لە مەودوا باسی ئەکەین ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَوَّلُ مافُرِضَتِ الصَّلاةُ رَكْعَتانِ إلاَّالْمَغْرِبَ فَإِنَّها وِتْرُ النَّهارِ﴾ رواه الامام احمد ﴿ثُمَّ هاجَرَ النَّبِيُّﷺ فَفُرِضَتْ أَرْبَعاً وَأُقِرَّتْ صَلاةُ السَّفَرِ عَلَى الأَوَّلِ﴾ رواه البخاري، (عائِشَة) -خوا لێی ڕازی بێ- فەرموویەتی: یەکەمجار هەموو نوێژەکان دوو ڕەکعەتی بوون، بەلام مەغریب سێ ڕەکعەتی بوو، ئینجا پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، نوێژەکان -جگە لە مەغریب و سبەینە- بوونە چوار ڕەکعەتی، بەلام لە سەفەردا هەروەك جاری پێشوو بە دوو ڕەکعەتی مانەوە.

(فِيها) لەو حەڤدە ڕەکعەتانەدا هەیە (أَرْبَعٌ وَثَلاثُونَ سَجْدَةً) سی‌وچوار سوجدە: چونکە هەر ڕەکعەتێك دوو سوجدەی تێدایە، واتە: دوو جاران حەڤدە=ئەکاتە سی‌وچوار.

(وَأَرْبَعٌ وَتِسْعُونَ تَكْبِيرَةً) نەوەدو چوار (اَللهُ أَكبَر)یان تێدایە: چونکە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و عیشا: هەر یەکەیان بیستو دوو (اَللهُ أَكبَر)ی تێدایە، ئەوە شەستو شەش، سبەینە یازدەی تێدایە، مەغریب حەڤدەی تێدایە=ئەکاتە نەوەدو چوار.

(وَتِسْعُ تَشَهُّداتٍ) نۆ تەحیاتیان تێدایە: نوێژی بەیانی یەك تەحیاتی تێدایەو، هەر یەکێکیش لە چوارەکانیتر دوو تەحیاتیان تێدایە.

وَعَشْرُ تَسْليمات، وَمائَةٌ وَثَلاثٌ وَخَمْسُونَ تَسْبيحَةً، وَجُمْلَـةُ الأرْكـان في الصَّـلاةِ مائَـةٌ وَسِـتَّةٌ وَعِشْـرُونَ رُكْنـاً: في الصُّـبْحِ ثَلاثُـونَ رُكْنـاً، وَفـي الْمَغْـرِبِ إثْنانِ وَأَرْبَعونَ رُكْناً، وَفِي الرُّباعِيَّةِ أَرْبَعَةٌ وَخَمْسُونَ رُكْناً.

وَمَنْ عَجَزَ عَنِ الْقِيامِ فِي الْفَرِيضَةِ: صَـلّى جالِسـاً، وَمَـنْ عَجَـزَ عَـنِ الْجُلُـوسِ صَلّى مُضْطَجِعاً، وَمَنْ عَجَزَ عَنْهُ صَلّى مُسْتَلْقِياً.

---

(وَعَشْرُ تَسْلِيماتٍ) ده سـەلامدانەوەیان تێدایـە: هـەر یـەكێك دوو سـەلام=ئەكاتـە دە.

(وَمائَةٌ وَثَلاثٌ وَخَمْسُونَ تَسْبِيحَةً) سەدو پـەنجاو سـێ تەسـبیحاتیان تێدایـە: چـونكە هـەر ڕەكعەتێك تۆ (سُبْحانَ رَبِّي)ی تێدایە، واتە: تۆ جاران حەڤدە=ئەكا سەدو پەنجاو سێ.

(وَجُمْلَةُ الأرْكانِ) ژمارەی ڕوكنەكان بە كورتی (فِي الصَّلاةِ) لەو پێنج فەرزانـەدا (مـائَةٌ وَسِـتَّةٌ وَعِشْرُونَ رُكْناً) سەدو بیستو شـەش ڕوكـن: (فِي الصُّبْحِ) لـە نوێـژی سـبەینەدا (ثَلاثُـونَ رُكْناً) سی ڕوكن هەنە (وَفِي الْمَغْرِبِ) لە نوێژی مەغریبدا (إثْنـانِ وَأَرْبَعـونَ رُكْنـاً) چـلو دوو ڕوكن هەنە (وَفِي الرُّباعِيَّةِ) لە هەر یەكێك لەو سێ نوێژانەی چوار ڕەكعتین (أَرْبَعَةٌ وَخَمْسُونَ رُكْناً) پەنجاو چوار ڕوكن هەنە.

(جـا ئەی خـوێنەری خـۆشەویست، لەجیاتی من ئەو ڕوكنانە بە درێژی بۆ خۆت بژمێرە).

## ﴿ باسی نوێژكردن بە دانیشتنەوە ﴾

(وَمَنْ عَجَزَ عَنِ الْقِيـامِ) هـەر كەسـێك توانـای نـەبو بـە پێـوە نوێـژ بكـا (فِي الْفَرِيضَـةِ) لـەو نوێژانەی كە واجبن، جا لە بەر نەخۆشی نەیتوانی بە پێوە بیكا، یان شوێنەكە زۆر نـەوی بوو و نەیئەتوانی خۆی ڕاست بكاتەوە، یان لە ترسـی دوژمـن نەئـەوێرا هەڵسـێتەوە سـەر پێ؟ چونكە خۆی لە مەكۆ نابو، یان بوبووە چاودێری جموجوڵیدوژمن، ئەگـەر هەڵسـابا سەرپێ ئاشكرا ئەبوو، هەر یەكێك لەوانە (صَلّى جالِساً) نوێژەفەرزەكەی بـە دانیشـتوویی ئەكا، ئینجا بۆ ڕوكووع خۆی دائەنێتەوە خـوارەوە تـا نێوچـاوانی بەرانبـەر ئەژنۆیـەكانی ئەبێ، ئینجا سوجدەش-بە تەواوی- ئەبا.

**﴿ئاگـاداری﴾**: ئەگـەر ئـەیتوانی بـە پێـوە نوێـژ بكـا بـەڵام پشـتی چەمابو: جـا لـە بـەر نەخۆشی، یان شوێنەكە تەختێك نەوی بـوو، ئـەوە ئـەبی بـە چـەماوەیی نوێـژ بكـاو، بـۆ ڕوكووعیش زیاتر خۆی كووڕ بكاتەوە، ئینجا سوجدەش-بە تەواوی- بیبا.

(وَمَنْ عَجَزَ عَنِ الْجُلُوسِ) هەركەسـێك لـە دانیشـتنەوەش نەیئـەتوانی نوێـژبكا، چـونكە زۆر نـەخۆش بـو، یـان دەسـتو قاچـی بەسـترا بـو (صَـلّى مُضْـطَجِعاً) ڕوو لـە قیبلـە لەسـەر تەنیشتی ڕاستەی نوێژ ئەكا.

(وَمَنْ عَجَزَ عَنْهُ) هەركەسێك نەیئەتوانی لە سەر تەنیشت نوێژ بكا (صَلّى مُسْتَلْقِياً) لە سەر پشت درێژ ئەبێو بەرە پێی لە قیبلە ئەكاو شتێك لە بن سەری دائـەنێو نوێـژ ئـەكا، جا

(فَصْلٌ) وَالْمَتْرُوكُ مِنَ الصَّلاَةِ ثَلاَثَةُ أَشْياءَ: فَرْضٌ، وَسُنَّةٌ، وَهَيْئَةٌ، فَالْفَرْضُ: لاَ يَنُوبُ عَنْهُ سُجُودُ السَّهْوِ، بَلْ إِنْ ذَكَرَهُ وَالزَّمانُ قَرِيبٌ أَتَى بِهِ وَبَنَى عَلَيْهِ وَسَجَدَ لِلسَّهْوِ،

---

ئەوانە-هەردووكیان-چۆن بۆیان بگونجێ سوجدەو ڕوكووع ئەبەن، ئەگەر نەگونجا، ئەبێ بە سەری‌خۆیان ئاماژە بۆ سوجدەو ڕوكووع بكەن، جا ئەگەر نەیانتوانی، با بە چاو ئاماژەیان بۆ بكەن، ئەگەر هەر نەیانتوانی، ئەبێ بە دڵ نوێژ بكەن، واتە: تا هۆشی مابێ، نابێ واز لە نوێژ بێنێ:

﴿عَنْ عمران بن حصين ﷺ: قالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: صَلِّ قائماً، فَانْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقاعداً، فَانْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ﴾ رواه البخاري، وزادالنسائي: ﴿فَإِنْ لَـمْ تَسْـتَطِعْ فَمُسْـتَلْقِيًا﴾ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژ بە پێوە بكە، ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتوویی بیكە، ئەگەر نەتتوانی لە سەر تەنیشت بیكە، ئەگەر نەتتوانی لە سەر پشت بیكە.

﴿ئاگاداری﴾: جگە لە چاوێرو مەكۆچی- ئەوانە- هیچیان دووبارەكردنەوەی نوێژیان لە سەر نیە.

﴿پاشكۆ﴾: ئەوەی گوتمان هەمووی بۆ نوێژەفەرزەكان بوو، بەڵام سوننەت بە هەموو جۆرێك دروستە، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ صَلَّى قاعداً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقائِمِ، وَمَـنْ صَلَّى نائِماً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقاعِدِ﴾ رواه أصحاب السنن، هەر كەسێك بە دانیشتوویی نوێژی سوننەت بكا، نیوەی خێری بە پێوەی هەیە، وەهەر كەسێك بە پاڵدانەوە نوێژی سوننەت بكا، نیوەی خێری دانیشتووی هەیە. بەڵام ئەبێ بۆ ڕوكووع‌و سوجدە دابنیشێ.

جا بزانە: قورئان خوێندن‌و هەموو زیكرێكی‌تریش بە پاڵدانەوەو لە سەر پشت-وەك دانیشتن- دروستەو خێری هەیە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی سوجدەی (سَهو) ﴾

(وَالْمَتْـرُوكُ مِـنَ الصَّلاَةِ) ئەو شتەی لە نوێژ لەبیر ئەچێ (ثَلاَثَـةُ أَشْـياءَ) سێ جۆرە: جۆری‌یەكەم: (فَـرْضٌ) واجبە، وەك ئەو ڕوكنانەی باسمان كردن. جۆری‌دووهەم: (وَسُنَّةٌ) سوننەتەو بەشێكە لە نوێژ. جۆری‌سێیەم: (وَهَيْئَةٌ) سوننەتەو بەشێك نیە لە نوێژ، وەكو باسمان كردن.

(فَالْفَرْضُ) جا ئەو واجبەی نەیكردوە (لاَ يَنُوبُ عَنْـهُ) نابێتە جێگری ئەو واجبە نەكراوە (سُجُودُالسَّهْوِ) سوجدەی سەهوو (بَلْ إِنْ ذَكَرَهُ) بەڵكو ئەگەر لە دوای سەلامدانەوە هاتەوە بیری كە واجبەكەی نەكردوە (وَالزَّمانُ قَرِيبٌ) ماوەی هاتنەوەبیری نزیك بوو لە سەلامدانەوە (أَتَى بِهِ) پێویستە بگەڕێتەوە ناو نوێژەكە، بۆ كردنی ئەو واجبەو (وَبَنَى عَلَيْهِ) هەر لە سەر واجبەنەكراوەكە دەست بە نوێژ ئەكاتەوە، بەو مەرجەی زۆر قسەی نەكردبێ‌و بێ‌دەستنوێژ نەبوبێ (وَسَجَدَ لِلسَّهْوِ) لە بەر ئەو سەهووە سوجدەی سەهوو ئەبا ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ:

وَالسُّنَّةُ: لاَيَعُودُ إِلَيْها بَعْـدَ التَّلَـبُّسِ بِـالْفَرْضِ، لَكِنَّـهُ يَسْـجُدُ لِلسَّـهْوِ عَنْهَـا، وَالْهَيْئَةُ: لاَيَعُودُ إِلَيْها بَعْدَ تَرْكِها، وَلاَيَسْجُدُ لِلسَّهْوِ عَنْها،

---

صَلَّى لَنا رَسولُ اللهِ ﷺ صَلاةَ الْعَصْرِ فَسَلَّـمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، فَقالَ ذُوالْيَدَيْنِ: أَقُصِـرَتِ الصَّلاَةُ أَمْ نَسِـيتَ يا رَسولَ اللهِ؟ فَقالَ: كُلُّ ذلِكَ لَمْ يَكُنْ. فَقالَ: قَدْ كَـانَ بَعْـضُ ذلِكَ. فَقالَ: أَصَدَقَ ذُوالْيَدَيْنِ؟ فَقالُوا: نَعَمْ. فَأَتَمَّ النَّبِيُّ ما بَقِيَ مِنَ الصَّلاةِ ثُمَّ سَـجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَالتَّسْلِيمِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەسری بە جەماعەت کرد، جا کە دوو ڕەکعەتی کردن سەلامی دایەوە، سەحابەیەك فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ کورت بۆتەوە، یان لەبیرت چوو؟ فەرمووی: هیچیان لەو دووانە نەبوە. سەحابەکە گوتی: شتێك هەر بووە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ڕاست ئەکا؟ سەحابەکان گوتیان: بەڵێ ڕاست ئەکا. جا پێغەمبەر ﷺ گەڕاوە ناو نوێژو ئەودوو ڕەکعەتەی مابون، تەواوی کردن و سوجدەی سەهووی برد.

جا بزانە: ئەگەر پێش سەلامدانەوەش هاتەوە بیری کە واجبێکی نەکردوە، نابێ سەلام بداتەوە تا واجبەکە ئەکا، بەو شێوەیەی لە کۆتایی ڕوکنەکانی نوێژدا باسمان کرد.

(وَالسُّنَّةُ) ئەو سوننەتانەی بەشێکن لە نوێژ: وەك قونووتی بەیانیو تەحیاتییەکەم، ئەگەر لەبیری چوو بیکا (لاَ يَعُودُ إِلَيْها) نابێ بگەڕێتەوە بۆ کردنی سوننەتەکە (بَعْدَالتَّلَبُّسِ بِالْفَرْضِ) پاش دەست پێکردنی واجبێك لە دوای نەکردنی ئەو سوننەتە:

بۆ وێنە: تەحیاتییەکەمی نەخوێندو تەواو هەڵساوە بۆ فاتیحەخوێندن، یان قونووتی نەخوێندو چوو دەستی بە سوجدە کرد، ئەوە نابێ بگەڕێتەوە بۆ تەحیاتەکەو قونووتەکە (لَكِنَّـهُ يَسْـجُدُ لِلسَّـهْوِ) بەڵام لە جیاتی نەکردنیان سوننەتە: سوجدەی سەهوو بیبا ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ بُحَيْنَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ قامَ مِنَ اثْنَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ لَمْ يَجْلِسْ بَيْنَهُما، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ دوو ڕەکعەتی لە نوێژینیوەڕۆ کردنو دانەنیشت تەحیاتییەکەم بخوێنێ، ئینجا کە نوێژەکەی تەواو کرد، دوو سوجدەی بردن و سەلامی دایەوە.

﴿ئاگـاداری﴾: ئەگەر تەحیاتییەکەمی نەخوێند بەڵام لە ئەندازەی ڕوکووع زیاتر هەڵنەستابۆوە، سوننەتە بگەڕێتەوە بیخوێنێ، هەروەها: ئەگەر قونووتی نەخوێند بەڵام دەستی بە سوجدە نەکردبو، سوننەتە بگەڕێتەوە بیخوێنێ.

(وَالْهَيْئَةُ) ئەو پانزە سوننەتانەی باسمان کردنو بەشێك نەبون لە نوێژ (لاَ يَعُودُ إِلَيْها) نابێ بۆیان بگەڕێتەوە (بَعْدَ تَرْكِها) پاش نەکردنیان (وَلاَ يَسْجُدُ لِلسَّهْوِ عَنْها) وە نابێ سوجدەی سەهوویان لەجیاتی بیا.

وَإِذا شَكَّ فِي عَدَدِ ما أَتَى بِهِ مِنَ الرَّكَعاتِ بَنَى عَلَى الْيَقِينِ -وَهُوَ الأقَلُّ- وَسَجَدَ لِلسَّهْوِ، وَسُجُودُ السَّهْوِ سُنَّةٌ، وَمَحَلُّهُ قَبْلَ السَّلَامِ.

---

(وَإِذا شَكَّ) هەر كاتێك گومانی لێپەیدابو (فِي عَدَدِ ما أَتَى بِهِ) دەربارەی ئەو ژمارەی کە کردویەتی (مِنَ الرَّكَعاتِ) لە ڕەکعەتەکانی نوێژ، واتە: کەوتە گومان: ئایا سێ ڕەکعەتی کردون، یان چوار (بَنَى عَلَى الْيَقِينِ) نوێژەکەی ئەکا لە سەر ئەو ژمارەیەی گومانی تێدا نیە (وَهُوَ) ئەو ژمارەبێگومانە (الأقَلُّ) ژمارە کەمەکەیە، واتە: وا دائەنێ تەنها سێ ڕەکعەتی کردون و هەڵئەستێ ڕەکعەتێکیتریش ئەکاو (وَسَجَدَ لِلسَّهْوِ) سونئەتە سوجدەی سەهوو ببا

﴿عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بنِ عَوْفٍ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذا سَها أَحَدُكُمْ فِي صَلاتِهِ: فَلَمْ يَدْرِ واحِدَةً صَلَّى أَوْ اثْنَتَيْنِ فَلْيَبْنِ عَلَى واحِدَةٍ، فَإِنْ لَمْ يَدْرِ ثِنْتَيْنِ صَلَّى أَوْ ثَلاثاً فَلْيَبْنِ عَلَى ثِنْتَيْنِ، وَإِنْ لَمْ يَدْرِ ثَلاثاً صَلَّى أَوْ أَرْبَعاً فَلْيَبْنِ عَلَى ثَلاثٍ، وَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ یەکێکتان کەوتە گومانو نەیزانی ئایا یەك ڕەکعەتی کردوە، یان دوو؟ با وا دابنێ تەنها یەك ڕەکعەتی کردوە، ئەگەر نەیزانی دوو ڕەکعەتی کردون، یان سێ؟ با وا دابنێ تەنها دوو ڕەکعەتی کردون، ئەگەر نەیزانی سێ ڕەکعەتی کردون، یان چوار؟ با وا دابنێ تەنها سێ ڕەکعەتی کردون، ئینجا پێش سەلامدانەوە دوو سوجدە ببا.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر کەسێك هاتەوە بیری کە ئەو ڕەکعەتەی ئێستا ئەیکا ڕەکعەتی پێنجەمە، ئەبی وازی لێبێنێو زوو بگەڕێتەوە بۆ تەحیات خوێندن، ئەگینا: نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێ، هەروەها ئەگەر لە دوای تەحیاتیئاخیر بە سەهوو هەڵساوە، دیسان ئەبی واز بێنێو دابنیشێتەوە بۆ سەلامدانەوە. جا لەو دوو جۆرەیە سونئەتە سوجدەی سەهوو ببا، ئینجا سەلام بداتەوە.

(وَسُجُودُالسَّهْوِ) هەردوو سوجدەکەیسەهوو (سُنَّةٌ) سونئەتن، ئەگەر سوجدەکانیش نەبا، نوێژەکەی دروستە (وَمَحَلُّهُ) شوێنی سوجدەیسەهوو (قَبْلَالسَّلَامِ) پێش سەلامدانەوەیە، جا بزانە: سونئەتە لەو دوو سوجدەیەدا بڵێ: (سُبْحانَ مَنْ لايَنامُ وَلا يَسْهُو).

## ﴿ باسی سوجدەی (تِلاوَة) ﴾

بزانە: چواردە ئایەت لە قورئانی پیرۆزدا هەنە، ووشەی سوجدەیان تێدایە، سونئەتە قورئان خوێنو ئەو کەسەی گوێی لێیە -پاش تەواوبوونی ئایەتەکە- سوجدەی(تلاوَة) ببەن ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: قالَ: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ السُّورَةَ الَّتِي فِيها السَّجْدَةُ، فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ مَعَهُ حَتَّى ما يَجِدُ أَحَدُنا مَكاناً لِمَوْضِعِ جَبْهَتِهِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ ئەو سوڕەتەی سوجدەی تێدایە ئەیخوێند، ئینجا سوجدەی ئەبرد، ئێمەش سوجدەمان ئەبرد، تا هەندێکمان شوێنی دەست نەئەکەوت نێوچاوانی لێدابنێ.

(فَصْلٌ) وَخَمْسَةُ أوْقات لاَ يُصَلّى فِيها إلاَّ صَلاَةٌ لَها سَبَبٌ: بَعْدَ صَلاَة الصُّبْحِ حَتّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَعِنْدَ طُلُوعِها حَتّى تَتَكامَلَ وَتَرْتَفِعَ قَدْرَ رُمْحٍ، وَإذا اسْتَوَتْ حَتّى تَزُولَ،

---

ئینجا سوجدەکان لەو سورەتانەدانە: دووانیان لە سورەتی(الحجّ)، یەکێك: لە (الأعْراف)و (الرّعد)و (النّحل)و (الإسْراء)و (مَرْيَم)و (الفُرْقان)و (النّمل)و (الم السّجدة)و (حم السّجدة)و (النّجم)و (الإنْشقاق)و (العَلَق).

جا لەگەڵ (اللهُ أكبَر)دا نیەتی سوجدەی (تِلاوَة) دێنێ‌و جارێکیتریش بۆ چوونە سوجدە ئەڵێ: (اللهُ أكبَر). ئینجا کە لە سوجدە هەڵساوە، ئەڵێ: (اللهُ أكبَر)، ئینجا دائەنیشێ‌و سەلام ئەداتەوە.

جا بزانە: سوجدەی (تِلاوَة) یەك سوجدەیە، سوننەتە تێیدا بڵێ: ﴿سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِه وَقُوَّتِه فَتَبارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخالِقِينَ﴾ رواه اصحاب السنن. جا بزانە: ئەبێ ئەم سوجدەیە مەرجەکانی نوێژی لێبێتەجێ.

## ﴿ باسی سوجدەی (شُكْر) ﴾

هەرکەسێك بەلایەکی لە سەر لاچوو، یان دڵخۆشیەکی پێگەیشت، سوننەتە سوجدەیەکی شوکر بۆ خودا ببا ﴿عَنْ أبي بَكْرَةَ ﷺ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ أَمْرٌ فَسُرَّ بِهِ فَخَرَّ لِلّهِ ساجِداً﴾ رواه الترمذي وأبوداود، پێغەمبەر ﷺ هەواڵێکی دڵخۆشکەری پێگەیشت، جا یەکسەر بۆ خوا کەوتە سوجدە.

جا بزانە: ئەم سوجدەیەش یەك سوجدەیە، وەکو سوجدەی (تِلاوَة)یە، ئەبێ مەرجەکانی نوێژی لێبێتەجێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو پێنج کاتانەی حەرامە نوێژیسوننەتیان تێدا بکرێ ﴾

(وَخَمْسةُ أوْقات) پێنج کات هەنە (لاَ يُصَلّىفيها) نابێ نوێژیسوننەتیان تێدا بکرێ (إلاَّ صَلاةٌ) تەنها جۆرە نوێژێك دروستە (لَها سَبَبٌ) کە هۆیەکیڕابردووی هەبێ: وەك قەزاکردنەوەی نوێژ، یان نوێژی مردوو، یان (تحيّةُالمَسْجِد)، یان سوننەتیدەستنوێژ، ئەوانە هەموویان لەو پێنج کاتانەدا دروستن، بەلام سوننەتی سەریەخۆ و نوێژی ئیستیخارەو سوننەتی ئیحرام دروست نین:

یەکەم: (بعْدَ صَلاة الصُّبحِ) پاش نوێژکردنی بەیانی نابێ هیچ نوێژێکی سوننەت بکا (حَتّى تطْلُعَ الشَّمْسُ) تا ڕۆژ دەرئەکەوێ.

دووەم: (وَعِنْدَ طُلُوعِها) کاتێ ڕۆژهەلات نابێ نوێژی سوننەت بکا (حَتّى تتكامَلَ) تا بە تەواوی ڕۆژ دەرئەکەوێو (وَتَرْتَفِعَ قدْرَ رُمْحٍ) بە ئەندازەی ڕمێك بەرز ئەبێتەوە.

سێیەم: (وَعِنْدَ الاسْتِواءِ) کاتێ ڕۆژ دێتە ناوەندی ئاسمان نابێ نوێژی سوننەت بکا (حَتّى تَزُولَ) تا ڕۆژ بەرەو چاوی ڕاستە لائەدا، بەلام ئەگەر نیوەڕۆیهەینی بوو، ئەوە

وَبَعْدَ صَلاَةِ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَعِنْدَ الْغُـرُوبِ حَتَّـى يَتَكامَـلَ غُرُوبُهـا. (فَصْلٌ) وَصَلاَةُ الْجَماعَةِ سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ،

---

دروسته نوێژیسوننەت بکا ﴿عَنْ عُقْبَةَ: ثَلاَثُ سـاعـات كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَنْهانـا أنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ وَأنْ نُقْبِرَ فِيهِنَّ مَوْتانا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بازِغَـةً حَتَّى تَرْتَفِـعَ، وَحِـينَ يَقُومُ قائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَتَضَيَّفُ الشَّـمْسُ لِلْغُـرُوبِ﴾ رواه مسلم، (عوقبه) ئەفەرموێ: لە سێ کاتدا پێغەمبەرﷺ نوێژ کردنو ناشتنی مردووی لە ئێمە قەدەغە ئەکرد، یەکەم: لە کاتی ڕۆژهەڵات تابە تەواوی بەرز ئەبۆوە. دووەم: لە کـاتی نیـوەڕۆ تـا ڕۆژ لایئەدا. سێیەم: لە کاتی زەردبوونی ڕۆژ بۆ ئاوابوون تا بە تەواوی ئاوا ئەبو.

چوارەم: (وَبَعْدَ صَلاَةِ الْعَصْرِ) لە پاش نوێژکردنی عەسر نابێ نوێژی سـوننەت بکـا (حَتَّـى تَغْرُبَ الشَّمْسُ) تا ڕۆژ ئاوا ئـەبێ ﴿عَنْ أبِي سَعِيدالخُدرِي: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ صَلاةَ بَعْـدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلاَ صَلاةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّىتَغِيبَ الشَّـمْسُ﴾ رواه الشـيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نوێژکردن دروست نیە پاش نوێژکردنی سبەینە تا ڕۆژ دەرئەکەوێ، وە نوێژکردن دروست نیە پاش نوێژکردنی عەسر تا ڕۆژ ئاوا ئەبێ.

پێنجەم: (وَعِنْدَ الْغُرُوبِ) لـە کـاتی ڕۆژئـاوابوون نابـێ نوێـژ بکـا (حَتَّـى يَتَكامَـلَ غُرُوبُهـا) تا بە تەواوی ئاوا ئەبێ.

﴿پاشکۆ﴾: لەو پێنج کاتانەدا تەوافـو نوێژکردن لە مەککەی پیرۆزدا دروستە ﴿عَنْ جُبَيْرِ بنِ مُطْعِمٍ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: يا بَنِيعَبدِمَناف لاَتَمْنَعُوا أحَداً طافَ بِهَذاالْبَيْتِ وَصَلَّى أيَّةَ ساعَةٍ شاءَ: مِنْ لَيْلٍ أوْنَهارٍ﴾ رواه أصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: هـیچ کەسـێك قەدەغە مەکەن کە بیەوێ تەوافی بەیت بکا، یان نوێژ لە مەککەدا بکا لە هەر کاتێکا خـۆی پێی خۆش بێ: شەو بێ، یان ڕۆژ بێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی نوێژکردنی بە جەماعەت ﴾

( **پێناسە** ): جەماعەت ئەوەیە جموجۆڵی نوێژەکەی خۆی ببەستێ بـە جموجـۆڵی نوێـژی یەکێکیتر، کە پێی ئەگوترێ: (ئیمام)، واتە: پێشنوێژ.

(وَصَـلاَةُ الْجَماعَـةِ) نوێـژکردنی بەجماعـەت لـە هـەر پێـنج فەرزەکانـدا (سُـنَّةٌ مُؤَكَّـدَةٌ) سوننەتێکی زۆر گەورەیە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَاللهُ عَنهُما: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَلاَةُ الْجَماعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نوێژکردنی بە جەماعەت گەورەترە لە نوێژکردنی بە تەنهایی بە بیستو حەفت پلە.

جا بزانە: ئیمامی(النواوي) فەرموویـەتی: نوێـژکردنی بـە جەماعـەت (فَـرْضُ الْكِفايَـةِ)یـە. کەوابوو: لە هەر شوێنێك–کە کۆمەڵەخەڵکێکی لێیە– ئەبێ جەماعەت بە ئاشکرایی بکرێ

بۆ ئەوەی خەڵك پێی بزانێ‌و بچێتە جەماعەت لە هەر پێنج فەرزەكان، هەرچەند هەموو خەڵكیش بەشداری نەكا، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَا مِنْ ثَلاَثَةٍ فِي قَرْيَةٍ وَلاَ بَدْوٍ لاَتُقامُ فِيهِمُ الصَّلاَةُ إِلاَّاسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطانُ﴾ رواه النسائی، لە هەر هۆبە ڕەشماڵێك‌و لە هەر لادێیەك سێ پیاوی لێبوون‌و نوێژیان بە جەماعەت نەكرد، شەیتان خۆیان بە سەردا ئەسەپێنێ‌و گومڕایان ئەكا.

(وَعَلَى الْمَأْمُومِ) واجبە: لە سەر مەئمووم، واتە: ئەو كەسەی لە دوای ئیمام نوێژ ئەكا (أَنْ يَنْوِيَ الإِئْتِمامَ) ئەبێ نیەتی جەماعەت بێنێ لەگەڵ (اللهُ أكبَر)ی‌نوێژدابەستندا، واتە: بە دڵ بڵێ: (ئەم نوێژە بە جەماعەت ئەكەم). یان بڵێ: (لە دوای ئەم ئیمامە نوێژ ئەكەم). جا ئەگەر نیەتی جەماعەت نەهێنێ جەماعەتەكەی دروست نیە.

(دُونَ الإِمامِ) بەڵام ئیمام لە سەری واجب نیە نیەتی جەماعەت، یان ئیمامەتی بێنێ، بەڵكو سوننەتە نیەتی ئیمامەتی بێنێ تاكو خێری جەماعەتی بگاتێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّماالأَعْمالُ بِالنِّيَّاتِ﴾ رواه الشیخان، هەر كردەوەیەكی خواپەرستی بێ، بە نیازی ناو دڵ نەبێ دانامەزرێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر یەكێك بە تەنهایی نوێژی دابەستبو، ئینجا یەكێكی‌تر هات نوێژی لە دوا دابەست، ئەوە دروستە، با ئیمامەكەش لەو كاتدا نیەتی ئیمامەتی بە دڵ بێنێ.

جا بزانە: واجبە لە سەر ئیمامی جومعە: نیەتی ئیمامەتی بێنێ، ئەگینا: جومعەكەی دروست نیە (وَيَجُوزُ) دروستە (أَنْ يَأْتَمَّ الْحُرُّ بِالْعَبْدِ) مرۆڤی ئازاد جەماعەت بكا لە دوای كۆیلە.

(وَالْبالِغُ بِالْمُراهِقِ) هەروەها دروستە مرۆڤی بالغبوو-واتە: پێگەیشتوو- جەماعەت بكا لە دوای منداڵێك كە چاكەو خراپە لێك جیا بكاتەوە ﴿كانَ عَمْرُوبِن سَلَمَةَ يَؤُمُّ قَوْمَهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِﷺ وَهُوَ ابنُ سِتٍّ أَوْسَبْعٍ﴾ رواه البخاری، (عەمر)ی كوڕی(سەلەمە) پێشنوێژی بۆ گەلەكەی خۆی ئەكرد- لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ- تەمەنی شەش، یان حەفت ساڵان بوو.

هەروەها دروستە مرۆڤی كوێر ببێتە ئیمام ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: إِسْتَخْلَفَ النَّبِيُّﷺ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ رضي الله عنه يَؤُمُّ النَّاسَ وَهُوَ أَعْمَى﴾ رواه‌أبوداود، پێغەمبەرﷺ (عَبْدالله)ی‌كوڕی (أم مكتوم)ی لە جێی خۆی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی پێشنوێژی بۆ خەڵكی(مەدینە) بكا، ئەو (عبدالله)یە كوێر بوو.

هەروەها دروستە لە دوای پیاوی گوناهبارو فاسق جەماعەت بكرێ ﴿كانَ ابْنُ عُمَرَرَضِيَ‌اللهُ عَنْهُما: يُصَلِّي خَلْفَ الْحَجَّاجِ﴾رواه‌البخاری، (ابن عمر) نوێژی لە دوای (حَجّاج)ی سەقەفی ئەكرد لەگەڵ ئەوەش زۆر گوناهبار بوو.

وَلاَ تَصحُّ قُدْوَةُ رَجُلٍ بِامْرَأَةٍ، وَلاَ قارِىءٍ بِـأُمِّيٍّ، وَأَيُّ مَوْضِـعٍ صَـلَّى فِي الْمَسْـجِدِ بِصَلاَةِ الإِمامِ وَهُوَ عَالِمٌ بِصَلاَتِه أَجْزَأَهُ

---

(وَلاَ تَصِحُّ) دروست نیه (قُدْوَةُ رَجُلٍ بِاِمْرَأَةٍ) پیاو له دوای ئافرەت جەماعەت بكا ﴿عَـنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ إمْرَأَةً﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو گەلە سەرفراز نابێ: كە كاری خۆیان بدەنە دەست ئافرەت.

(وَلاَ قارِىءٍ) هەروەها دروست نیە كەسێك كە فاتیحەی ڕەوان بێ (بِأُمِّيٍّ) جەماعەت بكا لە دوای كەسێك كـە فاتیحـەی نـاڕەوان بـێ، وەك پیتێـك بـە پیتێكیتـر بگـۆڕێ، وەك بڵـێ: (أَنْحَمتَ) له جیاتی (أَنْعَمْتَ)، یان بڵێ: (سِرات الزينَ) له جیاتی (صِراطَ الَّذِينَ)، یـان بڵـێ: (وَلاَ الظَّالِينَ) لـه جیـاتی (وَلاَ الضَّـالِّينَ)، یـان جووتـه پیتـەكان نـەكرێ، واتـه: (إياكَ) لـه جیاتی (إيَّاكَ)، ئەو جۆرە كەسانە پێشنوێژییان دروست نیە.

﴿عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكتاب الله تَعالَى، فَإِنْ كانُوا فِي الْقِراءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَـإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَواءً فَأَقْدَمُهُمْ سِنًّا، وَلاَ يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِـي سُـلْطانِه، وَلاَ يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ عَلَى تَكْرِمَتِه إِلاَّ بِإِذْنِه﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با ئەو كەسە پێشنوێژی بۆ موسوڵمانان بكا: كە شەرعزانتر بێو زیاتر قورئانی خوێندبێ، ئینجا ئـەو كەسەی زیاتر شارەزای شەرعو حەدیس بێ، ئینجا ئەو كەسـەی زووتـر كۆچـی كردبـێ، ئینجـا ئـەو كەسـەی بـە تەمـەنتر بـێ، نابـێ مـرۆڤ لـە شوێنیدەسـەڵاتی پیـاوێكیتردا پێشنوێژی بۆ وی بكا بە بێئیزنی وی، نابێ مرۆڤ لە ماڵی یەكێكیتردا لە سەر جێگـەی خاوەن ماڵ دابنیشێ بە بێئیزنی وی.

كەواتـە: خـاوەن مـاڵو ئیمـامی مزگـەوت لەپێشـترن بـۆ پێشـنوێژی كـردن، هەرچـەند خوێندەواریشیان كەم بێ، بەڵام ئەگـەر ئـەوان یـەكێكیتریان دیـاری كـرد بـۆ پێشـنوێژی كردن، ئەویان لەپێشترە.

هەروەها دروست نیە جەماعەتكردن لـە دوای كەسێك: كـە بزانـێ دەسـتنوێژی نیـە، یـان شتێكی پیسی پێوەیە، یان تەیەمومێكی وای كردوە: كـە دووبارەكردنـەوەی نوێـژی لـە سەر بێ، بەڵام ئەگەر پیسیەكەی پێوە دیار نەبو، یان نەیئەزانی بێدەستنوێژەو لە دوای نوێژ ئاشكرابو، ئەوە نوێژەكە دروستەو دووبارەی ناوێ.

(وَأَيُّ مَوْضِعٍ) لە هەر شوێنێك (صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ) كە مـەئموم نوێـژ بكـا لـە نـاو مزگەوتـدا (بِصَلاَةِ الإِمامِ) لە دوای ئیمامێك (فیه) كە ئەویش هەر لە مزگەوتدا بێ (وَهُوَ عـالِمٌ بِصَلاَتِهِ) مەئمومەكـەش ئاگـادار بـوو لـە هەڵسـانو دانیشـتنی ئیمامەكـەی (أَجْزَأَهُ) جەماعەتەكـەی دروستە، هەرچەند مزگەوتەكەش زۆر گەورە بێو هەرچـەند لێشـی دوور بـێ، یـان یـەكیان

مالَمْ يَتَقَدَّمْ عَلَيْه، وَإِنْ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ وَالْمَأْمُومُ خارِجَ الْمَسْجِدِ قَرِيباً مِنْهُ وَهُوَ عالِمٌ بِصَلاَتِه وَلاَ حائِلَ هُناكَ جازَ.

---

لەوێتر بەرزتر بێ، یان پەردە لە نێوانیاندا هەبێ (مالَمْ يَتَقَدَّمْ عَلَيْهِ) بەو مەرجەی لە شوێنی نوێژکردن بە پێش ئیمامەکەی نەکەوێ.

کەوا بوو: سوننەتە: لاێکەمی بە پاشنەی قاچی لە ئیمام بە دواوەتر بێ‌و لە لای ڕاستەی ئیمام نوێژ دابەستێ، جا ئەگەر یەکێکیتریش هات، با لە لای چەپەی دابەستێ، ئینجا هەردووکیان ئەکشێنەوە دواوە، یان ئیمام ئەڕواتە پێشەوە، بۆ ئەوەی ببن بە یەك سەف، چونکە سوننەتە مەئمومەکان شان بە شانی یەکتری بدەن‌و کەلێن لە نێوانیاندا نەبێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ:قالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، وَكانَ أَحَدُنا يُلْزِقُ مَنْكِبَهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ وَقَدَمَهُ بِقَدَمِهِ﴾ رواه البخاری، لە کاتی نوێژدابەستن پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: ڕیزتان ڕاست بکەن، ئینجا هەر یەکێك لە ئێمە شانی بە شانی ئەوی‌ترەوە ئەلکاندو قاچی بە قاچیەوە ئەلکاند.

هەروەها سوننەتە مندالان لە دوای سەفی پیاوان نوێژ دابەستن ئەگەر بە یەکەوە هاتبون بۆ مزگەوت، بەلام ئەگەر منداڵەکان زووتر هاتبون‌و لە سەفی یەکەم شوێنی خۆیان گرتبو، نابێ دوا بخرێن، هەروەها ئەبی ئافرەتان لە دوای مندالان بوەستن ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فَقُمْتُ وَيَتِيمٌ خَلْفَهُ، وَأُمُّ سُلَيْمٍ خَلْفَنَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، من‌و منداڵێکی یەتیم لە دوای پێغەمبەر ﷺ وەستاین‌و (أُمُّ سُلَيْمٍ)-کە دایکم بوو- لە دوای ئێمە ڕاوەستاو نوێژی دابەست.

(وَإِنْ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ) ئەگەر ئیمام پێشنوێژی لە ناو مزگەوتدا ئەکرد (وَالْمَأْمُومُ خارِجَ الْمَسْجِدِ) مەئموومیش لە دەرەوەی مزگەوت نوێژی لە دوای ئەو ئیمامە ئەکرد (قَرِيباً مِنْهُ) لێشی نێزیك بوو، واتە: لە سێسەد گەز زیاتر دوور نەبو (وَهُوَ عالِمٌ بِصَلاَتِهِ) مەئموومەکەش ئاگادار بوو لە هەڵسان‌و دانیشتنی ئیمام (وَلاَ حائِلَ هُناكَ) پەردەشیان لە نێواندا نەبو، لەوێ (جازَ) نوێژەکە دروستە.

جا بزانە: لە هەموو جۆرە جەماعەتێکدا ئەبی مەئموم ئاگادار بێ لە جموجۆڵی ئیمامەکەی، وە نابێ پێش ئیمام نوێژ دابەستێ‌و، واجبە هەموو کردەوەکانی نوێژ دوابەدوای ئیمام بکا ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَيُّها النَّاسُ إِنِّي إِمامُكُمْ فَلاَ تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَلاَ بِالسُّجُودِ وَلاَ بِالْقِيامِ وَلاَ بِالإِنْصِرافِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵکینە من پێشنوێژی ئێوەمە، پێش من ڕکووع‌و سوجدە مەبەن‌و پێش من هەڵمەستنەوەو پێش من سەلام مەدەنەوە.

﴿پاشكۆ﴾: ئەگەر كەسێك بە تەنهایی نوێژی كردبو، ئینجا جەماعەتی بۆ ڕێك كەوت، سوننەتە بە جەماعەت دووبارەی بكاتەوە، هەروەها دروستە نوێژدابەستن لە دوای كەسێك كە جۆرە نوێژێكیتر ئەكا، هەرچەند نوێژەكەشی سوننەت بێ: وەك دابەستنی نوێژی نیوەڕۆ لە دوای ئیمامێك كە نوێژی بەیانی، یان مەغریب، یان تەراویح ئەكا.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر مەئمووم درەنگ گەیشتە جەماعەت، با نوێژ دابیەستێو بەگوێرەی نوێژی ئیمام نوێژ بكا، ئینجا كە ئیمام سەلامی دایەوە، با هەڵبستێ نوێژەكەی خۆی تەواو بكا ﴿عَنْ أَبِي قتادَةَ رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إذا أَتَيْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ فَعَلَيْكُمْ بالسَّكِينَةِ فَما أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَما فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: كاتێ دێنە نوێژكردن بە هێواشیو بە بەڕێزانە وەرن، ئەوەندەی لەگەڵ ئیمام فریا كەوتن بیكەن، ئەوەی ماوە– لە پاش سەلامدانەوەی ئیمام– هەڵسن تەواوی بكەن.

جا ئەگەر مەئمووم فریاكەوت ڕوكووع بە تەواوی لەگەڵ ئیمام ببا، ئەوە بۆی بە بەر فاتیحە ئەكەوێو ڕەكعەتەكەی هەموو دروستە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إذاجِئْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ وَ نَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدوا وَلاَ تَعُدُّوها شَيْئاً، وَمَــنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَــةَ فَقَــدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ﴾ رواه الدارقطني، كاتێك كە هاتن نوێژتان دابەستو ئیمام لە سوجدەدا بوو، ئێوەش بڕۆنە سوجدە، بەڵام بە هیچی دامەنێن، وە هەر كەسێك لەگەڵ ئیمام گەیشتە ڕوكووعێكی تەواو، ئەوە بۆی بە ڕەكعەتێكی تەواو ئەژمێردرێ.

جا بزانە: ئەگەر ئیمام لەڕوكووعدا بوو، یان لە تەحیاتی ئاخیردا بوو، هەستی كرد: كە یەكێك ئەیەوێ نوێژی لە دوا دابیەستێ، ئەوە سوننەتە نەختێك چاوەڕوانی بكا.

﴿ئاگاداریەكیتر﴾: ئەگەر ئیمام لە ناو نوێژ هەڵەیەكی كرد، سوننەتە مەئمومی پیاو ئاگاداری بكاتەوە و بڵێ: (سبحان الله). بەڵام مەئموومی ئافرەت چەپڵە لێئەدا، واتە: بەرەدەستی ڕاستەی لە پشتەدەستی چەپەی ئەدا.

هەروەها ئەگەر ئیمام خوێندنی فاتیحە، یان سوورەتی پاش فاتیحەی لێ تێكچو، با مەئموم پێی بڵێتەوە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى صَلاَةً فَلُبِسَ عَلَيْهِ، فَلَمَّاانْصَرَفَ قالَ لأُبَيِّ بنِ كَعْبٍ: أَصَلَّيْتَ مَعَنا؟ قالَ: نَعَمْ. قالَ فَما مَنَعَــكَ أَنْ تَفْــتَحَ عَلَــيَّ؟﴾ رواه إبن حبان، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژێكدا خوێندنی قورئانی لێ تێكچو، جابە(ئوبەییی) كوڕی (كەعبی) فەرموو: تۆ نوێژت لەگەڵ ئێمەدا كرد؟ گوتی: بەڵێ. فەرمووی: ئەی بۆچی پێت نەگوتمەوە؟.

هەروەها ئەگەر ئیمام بێدەستنوێژ بوو، یان شتێكی بەسەر هات: با لە نوێژەكەی دەرچێو یەكێكیتر بچێت لەجیاتی ئەو دەست بە ئیمامەتی بكا، ئەوەك جەماعەتەكە

(فَصْــــلٌ) وَيَجُــــوزُ لِلْمُســــافِرِ قَصْــــرُ الصَّــــلاَةِ الرُّباعِيَّــــةِ بِخَمْسَــــةِ شَــــرائِطَ: أَنْ يَكُونَ سَفَرُهُ فِي غَيْرِ مَعْصِيَةٍ، وَأَنْ تَكُونَ مَسافَتُهُ سِتَّةَ عَشَرَ فَرْسَخاً،

---

تێك بچێ، لـه مـهدا جیـاوازی جومعـهو نوێـژەكانیتر نیـه، بەڵگـەش كـردەوەی ئیمـامی (عمر)ە، له كاتی برینداربوونیدا (عبدالرحمن بن عوف)ی له جێی خۆی داناو نوێـژی بەیانیی به خەڵكەكه تەواو كرد.

﴿ فَصْلٌ: له باسی (قَصْر) و (جَمْع) له سەفەردا ﴾

واته: كورتكردنەوەو كۆكردنەوەی نوێژ. (وَيَجُوزُ) دروسته (لِلْمُسافِرِ) بـۆ ئـەو كەسـەی لـه سەفەردایه (قَصْرُ الصَّلاَةِ الرُّباعِيَّةِ) ئەو سێ نوێژانەی چوار ڕەكعەتین، كورتیـان بكاتـەوە بۆ دوو ڕەكعەت، بەڵام نوێژی مەغریبو بـەیانی كـورت ناكرێنـەوە ﴿عَنْ أَنَسٍ قــالَ: خَرَجْنا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَىٰ مَكَّةَ فَكانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ﴾ رواه الشيخان، (أنـس) فەرموویـەتی: لەگـەڵ پێغەمبـەرﷺ لـه (مَدینَـة)وە چـووینه (مَكّـة)، نوێـژە چـوار ڕەكعەتیەكانی ئەكردنه دوو ڕەكعەت.

(بِخَمْسَــــةِ شَــــرائِطَ) بــــۆ ئــــەو كورتكردنەوەیــــە پێــــنج مــــەرج هەنــــە: یەكەم: (أَنْ يَكُونَ سَفَرُهُ فِي غَيْرِ مَعْصِيَةٍ) نابێ سەفەرەكەی بۆ گوناهكاری بێ، كـەوابوو: ئەگەر ئافرەت به بێئیزنی مێردیخۆی بـۆ سـەفەر بـڕوا، یـان كەسـێك بـۆ زینـا، یـان بـۆ مرۆڤكوشتنی بەناهەق، یان بۆ هەر گوناهباریەكیتر به سەفەر بڕۆن، نابێ قەسرو جـەمع بكەن، هەروەها قەرزدار ئەگەر كاتی قەرزدانەوەی هاتبێو به بێپرسی خاوەن قەرزەكەی بەسەفەر بچێ، نابێ قەسرو جەمع بكا.

دووەم: (وَأَنْ يَكُـونَ مَسـافَتُهُ) ئەنـدازەی دووری ئـەو شـوێنەی بـۆی ئەچـێ (سِـتَّةَ عَشَـرَ فَرْسَخاً) شانزه فەرسەخ بێ، واته: هەشتا كیلو مەتر، بەڵگە: (إجماع)ی هەرچوار مەزهـەبی (اهل السنة)یە، هـەم ﴿وَكانَ ابْنُ عُمَرَ وابْنُ عَبَّاسٍ يَقْصُرانِ وَيُفْطِرانِ فِي أَرْبَعَةِ بُــرُدٍ وَهِيَ سِتَّةَعَشَرَ فَرْسَخاً﴾ رواه البخـاری، واتـه: ئـەو دوو سـەحابەیه لـه ئەنـدازەی چـوار (بَرید)دا نوێژیان كورت ئەكردەوەو ڕۆژوویان ئەشكاند: كه ئەكاته شانزه فەرسەخ.

ئینجا ئەگەر ئەو ئەندازەیه به سواری فڕۆكە، یان ئۆتۆمبێل به سـەعاتێكیش بـبڕێ، هـەر بۆی دروسته: قەسرو جەمع بكا.

﴿ئاگــاداری﴾: ئەگـەر نیـەتی هێنـا: چـوار شـەو و ڕۆژی تـەواو لـه شـوێنێك بمێنێتـەوە، بـەوە كۆتـایی سـەفەرەكەی دێو نابێ هیچـیتر قەسـرو جـەمع بكـا، بـەڵام ئەگـەر نیـەتی مانـەوەی نـەهێنا، بـەڵكو تـەنها چاوەڕوانی پێكهـاتنی كـارێكیخۆی ئـەكردو نەیئـەزانی چ ڕۆژێك بۆی ئەبێ؟ ئەوە تا هەژدە ڕۆژ بۆی دروسته: قەسرو جەمع بكا، جگە له ڕۆژی هاتنو بـاركردن ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَقامَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَكَّةَ تِسْعَةَعَشَرَ يَوْماً يَقْصُــرُ﴾ رواه

وَأنْ يَكُونَ مُؤَدِّياً للصَّلاَةِ الرُّباعيَّة، وَأنْ يَنْوِيَ الْقَصْرَ مَعَ الاحْرام، وَأنْ لاَ يَأتَمَّ بِمُقِـيم. وَيَجُوزُ للْمُسافِرِ أَنْ يَجْمَـعَ بَـيْنَ الظُّهْـرِ وَالْعَصْـرِ فِـي وَقْـتِ أَيِّهِمـا شَـاءَ، وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشاءِ فِي وَقْتِ أَيِّهِما شاءَ،

---

البخـاری، پێغەمبـەرﷺ لـە دوای ڕزگـارکردنی(مَکَـة)ی پـیرۆز لـەوێ مایـەوە، مـاوەی نۆزدە ڕۆژ نوێژی کورت ئەکردەوە.

هەروەها ئەگەر کەسێك نەیئەزانی بۆ کوێ ئەچێ، ئەویش نابێ قەسرو جەمع بکا.

سێیەم: (وَأنْ يَكُونَ مُؤَدِّياً لِلصَّلاَةِ الرُّباعيَّة) ئەو نوێژانەی کورتیان ئەکاتەوە نوێژی ئەو کات بن، نەك نوێژی قەزا، واتە: ئەگەر نوێژی قەزای لە سەر بون، نابێ بە کورتکراوەیی قەزایان بکاتەوە، چونکە بە تەواوی کەوتۆتە ئەستۆی.

چوارەم: (وَأنْ يَنْـوِيَ الْقَصْـرَ) نیـەتی کورتکردنەوەی‌نوێـژ بێنـێ (مَـعَ الإِحْـرامِ) لەگـەڵ (اللهُ أکبَر)ی نوێژدابەستندا.

پێنجەم: (وَأنْ لاَ يَأْتَمَّ بِمُقِيمٍ) نابێ نوێژەکەی‌خۆی بە جەماعەت لە دوای ئیمامێکی وەها بکا: کە نوێژەکانی‌خۆی تەواو ئەکا، جا ئیمامەکە ڕێبوار بێ، یان نا، جا ئەگەر تەنها بە قەد (اللهُ أکبَر)ێك نوێژی لە دوای ئەوئیمامە دابەست، ئەبێ ئەویش نوێژەکەی‌خۆی تـەواو بکـا ﴿قِيلَ لابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: مَا بالُ الْمُسافِرِ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ إذا انْفَرَدَ، وَأرْبَعـاً إذا ائْتَمَّ بِمُقِيمٍ؟ قَالَ: تِلْكَ السُّنَّةُ﴾ رواه‌الامام احمد، بە(ابن عباس)یان گوت: بۆ چی ئەگەر ڕێبوار نوێژ بە تەنهایی بکا دوو ڕەکعەت ئـەکاو ئەگـەر بـە جماعـەت لـە دوای نیشتەجێ بیکا، ئەبێ چوار ڕەکعەت بکا؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوە ڕێگەی پێغەمبەرەﷺ.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ئەیزانی ئیمامەکە ڕێبوارە، بەڵام گومانی لە نیەتەکەی هەبوو، با نوێژەکەی لە دوا دابەستێ‌و نیەتی کورتکردنەوە بێنێ، ئینجا ئەگەر ئیمامەکە کورتی کردەوە، با ئەویش کورتی بکاتەوە، ئەگەر ئەو تەواوی کرد، با ئەویش تەواوی بکا.

### ﴿ باسی (جَمْع) کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە کاتی یەکێکیاندا ﴾

(وَيَجُـوزُ) دروسـتە (لِلْمُسـافِرِ) بـۆ کەسـێك کەبچێتە سـەفەرێکی هەشـتا کیلۆمەتری، بـۆ گوناهکاریش نەچێتە سەفەر (أنْ يَجْمَعَ) کۆ بکاتەوە (بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ) نوێـژی نیـوەڕۆو عەسر (فِي وَقْتِ أيِّهِما شاءَ) لە کاتی هـەر کامـەیان حـەز دەکـا: جـا نیـوەڕۆ بباتـە کـاتی عەسر، کە پێی ئـەگوترێ: (جَمْـعُ التَّـأْخِيرِ)، واتـە: دواخسـتن، یـان عەسـر بێنێتـە کـاتی نیوەڕۆ، کە پێی ئەگوترێ: (جَمْعُ التَّقْدِيمِ)، واتە: پێشخستن.

(وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشاءِ) هەروەهاش کۆکردنەوەی مەغریب‌و عیشا دروستە (فِي وَقْتِ أيِّهِما شاءَ) لە کاتی هەر کامەیان حەز دەکا: جا مەغریب دوا بێخی بۆ کاتی عیشـا، یـان عیشـا پێش بێخی بۆ کـاتی مـەغریب ﴿عَنْ معاذٍ ﷺ: أنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ كانَ فِي غَزْوَةِ تَبُـوكَ:

وَيَجُوزُ لِلْحاضِرِ فِي الْمَطَـرِ: أَنْ يَجْمَـعَ بَيْنَهُمـا فـي وَقْـتِ الْاوْلَـى مِنْهُمـا.
(فَصْلٌ) وَشَرَائِطُ وُجُوبِ الْجُمُعَةِ سَبْعَةُ أَشْياءَ: اَلإِسْلامُ،

---

إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْحَلَ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَإِنْ يَرْتَحِلْ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ حَتَّى يَنْزِلَ لِلْعَصْرِ، وَفِي الْمَغْرِبِ مِثْلَ ذَلِكَ﴾ رواه الترمذي وبعضه في‌البخاري، پێغه‌مبه‌رﷺ له‌ جه‌نگی (تبوك)دا كاتێ نیوه‌ڕۆ ئه‌بو پێش بارکردنی، ئه‌وه نوێژی عه‌سری له‌گه‌ڵ نیوه‌ڕۆ له‌ یه‌ك كاتدا ئه‌كردن، به‌ڵام ئه‌گه‌ر باری كردبایه‌ پێش ئه‌وه‌ی كاتی نوێژ بێ، ئه‌وه‌ نیوه‌ڕۆی دوا ئه‌خست بۆ كاتی عه‌سر، هه‌روه‌هاش مه‌غریب‌و عیشای به‌و جۆره‌ دوا ئه‌خست‌و پێش ئه‌خست.

﴿ئاگاداری﴾: له‌ (جمع‌التقديم)، واته‌: له‌ پێشخستنی‌نوێژدا، پێویسته‌: ده‌ست به‌ نوێژی یه‌كه‌م بكاو هه‌ر له‌ ناو نوێژی یه‌كه‌مدا نیه‌تی كۆكردنه‌وه‌ی نوێژی دووه‌م بێنێ، ئینجا كه‌ سه‌لامی دلوه‌، یه‌كسه‌ر ده‌ست به‌ نوێژی دووه‌م بكا. وه‌ له‌ (جمع‌التأخير)، واته‌: له‌ دواخستنی‌نوێژدا، پێویسته‌: له‌ كاتی نوێژی یه‌كه‌مدا نیه‌تی دواخستن بێنێ بۆ ئه‌وه‌ی گوناهبار نه‌بێ، هه‌روه‌ها دروسته‌: قه‌سرو جه‌مع به‌ یه‌كه‌وه‌ش بكرێن.

(وَيَجُوزُ) دروسته‌ (لِلْحاضِرِ) بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی له‌ ماڵه‌وه‌یه‌ (فِي الْمَطَرِ) له‌كاتی باران بارینـدا (أَنْ يَجْمَعَ بَيْنَهُما) كۆكردنه‌وه‌ی دوو نوێژ (فِي وَقْتِ الْأُولَى مِنْهُما) له‌ كاتی نوێژی یه‌كه‌مدا، به‌و مه‌رجه‌ی نوێژه‌كان به‌ جه‌ماعه‌ت بكا له‌ مزگه‌وتێكی دوور و به‌رگی ته‌ڕ ببێ و له‌ كاتی نوێژی یه‌كه‌میشدا باران بباری ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: صَلَّى رَسُولُ اللهِﷺ بِالْمَدِينَةِ سَبْعاً وَثَمانِياً: اَلظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ﴾ رواه البخاري، پێغه‌مبه‌رﷺ له‌ (مدينة) نوێژی نیوه‌ڕۆ و عه‌سری له‌ یه‌ك كاتدا ئه‌كردن‌و مه‌غریب‌و عیشای له‌ یه‌ك كاتدا ئه‌كردن.
ئیمام (مالك)و ئیمام (شافعی) فه‌رموویانه‌: ئه‌و كۆكردنه‌وه‌یه‌ به‌ هۆی باران بوو.

﴿پاشكۆ﴾: زۆر له‌ پێشه‌وایانی ئاینی فه‌رموویانه‌: دروسته‌ كۆكردنه‌وه‌ی دوو نوێژ له‌ یه‌ك كاتدا بۆ مرۆڤی نه‌خۆش، جا ئه‌گه‌ر له‌ كاتی نوێژی یه‌كه‌مدا نه‌خۆشتر بوو، با دوای بخا، ئه‌گه‌ر له‌ كاتی نوێژی دووه‌مدا نه‌خۆشتر ئه‌بێ، با پێشی بخا، به‌و مه‌رجانه‌ی گوتمان له‌ كۆكردنه‌وه‌ی سه‌فه‌ردا.

## ﴿ فَصْلٌ: له‌ باسی نوێژی (جُمُعَة) ﴾

نوێژی جومعه‌ دوو ڕه‌كعه‌ته‌، واجبه‌ له‌ كاتی نیوه‌ڕۆی ڕۆژی‌هه‌ینی‌دا به‌ جه‌ماعه‌ت بكرێ.
(وَشَرائِطُ وُجُوبِ الْجُمُعَةِ) ئه‌و مه‌رجانه‌ی دانراون بۆ واجبوونی نوێژی جومعه‌ (سَبْعَةُ أَشْياءَ) حه‌فت مه‌رجن:

یه‌كه‌م: (اَلإِسْلامُ) ئیسلامه‌تی‌یه‌، خوای گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ

وَالْبُلُـــوغُ، والْعَقْـــلُ، والْحُرِّيَّـــةُ، والذُّكُورِيَّـــةُ، وَالصِّـــحَّةُ، والإِسْـــتِيطانُ.
وَشَرائِطُ فِعْلِها ثَلاَثَةٌ: أَنْ تَكُونَ الْبَلَدُ مِصْراً أَوْ قَرْيَةً،

---

تَعْلَمُونَ﴾ ئەی خاوەن باوەڕان، کاتێ بانگی نیوەڕۆ درا لە ڕۆژی هەینی، زوو بڕۆن بۆ نوێژی جومعە، واز لە کڕینو فرۆشتن بێنن-واتە: کە بانگی جومعە درا، کڕینو فرۆشتن حەرامە-،جومعە کردن بۆ ئێوە باشترە ئەگەر ئێوە بزانن.

دووەم: (وَالْبُلُوغُ) بلۆغبوونە، واتە: لە سەر منداڵ جومعە واجب نیە. سێیەم: (وَالْعَقْلُ) عەقڵی هەبێ، نابێ شێت بێ. چوارەم: (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازاد بێ، کۆیلە نەبێ.

پێنجەم: (وَالذُّكُورِيَّةُ) نێرینە بێ، واتە: ئافرەت جومعەی لە سەر نیە، بەڵام: ئەگەر جومعەی کرد، ئەوە جومعەکەی دروستەو نیوەڕۆی لە سەر لائەچێ.

شەشەم: (وَالصِّحَّةُ) تەندروستیی باش بێ، واتە: ئەوەندە نەخۆشیی گران نەبێ: کە نەگاتە جومعە، یان بگاتێ بەڵام نەتوانێ تا کۆتایی نوێژ بمێنێتەوە ﴿عَنْ طَارِقِ بنِ شِهابٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلْجُمُعَةُ حَقٌّ واجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلاَّ أَرْبَعَةً: مَمْلُوكٌ، وَاِمْرَأَةٌ، وَصَبِيٌّ، وَمَرِيضٌ﴾ رواه‌ابوداود والحاكم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نوێژی جومعە لە سەر هەموو موسوڵمانێك واجبەو ئەبی بە جەماعەت بیکا، بەڵام چوار کەس جومعەیان لە سەر نیە: کۆیلەو ئافرەتو منداڵو نەخۆش.

حەفتەم: (وَالإِسْتِيطانُ) دانیشتووی ئەو شوێنە بێ کە جومعەی لێئەکرێ، یان نیازی مانەوەی چوار ڕۆژی هەبێ لەو شوێنەدا، کەوابوو: ڕێبوارێك کە چوار ڕۆژ لە شوێنێك نەمێنێتەوە جومعەی لە سەر نیە ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمْعاً بِعَرَفَةَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ﴾ رواه‌مسلم، پێغەمبەرﷺ کە لە حەجی ماڵئاوایی لە عەرەفە وەستا، نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆ کردنەوە. واتە: جومعەی نەکرد هەرچەند ئەو ڕۆژەش هەینی بوو.

جا بزانە: قوتابیو سەربازو بازرگان...هتد. ئەگەر نیازی مانەوەی چوار ڕۆژ، یان زیاتریان هەبێ، ئەبی جومعە بکەن، هەروەها حەرامە: سەفەرکردن لە ڕۆژی جومعە، ئەگەر مەترسی لەدەستچوونی جومعەی هەبێ.

(وَشَـــرائِطُ فِعْلِهَـــا) مەرجەکانی دروســـتبوونی نوێـــژی جومعـــە (ثَلاَثَـــةٌ) ســـێنە: یەکەم: (أَنْ تَكُونَ الْبَلَدُ) ئەو شوێنەی جومعەی لێئەکرێ (مِصْراً) شار بێ (أَوْ قَرْيَةً) یان لادێ بێ، واتە: شوێنی نیشتەجێی یەکجاری بێ ﴿لأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُقِمِ الْجُمُعَـةَ فِـي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِعَرَفَةَ﴾ كما فی‌حديث مسلم عَنْ جابِرٍ ﷺ، چونکە پێغەمبەرﷺ لە عەرەفە جومعەی نەکرد، لەگەڵ ئەوەش دانیشتووانی(مكة)ی لەگەڵدا بون.

کەوابوو: لە ناو هۆبەڕەشماڵو هەوارگەکانی کوێستاندا جومعەکردن دروست نیە، بەڵام ئەگەر گوێیان لە دەنگی بانگی شوێنێکیتر ئەبو، ئەبی بچن بۆ ئەوێ جومعە بکەن.

وَأَنْ يَكُونَ الْعَدَدُ أَرْبَعِينَ مِنْ أَهْلِ الْجُمُعَةِ، وَأَنْ يَكُونَ الْوَقْتُ بَاقِياً، فَإِنْ خَرَجَ الْوَقْتُ أَوْ عُدِمَت الشُّرُوطُ صُلِّيَتْ ظُهْراً، وَفَرَائِضُهَا ثَلاثَةٌ: خُطْبَتَانِ يَقُومُ فِيهِمَا وَيَجْلِسُ بَيْنَهُمَا،

---

﴿ئاگـــاداری﴾: ئەگـەر خـاوەن دەسـتەڵاتێك بـە زۆرلێكـردن دانیشـتووانی شـوێنێكی گواستنەوە بۆ شوێنێكیتر، ئەوانیش نیازیان وابو: هەر كاتێك بۆیان بگونجێ بچنەوە بـۆ شـوێنەكەی خۆیـان، ئەوانـە-لـە شـوێنەكەیتردا-جومعـەیان دروسـت نیـە، چـونكە نیشتەجێی یەكجاری نین، هەرچەند خانووشیان دروست كردبێ، جا ئەگـەر-لـەوێدا- جومعەیان كرد، ئەبی نوێژی نیوەڕۆش هەر بكەن.

دووەم: (وَأَنْ يكُونَ الْعَدَدُ) ژمارەی ئەو كەسانەی جومعـە ئەكـەن (أَرْبَعِينَ) بـە لایكـەمی چل كەس بن (مِنْ أَهْلِ الْجُمُعَةِ) لەو كەسانەش بن كە جومعەیان لـە سـەرە ﴿عَـــنْ ابْـــنِ مَسْعُودٍ ﷺ: قَالَ: جَمَّعَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ وَنَحْـــنُ أَرْبَعُـــونَ رَجُـــلاً﴾ رواه البیهقـی، پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە جومعەی كرد، ژمارەمان چل پیاو بوو.

كەوابوو: ئەگەر شوێنێك چل پیاوی لێنەبو، جومعەیان لە سەر نیە، بـەڵام ئەگـەر گوێیـان لە بانگی شوێنێكیتر بوو، ئەبی بچن بۆ ئەوێ جومعە بكەن.

جـا بزانـە: لـە مەزهـەبی ئیمـامی(حنفـی)دا: بـە چـوار كەسـان جومعـە دروسـتە، وە لە مەزهەبی ئیمامی(مالك)دا: بە دوانزە كەسان جومعە دروستە.

سـێیەم: (وَأَنْ يَكُـونَ الْوَقْـتُ بَاقِيـاً) كـاتی جومعـە كـردن-كـە كـاتی نیوەڕۆیـە- بمێنـێ تا جومعەكە تەواو ئەبێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: كَـانَ النَّبِـيُّ ﷺ يُصَـلِّي الْجُمُعَةَ حِـينَ تَمِيـلُ الشَّمْسُ﴾ رواەالبخـاری ﴿وَعَن سَلَمة: كُنَّا نُصَلِّي الْجُمُعَةَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَرْجِعُ وَمَا نَجِـدُ لِلْحِيطَانِ فَيْئاً نَسْتَظِلُّ بِهِ﴾ رواه الشیخان، (ئەنەس) ئەفەرموێ: كاتێ ڕۆژ لایئەدا بۆ چـاوی ڕاستە، پێغەمبەر ﷺ جومعەی ئەكرد. (سەلەمە) ئەفەرموێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ جومعەمان ئەكردو ئەگەڕاینەوە هێشتا دیوارەكان سێبەرێكی وایان نەبو تێیدا بڕۆین.

(فَـإِنْ خَـرَجَ الْوَقْـتُ) جـا ئەگـەر ئەوەنـدە مـاوەی نـەما جومعـە بـە دوو خوتبـەوە بكـرێ (أَوْ عُدِمَت الشُّرُوطُ) یان یەكێك لەو مەرجانەی گوتمان نەبو، ئەو كاتە (صُلِّيَتْ ظُهْراً) ئەبی چوار ڕەكعەت بە نیەتی نوێژی نیوەڕۆ بكرێ؟ چونكە جومعە قەزا ناكرێتەوە، جـا ئەگـەر جومعەش دروست نەبو، نابێ نوێژی نیوەڕۆ لە دەست بدرێ.

(وَفَرَائِضُـــــهَا) واجبــــەكانی جومعــــــە كــــــردن (ثَلاثَـــــةٌ) ســــێنە: یەكـەم: (خُطْبَتَانِ) خوێندنەوەی دوو ووتارە (يَقُومُ فِيهِمَا) ئەبی بە پێوە ووتارەكـان بـدا (وَيَجْلِسُ بَيْنَهُمَا) لـە پـاش ووتـاری یەكـەم ئـەبی بـە قـەد دانیشـتنی نێـوان دوو سـوجدە دابنیشـێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ قَائِماً ثُمَّ يَقْعُدُ، ثُمَّ يَقُومُ كَمَـا

وَأَنْ تُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، فِي جَماعَةٍ. وَهَيآتُها أَرْبَعُ خِصال: اَلْغُسْـــلُ وَتَنْظِيــفُ الْجَسَـــدِ، وَلُبْسُ الثِّيابِ الْبِيضِ، وَأَخْذُ الظُّفْرِ، وَالطِّيبُ. وَيُسْتَحَبُّ الإِنْصاتُ فِي وَقْتِ الْخُطْبَةِ،

---

تَفْعَلُونَ الآنَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ بە پێوە ووتاری جومعەی ئەخوێنـدەوە، ئینجا دا ئەنیشت، ئینجا هەڵئەستاوە بۆ ووتاری دووەم وەك ئێستا ئێوە ئەیكەن.

جا بزانە: ئەبی ووتارخوێنی جومعە پیاو بێو بە لای كەم چل كەس گوێی لـە ووتارەكـەی ببـێ. هـەروەها لـەو دوو ووتـارەدا واجبـە: هـەر پێـنج ڕوكنـەكان بـە عـەرەبی بـن: كـە

ڕوكنییەكەم: سوپاسی خودایە، وەك بڵێ: (اَلْحَمْدُلله).

ڕوكنیدووەم: سەلاوات لە سەر پێغەمبەرەﷺ، وەك بڵـێ: (اَللـــهُمَّ صَـــلِّ عَلَىمُحَمَّـــد).

ڕوكنـیسـێیەم: ئامۆژگـاری بـە ترسـان لـە خـودا، وەك بڵـێ: (أُوصِـــيكُمْ بِتَقْـــوَىالله).

ڕوكنیچوارەم: خوێندنەوەی ئایەتێكی قورئانی پیرۆزە لە ووتارێكدا.

ڕوكنیپێنجەم: دوعاكردن بۆ موسوڵمانان لە ووتاری دووەمدا، بە لای كـەمی بڵـێ: (اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِماتِ). جگە لەو پێنجانە واجب نیە ووتارەكان بە عەرەبی بن.

هەروەها سوننەتە: كە ووتار خوێن گەیشتە شوێنی ووتاردان ڕوو لە دانیشتووانی مزگەوت بكاو سەلامیان لێبكا، ئینجا كە هەردوو ووتارەكانی تەواو كردن، ئیقامەتی نوێـژ ئـەكرێو دەست بە نوێژیجومعە ئەكا.

دووەم: (وَأَنْ تُصَـــلِّي رَكْعَتَـــيْنِ) نوێژیجومعـــە بــــە دوو ڕەكعــــەتی بكـــرێ.

سێیەم: (فِي جَماعَةٍ) نوێژیجومعە بە جەماعەت بكرێو، واجبە ئیمامو مـەئمووم نیـەتی نوێژی جومعە بێنن، پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلاةِ الْجُمُعَـــةِ رَكْعَـــةً فَلْيُضِفْ إِلَيْها أُخْرَى وَقَدْ تَمَّتْ صَلاتُهُ، وَمَنْ فَاتَتْهُ الرَّكْعَتَـــانِ فَلْيُصَـــلِّ أَرْبَعـــاً﴾ رواه الدارقطني، هەر كەسێك لە نوێژیجومعە گەیشتە ڕكووعی دووەم، بۆی بە بەر ڕەكعەتێك ئەكەوێ، جا با لە دوای سەلامدانەوەی ئیمـام، ڕەكعـەتێكیتر بكـاو جومعەكـەی تـەواوە، بەڵام ئەگەر لە پاش ڕكووعی دووەم گەیشتە نوێژی جومعە- ئەوەش هەر نیەتی جومعە ئەهێنێ، بەڵام- لە دوای سەلامدانەوەیئیمام ئەبی چوار ڕەكعەت نوێژ بكا.

(وَهَيآتُها) سوننەتەكانی جومعە (أَرْبَعٌ) چوارن: (اَلْغُسْلُ) یەكەم: خـۆ شـۆردنە بـە نیـەتی غوسلی جومعەو (وَتَنْظِيفُ الْجَسَدِ) هەروەها پاكـژكردنی لەشـی خۆیـەتی لـە چڵكـو بـۆنی ناخۆش. (وَلُبْسُ الثِّيابِ الْبِيضِ) دووەم: بەرگێكی جوانو سپی بكاتـە بـەر. (وَآخْـذُالظُّفْرِ) سێیەم: نینۆكی لاببا. (وَالطِّيبُ) چوارەم: خۆی بۆنخۆش بكا.

(وَيُسْتَحَبُّ) هەروەها سوننەتە (الإِنْصاتُ) گوێڕاگرتنو بێدەنگی (فِـي وَقْـتِ الْخُطْبَـةِ) لـەو كاتەی ووتاری جومعە ئەخوێندرێتـەوە ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ: قالَ النَّبِيُّﷺ: مَنْ اغْتَسَـــلَ

وَمَنْ دَخَلَ وَالإمامُ يَخطُبُ صَلّى رَكْعَتَيْنِ خَفيفَتَينِ ثُمَّ يَجْلِسُ.

يَوْمَ الْجُمُعَة وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيابِه، وَمَسَّ مِنْ طِيبٍ إِنْ كانَ عِنْدَهُ، ثُمَّ أتَى الْجُمُعَةَ فَلَمْ يَتَخَطَّ أَعْناقَ النَّاسِ، ثُمَّ صَلّى مَا كَتَبَ اللهُ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ إِذا خَرَجَ إِمامُهُ حَتّى يَفْرُغَ مِنْ صَلاتِه، كانَتْ كَفّارَةً لِما بَيْنَها وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الَّتي قَبْلَها﴾ رواه‌ابوداود، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك ڕۆژی جومعە بە نیەتی جومعە خۆی بشواو جوانترین بەرگی بکاتە بەر، ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو خۆی بۆنخۆش بکا، ئینجا بچێتە جومعە، بەڵام بە سەر ملی خەڵکدا باز نەدا، ئینجا بۆ خۆی دەست بە نوێژکردن بکا، ئینجا کە ئیمام هاتە خوتبەخوێندنەوە بێدەنگ بێو گوێی لێرابگرێ تا نوێژ تەواو ئەبێ، ئەو چاکانە ئەبنە لادەرو داپۆشەری گوناهەکانی نێوان ئەم جومعەیەو جومعەکەی‌ڕابردوو.

(وَمَنْ دَخَلَ) هەر کەسێك هاتە ناو مزگەوت (وَالإمامُ يَخطُبُ) لەو کاتەش ئیمام ووتاری ئەدا (صَلّى رَكْعَتَيْنِ) با دوو ڕەکعەت بە نیەتی سوننەتی‌جومعە، یان (تَحِيّةُالْمَسْجِد) بکا (خَفيفَتَينِ) بە سوکی‌و بە پەلە بیانکا (ثُمَّ يَجْلِسُ) ئینجا دابنیشێ، بەڵام ئەگەر یەکسەر دانیشت، ئەو کاتە حەرامە بیسان هەڵسێتەوەو سوننەتەکە بکا ﴿عَنْ جابِرٍ﷛: قالَ النَّبِيُّﷺ: إِذا جاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإمامُ يَخطُبُ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کاتێ یەکێکتان هاتە مزگەوت لە ڕۆژی هەینی لەو کاتەش ئیمام ووتاری ئەدا، با دوو ڕەکعەت سوننەت بکا بە پەلە، واتە: ئینجا دابنیشێ.

﴿ئاگاداری﴾: دوو ڕەکعەت سوننەتی پێش جومعەش هەیە پێش ئەوەی ئیمام دەست بە ووتار بکا ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مُغَفَّلٍ﷛: قالَ النَّبِيُّﷺ: بَيْنَ كُلِّ أَذانَيْنِ صَلاةٌ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە نێوان هەر بانگو ئیقامەتێکدا نوێژێکی سوننەت هەیە. هەروەها لە دوای جومعەش چوار ڕەکعەت، یان دوو ڕەکعەت سوونەت هەیە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إِذا صَلّى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْدَها أَرْبَعاً﴾ رواه‌مسلم، ﴿وَكانَﷺ يُصَلّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِه﴾ رواه‌الشیخان، واتە: کاتێ یەکێکتان نوێژی جومعەی کرد، با چوار ڕەکعەت سوننەتیش لە دوای بکا. پێغەمبەرﷺ دوو ڕەکعەت سوننەتی لە پاش جومعە لە ماڵەوە ئەکرد.

﴿پاشکۆ﴾: سەلاوات لێدان لە شەو و ڕۆژی جومعەدا زۆر خێرە ﴿عَنْ أَوْسِ بنِ أَوْسٍ﷛: قالَ النَّبِيُّﷺ: إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاةِ فِيهِ فَإِنَّ صَلاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ، قالُوا: يا رَسُولَ اللهِ وَكَيْفَ تُعْرَضُ عَلَيْكَ صَلاتُنا وَقَدْ أَرَمْتَ؟ قالَ: إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَجْسادَ الأَنْبِياءِ﴾ رواه‌النسائی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە هەموو ڕۆژەکانتان گەورەتر ڕۆژی هەینی‌یە، کەوابوو: زۆر سەلاواتم لە سەر لێبدەن

(فَصْلٌ وَصَلاَةُ الْعِيدَيْنِ سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ، وَهِيَ رَكْعَتَانِ: يُكَبِّرُ فِي الأُولَى سَبْعاً سِوَى تَكْبِيرَةِ الاحْرَامِ، وَفِي الثَّانِيَةِ خَمْساً سِوَى تَكْبِيرَةِ الْقِيامِ،

---

له ڕۆژی هەینیدا، چونکه سەلاواتەکانتان ئەگەیەندرێته لای منو گوێم لێیە، گوتیان: چۆن سەلاواتەکان ئەگاتە لای تۆ، چونکه تۆ له ناو گۆڕەکەتدا ڕزیوی؟ فەرمووی: ناڕزێم چونکه خوای گەورە قەدەغەی کردوە: زەوی لاشەی پێغەمبەران بڕزێنێو بخوا.

﴿وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَضاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ ما بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ﴾ رواه الحاكم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك سورەتی (الْكَهْف) له ڕۆژی هەینیدا بخوێنێ، نێوان هەردوو هەینییەکەی بۆ ڕۆشن ئەبێتەوە. ئیمامی (النواوي) ئەفەرموێ: له شەوی هەینیش خێره بخوێندرێ.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی (صَلاَةُ الْعِيدَيْنِ) نوێژی هەردوو جەژنەکان ﴾

(وَصَلاَةُ الْعِيدَيْنِ) نوێژی جەژنی ڕەمەزانو قوربان (سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ) سوننەتێکی زۆر گەورەیە بۆ هەموو کەسێك، چونکه پێغەمبەرﷺ کردویەتی (وَهِيَ) نوێژی هەردوو جەژنەکان (رَكْعَتَانِ) دوو ڕەکعەتن: نیەتی نوێژی جەژنی ڕەمەزان، یان جەژنی قوربانی لێئەێنێ:

(يُكَبِّرُ) ئەڵێ: (اللهُ أكبَر)، (فِي الأُولَى) له ڕەکعەتی یەکەمدا له پاش خوێندنی (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ)...هتد (سَبْعاً) حەفت جار (سِوَى تَكْبِيرَةِ الإِحْرَامِ) جگه له (اللهُ أكبَر)ی نوێژدابەستن (وَفِي الثَّانِيَةِ) وەله ڕەکعەتی دووەمدا (خَمْساً) پێنج جار ئەڵێ: (اللهُ أكبَر)، (سِوَى تَكْبِيرَةِ الْقِيامِ) جگه له (اللهُ أكبَر)ی هەڵسانەوە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكَبِّرُ فِي الْعِيدَيْنِ: فِي الأُولَى سَبْعاً قَبْلَ الْقِراءَةِ، وَفِي الآخِرَةِ خَمْساً قَبْلَ الْقِراءَةِ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەرﷺ له نوێژی هەردوو جەژنەکان له ڕەکعەتی یەکەمدا حەفت (اللهُ أكبَر)ی ئەگوتن پێش فاتیحەخوێندن، هەروەها له ڕەکعەتی دووەمیشدا پێنج (اللهُ أكبَر)ی ئەگوتن پێش فاتیحەخوێندن.

جا بزانە: سوننەتە لەگەڵ هەر (اللهُ أكبَر)ێك هەردوو دەستەکانی بەرز بکاتەوە، وە له نێوان (اللهُ أكبَر)ەکاندا بڵێ: (سُبْحانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ وَلاإلَهَ إلاّ اللهُ وَاللهُ أكبَرُ). ئینجا پاش (اللهُ أكبَر)ی حەفتەم له ڕەکعەتی یەکەم، وە پاش (اللهُ أكبَر)ی پێنجەم له ڕەکعەتی دووەم یەکسەر (أَعُوذُ بِاللهِ) ئەکاو فاتیحه ئەخوێنێ.

﴿ئاگاداری﴾: یەکەم: کاتی نوێژی جەژنەکان له بەرزبوونی ڕۆژ بە قەد ڕمێك دەست پێ ئەکاو، تا ڕۆژ لائەدا بۆ چاوی ڕاستە، ئەمێنێ.

دووەم: نوێژی جەژنەکان سوننەتە بە جەماعەت بکرێ، بەلام دروستە بە تەنهاییش بکرێ.

سێیەم: ﴿كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ فِي الْعِيدِ: أَنْ يَقُولَ: اَلصَّلاةَ جامِعَةً﴾ رواه الشافعي عن الزهري مرسلا، پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە بانگدەر ئەکرد: لەجیاتی بانگو ئیقامەت له جەژنەکاندا بڵێ: (الصَّلاَةَ جامِعَةً).

وَيَخْطُبُ بَعْدَهَا خُطْبَتَيْنِ: يُكَبِّرُ فِي الأُولَى تِسْعاً، وَفِي الثَّانِيَةِ سَبْعاً. وَيُكَبِّرُ مِنْ غُرُوبِ الشَّمْسِ مِنْ لَيْلَةِ الْعِيدِ إِلَى أَنْ يَدْخُلَ الامامُ فِي الصَّلاَةِ، وَفِي الأَضْحَى خَلْفَ الصَّلَوَاتِ الْمَفْرُوضَاتِ: مِنْ صُبْحِ يَوْمِ عَرَفَةَ إِلَى الْعَصْرِ مِنْ آخِرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ.

---

(وَيَخْطُبُ بَعْدَهَا) سوننەتە پاش نوێژیجەژن (خُطْبَتَيْنِ) دوو ووتار بدا، وەك ووتارەكانی جومعە، جا لە جەژنی ڕەمەزاندا باسی سەرفیترە بكاو لە جەژنی قورباندا باسی قوربانی بكا، هەم (يُكَبِّرُ فِي الأُولَى تِسْعاً) پێش دەست پێكردنی ووتاری یەكەم نۆ جار بڵێ: (اللهُ أكبَر) بە دوای یەكدا.

(وَفِي الثَّانِيَةِ سَبْعاً) وە پێش ووتاری دووەم حەفت جار بڵێ: (اللهُ أكبَر) بە دوای یەكدا ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَبُوبَكْرٍ وَعُمَرُ رَضِيَ اللهُ عنهما يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺو ئیمامی(أبوبكر)و ئیمامی(عمر) پێش ووتاردان نوێژی جەژنیان ئەكرد.

(وَيُكَبِّرُ) سوننەتە تەكبیر لێبدا (مِنْ غُرُوبِ الشَّمْسِ) لە كاتی ڕۆژ ئاوابوونەوە (مِنْ لَيْلَةِ الْعِيدِ) لە شەوی هەردوو جەژنەكان (إِلى أن يَدْخُلَ الإمامُ فِي الصَّلاَةِ) تا ئیمام نوێژیجەژن دائەبەستێ، ئەگەر بە جەماعەت بیكا، ئەگەر نا: تا خۆی نوێژیجەژن دەست پێئەكا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ﴾ بۆ ئەوەی ژمارەی ڕۆژووەكان تەواو بكەن، جا كە تەواوتان كرد، (اللهُ أكبَر) بڵێن، چونكە خوای گەورە ئێوەی خستۆتە سەر ڕێگایەكی ڕاست.

جا بزانە: ئەو تەكبیرانەی شەوێ لە هەموو كاتێكو شوێنێكدا ئەگوترێن، نەك هەر لە دوای نوێژەكان، جا ئەمە شێوەی تەكبیر لێدانە: (اَللهُ أَكْبَرْ اَللهُ أَكْبَرْ اَللهُ أَكْبَرْ، لاَإِلهَ إِلاَّاللهُ وَاللهُ أَكْبَرْ، اَللهُ أَكْبَرْ، وَلِلهِ الْحَمْدُ)، سێ جار.

(وَفِي الأَضْحَى) هەروەها لە جەژنی قورباندا –جگە لە تەكبیرەكانی شەوێ– تەكبیر لێدان سوننەتە (خَلْفَ الصَّلَوَاتِ الْمَفْرُوضَاتِ) لە دوای هەموو نوێژە واجبەكانو سوننەتەكان (مِنْ صُبْحِ يَوْمِ عَرَفَةَ) لە پاش نوێژی سبەینەی ڕۆژی عالفەوە (إِلَى الْعَصْرِ) تا پاش نوێژی عەسر (مِنْ آخِرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ) لە كۆتایی سێیەمین ڕۆژەكانی دوای جەژنی قوربان، كە پێیان ئەگوترێ: (أَيَّام التَّشْرِيقِ).

بەڵام لە جەژنیڕەمەزاندا تەنها لە دوای نوێژی مەغریبو عیشاو سبەینەی جەژن سوننەتن.

﴿پاشكۆ﴾: سوننەتە بۆ هەردوو جەژنەكان خۆی بشۆرێو بەرگی جوانو پاك بكاتە بەر و خۆی بۆنخۆش بكاو بە ڕێگەیەكدا بچێتە نوێژی جەژن و بە یەكێكیتردا بگەڕێتەوە، وە جەژنە پیرۆزانەش حەڵاڵە.

(فَصْلٌ) وَصَلاةُ الْكُسُوفِ سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ، فَإِنْ فَاتَتْ لَمْ تُقْضَ، وَيُصَلِّي لِكُسُوفِ الشَّمْسِ وَخُسُوفِ الْقَمَرِ رَكْعَتَيْنِ: فِي كُلِّ رَكْعَةٍ قِيَامَانِ يُطِيلُ الْقِرَاءَةَ فِيهِمَا، وَرُكُوعَانِ يُطِيلُ التَّسْبِيحَ فِيهِمَا، دُونَ السُّجُودِ،

---

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی (صَلاةُ الْكُسُوفِ) نوێژی ڕۆژگیران و مانگگیران ﴾**

(وَصَلاةُ الْكُسُوفِ) نوێژکردنی ڕۆژگیران و مانگگیران (سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ) سوننەتێکی زۆر گەورەیە، چونکە پێغەمبەرﷺ کردویەتی (فَإِنْ فَاتَتْ) جا ئەگەر ئەو نوێژە کاتی کردنی نەما (لَمْ تُقْضَ) قەزا ناکرێتەوە.

جا بزانە: بە گیرانی مانگ، یان بە گیرانی ڕۆژ، کاتی ئەو نوێژە دەست پێئەکا، وە کاتی نوێژەکەش بە سەر ئەچێ: بە بوونەوەی ڕۆژ، یان مانگ، یان ئاوابوونی ڕۆژ بە گیراوی، یان بە دەرکەوتنی ڕۆژ ئەگەر مانگ گیرابو.

(وَيُصَلِّي) سوننەتە هەموو کەس نوێژ بکا (لِكُسُوفِ الشَّمْسِ) لە بەر ڕۆژگیران، نیەتی نوێژی ڕۆژگیرانی لێبێنێ (وَخُسُوفِ الْقَمَرِ) وە لە بەر مانگگیران، نیەتی نوێژیمانگگیرانی لێبێنێ (رَكْعَتَيْنِ) بە لایکەم ئەو نوێژە دوو ڕەکعەتە وەکو سوننەتی بەیانی، ئینجا دروستە: بە تەنهایی بکرێ و بە جەماعەتیش سوننەتە، بەڵام زیاتر خێرە بەم شێوەیە بکرێ:

(فِي كُلِّ رَكْعَةٍ) لە هەر ڕەکعەتێك لەو دوو ڕەکعەتانەدا (قِيَامَانِ) دوو ڕاوەستانی بە پێوەیان تێدانە، واتە: پاش ڕوکووع ناچێتە سوجدە، بەڵکو دیسان دەست بە فاتیحە ئەکاتەوە (يُطِيلُ الْقِرَاءَةَ فِيهِما) لە پاش فاتیحە لە هەردوو ڕەکعەتەکان، واتە: لە هەر چوار وەستانەکاندا سورەتی درێژ بخوێنێ (وَرُكُوعَانِ) وە هەر ڕەکعەتێك دوو ڕوکووعی تێدانە پێش چوونە سوجدە (يُطِيلُ التَّسْبِيحَ فِيهِما) زۆر بڵێ (سُبحانَ رَبِّيَ الْعَظِيم): بە قەد سەد ئایەت لە یەکەمدا، هەشتا ئایەت لە دووەمدا، حەفتا ئایەت لە سێیەمدا، پەنجا ئایەت لە چوارەمدا (دُونَ السُّجُودِ) بەڵام سوجدەکان درێژ ناکاتەوە.

جا بزانە: ئیمامی(النـواوي) فەرموویەتی: سوننەتە سوجدەکانیش درێژ بکاتەوە وەك ڕوکووعی پێشە خۆیان.

﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قَالَتْ خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِﷺ فَقامَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَأَطالَ الْقِيامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قامَ فَأَطالَ الْقِيامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطالَ الرُّكُوعَ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطالَ السُّجُودَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ما فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ انْجَلَتِ الشَّمْسُ فَخَطَبَ النَّاسَ﴾ رواه الشيخان، لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ ڕۆژ گیرا، ئینجا پێغەمبەرﷺ هەڵسا نوێژی ڕۆژگیرانی بە جەماعەت بۆ موسوڵمانان کرد، لە ڕەکعەتی یەکەمدا زۆر مایەوە و زۆر

وَيَخطُبُ بَعْدَها خُطْبَتَيْنِ، وَيُسِرُّ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ وَيَجْهَرُ فِي خُسُوفِ الْقَمَرِ.
(فَصْلٌ) وَصَلاَةُ الاسْتِسْقَاءِ مَسْنُونَةٌ، فَيَأْمُرُهُمُ الإِمامُ: بِالتَّوْبَةِ، وَالصَّدَقَةِ، وَالْخُرُوجِ مِنَ الْمَظَالِمِ، وَمُصالَحَةِ الأَعْداءِ،

---

قورئانى خوێند، ئینجا چووە ڕوکووع لەوێشدا زۆر مایەوە تەسبیحاتی ئەکرد، ئینجا لە ڕوکووع هەڵساوەو نەچووە سوجدە، دیسان دەستی بە فاتیحەخوێندن کرد، بەڵام لە ڕاوەستانەکەی پێشوو کەمتر مایەوە، ئینجا دیسان چووە ڕوکووع لە ڕوکووعەکەی پێشوو کەمتر مایەوە، ئینجا لە ڕوکووع هەڵساوە، ئینجا چووە سوجدەو لە هەردوو سوجدەکانیش زۆر مایەوە، ئینجا هەڵساوە بۆ ڕەکعەتیدووەم ئەویشی وەك ڕەکعەتیپێشوو کرد، دوایی –کە سەلامی داوە–ڕۆژ بوبۆوە، جا دەستی بە ووتاردان کرد.

(وَيَخْطُبُ بَعْدَها خُطْبَتَيْنِ) سوننەتە ئیمام لە دوای ئەو نوێژە دوو ووتار بخوێنێتەوە (بە بەڵگەی ئەو حەدیسەی باسمان کرد)، جا ئەو دوو ووتارە وەکو ووتارەکانی جومعە بن (وَيُسِرُّ) با بە نهێنی بخوێنێ (فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ) لە نوێژی ڕۆژگیران (وَيَجْهَرُ) با بە دەنگ بخوێنێ (فِي خُسُوفِ الْقَمَرِ) لە نوێژی مانگگیران.

﴿پاشكۆ﴾: لە بەر دونیا تاریکبوون و تۆز و ڕەشەبا و لافاو و زەمین لەرزین، سوننەتە: هەر کەسێك بۆ خۆی–بە تەنهایی–دوو ڕەکعەت نوێژ بکا وەك سوننەتی پێش نیوەڕۆ، نەك بەو شێوەی گوتمان ﴿عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إنَّ هَذه الآيات الَّتِي يُرْسِلُ اللهُ تَعالَى لاَ تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَد وَلاَ لِحَياته، وَلَكِنَّ اللهَ يُرْسِلُها يُخَوِّفُ بِها عِبادَهُ، فَإذا رَأَيْتُمْ مِنْها شَيْئاً فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللهِ وَدُعائِهِ وَاسْتِغْفارِهِ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو جۆرە نیشانە بە ترسانە، لە بەر مردنو ژینی هیچ کەسێك نایەن، بەڵام خوایگەورە بەو جۆرە ڕوداوانە بەندەکانیخۆی ئەترسێنێ، جا کاتێ شتێك لەوانە ڕوی‌دا، ئێوە ڕوو بکەنە نوێژکردنو پاڕانەوە لە خواو، تۆبەکردنو خێر کردنو (اللهُ أكبَر)و زیکریتر.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (صَلاَةُ الإِسْتِسْقاءِ) نوێژی داواکردنی ئاودان لە خوای گەورە ﴾

(وَصَلاَةُالإِسْتِسْقاءِ) نوێژی داواکردنی ئاودان (مَسْنُونَةٌ) سوننەتێکی زۆر گەورەیە، دروستە بە تەنهایی بکرێو بە جەماعەت سوننەتە، جا بزانە: ئەو نوێژە لە بەر نەبارینی باران، یان لە بەر کەمیی ئاو، یان لە بەر ووشکبوونی ئاو، سوننەتە بکرێ.

(فَيَأْمُرُهُمُ الإِمامُ) کاربەدەستی ئەو شوێنە فەرمان ئەداتە خەڵك: (بِالتَّوْبَةِ) کە خەڵکە تۆبە بکەن و (وَالصَّدَقَةِ) هەروەها خێرو چاکە بکەن و (وَالْخُرُوجِ مِنَ الْمَظالِمِ) واز لە ستەمکاری بێنن و مافی یەکتری بدەنەوە و گەردەنی یەکتری ئازاد بکەن (وَمُصالَحَةِ الأَعْداءِ) وە دوژمنەکان لەگەڵ یەکتری ئاشت ببنەوەو یەکتری ببورنو گفتوگۆ لەگەڵ

وَصِيامِ ثَلاثَةَ أيّامٍ، ثُمَّ يَخرُجُ بِهِمْ فِي الْيَوْمِ الرَّابِعِ فِي ثِيابٍ بِذْلَةٍ وَاسْتِكانَةٍ وَتَضَرُّعٍ، وَيُصَلِّي بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ كَصَلاةِ الْعِيدَيْنِ، ثُمَّ يَخْطُبُ بَعْدَهُما، وَيُحَوِّلُ رِداءَهُ، وَيُكْثِرُ مِنَ الدُّعاءِ وَالْإِسْتِغْفارِ،

---

یەکتری بکەن (وَصِيامِ ثَلاثَةِ أيّامٍ) هەروەها فەرمان ئەدا: کە هەموو کەسێك چوار ڕۆژان بەڕۆژوو بێ: سێ ڕۆژان–لە سەر یەکدا–لە ماڵەوە.

(ثُمَّ يَخْرُجُ بِهِمْ) ئینجا لە دوای ئەو سێ ڕۆژانە کاربەدەستەکە خەڵکەکە لە ئاوەدانی ئەباتە دەرەوە (فِي الْيَوْمِ الرَّابِعِ) لە ڕۆژی چوارەمینی ڕۆژووەکاندا ئەڕۆن بۆ شوێنێکی چۆڵ.

جا بزانە: ئەو چوار ڕۆژووانە بە فەرمانی کاربەدەست واجب ئەبن، واتە: هەر کەسێك بەڕۆژوو نەبێ، گوناهبارە.

ئینجا کە بۆ نوێژکردنەکە دەرچوون: (فِي ثِيابِ بِذْلَةٍ) جلو بەرگێکی شڕو دڕاو ئەکەنە بەر (وَاِسْتِكانَةٍ) بە دڵێکی پڕ ترس ئەڕۆن (وَتَضَرُّعٍ) بە ملکەچیو پارانەوە لە خوا، خۆیان خەریك ئەکەن، هەروەها پیرو منداڵو ئاژەڵو بێچووەکانیان لەگەڵ خۆیان ئەبەن.

(وَيُصَلِّي بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ) ئینجا ئیمام دوو ڕەکعەت نوێژ بە جەماعەت بۆ خەڵکەکە ئەکا، بە نیەتی نوێژی دواکردنی ئاودان (كَصَلاةِ الْعِيدَيْنِ) وەکو نوێژی جەژنەکان: بە دەنگ ئەخوێنێو لە ڕەکعەتی‌یەکەمدا حەفت تەکبیرو لە ڕەکعەتی‌دووەمدا پێنج تەکبیر لێ‌ئەدا، بەو شێوەی گوتمان.

﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُتَبَذِّلاً مُتَواضِعاً حَتَّى أَتَى الْمُصَلَّى فَرَقِيَ الْمِنْبَرَ فَلَمْ يَخْطُبْ خُطَبَكُمْ هَذِهِ، وَلَكِنْ لَمْ يَزَلْ فِي الدُّعاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالتَّكْبِيرِ حَتَّى صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَما يُصَلِّي فِي الْعِيدِ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ بۆ نوێژکردنی باران لە مەدینە چووە دەرەوە، بەرگێکی شڕەکەی کردە بەر، ملکەچ بوو، لە خوا ئەپاڕایەوە تا گەیشتە شوێنی نوێژکردن، جا چووە سەر مینبەر، ئەو جۆرە ووتارەی ئێوەی نەدا، بەڵکو هەر دوعای ئەکردو (اللهُ أكبَرُ)ی ئەگوت، ئینجا دوو ڕەکعەت نوێژی بە جەماعەت کرد وەکو نوێژی جەژن.

(ثُمَّ يَخْطُبُ بَعْدَهَا) ئینجا سوننەتە ئیمام دوو ووتار بدا لە پاش نوێژکردن (وَيُحَوِّلُ رِداءَهُ) ئینجا ئیمام–پاش دەست پێکردنی ووتاری دووەم– ڕوو لە قیبلە ئەکاو عەبایەکەی، یان جلەکانی‌تری دیواودیو ئەکاو سەراوژێر ئەیکاتە بەر (وَيُكْثِرُ مِنَ الدُّعاءِ) لە هەردوو ووتارەکاندا زۆر لە خوا ئەپاڕێتەوە کە باران ببارێنێو بەڵایەکان لاببا.

(وَالإِسْتِغْفارِ) زۆر (أَسْتَغْفِرُ اللهَ) ئەڵێ، واتە: پێش دەست پێکردنی ووتاری‌یەکەم نۆ جار ئەڵێ: (أَسْتَغْفِرُاللهَ الْعَظِيمَ الَّذِي لاإِلَهَ إِلاّهُوَالْحَيُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ). بەڵام پێش دەست پێکردنی ووتاری‌دووەم حەفت جار ئەیڵێ.

وَيَدْعُو بِدُعاء رَسُول اللهﷺ وَهُوَ: اَللَّهُمَّ اجْعَلْها سُقْيا رَحْمَةٍ وَلاَ تَجْعَلْها سُقْيا عَذاب وَلاَ مَحْقٍ وَلاَ بَلاَء وَلاَ هَدْمٍ وَلاَ غَرَقٍ، اَللَّهُمَّ عَلَى الظِّرابِ وَالآكامِ وَمَنابِتِ الشَّجَرِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ، اَللَّهُمَّ حَوالَيْنا وَلاَ عَلَيْنا، اَللَّهُمَّ أَسْقِنا غَيْثاً مُغِيثاً هَنِيئاً مَرِيئاً مَرِيعاً سَحّاً عامّاً غَدَقاً طَبَقاً مُجَلِّلاً دائِماً إِلَى يَوْمِ الدِّينِ، اَللَّهُمَّ أَسْقِنا الْغَيْثَ وَلاَ تَجْعَلْنا مِنَ الْقانِطِينَ، اَللَّهُمَّ إِنَّ بِالْعِبادِ وَالْبِلاَدِ مِنَ الْجَهْدِ وَالْجُوعِ وَالضَّنْكِ مَا لاَنَشْكُو إِلاَّ إِلَيْكَ، اَللَّهُمَّ أَنْبِتْ لَنا الزَّرْعَ وَأَدِرَّ لَنا الضَّرْعَ، وَأَنْزِلْ عَلَيْنا مِنْ بَرَكاتِ السَّماءِ وَأَنْبِتْ لَنا مِنْ بَرَكاتِ الأَرْضِ، وَاكْشِفْ عَنَّا مِنَ الْبَلاَءِ مَا لاَيَكْشِفُهُ غَيْرُكَ، اَللَّهُمَّ إِنّا نَسْتَغْفِرُكَ إِنَّكَ كُنْتَ غَفّاراً فَأَرْسِلِ السَّماءَ عَلَيْنا مِدْراراً. وَيَغْتَسِلُ فِي الْوادِي إِذا سَالَ،

---

﴿ئاگاداری﴾: سوننەتە ووتارەکان لە دوای نوێژکردن بن ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ﴾: خَرَجَ النَّبِيُّﷺ لِلإِسْتِسْقاءِ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ خَطَبَ﴾ رواه البيهقي واحمد وابن ماجه، پێغەمبەرﷺ نوێژی بارانی کرد، ئینجا ووتاریدا. هەروەها دروستیشە لە پێش نوێژکردندا بن ﴿عَنْ عَبّاد عَنْ عَمِّهِ: خَرَجَ النَّبِيُّﷺ يَسْتَسْقِي فَحَوَّلَ اِلَى النّاسِ ظَهْرَهُ واسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ يَدْعُو ثُمَّ حَوَّلَ رِداءَهُ ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ فِيهِما بِالْقِراءَةِ﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەرﷺ چووە دەرەوەی (مدينة) بۆ نوێژی باران، لە ووتارەکەیدا پشتی لە خەڵك کردو رووی کردە قیبلە دوعای ئەکرد، ئینجا عەبایەکەی دیوانیو کرد، ئینجا لە دوای ووتارەکە دوو رەکعەت نوێژی پێمان کردو دەنگی هەڵێنا لە فاتیحەخوێندن.

(وَيَدْعُو) سوننەتە لە ووتاری یەکەمدا دوعا بکا (بِدُعاءِ رَسُولِ اللهﷺ) بەو دوعایەی پێغەمبەرﷺئەیکرد (وَهُوَ) ئەو دوعایە ئەمەیە:

﴿أَللَّهُمَّ اجْعَلْها سُقْيارَحْمَةً وَلاَ تَجْعَلْها سُقْياعَذاب وَلاَ مَحْقٍ وَلاَ بَلاء وَلاَ هَدْمٍ وَلاَ غَرَقٍ، أَللَّهُمَّ عَلَىالظِّرابِ وَالآكامِ وَمَنابِتِ الشَّجَرِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ، أَللَّهُمَّ حَوالَيْنا وَلاَ عَلَيْنا، أَللَّهُمَّ أَسْقِنا غَيْثاً مُغِيثاً هَنِيئاً مَرِيئاً مَرِيعاً سَحّاً عامّاً غَدَقاً طَبَقاً مُجَلِّلاً دائِماً إِلَى يَوْمِ الدِّينِ، أَللَّهُمَّ أَسْقِنا الْغَيْثَ وَلاَ تَجْعَلْنا مِنَ الْقانِطِينَ، أَللَّهُمَّ إِنَّ بِالْعِبادِ وَالْبِلاَدِ مِنَ الْجَهْدِ وَالْجُوعِ وَالضَّنْكِ مَا لاَنَشْكُو إِلاَّ إِلَيْكَ، أَللَّهُمَّ أَنْبِتْ لَنا الزَّرْعَ وَأَدِرَّ لَنا الضَّرْعَ، وَأَنْزِلْ عَلَيْنا مِنْ بَرَكاتِ السَّماءِ وَأَنْبِتْ لَنا مِنْ بَرَكاتِ الأَرْضِ، وَاكْشِفْ عَنّا مِنَ الْبَلاَءِ مَا لاَيَكْشِفُهُ غَيْرُكَ، أَللَّهُمَّ إِنّا نَسْتَغْفِرُكَ إِنَّكَ كُنْتَ غَفّاراً فَأَرْسِلِ السَّماءَ عَلَيْنا مِدْراراً﴾ رواه الامام الشافعي فيالمختصر.

(وَيَغْتَسِلُ) سوننەتە خۆی بشۆری، یان دەستنوێژ بگری (فِيالْوادِي) لە شیوەکان (إِذا سَالَ) کاتێ لافاوی پێدا هات، هەروەها سوننەتە کە بارانی نوێ ئەباری: خۆی روت

وَيُسَبِّحُ لِلرَّعْدِ وَالْبَرْقِ.

(فَصْلٌ) وَصَلاَةُ الْخَوْفِ عَلَى ثَلاَثَةِ أَضْرُبٍ، أَحَدُهَا: أَنْ يَكُونَ الْعَدُوُّ فِي غَيْرِ جِهَةِ الْقِبْلَةِ، فَيُفَرِّقُهُمُ الإِمَامُ فِرْقَتَيْنِ: فِرْقَةٌ تَقِفُ فِي وَجْهِ الْعَدُوِّ، وَفِرْقَةٌ خَلْفَهُ، فَيُصَلِّي بِالْفِرْقَةِ الَّتِي خَلْفَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ تُتِمُّ لِنَفْسِهَا وَتَمْضِي إِلَى وَجْهِ الْعَدُوِّ، وَتَأْتِي الطَّائِفَةُ الأُخْرَى، فَيُصَلِّي بِهَا رَكْعَةً، وَتُتِمُّ لِنَفْسِهَا وَيُسَلِّمُ بِهَا.

---

بكاتەوە تا لەشی تەڕ ئەبێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: حَسَرَ النَّبِيُّ ﷺ ثَوْبَهُ حَتَّى أَصَابَهُ مِنَ الْمَطَرِ، وَقَالَ: إِنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەر ﷺ بەرگیخۆی لە سەر خۆی لادا تا لەشی تەڕ بوو بە بارانو فەرمووی: ئەوە تازە لە لایخوا هاتوە.

(وَيُسَبِّحُ لِلرَّعْدِ) سوننەتە لە بەر گرمەیهەور تەسبیحات بکاو بڵێ: ﴿سُبْحانَ مَنْ يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلاَئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ﴾ رواه الامام مالك. (وَالْبَرْقِ) هەروەها لە کاتی بریقەی بروسك بڵێ: ﴿سُبْحانَ مَنْ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً﴾. بەلام با تەماشای بریقەی بروسك نەکا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (صَلاَةُ الْخَوْفِ) نوێژی ترس ﴾

(وَصَلاَةُ الْخَوْفِ) نوێژکردن لە کاتی ترسان (عَلَى ثَلاَثَةِ أَضْرُبٍ) سێ جۆرە: (أَحَدُهَا) یەکەمیان: (أَنْ يَكُونَ الْعَدُوُّ) ئەوەیە: دوژمن لە شوێنێك بێ (فِي غَيْرِ جِهَةِ الْقِبْلَةِ) کە لای قیبلە نەبێ (فَيُفَرِّقُهُمُ الإِمَامُ فِرْقَتَيْنِ) ئیمام سوپاکەی ئەکاتە دوو کۆمەڵ (فِرْقَةٌ) کۆمەڵێك (تَقِفُ فِي وَجْهِ الْعَدُوِّ) لە بەرانبەر دوژمن ئەوەستن پاسەوانی ئەکەن (وَفِرْقَةٌ) کۆمەڵەکەیتریش (تَقِفُ خَلْفَهُ) لە پشت ئیمام ئەوەستن لە شوێنێکی وا: کە چەکی دوژمن نەیانگاتێ (فَيُصَلِّي) جا ئیمام نوێژ بە جەماعەت ئەکا (بِالْفِرْقَةِ الَّتِي خَلْفَهُ) بەو کۆمەڵەی لە دوای خۆی ماوەتەوە (رَكْعَةً) تەنها یەك ڕەکعەتیان پێئەکا –ئەگەر نوێژەکە دوو ڕەکعەتی بوو– بەلام ئەگەر سێ ڕەکعەت، یان چوار بوو، دوو ڕەکعەتیان پێئەکا (ثُمَّ) ئینجا کە ئیمام هەڵساوە بۆ ڕەکعەتی دووەم، ئەگەر دوو ڕەکعەتی بوو (تُتِمُّ لِنَفْسِهَا) با ئەو کۆمەڵە نیەتی جیابوونەوە بێننو بۆ خۆیان نوێژەکە تەواو بکەن (وَتَمْضِي) کە تەواویان کرد بابڕۆن (لِوَجْهِ الْعَدُوِّ) بۆ بەرانبەر دوژمن، بەلام ئیمام لە ڕەکعەتی دووەم چاوەڕوان ئەکاو پاش فاتیحە سورەتیدرێژ ئەخوێنێ، ئینجا (وَتَأْتِي الطَّائِفَةُ الأُخْرَى) با کۆمەڵەکەیتریش بێنە پشت ئیمامو نوێژ دابەستن (فَيُصَلِّي بِهَا رَكْعَةً) ئینجا ئیمام ڕەکعەتەکەیتریش بە جەماعەت لەگەڵ ئەوان بکا، ئەگەر دوو ڕەکعەتی بوو، ئەگەر نا: با سێیەمو چوارەم لەگەڵ ئەوان بکا (وَتُتِمُّ لِنَفْسِهَا) جا کە ئیمام بۆ تەحیات دانیشت، ئەوان هەڵئەستن نوێژەکەی خۆیان تەواو ئەکەن (وَيُسَلِّمُ بِهَا) با ئیمام لەتەحیات چاوەڕوانیان بکا بۆ

وَالثَّانى: أَنْ يَكُونَ فِى جِهَةِ الْقِبْلَةِ، فَيَصُفُّهُمُ الإمامُ صَفَّيْنِ وَيُحْرِمُ بِهِمْ، فَإذا سَجَدَ سَجَدَ مَعَهُ أَحَدُ الصَّفَّيْنِ، وَوَقَفَ الصَّفُّ الآخَرُ يَحْرُسُهُمْ، فَإذا رَفَعَ سَجَدُوا وَلَحِقُوهُ. وَالثَّالِثُ: أَنْ يَكُونَ فِى شِدَّةِ الْخَوْفِ وَالْتِحامِ الْحَرْبِ، فَيُصَلِّى كَيْفَ أَمْكَنَهُ: رَاجِلاً، أَوْ رَاكِباً، مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، وَغَيْرَ مُسْتَقْبِلٍ لَها. (فَصْلٌ) وَيَحْرُمُ عَلَى الرِّجالِ لُبْسُ الْحَرِيرِ وَالتَّخَتُّمُ بِالذَّهَبِ،

---

ئەوەی بە یەکەوە سەلام بدەنەوە. ئەم شێوەیە پێغەمبەرﷺ لە جەنگی (ذات الرقاع) کردویەتی، (بخاری)و(مسلم) گێڕاویەتیانەوە.

(وَالثَّانِى) شێوەیدووەم لە نوێژی ترس: (أَنْ يَكُونَ فِى جِهَةِ الْقِبْلَةِ) ئەوەیە دوژمن لە لای قیبلە بێ (فَيَصُفُّهُمُ الإمامُ صَفَّيْنِ) با ئیمام بیانکاتە دوو ڕیز (وَيُحْرِمُ بِهِمْ) ئینجا نوێژ لەگەڵ هەردوو ڕیزەکان دابیەستێو هەموو بە یەکەوە ڕوکوع ببەن (فَإذا سَجَدَ) جا کە ئیمام چووە سوجدە (سَجَدَ مَعَهُ أَحَدُالصَّفَّيْنِ) با تەنها یەك ڕیز سوجدە لەگەڵ ئیمام ببا (وَوَقَفَ الصَّفُّ الآخَرُ) ڕیزەکەیتریش بە پێوە بوەستێ (يَحْرُسُهُم) پاسەوانی ئەوانە بکەن کە لە سوجدەدان (فَإذا رَفَعَ) جا کە ئیمامو ڕیزەکە لە سوجدەیدووەم هەڵسانەوە (سَجَدُوا) با ڕیزەکەیتریش سوجدە ببەنو (وَلَحِقُوهُ) لە ڕەکعەتی دووەم بگەنەوە ئیمام. ئەم شێوەیە پێغەمبەرﷺ لە(عسفان) کردویەتی، (مسلم) گێڕاویەتیەوە.

(وَالثَّالِثُ) شێوەیسێیەم لە نوێژی ترس: (أَنْ يَكُونَ فِى شِدَّةِ الْخَوْفِ) ئەوەیە ترس زۆر بێ (وَالْتِحامِ الْحَرْبِ) لەشکری هەردوو لا، لە جەنگ تێکەڵی یەکتری بێ (فَيُصَلِّى) هەرکەسە نوێژیخۆی ئەکا (كَيْفَ أَمْكَنَهُ) بە هەر جۆرێکی بۆی ڕێك بکەوێ (رَاجِلاً) ج بە پیادەیی (أَوْ رَاكِباً) یان بە سواری (مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ) بگونجێ ڕووی لە قیبلە بێ (وَغَيْرَ مُسْتَقْبِلٍ لَها) یان ڕووی لە قیبلە نەبێ، ئەبێ نوێژەکە هەر بکا.

جا ئەگەر نەگونجا ڕوکوع وسوجدە ببا، با نە ختێك خۆی کوڕ بکاتەوە بۆ ڕوکوعو کەمێك زیاتر بۆ سوجدە، ئیتر ڕاکردنو چەك بەکارهێنانو لێدانو کوشتن، زیان بە نوێژ ناگەیەنێ، نوێژەکەش دوو بارە کردنەوەی ناوێ، بەو مەرجەی هاوارو قسە نەکا.

ئینجا بزانە: ئەو جۆرە نوێژەیسێیەم لە بەر هەموو جۆرە ترسێك دروستە، وەك لە بەر دوژمنێك، یان لە ترسی لافاو، یان ئاگر، یان درندە ڕا بکا، نوێژەکەش دووبارەی ناوێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَاناً﴾ ئەگەر کەوتنە مەترسی، نوێژەکەتان بکەن بە پیادەیی، یان بە سواری، ڕووتان لە قیبلە بێ یان نا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی جلو بەرگ ﴾

(وَيَحْرُمُ عَلَى الرِّجالِ) حەرامە لە سەر پیاوان: (لُبْسُ الْحَرِيرِ) بەکارهێنانی ئاوریشم، جا بۆ کردنەبەر، یان بۆ ڕاخستن (وَالتَّخَتُّمُ بِالذَّهَبِ) هەروەها حەرامە لە سەر پیاوان:

وَيَحِلُّ لِلنِّساءِ، وَقَلِيلُ الذَّهَبِ وَكَثِيرُهُ فِي التَّحْرِيمِ سَواءٌ، وَإِذا كانَ بَعْضُ الثَّوْبِ إِبْرِيسَماً وَبَعْضُهُ قُطْناً أَوْ كَتَّاناً جازَ لُبْسُهُ مالَمْ يَكُنِ الإِبْرِيسَمُ غالِباً.

---

ئەنگوستیلەی زێڕ بکەنە پەنجەیان (وَيَحِلُّ لِلنِّساءِ) ئەو دووانە بۆ ئافرەتان حەڵاڵن ﴿عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّهُ ﷺ أَخَذَ حَرِيراً فَجَعَلَهُ فِي يَمِينِهِ، وَأَخَذَ ذَهَباً فَجَعَلَهُ فِي شِمالِهِ ثُمَّ قالَ: إِنَّ هَذَيْنِ حَرامٌ عَلَى ذُكُورِأُمَّتِي﴾ وفي رواية: ﴿وَأُحِلَّ لِإِناثِهِمْ﴾ رواه‌اصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ پارچە ئاوریشمێکی بە دەستی ڕاستەیەوە گرتو پارچە زێڕێکی بە دەستی چەپەیەوەگرتو فەرمووی: ئەم دووانە بۆ نێرینەی ئوممەتی من حەرامن‌و بۆ مێینەی ئوممەتم حەڵاڵن.

(وَقَلِيلُ الذَّهَبِ) زێڕی کەم و (وَكَثِيرُهُ) زێڕی زۆر (فِي‌التَّحْرِيمِ) لە حەرامی‌دا (سَواءٌ) یەکسانە، وەکو یەك حەرامە.

(وَإِذا كانَ بَعْضُ الثَّوْبِ) جا ئەگەر بەشێکی جلو بەرگ (إِبْرِيسَماً) ئاوریشم بوو (وَبَعْضُهُ) بەشەکەی‌تریشی (قُطْناً) لۆکە بوو (أَوْ كَتَّاناً) یان کەتان بوو (جازَ لُبْسُهُ) دروستە بیکاتە بەری (مالَمْ يَكُنْ الإِبْرِيسَمُ غالِباً) بەو مەرجەی ئاوریشمەکە زیاتر نەبێ ﴿عَنْ أَسْماءَ رضي الله عنها: كانَتْ جُبَّةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ مَكْفُوفَةَ الْجَيْبِ وَالْكُمَّيْنِ وَالْفَرْجَيْنِ بِالدِّيباجِ﴾ رواه‌مسلم وابوداود، جوببەکەی پێغەمبەرﷺ یەخەو سەرەدەستو ڕۆخەکانی لە ئاوریشم بوو.

﴿پاشکۆ﴾: دروستە بۆ پیاو و ئافرەت: ددانی زێڕو بەرگکردنی ددان بەزێڕ ﴿عَنْ معاويةﷺ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ إِلاَّ مُقَطَّعاً﴾ رواه النسائي، پێغەمبەرﷺ بەکارهێنانی زێڕی حەرام کردوە مەگەر پارچەی بچوك بۆ پێویستی.

هەروەها سوننەتە بۆ پیاو: یەك ئەنگوستیلەی زیو، وە سوننەتە بیخاتە پەنجەی قلیچە، واتە: پەنجەی هەرە بچکۆڵە، جا چ لە دەستی ڕاستە بێ، یان لە دەستی چەپە ﴿عَنْ أَنَسٍﷺ: لَبِسَ النَّبِيُّ ﷺ خاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ﴾ وَعَنْهُ ايضاً: ﴿كانَ خاتَمُ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْخِنْصَرِ مِنَ الْيُسْرَى﴾ رواهما مسلم، (أنس)-خوا لێی ڕازی بێ- فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی کردە پەنجەی دەستەڕاستی. هەروەها فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەی خستە قلیچەی دەستەچەپی. واتە: جارێك خستویەتیە دەستی‌ڕاستە، جارێکێش دەستی‌چەپە.

هەروەها سوننەتە بۆ پیاو و ئافرەت: هەموو حەفتەیەك سەرو چاوی خۆیان‌و لاشەی خۆیان بشۆن‌و، پیاو ڕیشی خۆی شانە بکاو، هەردووکیان جلو بەرگی خاوێن بکەنە بەرو، بەگوێرەی دەستەڵاتی خۆیان بەرگی نوێ بکەنە بەر، سوننەتە: پیاو بۆنی خۆش لە خۆی بداو، مێزەر بنێتە سەری‌و لیچکەی مێزەری بە نێوشانیدا بەر بداتەوە. ئەوانە هەموویان حەدیسیان دەربارە هاتوە.

(فَصْلٌ) وَيَلْزَمُ فِي الْمَيِّتِ أَرْبَعَةُ أَشْيَاءَ: غُسْلُهُ، وَتَكْفِينُهُ، وَالصَّلاَةُ عَلَيْهِ، وَدَفْنُهُ. وَإِثْنَانِ لاَ يُغَسَّلاَنِ وَلاَ يُصَلَّى عَلَيْهِما: اَلشَّهِيدُ فِي مَعْرَكَةِ الْمُشْرِكِينَ،

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی پێویستیەکانی مردوو ﴾

(وَيَلْزَمُ) واجبە (فِي الْمَيِّتِ) دەربارەی موسوڵمانی مردوو (أَرْبَعَةُ أَشْيَاءَ) چوار شت واجبن بە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ)، واتە: ئەو چوارانە لە سەر هەموو کەسێك واجبن-کە ئاگاداری مردنەکەی بێ-جا ئەگەر یەکێك بەو واجبانە هەڵسا، ئەوە خێرەکە بۆ خۆیەتیو تاوانیش لە سەر هەموویان لادەچێ، ئەگەر نا: هەموویان تاوانبارن:

یەکەم: (غُسْلُهُ) شۆردنی. دووەم: (وَتَكْفِينُهُ) کفن کردنی. سێیەم: (وَالصَّلاَةُ عَلَيْهِ) نوێژ لە سەرکردنی. چوارەم: (وَدَفْنُهُ) شاردنەوەی لە ناو خاکدا.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ئافرەتێکی ئاوس مرد و منداڵەکەی لە ناو زگیدا ئەبزوت، واجبە: زگی هەڵبدڕێو منداڵەکەی بێننە دەرەوە، بەو مەرجەی تەمەنی شەش مانگ تەواو بوبێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً﴾ هەر کەسێك ئادەمیزادێکی لە مردن ڕزگار کردبێ، خێری وەك ئەوکەسەیە کە هەموو خەڵکی ڕزگار کردبێ.

(وَإِثْنَانِ) دوو جۆرە مردوو هەنە (لاَيُغَسَّلاَنِ) دروست نیە بشورێن (وَلاَ يُصَلَّى عَلَيْهِما) هەروەها دروست نیە نوێژیان لە سەر بکرێ:

(اَلشَّهِيدُ) یەکەم: موسوڵمانێکە کە شەهید بوبێ (فِي مَعْرَكَةِ الْمُشْرِكِينَ) لە جەنگی موسوڵمانان لەگەڵ کافرەکان، بەو مەرجەی بە هۆی جەنگ- لە کاتی جەنگ- گیانی دەربچێ، نەك بە هۆیەکیتر: وەکو نەخۆشی ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ فِي قَتْلَى أُحُد: بِدَفْنِهِمْ فِي دِمائِهِمْ وَلَمْ يُغَسَّلُوا وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ﴾ رواه البخاری، پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی (أُحُد) فەرمانیدا: شەهیدەکان بە بەرگیخوێنینی خۆیانەوە بنێژرێنو نەشۆرانو نوێژیان لە سەر نەکرا.

جا بزانە: ئەو حەدیسە بەڵگەیە: کە سوننەتە شەهید بە بەرگی خوێنینی خۆیەوە، هەر لەو شوێنەی لێی شەهید بووە بنێژرێ ئەگەر بگونجێ.

﴿ئاگاداری﴾: دوو فەرمودەی جیاواز هەنە: دەربارەی ئەو شەهیدەی لە کاتی جەنگ بریندار ئەبێو لە دوای جەنگ گیانی دەرئەچێ، هەم دەربارەی ئەو موسوڵمانانەی لە ڕێگای خوا تێدەکۆشنو لە جەنگی ئەو موسوڵمانانە شەهید ئەکرێن کە بە حوکمی خواو پێغەمبەر ﷺ ڕەفتار ناکەن:

یەکەمیان: ئەفەرموێ: ئەو دوو شەهیدانەش وەك شەهیدی جەنگی کافرانن: شۆردنو نوێژیان لە سەر نیە. دووەمیان: ئەفەرموێ: ئەبی بشۆردرێنو نوێژیان لە سەر بکرێ وەکو شەهیدانیتری قیامەتی. جا بزانە: ئەم دووەمە بەهێزترە.

وَالسَّقْطُ الَّذِى لَمْ يَسْتَهِلَّ صَارِخاً، وَيُغَسَّلُ الْمَيِّتُ وِتْراً، وَيَكُونُ فِي أَوَّلِ غَسْلِهِ سِدْرٌ، وَفِي آخِرِهِ شَيْءٌ مِنْ كَافُورٍ،

(وَالسَّقْطُ) دووەم كەس كە ناشۆرێ‌و نوێژی لە سەر ناكرێ: منداڵێكی ناتەواوی لەبارچووە (الَّذِى لَمْ يَسْتَهِلَّ صَارِخاً) واتە: كە بە دەرنەكەوێ دەنگی لێ‌نەبیسترێ‌و نەجولێ، چونكە لە ناو زگی‌دایكی‌دا دروستكردنی تەواو نەبوە، ئەمەیان تەنها لە ناو پەڕۆكێكدا ئەپێچرێ‌و ژێر خاك ئەكرێ، بەڵام ئەگەر منداڵێكی‌تەواو بە مردوویی لە دایك بوو، ئەوە تەنها نوێژ لە سەركردنی واجب نیەو سێیەكانی‌تر واجبن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿الطِّفْلُ لاَيُصَلَّى عَلَيْهِ وَلاَيَرِثُ وَلاَيُورَثُ حَتَّى يَسْتَهِلَّ﴾ رواه الترمذي، منداڵی لەبارچوو نابێ نوێژی لە سەر بكرێ‌و نابێ میرات بگرێ‌و نابێ میراتی لێبگیرێ تا بە زیندوویی بەدەرنەكەوێ.

هەروەها ئەو حەدیسە وا ئەگەیەنێ: ئەگەر منداڵێك لە دایك بوو و جولاوە، یان دەنگی كردو مرد، ئەوە ئەبی وەكو گەورە ڕفتاری لەگەڵ بكرێ.

## ﴿ باسی شۆردنی مردوو ﴾

(وَيُغَسَّلُ الْمَيِّتُ) واجبە: مردوو بشۆرێ كە تەواو گیانی دەرچوو، هەرچەند لە ناو ئاویشدا خنكابێ (وِتْراً) سوننەتە: شۆردنەكە تاك بێ.

جا بزانە: واجبەكە هەر ئەوەندەیە: جارێك بشۆرێ وەكو غوسلی‌جەنابەت، بەڵام سوننەت وەهایە: سێ جار بشورێ، هەم (وَيَكُونُ) سوننەتە: هەبێ (فِي أَوَّلِ غُسْلِهِ) لە یەكەم شۆردنی‌دا (سِدْرٌ) شتێكی وا كە چلكی لێ لاببا: وەكو سابون.

هەم (وَفِي آخِرِهِ) سوننەتە لە كۆتایی شۆردنی‌دا تێكەڵێ ئاوەكە بكرێ (شَيْءٌ) كەمێك (مِنْ كَافُورٍ) لە كافور، بۆ ئەوەی بۆنی خۆش بێ‌و لاشەی توند بێ، ئینجا زۆر باش وشك ئەكرێتەوەو كفن ئەكرێ.

جا بزانە: پێویستە پیاو پیاو بشۆرێ‌و، ئافرەت ئافرەت بشۆرێ، بەڵام دروستە منداڵی بچكۆڵە: ئافرەت‌و پیاو بیشۆن، هەروەها دروستە: ژن‌و مێرد یەكتری بشۆن ﴿قَالَ النَّبِيُّﷺ لعائشةَرَضِيَ اللهُ عَنها: لَوْ مِتِّ قَبْلِي لَغَسَّلْتُكِ وَكَفَّنْتُكِ﴾ رواه أحمد وابن ماجه، پێغەمبەرﷺ بە(عائشة)ی فەرموو: ئەگەر پێشی من مردی، من ئەتشۆم‌و كفنت ئەكەم.

هەروەها بزانە: سوننەتە: مردووشۆر دەستی خۆی بە توندی بە سەر ورگی مردووەكەدا بێنێ، ئینجا واجبە: پەڕۆكێك، یان دەستەوانەیەك بخاتە دەستی خۆی‌و تارەتی مردووەكە بكاو هەر پیسیەكی‌تریش هەبوو لایبباو نابێ تەماشای عەورەتی بكا، ئینجا بە پەڕۆكێكی‌تر ناو دەم‌و لووتی پاك بكاتەوە، ئینجا دەستنوێژی مردووەكە ئەشۆرێ، ئینجا دەست بە لای ڕاستەی ئەكا، ئینجا كە سابونی لێ شۆرد، دوو جاری‌تریش ئەیشۆرێ، پێغەمبەرﷺ –كاتی كە كیژەكەی وەفاتی كردو ویستیان بیشۆن– فەرمووی:

﴿إِبْدَأْنَ بِمَيامِنِها وَمَواضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا﴾ رواه‌الشيخان، له پێشا دەست بە لای ڕاستەو شوێنەکانی دەستنوێژ بکەن.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر پیاوێك مرد و هیچ پیاوێك نەبو بیشۆری، یان ئافرەتێك مرد و هیچ ئافرەتێك نەبو بیشۆری، ئەوە ئەگەر بگونجێ بە جلی خۆیانەوە نقومی ناو ئاو بکرێن، یان لە ناو جلەکانی خۆیاندا بشورێن‌و ڕووت نەکرێن، واجبە بەو جۆرە بشورێن، جا ئەگەر نەگونجا، ئەبێ تەیەممومی بکرێن ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: غَسَّلُوا النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ قَمِيصُهُ﴾ رواه احمد، کە پێغەمبەریان ﷺ شۆرد، کراسی هەر لە بەردا بوو و ڕووتیان نەکردەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە ئاوەدانی‌دا -لە بەر نەبوونی ئاو- مردووێك تەیەممومی کرا، ئینجا پێش ناشتنی ئاو بە دەست کەوت، ئەوە واجبە: بشۆرێ‌و دووبارە نوێژی (جنازة)ی لە سەر بکرێتەوە.

هەروەها ئەگەر لە ئاوەدانی‌دا بە تەیەممومی نوێژی (جنازة)ی لە سەر کرابو، ئینجا ئاو بە دەست کەوت، واجبە: دووبارە -بە دەستنوێژەوە- نوێژی (جنازة)ی لە سەر بکرێتەوە، جا ئەگەر ناشترابو، ئەو کاتە لە سەر گۆڕەکەی -بە دەستنوێژەوە- نوێژەکە ئەکرێتەوە، واتە: ئەگەر تەیەممومی کرابو، نە بۆ شوشتن‌و نە بۆ نوێژ لەسەرکردن نابێ بیهێننە دەرەوە.

## ﴿ باسی کفن کردن ﴾

بزانە: ئەگەر مردووەکە ماڵی‌خۆی نەبو، ئەوە تەنها یەك پارچە کفن واجبە: کە هەموو لەشی داپۆشێ، جا خزمی‌خۆی بۆی بکا، یان کەسێکی‌تر، بەڵام خێریان ئەکاتێ ئەگەر سێ پارچەی بۆ تەواو بکەن.

(وَيُكَفَّنُ) واجبە مردوو کفن بکرێ (فِي ثَلاَثَةِ أَثْوابٍ) لە ناو سێ پارچە جلدا، ئەگەر ماڵی خۆی هەبوو (بِيضٍ) سوننەتە ئەو سێ پارچانە سپی بن (لَيْسَ فِيها قَمِيصٌ) هیچیان لەو سێ پارچانە نەکرێنە کراس (وَلاَ عِمامَةٌ) وەنەشکرێنە مێزەر، یان لەچەك، بەڵکو هەرسێکیان -یەکە یەکە- لە مردووەکە بپێچرێن ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كُفِّنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوابٍ بِيضٍ لَيْسَ فِيها قَمِيصٌ وَلا عِمامَةٌ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە ناو سێ پارچە جلی سپی‌دا کفن کرا، هیچیان لەو سێ جلانە نەکرانە کراس‌و مێزەر.

جا بزانە: ئەگەر مردووەکە میراتگری یەتیم‌و شێتی نەبو، دروستە: پێنج پارچە کفنی بۆ بکرێن: جا ئەگەر پیاو بوو، چوارەمیان ئەکرێتە مێزەرو پێنجەمیان ئەکرێتە کراسێك لە شانیەوە تا قاچی.

وە ئەگەر ئافرەت بوو، سێیەمیان ئەکرێتە لەچکەو چوارەمیان ئەکرێتە پەشتەماڵی نێوان ناوك‌و ئەژنۆو پێنجەمیان ئەکرێتە کراس.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر کەسێك لە ئیحرامی حەج و عومرەدا مرد، ئەوە ئەگەر پیاو بوو، نابێ سەری داپۆشرێ و ئەگەر ئافرەت بوو، نابێ ڕووخساری داپۆشرێ.

جا بزانە: هەر جۆرە جلێك هەبێ و هەر ڕەنگێك هەبێ، دروستە بکرێتە کفن، جا ئەگەر هیچ جل دەست نەکەوت، ئەو کاتە نایلۆن و شتی وەك پێستە دروستە، جا ئەگەر ئەمەش نەبو، ئەبی بە پووش و گیا کفن بکرێ، جا ئەگەر نەبو، ئەوکاتە قوڕ لە لاشەی ئەدرێ ﴿عَنْ خَبّابٍ: اُسْتُشْهِدَ مُصْعَبٌ وَلَمْ يَتْرُكْ إِلاّ ثَوْباً: كانُوا إذا غَطَّوْا بِه رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلاهُ، وَإِذا غُطِّيَ بِه رِجْلاهُ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَقالَ ﷺ: غَطُّوا رَأْسَهُ وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ الإِذْخِرَ﴾ رواه الترمذي، (مُصْعَب)ی کوڕی (عُمَيْر) لە غەزای (أُحُد) شەهید بوو، تەنها یەك پارچە جلی هەبوو، ئەگەر سەریان داپۆشیبایە قاچی دەرئەکەوت، ئەگەر قاچیان داپۆشیبا سەری دەرئەکەوت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەری بە جلەکە داپۆشن و قاچەکانیشی بەو گیایە داپۆشن کە ناوی ئیزخیرە.

﴿ باسی نوێژی (جَنازَة) لە سەر مردوو ﴾

ئەم نوێژە ئەبی بە پێوە بە بێ سوجدە و ڕوکوع بکرێ، مەرجەکانی ئەم نوێژە -جگە لە مەرجەکانی تری نوێژ- ئەمانەن:

١- ئەبی مردووەکە شۆرابێ، یان تەیەمموم کرابێ، واتە: ئەگەر نەگونجا مردووەکە بشۆرێ، یان تەیەمموم بکرێ، نابێ نوێژی لە سەر بکرێ.

٢- ئەبی لاشەو کفنەکەی پاك بێ، بەڵام ئەگەر خوێنی مردووەکە نەوەستا، ئەو کاتە لە بەر ناچاری نوێژی لە سەر دەکرێ.

٣- ئەبی مردووەکە لە لای قیبلە لە پێش نوێژکەرەکە دابندرێ، بەڵام ئەگەر مردووەکە لە شارێکی تر بوو، یان لە لادێیەکی تر بوو، ئەو کاتە دروستە لە شوێنێکی ترەوە نوێژی لە سەر بکا، هەرچەند لە لای قیبلەش نەبێ ﴿عَنْ جابِرٍ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ عَلَى النَّجاشِيِّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي ماتَ فِيهِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە (مەدینە)وە نوێژی لە سەر (نەجاشی) کرد لەو ڕۆژەی لە (حەبەشە) وەفاتی کردبوو.

٤- ئەبی ئەوەی نوێژی لە سەر مردوو ئەکا: نێرینە بێ، هەرچەند منداڵیش بێ، بەڵام ئەگەر نێرینە دەست نەکەوت، واجبە: ئافرەت نوێژی لە سەر بکا.

ئینجا بزانە: سوننەتە نوێژی جەنازە -لە سەر مردوو- بە جەماعەت بکرێ و بە تەنهاییش دروستە.

وَيُكَبِّرُ عَلَيْهِ أَرْبَعَ تَكْبِيرات: يَقْرَأُ الْفاتحَةَ بَعْدَالأُولَى، وَيُصَلِّي عَلَىالنَّبيِّﷺ بَعْدَ الثَّانِيَةِ، وَيَدْعُو لِلْمَيِّت بَعْدَ الثَّالثَة، فَيَقُولُ: اَللَّهُمَّ هَذَا عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدَيْكَ، خَرَجَ مِنْ رَوْحِ الدُّنْيَا وَسَعَتِهَا-وَمَحْبُوبُهُ وَأَحِبَّاؤُهُ فيها- إِلَى ظُلْمَةِالْقَبْرِ وَمَا هُوَ لاَقِيه، كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّأَنْتَ وَحْدَكَ لاَشَرِيكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِه منَّا، اَللَّهُمَّ إِنَّهُ نَزَلَ بِكَ وَأَنْتَ خَيْرُ مَنْزُولٍ بِه، وَأَصْبَحَ فَقيراً إِلَى رَحْمَتكَ وَأَنْتَ غَنِيٌّ عَنْ عَذَابِه، وَقَدْ جِئْنَاكَ رَاغِبِينَ إِلَيْكَ شُفَعَاءَ لَهُ، اَللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِناً فَزِدْ فِيإِحْسَانه، وَإِنْ كَانَ مُسِيئاً فَتَجَاوَزْ عَنْهُ، وَلَقِّه بِرَحْمَتِكَ رِضَاكَ، وَقِه فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَهُ وَافْسَحْ لَهُ فِيقَبْرِه وَجَافِ الْأَرْضَ عَنْ جَنْبَيْه، وَلَقِّه بِرَحْمَتِكَ الْأَمْنَ مِنْ عَذَابِكَ حَتَّى تَبْعَثَهُ آمناً إِلَى جَنَّتِكَ بِرَحْمَتِكَ يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ. وَيَقُولُ فِيالرَّابِعَة: اَللَّهُمَّ لاَتَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ.

---

(وَيُكَبِّرُ عَلَيْهِ) واجبه ئەو کەسەی نوێژ لە سەر مردوو ئەکا، بڵێ: (اللهُ أكبَر)، (أَرْبَعَ تَكْبِيراتٍ) چوار جار: به (اللهُ أكبَر)ی یەکەم نوێژ دابەستێو بە دڵ نیەت بێنێو بڵێ: (نیەتم وەیە فەرزی نوێژیجەنازە لە سەر ئەم مردووە ئەکەم).

ئینجا (يَقْرَأُ الْفاتِحَةَ) یا فاتیحە بخوێنێ (بَعْدَ الأُولَى) پاش (اللهُ أكبَر)ییەکەم-کە نوێژی پێ دابەستوە- ئینجا لە دوایفاتیحە، دووەم جار بڵێ: (اللهُ أكبَر)، جا (وَيُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّﷺ) سەلاوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێبدا (بَعْدَ الثَّانِيَةِ) پاش (اللهُ أكبَر)یدووەم، واتە: بڵێ: (اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَىمُحَمَّدٍ وَعَلَىآلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ)، بەلام سەلاواتی تەحیات لەمە خێرترە، ئینجا-لە دوایسەلاوات-سێیەم جار بڵێ: (اللهُ أكبَر)، جا (وَيَدْعُو لِلْمَيِّتِ) واجبە: دوعا بۆ مردووەکە بکا (بَعْدَالثَّالِثَةِ) پاش (اللهُ أكبَر)ی سێیەم.

ئینجا بزانە: دوعای واجب بۆ ئافرەتو بۆ پیاو بۆ گەورەو بۆ بچووك، هەر ئەوەندەیە بڵێ: (اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ). بەلام سوننەتە جگە لەو دوعایە ئەم دوعایەش بکا:

(فَيَقُولُ) بڵێ: (أَللَّهُمَّ هَذَا عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدَيْكَ، خَرَجَ مِنْ رَوْحِ الدُّنْيَا وَسَعَتِهَا-وَمَحْبُوبُهُ وَأَحِبَّاؤُهُ فِيها-إِلَى ظُلْمَةِ الْقَبْرِ وَمَا هُوَ لاَقِيه، كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّأَنْتَ وَحْدَكَ لاَشَرِيكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ-وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِه منَّا-أَللَّهُمَّ إِنَّهُ نَزَلَ بِكَ وَأَنْتَ خَيْرُ مَنْزُولٍ بِه، وَأَصْبَحَ فَقِيراً إِلَى رَحْمَتِكَ وَأَنْتَ غَنِيٌّ عَنْ عَذَابِه، وَقَدْ جِئْنَاكَ رَاغِبِينَ إِلَيْكَ شُفَعَاءَ لَهُ، أَللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِناً فَزِدْ فِي إِحْسَانه، وَإِنْ كَانَ مُسِيئاً فَتَجَاوَزْ عَنْهُ وَلَقِّه بِرَحْمَتِكَ رِضَاكَ وَقِه فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَهُ وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِه وَجَافِ الأَرْضَ عَنْ جَنْبَيْه، وَلَقِّهِ بِرَحْمَتِكَ الأَمْنَ مِنْ عَذَابِكَ حَتَّى تَبْعَثَهُ آمناً إِلَىجَنَّتِكَ بِرَحْمَتِكَ يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ).

ئینجا-کە دوعای تەواو کرد-چوارەمین جار بڵێ: (اللهُ أكبَر). جا (وَيَقُولُ فِي الرَّابِعَةِ) سوننەتە (پاش (اللهُ أكبَر)یچوارەم بڵێ: (أَللَّهُمَّ لاَتَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ).

وە ئەگەر ئەمەش نەڵێ، زیانی نیە (وَيُسَلِّمُ بَعْدَ الرَّابِعَةِ) واجبە: پاش (اللهُ أَكبَر)ی چوارەم سەلام بداتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو دوعایانە لە چەند حەدیسێك كۆ كراونەوە، چەند دوعایتریش هەنە لەبەر درێژی نەماننووسین.

ئینجا بزانە: سوننەتە ئەو نوێژە لە هەموو كاتێكدا بە بێدەنگ هەڵێنان بكرێ و لەگەڵ هەموو (اللهُ أَكبَر)ێكدا هەردوو دەستەكانی بەرز بكاتەوە، هەروەها سوننەتە ئەگەر بە جەماعەت كرا: ریزەكان بكەنە سێ ریز ﴿عَنْ مالكِ بن هبيرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: ما مِنْ مَيِّتٍ يَمُوتُ فَيُصَلِّي عَلَيْهِ ثَلاثَةُ صُفُوفٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ أَوْجَبَ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك كە دەمرێ، سێ ریز لە موسوڵمانان نوێژی لە سەر بكەن، خوای گەورە بەهەشتی بۆ دابین ئەكا.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلطِّفْلُ يُصَلِّى عَلَيْهِ وَيُدْعَى لِوالِدَيْهِ﴾ رواه أبوداود، منداڵ نوێژی جەنازەی لە سەر ئەكرێ و دوعاش بۆ دایك و باوكی ئەكرێ. جا سوننەتە لەو دوعایەدا بڵێ: (اَللَّهُمَّ اجْعَلْهُ فَرَطاً لأَبَوَيْهِ وَسَلَفاً وَذُخْراً وَاعْتِباراً وَشَفِيعاً وَثَقِّلْ بِهِ مَوازِينَهُما وَأَفْرِغِ الصَّبْرَ عَلَى قُلُوبِهِما).

﴿ئاگاداریەكی تر﴾: دروستە لە سەر كۆمەڵە مردوویێك یەك نوێژ بكرێ، بەو مەرجەی خزمەكانیان رازی بن، هەروەها دروستە پاش ئەوەی مردووەكە بە خاك سپێردرا: نوێژی لە سەر بكرێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ إِمْرَأَةً كانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ فَماتَتْ، فَسَأَلَ عَنْهَا النَّبِيُّ ﷺ؟ فَدَلُّوهُ عَلَى قَبْرِها فَصَلَّى عَلَيْهَا﴾ رواه الشيخان، ئافرەتێك خزمەتی مزگەوتی ئەكرد، كاتێ كە مرد پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێكرد؟ گوتیان: مردوە. جا قەبرەكەیان نیشانی پێغەمبەر دا ﷺ نوێژی لە سەر كرد.

هەروەها ئەگەر پارچە ئەندامێكی مردوویێكی موسوڵمان دۆزرایەوە، ئەبێ بشورێ و لە ناو پارچە پەرۆیەكدا بپێچرێ و نوێژی لە سەر بكرێ و ژێرخاك بكرێ.

## ﴿ باسی شاردنەوەی مردوو لە ناو خاكدا ﴾

(وَيُدْفَنُ) واجبە مردوو لە ناو چاڵێكی وەهادا ژێر خاك بكرێ: كە بۆنی نەیەتە دەرەوە و درندە دەری نەهێنێ (فِي لَحْدٍ) وەها سوننەتە: ئەو چاڵە لادێ بێ، جا ئەگەر نەگونجا، با ناودێ بێ و لە هەردوو لای دیواری بۆ بكرێ، ئینجا مردووەكەی لە ناو دابندرێ.

(مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ) واجبە: رووی لە قیبلە بكرێ، ئینجا سەریانی بۆ بكرێ بە داڵ، یان بە خشت، یان بە بەرد (وَيُسَلُّ) سوننەتە: مردووەكە لە ناو داڕجەنازە بهێندرێتە دەرەوە (مِنْ قِبَلِ رَأْسِهِ) لە لای سەریەوە، تاكو بە دامێنی قەبرەكەدا سەری رەوانە بكرێتە ناو قەبرەكە

برفقٍ، وَيَقُولُ الَّذِى يُلْحِدُهُ: بِسْمِ اللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِﷺ، وَيُضْجَعُ فِى الْقَبْرِ بَعْدَ أَنْ يُعَمَّقَ قامَةً وَبَسْطَةً، وَيُسَطَّحُ الْقَبْرُ، وَلاَيُبْنَى عَلَيْهِ وَلاَيُجَصَّصُ، وَلاَ بَأْسَ بِالْبُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ

---

(بِرِفْقٍ) به هێواشی (وَيَقُولُ الَّذِى يُلْحِدُهُ) سوننەته ئەو كەسەی مردووەكە ئەخاتە ناو قەبر، بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِﷺ﴾ رواه اصحاب السنن.

(وَيُضْجَعُ فِى الْقَبْرِ) مردووەكە لە سەر تەنیشتی ڕاستەی لە ناو قەبر درێژ ئەكرێ، وه ڕوومەتی بە ڕووتی لە سەر كزمەڵە خۆڵێك، یان خشتێك دائەنرێ (بَعْدَ أَنْ يُعَمَّقَ) پاش ئەوەی قەبرەكە قووڵ ئەكرێ (قامَةً) بە قەد باڵای پیاوێك (وَبَسْطَةً) وە بە قەد باسكێكی درێژكراو بۆ سەرەوە، جا بزانە: ئەوەندە قووڵییە سوننەتە، ئینجا خۆڵەكەی تێئەكرێتەوە تا پڕ ئەبێتەوە.

(وَيُسَطَّحُ الْقَبْرُ) سوننەتە قەبرەكە سەرگۆڕ بكرێو بە قەد بستێك بەرز بكرێتەوە، هەروەها سوننەتە كێلێك لە لای سەری قەبرەكە دابكوترێ، وە خزمەكان لە یەك شوێن بنێژرێن ﴿عَنِ المطَّلب بن أَبي وداعةَ: لَمَّا ماتَ عُثْمانُ بن مَظْعُونٍ، وَضَعَ النَّبيُّﷺ حَجَراً عِنْدَ رَأْسِ الْقَبْرِ، وَقالَ: أَتَعَلَّمُ بِها قَبْرَ أَخِي وَأَدْفِنُ إِلَيْهِ مَنْ ماتَ مِنْ أَهْلِي﴾ رواه أبوداود، كاتێ (عوسمان)ی كوڕی(مەزعون)–كە شیربرای پێغەمبەر بووﷺ– وەفاتی كرد، پێغەمبەرﷺ كێلێكی لە لای سەری قەبرەكەی داكوتاو فەرمووی: گۆڕی برای خۆمم پێ ئەناسمەوەو خزمەكانیترم لە لای ئەو ئەنێژم.

(وَلاَ يُبْنَى عَلَيْهِ) حەرامە–لە گۆڕستانی گشتیدا–خانوو لە سەر قەبرەكە دروست بكرێ، بەڵام ئەگەر ملكی خۆی بوو، مەكروهە (وَلاَ يُجَصَّصُ) هەروەها مەكروهە بە گەچ و چیمەنتۆ گۆڕەكە مارنج بكرێ لە دەرەوە و لە ژوورەوە ﴿عَنْ جابِرٍ: نَهَى رَسُولُ اللهِﷺ: أَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی كردوە: قەبر گێچكاری بكرێ، وە لە سەری دابنیشن، یان بە پێ بە سەری كەون، وە خانووی لە سەر بكرێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر لە كاتی قەبر هەڵكەندندا قەبرێكیتر دەركەوت، ئەوە ئەگەر قووڵكردنەكەی تەواو نەبوبێ، واجبە پڕ بكرێتەوەو وازی لێبێنن، بەڵام ئەگەر تەواو قووڵ كرا، ئینجا قەبرێكیتر دەركەوت، ئەوە ئێسقانەكانی ئەخرێنە لایەكی قەبرەكە، مردووە نوێیەكەیشی تێدا ئەنێژرێ.

(وَلاَ بَأْسَ) هیچ گوناه نیە (بِالْبُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ) بە هۆی گریان لە سەر مردوو، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ لاَيُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ وَلاَ بِحُزْنِ الْقَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذا أَوْ يَرْحَمُ﴾ رواه الشيخان، خوای گەورە بە هۆی فرمێچكی چاو و غەمگینیی

مِنْ غَيْرِ نَـوْحٍ وَلاَ شَـقِّ جَيْـبٍ، وَيُعَـزَّى أَهْلُـهُ إِلَـى ثَلاَثَـةِ أَيَّـامٍ مِـنْ دَفْنِـهِ، وَلاَ يُدْفَنُ إِثْنانِ فِي قَبْرٍ إِلاَّ لِحاجَةٍ.

---

دڵ هیچ کەسێك ئازار نادا، بەڵام بە هۆی ئەو زوبانە ئازار ئەدا-واتە: ئەگەر لە گریانەکەدا دەنگ هەڵێنێ)-، یان ڕەحم ئەکا، ئەگەر دوعای چاکی پێبکەی.

(مِنْ غَيْرِ نَوْحٍ) بەو مەرجەی ئەو گریانە، بێهاوارکردن بێ (وَلاَ شَقِّ جَيْبٍ) وە بەو مەرجەی یەخەیخۆی دانەدڕێو پەرچەمیخۆی دەرنەکێشێو ڕوویخۆی نەڕنێ، ئەوانـە هـەمووی حەرامن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَى الْجاهِلِيَّةِ﴾ رواه الشيخان، ئەو کەسە لە سەر ڕەوشتو ڕێگای ئێمـەی موسـوڵمان نیـە: کـە لەپەدەسـت لـە ڕوویخـۆی ئـەدا، یـان ئـەیڕنێ، وە ئـەو کەسـەی یەخـەیخۆی دائەدڕێ، یان لە سینەیخۆی ئەدا، وە ئەو کەسەی وەك سەردەمی کافرەکـان بـە دەنـگ هەڵێنان ئەگریێ.

(وَيُعَزَّى أَهْلُهُ) سوننەتە: تازیەکردن لە خزمەکانی مردووەکە-یەك جار-واتـە: دڵدانـەوەیانو دوعا بۆ مردووەکە بکاو بڵێ: خوا ئارامی دڵت بدا، خوا لە مردووەکەت خۆش بیێ (إِلَى ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ) تا ماوەی سێ ڕۆژان (مِنْ دَفْنِـهِ) لـە کـاتی ناشتنیەوە، پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُعَزِّي أَخاهُ بِمُصِيبَةٍ إِلاَّ كَسَاهُ اللهُ مِنْ حُلَلِ الْكَرامَةِ يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾ رواه إبن ماجه، هـەر موسـوڵمانێك تازیـەی بـرای خـۆی بکـاو دڵـی بداتـەوە لـە کـاتی بەسـەرهاتێکی دڵتەزێن، خوایگەورە بەرگی بەڕێزانی ئەکاتە بەر لە ڕۆژی قیامەت.

﴿ئاگـــاداری﴾: ١- مەکروهــە خزمــەکانی مردووەکــە دابنیشــن بــۆ ئــەوەی خــەڵك تازیەیان بکا، بەڵکو ئەبی بۆ ئیشوکاریخۆیان بڕۆن، جا هـەر کەسـێك کـە دەیانگاتـێ، تازیەیان بکاو بڕوا.

٢- سوننەتە دراوسێکانیو خزمەکانی دوور: چێشتو خواردەمەنی ئامادە بکەن بۆ مـاڵی مردووەکـە، بـۆ مـاوەی شـەوێكو ڕۆژێك ﴿عَـنْ عَبْـدِاللهِ بـنِ جَعْفَـرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: لَمَّا جاءَ نَعْيُ جَعْفَرَ﷛ قالَ النَّبِيُّﷺ: إِصْنَعُوا لأَهْلِ جَعْفَرَ طَعاماً فَإِنَّهُ قَدْ جَـاءَهُمْ مَـا يَشْـغَلُهُمْ﴾ رواه الترمـذي، کاتـێ هــەواڵی شـەهیدبوونی(جەعفـەر) گەیشـتە (مەدینـە)، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خواردەمەنی بۆ ماڵو منداڵی (جەعفەر) دروست بکـەن چـونکە ئەوان بە غەمناکیخۆیان خەریکن.

(وَلاَ يُدْفَنُ إِثْنانِ فِي قَبْرٍ) دروست نیە دوو مردوو بە یەکەوە لـە نـاو قەبرێکـدا بشـاردرێنەوە (إِلاَّ لِحاجَةٍ) تەنها لە بەر پێویستی دروستە، وەك ئەوەی مردووەکان زۆر بـن، یـان زەویەکـە کەم بێ، یان کفنەکە بەش نەکا، جا سوننەتە پەردەیەکی خـۆڵ، یـان شـتێکیتر لـە نێـوان

مردووەکاندا دابنـدرێ ﴿عَنْ هشام: قالَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ أُحُد: اجْعَلُوا الرَّجُلَيْنِ والثَّلاثَـةَ فِي الْقَبْرِ، قِيلَ: فَأَيُّهُمْ يُقَدَّمُ؟ قَالَ: أَكْثَرُهُمْ قُرْآناً﴾ رواه اصحاب السنن، لە غەزای (ئوحـود) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو پیاو و سێ پیاو بە یەکەوە لە نـاو یـەك قـەبردا بشـارنەوە، وە کامیان زۆرتر قورئانی خوێندوە، با ئەویان لەپێشتر بێ بۆ لای قیبلە.

﴿ئاگاداری﴾: کرێی شۆردن و کفن و نوێژو قەبر-هەمووی- لە مـاڵی مردووەکـە ئـەدرێ، بـەڵام ئـەبێ مێـرد کـرێی ئەوانـە بـۆ ژنـە مردووەکـەی بـدا، ئینجـا ئەگـەر مـاڵی خـۆی نەبو، ئەو کاتە لە ماڵی ئەو کەسەی ئەدرێ کە واجب بوو بەخێوی بکا، جا ئەگەر ئـەویش نەبو، لە (بَيْتُ الْمال) ئەدرێ، جا ئەگـەر ئـەویش نـەبو، لـە مـاڵی موسـوڵمانانیدەوڵەمەند جێبەجێ ئەکرێ.

﴿پاشـکۆ﴾: ١- سـوننەتە پـێش ئـەوەی گیـانی دەرچـێ: ڕووبـەڕووی قیبلـە بکـرێ و (لاَإِلَهَ إِلاَّالله)ی لە لا بگوترێ، بەڵام نابێ پێی بڵێن: بڵـێ: (لاَإِلَـهَ إِلاَّالله). ﴿عَنْ أَبِي سَـعِيد وَعَنْ مُعاذ رَضِيَ اللهُ عَنهُمـا: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَقِّنُوا مَوْتاكُمْ لاَإِلَهَ إِلاَّالله، وَقالَ: مَنْ كَانَ آخِـرُ كَلامِهِ لاَإِلَهَ إِلاَّالله دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾ رواهمـا الترمـذي، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: لـە لای ئـەو نەخۆشانەی مەترسی مردنیان لێئەکرێ، بڵـێن: (لاَإِلَـهَ إِلاَّالله). هەرکەسێك دوایـین قسـەی لە دونیادا (لاَإِلَهَ إِلاَّالله) بێ، ئەچێتە بەهەشت.

٢- کاتێ کە گیانی دەرچو: بە زوترین کات ئەبێ ئەو چوار واجبانـەی گوتمـان جێبـەجێ بکرێن و نابێ ژێـر خـاککردنی دوا بخـرێ ﴿عَنْ عَلِيّ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: ياعَلِيّ ثَـلاثٌ لاَ تُؤَخِّرْها: اَلصَّلاةُ إِذا أَتَتْ، وَالْجَنازَةُ إِذا حَضَرَتْ، وَالأَيِّمُ إِذا وَجَدْتَ لَها كُفْؤاً﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی (علي)، کە کاتی نوێژ هات دوای مەخەو زوو بیکـە، کە مـردوو ئامـادەبو دوای مەخـەو زوو بینێـژە، کـە ئـافرەتی بـێمێرد هاوچەشـنی خـۆی دەست کەوت دوای مەخەو لێی مارە بکە.

٣- سوننەتە مردووی موسـوڵمان لـە گۆڕستانیگشـتیدا بنێـژرێ، چـونکە پێغەمبـەر ﷺ و (صحابة) وایان کردوە، بەڵام مردووی کافر دروست نیە: نە نوێژی لە سـەر بکـرێ و نـە لـە گۆڕستانی موسوڵماناندا بنێژرێ، جیـاوازی کـافری بنـەڕەتی و موسـوڵمانی کـافربوو نیـە، چـونکە خوایگـەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَلاَتُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَتَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِ﴾ نوێژی مردوو لە سەر هیچ کەسێك لەو کافرەمنافقانە مەکەو لـە سـەر گـۆڕی ڕامەوەسـتە، واتە: بەشداری ناشتنی مەکە.

٤- ئامادەبوون بۆ ئەو چوار واجبانەیمردوو-کـە باسـمان کـردن- خێرێکـی زۆری هەیـە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ شَهِدَ الْجَنازَةَ حَتَّى يُصَلِّيَ عَلَيْها فَلَهُ قِيراطٌ وَمَنْ

شَهِدَها حَتّى تُدْفَنَ كانَ لَهُ قيراطانِ﴾ رواه‌الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: هه‌ر كه‌سێك له‌ لای مردوو ئاماده‌ بێ تا نوێژی له‌ سه‌ر ئه‌كا، ئه‌وه‌ به‌ قه‌د قیراتێك خێری بۆ ئه‌نووسرێ، وه‌ هه‌ر كه‌سێك له‌ لای مردوو ئاماده‌ بێ تا ئه‌یبه‌نه‌ گۆڕستان‌و ئه‌ینێژن، خێری دوو قیراتی هه‌یه‌، هه‌ر قیراتێك به‌ قه‌د كێوی ئوحوده‌.

٥- به‌ زووترین كات ئه‌بێ قه‌رزه‌كانی‌مردووه‌كه‌ بدرێنه‌وه‌، جا قه‌رزداری خوا بێ: وه‌كو زه‌كات، یان ئاده‌میزاد، وه‌ هه‌وڵی ئه‌وه‌ بده‌ن خه‌ڵك گه‌رده‌نی‌ئازاد بكا، به‌ تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی كاتی خۆی سته‌می لێكردون، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموویه‌تی: ﴿نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتّى يُقْضَى عَنْهُ﴾ رواه الترمذي، گیانی موسوڵمانی‌مردوو به‌ هۆی قه‌رزداریه‌كه‌ی له‌ به‌هه‌شت قه‌ده‌غه‌ ئه‌كرێ تا قه‌رزه‌كه‌ی بۆ ئه‌درێته‌وه‌. كه‌وابوو: ئه‌بێ به‌ زووترین كات قه‌رزی زه‌كات‌و كه‌ففاره‌ته‌كان-كه‌ له‌ مه‌ودوا باسیان ئه‌كه‌ین- بۆی بدرێنه‌وه‌.

٦- سوننه‌ته‌: خێركردن بۆ مردوو، چونكه‌ سودی خێره‌كه‌ی پێ‌ئه‌گا ﴿عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ رضي‌الله عنهما: قالَ سَعْدُ بن عُبادَةَ: يارَسُولَ اللهِﷺ إنَّ أُمّي تُوُفِّيَتْ، أَيَنْفَعُها شَيْءٌ إنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْها؟ قالَ: نَعَمْ. قالَ فَإنّي أُشْهِدُكَ أَنَّ حائِطِيَ‌الْمِخْرافَ صَدَقَةٌ عَنْها﴾ رواه البخاري، (سه‌عد)ی كوڕی(عوباده‌) گوتی: (یا رسول الله) دایكم وه‌فاتی كردوه‌ ئایا سودی پێ‌ئه‌گا ئه‌گه‌ر خێری بۆ بكه‌م؟ پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: به‌ڵێ. (سه‌عد)گوتی: كه‌وابێ: تۆ شاهیدبه‌، باغه‌كه‌ی خۆم خێری دایكم بێ.

هه‌روه‌ها دوعاكردنیش سودی بۆ مردوو هه‌یه‌ ﴿عَنْ أَبي‌هُرَيْرَةَ: قالَ النَّبيُّﷺ: إذا ماتَ ابْنُ آدَمَ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إلاّ مِنْ ثَلاثٍ: صَدَقَةٍ جارِيَةٍ، أَوْعِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْوَلَدٍ صالِحٍ يَدْعُو لَهُ﴾ رواه‌مسلم، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: كاتێ ئاده‌میزادی موسوڵمان ئه‌مرێ خێری هه‌موو كرده‌وه‌كانی‌خۆی كۆتایی دێ، به‌ڵام سێ كرده‌وه‌ هه‌نه‌ له‌ دوای مردنیش خێره‌كه‌یان به‌رده‌وام بۆ مردووه‌كه‌ ئه‌چێ، یه‌كه‌م: خێرێكی وه‌ها كه‌ سوده‌كه‌ی به‌رده‌وام بێ: وه‌كو مزگه‌وت‌و قوتابخانه‌ی ئایینی‌و نه‌خۆشخانه‌و ئاوی خواردنه‌وه‌و...هتد. دووه‌م: زانستێكی به‌ كه‌ڵك بۆ موسوڵمانان، جا فێری خه‌ڵكی كردبێ، یان كتێبێكی له‌ دوای خۆی به‌جێ هێشتبێ. سێیه‌م: رۆڵه‌یه‌كی خۆی كه‌ له‌ دوای خۆی دوعای بۆ بكا. واته‌: له‌ سه‌ر كرده‌وه‌ی باش په‌روه‌رده‌ی كردبێ، یان هه‌ر به‌ خۆی منداڵێكی باش بێ.

٧- سه‌ردانی‌قه‌بر بۆ پیاوان سوننه‌ته‌، چونكه‌ پێغه‌مبه‌رﷺفه‌رموویه‌تی: ﴿كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيارَةِ الْقُبُورِ، أَلاَ فَزُورُوها فَإنَّها تُذَكِّرُكُمُ الآخِرَةَ﴾ رواه‌مسلم، تا ئێستا من سه‌ردانی قه‌برانم له‌ ئێوه‌ قه‌ده‌غه‌كردبو، ئاگادارتان ئه‌كه‌مه‌وه‌: ئیزنه‌ سه‌ردانی قه‌بران بكه‌ن، چونكه‌ قیامه‌تتان به‌ بیر دێنێته‌وه‌.

## (كِتابُ الزَّكاة)

تَجِبُ الزَّكاةُ فِي خَمْسَةِ أَشْياءَ: وَهِيَ الْمَواشِي، وَالأَثْمانُ، وَالزُّرُوعُ، وَالثِّمارُ، وَعُرُوضُ التِّجارَةِ.

---

جا كە چووە سەر گۆڕستان، سوننەتە ئەم دوعایە بڵێ: ﴿اَلسَّلامُ عَلَيْكُمْ دارَ قَومٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِنْ شاءَاللهُ بِكُمْ لاحِقُونَ﴾ رواه مسلم. هەروەها بڵێ: ﴿يَغْفِرُاللهُ لَنا وَلَكُمْ أَنْتُمْ سَلَفُنا وَنَحْنُ بِالأَثَرِ﴾ رواه الترمذي. ئینجا سوننەتە دوعایتریشی بۆ بکا.

بەڵام سەردانی قەبران بۆ ئافرەتان مەکروهەو خێری ناگاتێ، هەندێك لە زانایان فەرموویانە: حەرامە ئافرەت بچێتە سەر قەبران، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لَعَنَ اللهُ زائِراتِ الْقُبُورِ وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَساجِدَ وَالسُّرُجَ﴾ رواه اصحاب السنن، لەعنەتیخوا لەو ئافرەتانە کە ئەچنە سەر قەبران، لەعنەتیخوا لەو کەسانە کە لە سەر قەبر مزگەوت دروست ئەکەن بۆ ئەوەی خەڵك نوێژی لێبکا، لەعنەتیخوا لەو کەسانە کە لە سەر قەبران چرا دائەگیرسێنن، چونکە ماڵ بەفیڕۆدانە. وَصَلَّى اللهُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ.

* * *

### ﴿ كِتابُ الزَّكاةِ: ئەم پەڕتووکە باسی زەکات ئەکا ﴾

زەکات لە ئایینی ئیسلامدا ئەمەیە: موسوڵمان تەختێك ماڵیخۆی بداتە موسوڵمانێکیتر، بەو مەرجانەی باسیان ئەکەین. زەکات ڕوکنی سێیەمی ئیسلامە، لە مانگی (شوّال) ساڵی دووەمی کۆچی واجب کراوە.

جا هەر کەسێك بڵێ: زەکات واجب نیە، کافر ئەبێ، وە ئەو کەسەی زەکات نەدا، ئەبی گەورەی موسوڵمانان بە زۆر لێی وەربگرێ، جا ئەگەر هەر نەیدا، جەنگی لەگەڵ ئەکرێ، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكاةَ ﴾ نوێژ بە هەموو واجبێکەوە ئەنجام بدەن و زەکات بدەن. ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: قالَ رَسُولُ اللهِﷺ لِمُعاذٍ -لَمَّا بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ- أَخْبِرْهُمْ: أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرائِهِمْ﴾ رواه الشيخان، کە پێغەمبەرﷺ (مُعاذ)ی نارده (یَمَن)، فەرمووی: پێیان بڵێ: خوایگەورە زەکاتی لە سەر دەوڵەمەندەکانیان واجب کردوە، لێیان وەرئەگیرێو ئەدرێتە هەژارەکانیان.

(تَجِبُ الزَّكاةُ) زەکات واجبە (فِي خَمْسَةِ أَشْياءَ) لە پێنج جۆرە شتدا: (وَهِيَ) ئەو شتانەی زەکاتیان تێدایە یەکەم: (اَلْمَواشِي) ئاژەڵە. دووەم: (وَالأَثْمانُ) پارەو پولە. سێیەم: (وَالزُّرُوعُ) دەغڵو دانە. چوارەم: (وَالثِّمارُ) میوەیە. پێنجەم: (وَعُرُوضُ التِّجارَةِ) کەلوپەلی بازرگانییە.

فَأَمَّا الْمَواشي فَتَجِبُ الزَّكاةُ في ثَلاثَةِ أَجْناسٍ مِنْها: وَهِيَ الإِبِـلُ، وَالْبَقَـرُ، وَالْغَـنَمُ، وَشَرائِطُ وُجُوبِها سِتَّةُ أَشْياءَ: اَلإِسْلامُ، وَالْحُرِّيَّةُ، وَالْمِلْكُ التَّامُّ، وَالنِّصابُ، وَالْحَـوْلُ، وَالسَّوْمُ. وَأَمَّا الأَثْمانُ فَشَيْئانِ: اَلذَّهَبُ وَالْفِضَّةُ،

---

(فَأَمَّا الْمَواشي) جا هەرچی ئاژەڵە (فَتَجِبُ الزَّكاةُ) زەكات واجبە هـەموو سـاڵێك یـەك جـار (في ثَلاثَةِ أَجْناسٍ مِنْها) لە سێ ڕەگەزی ئاژەڵدا (وَهِيَ الإِبِلُ) یەكەم: ووشـترە. (وَالْبَقَرُ) دووەم: ڕەشە ووڵاغە. (وَالْغَنَمُ) سێیەم: كارەگەلە، واتە: بزنو مەڕ.

(وَشَرائِطُ وُجُوبِها) مەرجـەكانی واجببـوونی زەكـات لـەو ئاژەڵانـەدا (سِتَّةُ أَشْياءَ) شـەش مەرجن (اَلإِسْلامُ) یەكەم: زەكاتدەرەكە موسوڵمان بێ: جـا منـداڵ بـێ، یـان گـەورە بـێ، شـێت بـێ، یـان عـاقڵ بـێ. (وَالْحُرِّيَّـةُ) دووەم: ئـازاد بـێ، كۆیلـە نـەبێ. (وَالْمِلْـكُ التَّـامُّ) سێیەم: ئاژەڵەكە بە تـەواوی ملكی‌خۆی بـێ. (وَالنِّصـابُ) چوارەم: ئاژەڵـەكان بگەنـە ڕادەی زەكات، وەك لەمەودوا باسی ئەكـەین. (وَالْحَـوْلُ) پێنجەم: سـاڵێكی ئیسـلامی بـە سەردا بڕواو هەر لە موڵكی خاوەنەكەیدا بێ.

(وَالسَّوْمُ) شەشەم: ئەو ئاژەڵانە بلەوەڕێندرێن لە پووش‌و گیای گشتی، جا ئەگەر ماوەیـەك خاوەنەكەی (ئاڵفی) ئەدانێ، یان بـە پـارە گـەڵای داروپـووش‌و گیـای بـۆ ئـەهێنان، ئـەوە تێبینی ئەكەین: ئەگەر نرخی (ئاڵفەكە) كەمتر بوو لە بـەرووبومی ئاژەڵـەكان، یـان لـە نرخـی ئاژەڵەكان–ئەگەر بەرووبومیان نەبو– یان بە ئەندازەی یـەكتری بـون، ئـەوە واجبـە زەكـات بدا، بەڵام ئەگەر نرخی (ئاڵفەكە) زۆرتر بوو لە بەرووبومەكە، یان لە نرخی‌ئاژەڵـەكان–ئەگـەر بەرووبوم نەبو– ئەوە زەكاتی لە سەر نیە.

ئینـجا بـزانە: مەبەسـت لە بەرووبوم: بێچووەكان‌و شیرو خـوری‌و مووەكەیە بە تێكڕایی.

﴿ئـاگاداری﴾: ئەو ئاژەڵـەی بـە زەكـات ئەچـێ: نابـێ نـەخۆش بـێ‌و نابـێ كـەم‌وكوڕی هەبێ‌و نابێ نێرینە بێ، مەگەر هەر ئەو جۆرە ئاژەڵانەی هەبن، ئەو كاتە هەر لە وێنەكەی خۆیان زەكاتەكەیان ئەدا.

هەروەها ئەو كەسەی زەكـات وەرئـەگرێ: نابـێ دلوای ئـاژەڵی بـە بێچوو بكـاو نابـێ دلوای ئاژەڵی ئاوس بكاو نابێ دلوای دابەستەی خواردن بكـاو نابـێ دلوای ئـاژەڵێكی لـە هـەموان باشتر بكـا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: قالَ النَّبِيُّ ﷺ لِمُعاذ: إِيَّـاكَ وَكَـرائِمَ أَمْـوالِهِمْ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەر ﷺ فەرموویە(مُعاذ): ئاگاداربە نەكەی ماڵە باشەكەیان–لە زەكات– لێوەربگری. بەڵام: ئەگەر خاوەنەكەی ڕازی بێ، ئەو كاتە دروستە باشەكە وەربگرێ.

(وَأَمَّا الأَثْمانُ) ئەو پارەو پولەی زەكاتی تێدایە لە بەر بە نرخی خۆی (فَشَيْئانِ) دوو جۆرە پارەیـە: (اَلـذَّهَبُ) یەكەم: زێـڕە (وَالْفِضَّـةُ) دووەم: زیـوە. ئـەو دووانـە زەكاتیـان تێدایـە هەرچەند نەشكرێنە پارە.

وَشَرائطُ وُجُوب الزَّكاة فيها خَمْسَةُ أَشياءَ: اَلإِسْلامُ، وَالْحُرِّيَةُ، وَالْمِلْكُ التَّامُّ، وَالنِّصَابُ، وَالْحَوْلُ. وَأَمَّا الزُّرُوعُ فَتجبُ الزَّكاةُ فيها بثلاثة شَرائطَ: أَنْ يَكُونَ ممَّا يَزْرَعُهُ الآدَمِيُّونَ، وَأَنْ يَكُونَ قُوتاً مُدَّخَراً، وَأَنْ يَكُونَ نصاباً وَهُوَ خَمْسَةُ أَوْسُقٍ لاَقِشْرَ عَلَيْها. وَأَمَّا الثِّمارُ فَتجبُ الزَّكاةُ فِي شَيْئَيْنِ مِنْها: ثَمَرَةُ النَّخلِ وَثَمَرَةُ الْكَرْمِ،

---

(وَشَرائطُ وُجُوبِ الزَّكاةِ فِيها) ئەو مەرجانەی پێویستن بۆ واجیبوونی زەکات لە زێڕو زیودا، هەموو ساڵێك یەك جار (خَمْسَةُ أَشياءَ) پێنج مەرجن (اَلإِسْلامُ) یەکەم: زەکاتدەرەکە موسوڵمان بێ. (وَالْحُرِّيَةُ) دووەم: ئازاد بێ. (وَالْمِلْكُ التَّامُّ) سێیەم: بە تەواوی موڵکی خۆی بێ. (وَالنِّصابُ) چوارەم: بگاتە ڕادەی زەکات.

(وَالْحَوْلُ) پێنجەم: ئەبێ ساڵێکی ئیسلامی بە سەردا بڕواو هەر لە موڵکی خاوەنەکەیدا بێ ﴿قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَن استَفادَ مَالاً فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ عِنْدَ رَبِّـهِ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك ماڵێکی وەدەست هێنا، زەکاتی لە سەر نیە تا ساڵێکی بە سەردا ئەڕوا لە لای خاوەنەکەی خۆی.

(وَأَمَّا الزُّرُوعُ) هەروەها دەغڵودان (فَتَجِبُ الزَّكاةُ فِيها) تەنها یەك جار زەکاتی تێدا واجبە لە کاتی دروێنەیدا (بِثلاثَةِ شَرائطَ) بە سێ مەرج:

یەکەم: (أَنْ يَكُونَ مِمَّا يَزْرَعُهُ الآدَمِيُّونَ) لەو جۆرە دانەوێڵەیە بێ: کە ئادەمیزادان بۆ خواردن دایئەچێنن، هەرچەند لە کاتی هەرزانیش نەیخۆن: وەکو جۆ و هەرزن.

دووەم: (وَأَنْ يَكُونَ قُوتاً) ئادەمیزاد پێی بژێ–واتە: وەکو گوڵەبەڕۆژە نەبێ– هەم (مُدَّخَراً) پاشەکەوتیش بکرێ: وەکو گەنمو ماشو نیسکو نۆکو جۆ و برنجو گەنمەشامیو لۆبیاو...هتد، واتە: خەیارو کندۆرەو شوتی زەکاتی تێدا نیە.

سێیەم: (وَأَنْ يَكُونَ نِصاباً) بگاتە ڕادەی زەکات (وَهُوَ خَمْسَةُ أَوْسُقٍ) ڕادەی زەکاتی دەغڵو دان: پێنج بارە–واتە: چل تەنەکە– بەو مەرجەی (لاَقِشْرَ عَلَيْها) توێکڵەکەی لە سەر نەبێ: وەکو چەڵتوك ﴿عَنْ أَبِي سَعِيد رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە پێنج بار کەمتر زەکاتی تێدا نیە.

جا ئەگەر توێکڵەکەی لە سەر بوو: وەکو چەڵتوك، ئەو کاتە ڕادەی زەکات ئەگاتە دە بار.

(وَأَمَّا الثِّمارُ) هەروەها میوە (فَتَجِبُ الزَّكاةُ) تەنها یەك جار زەکاتی تێدا واجبە لە کاتی برینەوەیدا (فِي شَيْئَيْنِ مِنْها) لە دوو جۆرە میوەدا:

یەکەم: (ثَمَرَةُ النَّخْلِ) میوەی دارخورما. دووەم: (وَثَمَرَةُ الْكَرْمِ) میوەی دارەمێو، واتە: ترێ، چونکە ئەو دووانە ئادەمیزاد پێیان ئەژێو پاشەکەوت ئەکرێن، کەوابوو: جگە لەو دووە هیچ جۆرە میوەیتر زەکاتی تێدا نیە.

وَشَرائِطُ وُجُوبُ الزَّكاةِ فِيها أَرْبَعَةُ أَشياءَ: اَلإِسْلاَمُ، وَالْحُرِّيَّةُ، وَالْمِلْكُ التّامُّ، وَالنِّصابُ.
وَأَمَّا عُرُوضُ التِّجارَةِ فَتَجِبُ الزَّكاةُ فِيها بِالشَّرائِطِ الْمَذْكُورَةِ فِي الأَثْمانِ.

---

(وَشَرائِطُ وُجُوبُ الزَّكاةِ فِيها) مەرجەکانی واجببوونی زەکات لە میوەدا (أَرْبَعَةُ أَشْياءَ) چوار مەرجن (اَلإِسْلاَمُ) یەکەم: زەکاتدەرەکە موسوڵمان بێ. (وَالْحُرِّيَّةُ) دووەم: ئازاد بێ. (وَالْمِلْكُ التّامُّ) سێیەم: بە تەواوی مولکی خۆی بێ. (وَالنِّصابُ) چوارەم: بگاتە ڕادەی زەکات، کە پێنج بارە لە دوای ووشککردنەوەی.

﴿ئاگاداری﴾: بۆ واجببوونی زەکاتی میوەو دانەوێڵە مەرج نیە ساڵێکی بە سەردا بڕوا، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ واتە: مافی ئەو ماڵە دەرکەن لە کاتی دروێنەیدا. کەوابوو: ئەگەر زەکاتی دانەوێڵەو میوە جارێک درا، ئینجا مایەوە بۆ ساڵێکیتر، ئەوە دووبارە زەکاتی تێدا واجب نیە.

(وَأَمَّا عُرُوضُ التِّجارَةِ) بەلاَم ماڵی بازرگانی (فَتَجِبُ الزَّكاةُ فِيها) زەکاتی تێدا واجبە هەموو ساڵێك یەك جار (بِالشَّرائِطِ الْمَذْكُورَةِ) بەو پێنج مەرجانەی گوتمان (فِی الأَثْمانِ) لە باسی پارەو پولدا.

(ڕوونکردنەوە): ١- کافر بۆیێ زەکاتی لە دونیادا لە سەر نیە چونکە زەکات ڕوکنی سێیەمی ئیسلامەو پێویستی بە نیەت هەیە، کەوابوو: ئەگەر بووە موسوڵمانیش زەکاتی ڕابردووی لە سەر نیە.

٢- کۆیلە-(عبد) بۆیێ زەکاتی لە سەر نیە چونکە خاوەن ماڵ نیە، ئەو خۆیو ماڵەکەی هی گەورەکەیەتی.

٣- مولکی گشتی: وەکو وەقفی مزگەوتەکانو قوتابخانەکانو (بیت المال)، بۆیێ زەکاتی تێدا نیە چونکە خاوەنی تایبەتیی نیەو بە تەواوی مولکی کەس نیە.

٤- منداڵو شێت زەکات لە ماڵەکەیاندا واجبە؟ چونکە موسوڵمانن، بەلاَم ئەبی ئەو کەسەی بەخێویان ئەکا، زەکاتەکەیان بۆ بدا ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَخْبِرْهُمْ: أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای‌گەورە زەکاتی لە سەر موسوڵمانان واجب کردوە لە دەوڵەمەندەکانیان وەرئەگیرێ. لەو فەرموودەیە هیچ جیاوازی نەکردوە لە نێوان دەوڵەمەندی گەورەو منداڵو شێتو عاقڵ.

٥- ئەو ماڵەی لێی زەوت کراوە، یان بە قەرزی داوە بەلاَم قەرزدارەکە ون بووە، یان نەیبو بیداتەوە، یان لە بەر زۆرداری نایداتەوە، ئەو جۆرە کەسانە تا ماڵەکەی خۆیان دەست نەکەوێتەوە واجب نیە زەکاتەکە بدەن، جا ئەگەر دەستیان کەوتەوە، ئەبی ئەو ساڵانەی کە زەکاتەکەیان نەدراوە، هەمووی بە یەکەوە بدرێ.

(فَصْلٌ) وَأَوَّلُ نصاب الْإِبِلِ خَمْسٌ، وَفِيها شاةٌ، وَفِي عَشْرٍ شَاتَان، وَفِي خَمْسَ عَشْرَةَ ثَلاثُ شياه، وَفِي عِشْرِينَ أَرْبَعُ شياه، وَفِي خَمْسٍ وَعِشْرِينَ بِنْتُ مَخاضٍ، وَفِي ستٍّ وَثَلاثِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي ستٍّ وَأَرْبَعِينَ حِقَّةٌ، وَفِي إِحْدَى وَستِّينَ جَذَعَةٌ، وَفِي ستٍّ وَسَبْعِينَ بِنْتَا لَبُونٍ، وَفِي إِحْدَى وَتِسْعِينَ حِقَّتَان، وَفِي مائَة وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ ثَلاثُ بَنات لَبُون،

---

هەروەها ئەگەر مارەیی ژن گەیشتە ڕادەی زەكات، واجبە زەكاتی لێبدا، وەكو ئەو قەرزەی باسمان كرد.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی زەكاتی ووشتر ﴾

(وَأَوَّلُ نِصابِ الإبِلِ) یەكەم ڕادەی زەكاتی ووشتر (خَمْسٌ) پێنج سەرە: چ نێر، چ مێ ﴿عَنْ جابِرٍ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الإِبِلِ صَدَقَةٌ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە پێنج سەر ووشتر كەمتر بێ، زەكاتی تێدا نیە.

(وَفِيها) واجبە لە زەكاتی ئەو پێنج ووشترەدا (شاةٌ) بەرخێكی مێی یەك ساڵە، واتە: (كاوڕێك) بدا، یان بزنێكی دوو ساڵە بدا (وَفِي عَشْرٍ) هەروەها لە دە ووشتردا (شاتانِ) دوو بزن، یان دوو كاوڕ بدا (وَفِي خَمْسَ عَشْرَةَ) لە پانزە ووشتردا (ثَلاثُ شِياهٍ) سێ كاوڕ، یان سێ بزن (وَفِي عِشْرِينَ) لە بیست ووشتردا (أَرْبَعُ شِياهٍ) چوار كاوڕ، یان چوار بزن بدا ﴿عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبَابَكْرٍ كَتَبَ لَهُ هَذَاالْكِتَابَ وَفِيه: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ فَمَا دُونَهَا: مِنْ كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ﴾ رواەالبخاری، ئیمامی (ئەبوبكر-خوا لێی ڕازی بێ- بۆ (ئەنەس)ی نووسی: پێغەمبەر ﷺ واجبی كردوە لە سەر موسوڵمانان- لە بیستو چوار ووشتردا، یان كەمتر- لە هەر پێنج ووشترێكدا: كاوڕێك، یان بزنێك لە زەكات بدەن.

(وَفِي خَمْسٍ وَعِشْرِينَ) وە لە بیستو پێنج ووشتردا (بِنْتُ مَخاضٍ) فەرخە ووشترێكی مێی یەك ساڵە ئەدرێ (وَفِي ستٍّ وَثَلاثِينَ) لە سیو شەش ووشتردا (بِنْتُ لَبُونٍ) ووشترێكی مێی دوو ساڵە ئەدرێ (وَفِي ستٍّ وَأَرْبَعِينَ) لە چلو شەش ووشتردا (حِقَّةٌ) ووشترێكی مێی سێ ساڵە ئەدرێ (وَفِي إِحْدَى وَستِّينَ) لە شەستو یەك ووشتردا (جَذَعَةٌ) ووشترێكی مێی چوار ساڵە ئەدرێ (وَفِي ستٍّ وَسَبْعِينَ) لە حەفتاو شەش ووشتردا (بِنْتَا لَبُونٍ) دوو ووشتری مێی دوو ساڵە ئەدرێن (وَفِي إِحْدَى وَتِسْعِينَ) لە نەوەدو یەك ووشتردا (حِقَّتَانِ) دوو ووشتری مێی سێ ساڵە ئەدرێن (وَفِي مِاَةٍ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ) لە سەدو بیستو یەك ووشتردا (ثَلاثُ بَنات لَبُونٍ) سێ ووشتری مێی دوو ساڵە ئەدرێن ﴿عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبَابَكْرٍ كَتَبَ لَهُ هَذَا الْكِتَابَ لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى الْبَحْرَيْنِ﴾ رواەالبخاری، (أنس) فەرمووی: (ئەبوبكر) ئەوەمای بۆ من نووسی كە ناردمی بۆ (بەحرەین)...تا كۆتایی حەدیسەكە.

ثُــمَّ فِــي كُــلِّ أَرْبَعِــينَ بِنْــتُ لَبُــونٍ، وَفِــي كُــلِّ خَمْسِــينَ حِقَّــةٌ.
(فَصْلٌ) وَأَوَّلُ نِصابِ الْبَقَرِ ثَلاثُونَ، وَفِيها تَبِيعٌ، وَفِي أَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ، وَعَلَى هَذا أَبَداً فَقِسْ.
(فَصْلٌ) وَأَوَّلُ نِصابِ الْغَنَمِ أَرْبَعُونَ، وَفِيها شاةٌ جَذَعَةٌ مِنَ الضَّأْنِ أَوْ ثَنِيَّةٌ مِنَ الْمَعْزِ، وَفِي مِأَةٍ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ شاتَانِ، وَفِي مِأَتَيْنِ وَوَاحِدَةٍ ثَلاثُ شِياهٍ، وَفِي أَرْبَعمِأَةٍ أَرْبَعُ شِياهٍ،

---

(ثُمَّ) ئینجا له دوای سه‌دو بیستو یه‌ك تا ئه‌گاته سه‌دو سی، هیچی‌تر زه‌كات واجب نیه، ئینجا كه گه‌یشته سه‌دو سی (فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ) له هه‌موو چله‌كاندا (بِنْتُ لَبُونٍ) ووشترێكی مێی دوو ساڵه ئه‌درێ (وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ) له هه‌موو په‌نجایه‌كاندا ووشترێكی مێی سێ ساڵه ئه‌درێ، واته: له سه‌دو سی‌دا: یه‌ك په‌نجاو دوو چلی تێدانه، كه‌واته: ووشترێكی سێ ساڵه‌و دوو ووشتری دوو ساڵه له زه‌كاتیان ئه‌درێن ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: فَإِذا زادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِأَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ﴾ رواه البخاري، واته‌ی دیاره.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی زه‌كاتی ڕه‌شه‌وولاغ ﴾

واته: گامێش‌و گاجووت. (وَأَوَّلُ نِصابِ الْبَقَرِ) یه‌كه‌م ڕاده‌ی زه‌كاتی ڕه‌شه‌وولاغ (ثَلاثُونَ) سی سه‌ره: چ نێر، چ مێ (وَفِيها) واجبه له زه‌كاتی ئه‌و سی سه‌ره‌دا (تَبِيعٌ) گوێلكێكی یه‌ك ساڵه بدرێ: چ نێر، چ مێ (وَفِي أَرْبَعِينَ) واجبه له زه‌كاتی چل سه‌ردا (مُسِنَّةٌ) مێنگوینێكی دوو ساڵه بدرێ، یان دوو گوێلكی یه‌ك ساڵه (وَعَلَى هَذا) له سه‌ر شێوه‌ی ئه‌و دوو ژماره‌یه (أَبَداً فَقِسْ) به‌رده‌وام برۆ...واته: له حه‌فتا سه‌ر: یه‌كی یه‌ك ساڵه‌و یه‌كی دوو ساڵه زه‌كاته ﴿عَنْ معاذٍ ﷺ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ ثَلاثِينَ بَقَرَةً تَبِيعاً أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً﴾ رواه اصحاب‌السنن، (معاذ) ﷺ فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمانی پێكردم: له سی ڕه‌شه‌وولاغ گوێلكێكی یه‌ك ساڵه: چ نێر، چ مێ وه‌ربگرم، وه له چل سه‌ر: مێنگوینێكی دوو ساڵه وه‌ربگرم.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی زه‌كاتی مه‌ڕو بزن ﴾

(وَأَوَّلُ نِصابِ الْغَنَمِ) یه‌كه‌م ڕاده‌ی زه‌كاتی مه‌ڕو بزن (أَرْبَعُونَ) چل سه‌ره (وَفِيها شاةٌ) له‌و چله‌دا واجبه: یه‌ك سه‌ر بدرێ (جَذَعَةٌ مِنَ الضَّأْنِ) كاوڕێكی مێی یه‌ك ساڵه (أَوْ ثَنِيَّةٌ مِنَ الْمَعْزِ) یان بزنێكی دوو ساڵه (وَفِي مِأَةٍ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ) له سه‌دو بیستو یه‌ك سه‌ردا (شاتَانِ) دوو سه‌ر له زه‌كات ئه‌درێن، هه‌ر به‌و ته‌مه‌نه‌ی گوتمان (وَفِي مِأَتَيْنِ وَوَاحِدَةٍ) له دووسه‌دو یه‌ك سه‌ردا (ثَلاثُ شِياهٍ) سێ‌سه‌ر له زه‌كات ئه‌درێن (وَفِي أَرْبَعمِأَةٍ) له چوارسه‌د سه‌ردا (أَرْبَعُ شِياهٍ) چوار سه‌ر له زه‌كات ئه‌درێن.

ثُمَّ فِي كُلِّ مِأَةٍ شَاةٌ.

(ثُمَّ) ئینجا له چوارسه‌د به‌و لاوه (فِي كُلِّ مِأَةٍ) له هه‌ر سه‌دێكدا (شَاةٌ) كاورێكی یه‌ك ساڵه، یان بزنێكی دوو ساڵه له زه‌كات ئه‌درێ ﴿عَنْ أَبِي بَكْرٍ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا: إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِأَةِ شَاةٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِأَةٍ إِلَى مِأَتَيْنِ شَاتَانِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِأَتَيْنِ إِلَى ثَلاثمِأَةٍ فَفِيهَا ثَلاثٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاثمِأَةٍ فَفِي كُلِّ مِأَةٍ شَاةٌ﴾ رواه البخاري، پێغه‌مبه‌ر ﷺ زه‌كاتی مه‌ڕو بزنی له‌وه‌ڕێندراوی به‌م جۆره داناوه: له چل سه‌ر تا ئه‌گاته سه‌دو بیست: یه‌ك مه‌ڕ، یان یه‌ك بزن زه‌كاتی تێدایه...هتد.

ئینجا بزانه: جیاوازی نیه‌ -بۆ واجببوونی زه‌كات- كاره‌گه‌له‌كه: گشتی مه‌ڕ بێ، یان گشتی بزن بێ، یان له مه‌ڕو بزن پێك هاتبێ‌و به هه‌ردووكیان بگاته ڕاده‌ی زه‌كات، گامێش‌و مانگاش هه‌ر به‌م شێوه‌یه‌یه.

﴿ئاگاداری﴾: دروسته له جیاتی بزن: مه‌ڕ له زه‌كات بدرێ، وه له جیاتی مه‌ڕ: بزن له زه‌كات بدرێ، به‌و مه‌رجه‌ی تێبینیی نرخ بكرێ.

جا بزانه: له مه‌زهه‌بی ئیمامی (حنفي)دا دروسته: نرخی ئاژه‌ڵه‌كه له زه‌كات بدرێ. هه‌روه‌ها بزانه: ئه‌و ژماره‌یه‌ی ئه‌كه‌وێته نێوان زه‌كاته‌كان: وه‌ك نێوان پێنج‌و ده، له زه‌كاتی ووشتردا، وه نێوان چل‌و سه‌دوبیست‌ویه‌ك، له زه‌كاتی مه‌ڕو بزندا، وه نێوان سی‌و چل، له زه‌كاتی ڕه‌شه‌وولاغدا. ئه‌وه گشتی لێبوردراوه‌و زه‌كاتی تێدا نیه.

﴿پاشكۆ﴾: بێچووی ئه‌و ئاژه‌ڵانه زه‌كاتی تێدا نیه، ته‌نها له دوو كاتدا نه‌بێ: یه‌كه‌م: ئه‌گه‌ر دایكه‌كان بمرن به گشتی، یان هه‌ندێكیان بمرن پێش سه‌ره‌ساڵ، ئه‌وه بێچووه‌كانیان له جێ ئه‌ژمێردرێن، بۆ وێنه: ئه‌گه‌ر سی مانگای لێ مردن‌و سی بێچوویان له پاش به‌جێمان، یان له چل مه‌ڕ پانزه‌یان مردن‌و پانزه به‌رخیان له پاش به‌جێمان، ئه‌وه بێچووه‌كان كه‌لێنی دایكیان پێ پڕ ئه‌كرێته‌وه‌و ئه‌بی زه‌كات بدا.

دووه‌م: بۆ ته‌واوكردنی ڕاده‌ی دووه‌می زه‌كات‌و به سه‌ره‌وه‌تر، بێچووه‌كان سه‌رژمێر ئه‌كرێن، بۆ وێنه: ئه‌گه‌ر سه‌د مه‌ڕی هه‌بوو له‌گه‌ڵ بیست‌و یه‌ك به‌رخ، ئه‌بی ئه‌و بیست‌و یه‌ك به‌رخه بخرێته سه‌ر سه‌د مه‌ڕه‌كه، بۆ ئه‌وه‌ی دوو زه‌كاتی لێبدا ﴿عَنْ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ لِسَاعِيهِ: إِعْتَدَّ عَلَيْهِمْ بِالسَّخْلَةِ﴾ رواه الإمام مالك، ئیمامی(عمر) به كرێكاره‌كه‌ی زه‌كاتی فه‌رموو: به‌رخه‌ساوایه‌كانیش سه‌رژمێر بكه. به‌ڵام ڕاده‌ی زه‌كاتی یه‌كه‌م به بێچوو ته‌واو ناكرێ، بۆ وێنه: ئه‌گه‌ر سی مه‌ڕو سی به‌رخی هه‌بێ‌و به‌رخه‌كان ته‌مه‌نیان نه‌بوبێته ساڵێك، ئه‌وه زه‌كاتی له سه‌ر واجب نیه.

(فَصْلٌ) وَالْخَلِيطَانِ يُزَكِّيانِ زَكاةَ الْواحِدِ، بِسَبْعَةِ شَرائِطَ: إذا كانَ الْمَـراحُ واحِـداً، وَالْمَسْرَحُ واحِداً، وَالْمَرعَى واحِداً، وَالْفَحْلُ واحِداً، وَالْمَشْرَبُ واحِـداً، وَالْحالِـبُ واحِداً، وَمَوْضِعُ الْحَلْبِ واحِداً.

---

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی زەكاتی ئاژەڵی تێكەڵاو و ماڵی تێكەڵاو ﴾

(وَالْخَلِيطانِ) ئەو كەسانەی ئاژەڵەكانیان تێكەڵ كردون و بەو تێكەڵكردنەش ئەگەیشتنە رادەی زەكات (يُزَكِّيانِ) واجبە زەكات بدەن (زَكاةَالْواحِدِ) وەك زەكاتی یەك ماڵ كە هی یەك خاوەن بێ (بِسَبْعَةِ شَرائِطَ) بە حەفت مەرج:

(إذا كانَ الْمَراحُ واحِداً) یەكەم: شوێنی مانەوەی شەویان یەك بێ. (وَالْمَسْرَحُ واحِداً) دووەم: مۆڵگایان یەك بێ. (وَالْمَرْعَى واحِداً) سێیەم: شوێنی لەوەڕیان یەك بێ. (وَالْفَحْلُ واحِداً) چوارەم: نێرییان یەك بێ، بەڵام ئەگەر دوو جۆرە ئاژەڵ بون: وەك مەڕو بزن، ئەوە مەرج نیە. (وَالْمَشْرَبُ واحِداً) پێنجەم: شوێنی ئاوخواردنەوەیان یەك بێ. (وَالْحالِبُ واحِداً) شەشەم: بێرییان یەك بێ، بەڵام ئەم فەرموودەیە بێهێزە، كەواتە: زیانی نیە هەریەكە بێریی خۆی دیار بێ. (وَمَوْضِعُ الْحَلْبِ واحِداً) حەفتەم: شوێنی دۆشینیان یەك بێ.

جا بزانە: ئەبێ ئەو مەرجانە بۆ ماوەی ساڵێك بەردەوام بن، واتە: ئەگەر تەنها زستانان، یان هاوینان تێكەڵیان ئەكرد، ئەوە ئەبێ هەر كەسەیان زەكاتی خۆی بە جیاوازی بدا.

﴿ئاگاداری﴾: جاری وا هەیە ئەو تێكەڵكردنە قازانجە: وەك ئەو دوو كەسانەی هەر یەكەو چل مەڕی هەبێ، بە تێكەڵكردن ئەكاتە هەشتا، ئەوە تەنها یەك زەكاتی تێدایە، جاری واش هەیە زەرەرە: وەك ئەو دوو كەسانەی هەر یەكەو بیست مەڕیان هەیە، بە تێكەڵكردن ئەبێتە چل، ئەبێ زەكات بدەن ﴿عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ في كِتابِهِ لأَنَسٍ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ: لاَيُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَالصَّدَقَةِ، وَمَا كانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإنَّهُما يَتَراجَعـانِ بِالسَّـوِيَّةِ﴾ رواه‌البخاري، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ لە ترسی زەكاتدان ئاژەڵ تێكەڵ بكرێن و نابێ لێك جیا بكرێنەوە، وە ئەو دوو كەسانەی ئاژەڵی خۆیان تێكەڵ كردون، ئەبێ زەكات بدەن، ئینجا بەگوێرەی ئەندازەی‌ماڵەكەیان بۆ یەكتری ئەگەڕێننەوە.

﴿پاشكۆ﴾: هەر ئەو حەدیسە بەڵگەیە بۆ واجببوونی زەكات لە ماڵی هاوبەش: جا دانەوێڵە بێ، یان بازرگانی بێ، یان ئاژەڵ بێ، یان هەر شتێكیتر: كە زەكاتی تێدا بێ، هەروەها ئەگەر ئەو جۆرە شتانە تێكەڵیش بكرێن بۆ ماوەی ساڵێك هەروەك ماڵی یەك خاوەن زەكاتیان لێئەدرێ، بەو مەرجەی ئەگەر دانەوێڵە بوو: جۆخین و دروێنەو داچاندن و كێڵانی لێك جیا نەكرێتەوە، وە ئەگەر بازرگانی بوو: تەرازوو و چاودێر و فرۆشیار و دوكانی

(فَصْلٌ) وَنصابُ الذَّهَبِ عِشْرُونَ مِثْقالاً، وَفِيهِ رُبْعُ الْعُشْرِ وَهُوَ نِصْفُ مِثْقالٍ، وَفِيمَا زادَ بِحسابه.

وَنِصابُ الْوَرِقِ مِأَتَا دِرْهَمٍ، وَفِيهِ رُبْعُ الْعُشْرِ وَهُوَ خَمْسَةُ دَراهِمَ، وَفِيمَا زادَ بِحسابه.

---

لێك جیا نەكرێتەوە، جا بۆ زەكاتدان پێویست ناكا ئەو هاوڕێیە ئەوی‌تریان ئیزن بدا، بەڵكو یەكێكیان زەكات ئەداو نیەت لە جیاتی خۆی‌و هاوڕێیەكەی دێنێ.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی زەكاتی زێڕو زیو، پارەو پول ﴾**

(وَنِصابُ الذَّهَبِ) ڕادەی زەكاتی زێڕ (عِشْرُونَ مِثْقالاً) بیست میسقالە، هەر میسقالێك حەفتاو دوو دەنكە جۆیە، بەو مەرجەی -لە هەردوو لایەوە- زلكە باریكەكەی لێقرتابێ.

(وَفِيهِ) واجبە لە بیست میسقالی زێڕدا: (رُبْعُ الْعُشْرِ) چارێكی‌دەیەك زەكات بدا (وَهُوَ نِصْفُ مِثْقالٍ) واتە: لە بیست میسقالی زێڕدا: نیو میسقال زەكاتە.

(وَفِيما زادَ) هەروەها ئەگەر لە ئەندازەی بیست میسقال زیاتر زێڕی هەبوو، ئەوە (بِحسابِهِ) بەگوێرەی زێدەیەكە زەكاتەكەی ئەدا.

(وَنِصابُ الْوَرِقِ) ڕادەی زەكاتی زیو (مِأَتا دِرْهَمٍ) دووسەد دیرهەمە، كە بە كێشانە ئەكاتە سەدو چل میسقال (وَفِيهِ) واجبە لە دوو سەد دیرهەمی زیودا: (رُبْعُ الْعُشْرِ) چارێكی دەیەك زەكات بدا (وَهُوَ خَمْسَةُ دَراهِمَ) واتە: پێنج دیرهەمی زیو.

(وَفِيما زادَ) هەروەها ئەگەر لە ئەندازەی دوو سەد دیرهەم زیاتر زیوی هەبوو، ئەوە (بِحسابِهِ) بەگوێرەی زێدەیەكە زەكاتەكەی ئەدا ﴿عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فَإِذَا كَانَتْ لَكَ مِأَتَا دِرْهَمٍ وَحالَ عَلَيْهاالْحَوْلُ فَفِيهَا خَمْسَةُدَرَاهِمَ، وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ حَتَّى يَكُونَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا فَإِذَا كَانَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا وَحَالَ عَلَيْهَاالْحَوْلُ فَفِيهَا نِصْفُ دِينَارٍ، فَمَا زَادَ فَبِحِسَابِ ذَلِكَ﴾ رواەابوداود وصححه البخاري، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كاتێ دووسەد دیرهەمی زیوت هەبوو و ساڵی بە سەردا ڕابرد، پێنج دیرهەم زەكاتی تێدا واجبە، بەڵام ئەگەر زێڕ گەیشتە بیست میسقال‌و ساڵی بە سەردا ڕابرد، نیو میسقال زەكاتی تێدا واجبە، جا ئەو ئەندازەی لە ڕادەی زەكاتی زێڕو زیو زیاترە، بەگوێرەی زیدەیەكە زەكاتی تێدا واجبە، هەرچەند كەمیش بێ.

**﴿ئاگاداری﴾**: پارەو پولی ئەم سەردەمە -بۆ زەكاتدان- بەرانبەر بە زیو ئەقرسێندرێ، نەك بە زێڕ؟ چونكە زەكات بۆ بەرژەوەندی هەژاران دانراوەو ئەوەهاش بۆ هەژاران بەسودترە، هەروەها پێغەمبەرﷺ لە چەند حەدیسێكدا زیوی بە پارەیەكی سەرەكی داناوە بۆ زانینی نرخی‌زێڕ:

بۆ نموونە: ﴿عَنْ ابْنِ مَسْعودٍ ﷺ: قِيلَ: يارَسُولَ اللهِ ﷺ ما يُغْنِيهِ؟ قَالَ: خَمْسُونَ دِرْهَماً أَوْ قِيمَتُها مِنَ الذَّهَبِ﴾ اخرجه أصحاب السنن، گوترا: ئەی پێغەمبەری خواﷺ

وَلاَ تَجِــــــبُ فِــــــي الْحُلِــــــيِّ الْمُبَــــــاحِ زَكَــــــاةٌ.
(فَصْلٌ) وَنِصابُ الزُّرُوعِ وَالثِّمارِ خَمْسَةُ أَوْسُقٍ: وَهِيَ أَلْفٌ وَسِتُّمِائَةِ رَطْلٍ بِالْعِراقِيِّ،

---

چی مرۆڤ دەوڵەمەند ئەکا لە دەرۆزە کردن؟ فەرمووی: پەنجا دیرهەمی زیو، یان نرخی ئەو پەنجایە لە زێڕ.

کەوابوو: هەر کەسێك بە ئەندازەی نرخی سەدو چل مسقالی زیو پارەی هەبوو، زەکاتی لە سەر واجب ئەبێو واجبە: بە ئەندازەی لە سەدا: دوو و نیو زەکاتی لێبدا، واتە: لە هەر هەزارێك: بیستو پێنج.

(وَلاَ تَجِبُ) واجب نیە (فِي الْحُلِيِّ الْمُبَاحِ) لە خشڵی زێڕو زیوی حەلاڵ (زَكَاةٌ) زەکات بدا ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: أَنَّهُ كَانَ يُحَلِّي بَنَاتِهِ وَجَوَارِيَهُ بِالذَّهَبِ ثُمَّ لاَيُخْرِجُ مِنْهُ الزَّكَاةَ﴾ رواه مالك والشافعي، (ابن عمر رَضِيَ اللهُ عَنهُما) بە خشڵی زێڕ کیژەکانیو کارەکەرەکانی ئەڕازاندەوە، ئینجا زەکاتی ئەو خشڵەی نەئەدا.

بەڵام ئەگەر خشڵەکە حەرام بوو: وەك ئەو خشڵەی پیاو بیکاتە بەر خۆی، یان ئافرەت، بەڵام لە ئەندازە بەدەر بوو و ئیسرافی تێدا کرابو، ئەوە ئەبێ زەکاتی بدا ﴿عَنْ عَمْرِو بن شُعَيْبٍ ﷺ: أَتَتْ إِمْرَأَةٌ النَّبِيَّ ﷺ وَمَعَها بِنْتٌ لَها فِي يَدِها مَسْكَتَانِ غَلِيظَتَانِ مِنَ الذَّهَبِ، فَقالَ لَها: أَتُعْطِينَ زَكَاةَهَذا؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: أَيَسُرُّكِ أَنْ يُسَوِّرَكِ اللهُ بِهِما يَوْمَ الْقِيامَةِ سِوارَيْنِ مِنْ نارٍ﴾ رواه اصحاب السنن، ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ، کیژەکەی خۆی لەگەڵدا بوو، دوو بازنی گەورە لە دەستی کیژەکەیدا بون–واتە: لە ئەندازە بەدەر بون– پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا زەکاتی ئەو بازنانە ئەدەی؟ ئافرەتەکە گوتی: نا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا پێت خۆشە خوای گەورە بە هۆی ئەو دوو بازنانە لە رۆژی قیامەت دوو بازنی ئاگر بخاتە دەستت؟، واتە: چونکە زەکاتەکەیان نەدراوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر پیاو خشڵی زێڕو زیو بکڕێو لە ماڵەوە دایبنێ تاکو لەمەودوا بیکاتە بەر ژنی خۆی، یان ئافرەتێکیتر، ئەوە حەرام نیەو زەکاتی لێناکەوێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی زەکاتی دانەوێڵەو میوە ﴾

(وَنِصابُ الزُّرُوعِ) رادەی زەکاتی دانەوێڵەو (وَالثِّمارِ) رادەی زەکاتی میوە (خَمْسَةُ أَوْسُقٍ) بە پێوانە ئەکاتە پێنج بار، کە هەر بارێکی هەشت تەنەکەی بە سەر بێ، بە تەنەکەی نەفت، واتە: تێکڕا ئەکاتە چل تەنەکەی بە سەر، بەڵام ئەگەر دلرماڵ بکرێ، ئەکاتە چلو پێنج تەنەکەی دلرماڵکراو:

(وَهِيَ) ئەو پێنج بارە بە کێشانە (أَلْفٌ وَسِتُّمِائَةِ رِطْلٍ بِالْعِراقِيِّ) ئەکاتە هەزارو شەشسەد ڕیتل بە ڕیتلی عێراق، ئێستا ئەکاتە (حەفتسەدو بیستو پێنج) کیلۆ گرام

وَمَـــازادَ فَبِحســـابِه، وَفِيهـــا: إنْ سُـــقِيَتْ بِمـــاءِ السَّـــماءِ أوِالسَّـــيْحِ اَلْعُشْـــرُ، وَإنْ سُقِيَتْ بِدُلاَبٍ أوْ نَضْحٍ نِصْفُ الْعُشْرِ.

---

(وَما زادَ) ئەوەی لەو ئەندازەیە زیاتر بێ (فَبِحِسابِهِ) بەگوێرەی زێدەیەكەی زەكاتی تێدا واجبە (وَفِيها) لەو دا نەوێڵەو میوەیەدا بەم ئەندازیە زەكات واجبە:

(إنْ سُقِيَتْ بِماءِ السَّماءِ) ئەگەر ئاو درابو بە ئاوی باران (أوِالسَّيْحِ) یان بە ئاوی جۆگەو ڕوبار، ئەوە (اَلْعُشْرُ) دەیەكی واجبە لە زەكات بدرێ، واتە: لە چل تەنەكە: چوار تەنەكە ئەدرێن.

(وَإنْ سُقِيَتْ) بەڵام ئەگەر ئاو درابو (بِدُلاَبٍ) بەو ئاوەی لە ناو بیر ئەهێندرێتە دەرەوە بە هۆی ئاژەڵ، یان ئامێرێكی‌تر (أوْ نَضْحٍ) یان لە ڕوبار بۆی هێنابو بە هۆی ئۆتۆمۆبیل، یان ئاوەكەی كڕیبو، یان پێی بەخشرابو، ئەوە (نِصْفُ الْعُشْرِ) نیوەی دەیەكی زەكاتە، واتە: لە چل تەنەكە: دوو تەنەكە زەكاتی لێ واجب ئەبێ ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: فِيما سَقَت الأنْهارُ وَالْغَيْمُ اَلْعُشُورُ، وَفِيما سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعُشْـــرِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو میوەو دانەوێڵەی بە بارانو ڕوبار ئاو دراوە، دەیەكی لە زەكاتا ئەدرێ، وە ئەوەی بە هۆی ئاژەڵ ئاودراوە، واتە: بۆی هەڵێنجراوە، نیوەی دەیەكی لە زەكاتا ئەدرێ.

﴿پاشكۆ﴾: ١- زەكاتی میوە لە كاتی بەڵەكەبوونی واجب ئەبێ، وە زەكاتی دانەوێڵە لە كاتی دەنك ڕەقبوونی واجب ئەبێ، جا لە بەر ئەوە ئیمامی (اَلْحَرَمَيْن)و، ئیمامی (اَلْغَزالِي) -خوا لێیان ڕازی بێ- فەرموویانە: هەرچی لە پێش زەكاتدان ئەیخوا، یان ئەیبەخشێ، لە سەری ئەژمێردرێو ئەبێ زەكاتەكەی بدا.

٢- پێویستە خورما ووشك بكرێتەوە،ترێ بكرێتە مێوژ، دانەوێڵە لە كاوكۆت پاك بكرێتەوە، ئینجا لە زەكات بدرێ.

٣- كرێی برینەوەی خورماو ترێو ووشككردنەوەیانو كرێی دروێنەی دانەوێڵەو گێرەكردنیو هێنانی بۆ ماڵی هەژارەكانو كرێی زەویەكەو كێڵانیو كرێی سەپانو كرێكارەكان: گشتی لە ماڵی زەكاتدەرەكە ئەدرێو نابێ پێش زەكاتدان هیچی لەو بەروبومە بدرێ.

جا ئەگەر لە بەروبومەكە ئەو كرێیانەی دا، ئەوە زەكاتی ئەو ئەندازەیەی هەر لە سەر ئەمێنێو ئەبێ لە ماڵی خۆی هەر بیدا.

﴿ئاگاداری﴾: لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا دروستە لە جیاتی میوە، یان دانەوێڵە: نرخی ئەو ئەندازەیە بدا كە لە سەری واجبە بیداتە زەكات.

(فَصْـــلٌ) وَتُقَـــوَّمُ عُـــرُوضُ التِّجـــارَةِ عِنْـــدَ آخِرِالْحَـــوْلِ بِمَااشْـــتُرِيَتْ بِـــهِ، وَيُخْرِجُ مِنْ ذَلِكَ رُبُعَ الْعُشْرِ.

**﴿ فَصْلٌ: له باسی زەكاتی ماڵی بازرگانی ﴾**

واتە: كڕینو فرۆشتن بۆ قازانج كردن (وَتُقَوَّمُ) ئەقرسێندرێ، واتە: نرخ دائەندرێ بۆ (عُرُوضُ التِّجارَةِ) كەلوپەلی بازرگانی بەگوێرەی نرخی فرۆشتنی بازاڕ (عِنْدَ آخِرِالْحَوْلِ) لە كاتی كۆتایی هاتنی ساڵێك لەو ڕۆژەوە كە كڕیویەتی (بِما) بەو جۆرە پارەیەی (اُشْتُرِيَتْ بِهِ) كە ماڵەكەی پێ كڕاوە: ئەگەر بە پارەی ئێرانی كڕیبوی، بە پارەی ئێرانی نرخی فرۆشتنی بە قازانجەوە بۆ دائەنێو ئەگەر بە عێراقی كڕیبوی، هەر بە عێراقی نرخی فرۆشتنی بە قازانجەوە بۆ دائەنێ، ئینجا ئەگەر بە قازانجەوە گەیشتە ڕادەی زەكات–كە نرخی سەدو چل میسقالی زیوە– ئەوە زەكاتی لێئەدا.

(**ڕوونكردنەوە**): ئەگەر لە مانگی ڕەمەزان شتێكی كڕی بە هەزار دینار، ئینجا لە كۆتایی ساڵ نرخی بووە دوو هەزار دینار، ئەوە ئەبێ زەكات لە دوو هەزار دینارەكە بدا.

(وَيُخْرِجُ) واجبە: زەكات بدا (مِنْ ذَلِكَ) لە ماڵی بازرگانی (رُبُعَ الْعُشْرِ) چارێكی دەیەك، واتە: لە چلا: یەك، لە سەدا: دوو و نیو، بەو مەرجەی بگاتە نرخی سەدو چل میسقالی زیو ﴿عَنْ سَمُرَةَ ﷺ: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْمُرُنا: أَنْ نُخْرِجَ الصَّدَقَةَ فِيما نُعِدُّهُ لِلْبَيْـــعِ ﴾ رواه ابوداود، (سەمورە) ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێئەكردین: زەكاتی ئەو ماڵە بدەین كە بۆ فرۆشتن ئامادەی ئەكەین.

جا بزانە: ئەبێ لە زەكاتی بازرگانیدا پارە بدرێتە زەكات، واتە: دروست نیە كەلوپەل لە زەكات بدرێ.

**﴿ئاگاداری﴾**: ١– ئەو شتەی بە نیازیبازرگانی كڕیویەتی، دوایێ لە فرۆشتنی پەشیمان ئەبێتەوەو بۆ خۆی دایئەنێ، ئەوە زەكاتی تێدا نیە.

٢– هەروەها كەلوپەلی ناو ماڵی خۆی كە دەیفرۆشێ ئەویش زەكاتی تێدا نیە، بەلام ئەگەر تا ساڵێك پارەكەی لە لا مایەوە، ئەبێ زەكاتی پارەكە بدا.

٣– ئامێرەكانی پیشەسازیو كەلوپەلی ناو دوكان–كە بۆ فرۆشتن دانەندراوەن–خانووی بەكرێدراو و ئۆتۆمبێلی هاتوچۆكردنو بارهەلگرتنو كرێ پێكردنو ئامێری كێلانو دروێنە، ئەوانە هیچیان زەكاتیان تێدا نیە، بەلام ئەگەر بەرووبومیان هەبوو و بۆ ماوەی ساڵێك پاشەكەوت كرا، ئەبێ زەكات لە بەرووبومەكە بدا.

٤– ئەگەر كەسێك بازرگانی سەر پێیی ئەكرد: وەك ئاژەڵ فرۆشتنو ئۆتۆمبێل فرۆشتنو خانوو فرۆشتن، ئەوە هەر كاتێ ساڵێك ڕابرد، ئەبێ زەكاتی ئەوانە بدا: بەگوێرەی نرخی فرۆشتنی بازاڕ.

وَمَا اسْتُخْرِجَ مِنْ مَعادِنِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ يُخْرَجُ مِنْـهُ رُبْـعُ الْعُشْـرِ فِـي الْحَـالِ، وَما يُوجَدُ مِنَ الرِّكازِ فَفِيهِ الْخُمُسُ.

---

## ﴿ باسى زەكاتى كانگەو گە نجينە ﴾

(وَما اسْتُخْرِجَ) ئەوەى هێندراوەتە دەرەوە (مِنْ مَعادِنِ الذَّهَبِ) لە كانگەى زێڕ (وَالْفِضَّةِ) يان لە كانگەى زيو، جا لە موڵكى خۆى بێ، يان لە شوێنێكى وەها كە موڵكى كەس نەبێ (يُخْرَجُ مِنْهُ) زەكاتى لێتەدرێ ئەگەر لە دواى پاككردنەوە گەيشتە ڕادەى زەكات (رُبْـعُ الْعُشْرِ) چوارێكى دەيەك، واتە: لە چلا: يەك، زەكاتيەتى (فِي الْحالِ) هەر لەو دەمەى ئەيهێنێتە دەرەوە، واتە: نابێ ساڵێكى بە سەردا بڕوا ﴿عَنْ بِلاَلِ بنِ الْحَرثِ ﷺ: أَخَذَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنَ الْمَعادِنِ الْقَبَلِيَّةِ اَلزَّكَـاةَ﴾ رواه الإمام مالك وأبوداود، پێغەمبەر ﷺ لە كانگەكانى (قەبەلييە) زەكاتى وەرگرت.

(وَما يُوجَدُ) هەر زێڕو زيوێكى بدۆزرێتەوە (مِنَ الرِّكازِ) لەو گەنجينانەى لە پێش هاتنى ئيسلام شاردراونەوە (فَفِيهِ الْخُمُسُ) ئەگەر گەيشتە ڕادەى زەكات، ئەوە لە پێنج بەش بەشێكى ئەدرێتە زەكات، هەر لەو دەمەى ئەيدۆزێتەوەو نابێ ساڵێكى بە سەردا بڕوا ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ: فِي الرِّكازِ اَلْخُمُسُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: لە گەنجينەى دۆزراوەدا پێنجێك زەكاتە.

كەواتە: چوار بەشەكەى‌تر هەمووى بۆ خۆيەتى، بەو مەرجەى لە شوێنێكى وا بيدۆزێتەوە: كە ملكى هيچ كەسێك نەبێ، يان هەر بەخۆى ملكەكەى ئاوەدان كردبێتەوە.

بەڵام ئەگەر لە شوێنێكى گشتىى وەك مزگەوت دۆزيەوە، يان نيشانەيەكى ئيسلامى لە سەر بوو، ئەوە وەك ماڵى ونبوو ڕەفتارى لەگەڵ ئەكرێ، واتە: تا ماوەى ساڵێك بانگەوازى ئەكا، جا ئەگەر خاوەنى نەبو، دروستە بيكاتە موڵكى خۆى.

بەڵام ئەگەر لە موڵكى كەسێكى‌تر دۆزيەوە، ئەوە هى خاوەن موڵكەكەيە ئەگەر دلواى بكا، ئەگەر نا: هى ئەو كەسەيە كە ئەو موڵكى لێوەرگرتوە، ئەگەر هەر كەس نەبو، ئەو كاتە ئەبێتە هى (بيت المال)و نابێتە هى خۆى، واتە: هەمووى لە بەرژەوەندى موسوڵمانان سەرف ئەكرێو ئەكرێتە خێر، جا ئەگەر بەخۆيشى هەژار بوو، تەنها بەشى هەژارێك بۆ خۆى دائەنێ.

﴿پاشكۆ﴾: ١- نيەت هێنان واجبە بۆ زەكاتدان، پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: ﴿إِنَّمَـا اَلأَعْمالُ بِالنِّيَّاتِ﴾ رواه الشيخان، هەر كردەوەيەكى خواپەرستى بێ، بە نيازى ناودڵ نەبێ دانامەزرێ.

ئينجا لە كاتى زەكاتدان، يان لە كاتى وەكيلگرتن، يان لە كاتى دياريكردنى ئەندازەى زەكات، بە دڵ بڵێ: ئەوە زەكاتە.

(فَصْلٌ) وَتَجِبُ زَكَاةُ الْفِطْرِ بِثَلاثَةِ شَرائِطَ: اَلإِسْلاَمِ، وَبِغُرُوبِ الشَّمْسِ مِنْ آخِرِ يَوْمٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضانَ، وَوُجُودِ الْفَضْلِ عَنْ قُوتِهِ وَقُوتِ عِيالِهِ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ وَلَيْلَتِهِ،

---

٢- دروسته پێش تەواوبوونیسالْ زەکاتەکەی بدا، بەو مەرجەی ماڵەکە گەیشتبێتە رادەی زەکات، زەکاتوەرگرەکەش تا کۆتایی ساڵ زەکاتی پێ بچێو هەر موسوڵمان بێو هەر زیندوو بێ ﴿عَنْ عَلِيٍّ: أَنَّ الْعَبَّاسَ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: فِي تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ؟ فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِـكَ﴾ رواه الترمذي وغيره، حەزرەتی (عباس-خوا لێی رازی بێ-) پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد: ئایا دروستە زەکاتەکەم پێش بخەم پێش ئەوەی ساڵ تەواو ببێ؟ پێغەمبەرﷺ رێگەی دایێ پێشی بێخێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (زَكَاةُالْفِطْرِ) سەرفیترەی مانگی رەمەزان ﴾

(وَتَجِبُ زَكَاةُ الْفِطْرِ) واجبە زەکاتی سەرفیترەی مانگی رەمەزان (بِثَلاثَةِ شَرائِطَ) بە سێ مەرج (اَلإِسْلاَمِ) یەکەم: موسوڵمان بێ، واتە: لە سەر کافر واجب نیە سەرفیترەی خۆی بدا ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَالْفِطْرِ صاعاً مِنْ تَمْـرٍ أَوْ صاعاً مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ سەرفیترەی رەمەزانی واجبی کردوە: لە سەر کۆیلەو ئازادو نێرو مێو گەورەو بچوك، بەو مەرجەی ئەوانە موسوڵمان بن.

(وَبِغُرُوبِ الشَّمْسِ) دووەم: بە ئاوابوونی رۆژ (مِنْ آخِرِ يَوْمٍ) لە ئاخیرڕۆژ (مِنْ شَهْرِ رَمَضانَ) لە مانگی رەمەزان، واتە: لە دەست پێکردنی شەویجەژنەوە سەرفیترە واجب ئەبێ، کەواتە: ئەگەر یەکێك لە شەویجەژندا بمرێ، واجبە سەرفیترەی بۆ بدرێ.

هەروەها ئەگەر منداڵێك لە رەمەزاندا لە دایك ببێ، یان پێش رۆژ ئاوابوونی رۆژی ئاخیری رەمەزان لە دایك ببێ، واجبە سەرفیترەی بۆ بدرێ، بەڵام ئەگەر لە شەویجەژندا لە دایك بوو، ئەوە سەرفیترەکەی واجب نیە.

(وَوُجُودِالْفَضْلِ) سێیەم: ئەو سەرفیترەیە زیاد بێ (عَنْ قُوتِهِ) لە مەسرەفی خۆی (وَقُوتِ عِيالِهِ) وە لە مەسرەفی ماڵو منداڵی خۆی (فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ) هی رۆژی جەژن و (وَلَيْلَتِهِ) هی شەوی جەژن، واتە: ئەگەر کەسێك زیاتری نەبو لە جلو بەرگو خواردنی شەو و رۆژی جەژن بۆ خۆیو ماڵو منداڵی، وە زیاتری نەبو لە ئەرکی خانوو، وە لە ئەندازەی قەرزداری، ئەوە سەرفیترەی لە سەر واجب نیە.

﴿ئاگاداری﴾: دروستە سەرفیترە هەر لە یەکەم رۆژیرەمەزانەوە بدرێ ﴿كَانَ النَّـاسُ يُعْطُونَها قَبْلَ الْعِيدِ بِالْيَوْمِ وَالْيَوْمَيْنِ﴾ رواه‌البخاري، لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ بە رۆژێكو بە دوو رۆژ پێش جەژن سەرفیترەیان ئەدا. هەروەها ئەگەر رۆژی جەژن کۆتایی هاتو سەرفیترەی نەدابو، واجبە قەزای بکاتەوە.

وَيُزَكِّي عَنْ نَفْسِهِ وَعَمَّنْ تَلْزَمُهُ نَفَقَتُهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: صَاعاً مِنْ قُوتِ بَلَدِهِ، وَقَدْرُهُ خَمْسَةُ أَرْطَالٍ وَثُلُثٌ بِالْعِرَاقِيِّ.

---

(وَيُزَكِّي) واجبه زەكاتی سەرفیترە بدا (عَنْ نَفْسِهِ) لەجیاتی خۆی (وَعَمَّنْ تَلْزَمُهُ نَفَقَتُهُ) وە لەجیاتی ئەو کەسانەی کە لە سەری واجبە بەخێویان بکا: وەك ژنەکەی‌خۆی‌و منداڵە بچوکەکانی‌خۆی، هەروەها منداڵە گەورەکانیشی‌و دایك‌و باوکیشی بەو مەرجەی فەقیر بن‌و هەم (مِنَ الْمُسْلِمِينَ) موسوڵمانیش بن.

(صاعاً) ئەندازەی سەرفیترە بە پێوانە: یەك ساعە (مِنْ قُوتِ بَلَدِهِ) لەو جۆرە خواردنەی دانیشتووانی ئەو شوێنە بە زۆری ئەیخۆن (وَقَدْرُهُ) ئەندازەی ساعی‌سەرفیترە بەکێشان (خَمْسَةُ أَرْطَالٍ وَثُلُثٌ) پێنج ڕیتڵ‌و سێیەکە ڕیتڵێکە (بِالْعِرَاقِيِّ) بەڕیتڵی‌عێراق، ئێستا ئەکاتە (٢٤٢٠)گرام، واتە: نزیکەی دوو کیلۆو نیو.

﴿ئاگاداری﴾: ئەوە لە سەر مەزهەبی ئیمامی(شافعی)یە، بەڵام لە سەر مەزهەبی ئیمامی (حنفي): ئەگەر خورما، یان جۆ لە سەرفیترە بدا، ئەوە یەك ساع واجبە، بەڵام ئەگەر مێوژ، یان گەنم، یان ئاردی گەنم بدا، ئەو کاتە نیو ساع واجبە.

ئینجا بزانە: ساعی (حنفي) لەگەڵ ساعی(شافعي) جیاوازە؟ چونکە ساعی(حنفي) (٣٦٣٠) سێ کیلۆو شەشسەدو سی گرامە، کەواتە: نیو ساعی ئەوان ئەکاتە (١٨١٥) گرام، نزیکەی دوو کیلۆ.

دووبارە بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا دروستە: نرخی ئەو نیو ساعە پارە بدرێتە هەژاران بۆ سەرفیترە، بەگوێرەی نرخی بازاڕ.

﴿پاشکۆ﴾: ١- دروستە هەژارێك سەرفیترەی خۆی بداتە هەژارێکی‌تر، ئینجا ئەو هەژارەش سەرفیترەی‌خۆی بداتە ئەوی، هەر چەند ژمارەی خێزانیشیان وەکو یەکتری نەبێ.

٢- ئەگەر ئافرەتێك لە مێردەکەی خۆی تۆرابو، یان بە بێ‌ئیزنی مێردەکەی لە ماڵەوە دەرچوبو، ئەوە سەرفیترەی لە سەر مێردەکەی واجب نیە.

٣- ئەگەر دایك‌و باوك‌و کوڕو کیژی بالغ ئەیانتوانی خۆیان بەخێو بکەن دروست نیە بە بێ‌ئیزن سەرفیترەیان بۆ بدا؟ چونکە زەکات خواپەرستیەو پێویستی بە نیەت هەیە، جا ئەو ئیزندانە ئەبێتە نیەتهێنان، هەروەها دروست نیە بە بێ‌ئیزن سەرفیترەی خوشك‌و برا، یان ژنی‌برای، یان ژنی‌کوڕی، یان خوشکی‌ژنی، یان هەر بێگانەیەکی‌تر بدا، هەر چەند ماڵیشیان لەگەڵ یەکدا بێ.

٤- بزانە: ئەوەی ڕۆژووش ناگرێ، هەر واجبە سەرفیترەکەی بدا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ﴾ رواه

(فَصْلٌ) وَتُدْفَعُ الزَّكَاةُ إِلَى الأَصْنَافِ الثَّمَانِيَةِ الَّذِينَ ذَكَرَهُمُ اللهُ تَعالَى فِي كِتابِهِ الْعَزِيزِ فِي قَوْلِهِ تَعالَى: [إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللهِ وَابْنِ السَّبِيلِ].

---

الحاكم، پێغەمبەرﷺ سەرفیترەی واجب کردوە بۆ ئەوەی ببێتە پاککەرەوەی مرۆڤی بەڕۆژوو لە قسەی پڕوپوچ و ناشەرعی، هەم بۆ ئەوەی ببێتە خۆراکی هەژاران.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەشکردنی زەکات ﴾

(وَتُدْفَعُ الزَّكَاةُ) ئەو زەکاتانەی باسمان کردن، ئەدرێن و دابەش ئەکرێن (إِلَى الأَصْنَافِ الثَّمانِيَةِ الَّذِينَ) بە سەر ئەو هەشت جۆرە کەسانەی کە (ذَكَرَهُمُ اللهُ) خوای گەورە ناوی بردون (فِي كِتَابِهِ الْعَزِيزِ) لە قورئانی پیرۆزدا (فِي قَوْلِهِ تَعالَى) لەو ئایەتە پیرۆزەی سورەتی (التوبة) کە ئەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللهِ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ زەکات دانراوە تەنها بدرێتە گەدایان و هەژاران و کرێکارانی زەکات و نوێموسوڵمانان و کۆیلەکان و قەرزداران و جەنگاوەرانی ڕێگەی خواو ڕێبوار، خوای گەورە وەهای واجب کردوە، خوا زانایە و کارلەجێیە.

( **پێناسە** ): ١- (فَقِير)، واتە: هەژار، کەسێکە ئەوەندە ماڵی نەبێ و کارێکی وەهای پێ نەکرێ: کە جێگەی نیوەی پێویستیەکانی ژیانی بۆ پڕ بکاتەوە، بۆ وێنە: پێویستی بە سەد دینار هەبێ، بەڵام ئەو تەنها سی دینار، یان چل دیناری دەست بکەوێ.

٢- (مِسْكِين)، واتە: گەدا، کەسێکە ماڵی هەبێ، یان بتوانێ کارێکی وەهابکا: کە جێگەی پێویستیەکانی ژیانی لە نیوەی زیاتر بۆ پڕ بکاتەوە، بەڵام بەشی نەکا، واتە: پێویستی بە سەد دینار هەبێ، بەڵام ئەو تەنها حەفتا، یان هەشتا دیناری دەست بکەوێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر هاتو ئەیتوانی کار بکا، بەڵام لە بەر خوێندن ڕێگەی نەبو کار بکا، یان کاری حەڵاڵی دەست نەئەکەوت، یان نەئەگونجا خۆی ئاشکرا بکاو کار بکا، ئەوانە گشتیان بە گەدا، یان بە هەژار دائەنرێن، هەروەها ئەگەر کەسێك پێویستی بە ژن هێنان هەبوو، بۆی دروستە بە ئەندازەی ئەرکی ژن هێنان زەکات وەربگرێ.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کەسێك لە لایەن دایك و باوکی، یان لە لایەن منداڵەکانی بەخێو بکرێ و پێویستیەکانی ژیانی بۆ دابین بکرێن، ئەوە نە بە گەداو نە بە هەژار ناژمێردرێ، هەرچەند هیچیشی نەبێ.

هەروەها ئەو کەسەی بە ناوی خواپەرستی واز لە ئیش وکار ئەهێنێ، هەم ئەو ژنەی لە مێردەکەی تۆراوە، ئەوانەش بە گەداو هەژار ناژمێردرێن و نابێ زەکات وەربگرن.

وَإِلَى مَنْ يُوجَدُ مِنْهُمْ، وَلاَ يَقْتَصِرُ عَلَى أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثَة مِنْ كُلِّ صِنْف إلاَّ الْعَامِلَ،

٣- (عامِلُ الزَّكَاة)، واتە: کرێکاری زەکات، ئەو کەسەیە کە زەکات کۆ ئەکاتەوەو دابەشی ئەکاو ناوی زەکاتدەرەکان ئەنووسێ.

٤- (مُؤَلَّفَةُ الْقُلُوب)، واتە: نوێموسوڵمان، ئەو کەسەیە کە تازە موسوڵمان بووەو نیازی بێهێزە، یان بەهێزە بەڵام خاوەنی پلەو خزمو دۆستە، ئەگەر بە زەکات پێدانی ڕێزی لێبندرێ، کەسانیتریش چاوی لێئەکەنو موسوڵمان ئەبن.

٥- (الرِّقَاب)، واتە: کۆیلەی نووسراوپێدراو، ئەو کۆیلەیە گەورەکەی پێی ئەڵێ: ئەگەر ئەوەندە پارەیەم بۆ بێنی ئازادت ئەکەم، ئەوەش بە ئەندازەی پێویستی زەکاتی ئەدرێتێ.

٦- (الْغَارِمُ)، واتە: قەرزدار، ئەو کەسەیە بۆ کاروباریخۆی تووشی قەرزداری بوبێ: وەك خانووکردنو ژن هێنان، یان بەڵایەکی هاتبێتە سەر: وەك کوشتنێکی بە هەڵە، ئەو جۆرە قەرزدارانە-بە ئەندازەی قەرزەکە-ئەیاندرێتێ، بەو مەرجەی نەتوانن قەرزەکە بدەنەوە، بەڵام ئەگەر بۆ ئاشتکردنەوەو مراندنەوەیئاژاوە قەرزدار بوبێ، ئەوە زەکاتی ئەدرێتێ هەرچەند دەوڵەمەندیش بێ.

٧- (سَبِيلُ اللّه)، واتە: جەنگاوەرانی ڕێگایخوا، ئەو کەسانەن کە بە بێموچە لە ڕێگای خوا جەنگ ئەکەن، ئەوانەش بە ئەندازەی ئەرکی خواردنو جلو بەرگی خۆیانو منداڵیان تا ئەگەڕێنەوە، هەروەها بۆ کڕینی چەكو تەقەمەنیش زەکاتیان ئەدرێتێ، هەرچەند دەوڵەمەندیش بن.

٨- (ابْنُ السَّبِيل)، واتە: ڕێبوار، ئەو کەسەیە کە پێویستە بۆ شوێنێك بچێ، یان ئەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵیخۆی، ئەمەش بەگوێرەی پێویستیسەفەرەکەی زەکاتی ئەدرێتێ، بەو مەرجەی هیچی نەبێ بۆ مەسرەفی ڕێگەو سەفەرەکەشی بۆ گوناهکاری نەبێ.

ئینجا ئەبی زەکات بدرێتە ئەو هەشت جۆرانە ئەگەر هەبون (وَإِلَى مَنْ يُوجَدُ مِنْهُمْ) ئەگەر گشتیان پێکرا نەبون ئەدرێتە ئەوانەی ئێستا دەست ئەکەون (وَلاَ يَقْتَصِرُ عَلَى أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثَة) وە نابێ زەکاتەکەی بداتە کەمتر لە سێ کەسان لە هەر جۆرێك (اِلاَّ الْعَامِلَ) تەنها جۆری کۆکەرەوەی زەکات، ئەگەر یەك کەسیش بێ، دروستە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەوەی باسمان کرد، فەرموودەی ئیمامی(شافعي)یە-خوا لێی ڕازی بێ- بەڵام هەندێ زانایتر فەرموویانە: دروستە زەکات بداتە سێ کەسیش.

هەم لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا-خوا لێی ڕازی بێ- دروستە: زەکات بدرێتە تەنها یەك کەسیش، جا سەرفیترە بێ، یان زەکاتەکانیتر، زۆر لە زانایان ئەم فەرموودەیان بە پەسند زانیوە.

وَخَمْسَةٌ لاَيَجُوزُ دَفْعُها إِلَيْهِمْ: اَلْغَنِيُّ بِمالٍ أَوْ كَسْبٍ، وَالْعَبْدُ، وَبَنُوهاشِمٍ وَبَنُوالْمُطَّلِب،

جا بزانه: دروست نيه گواستنهوهى زهكات له شوێنێك-كه ههژارو گهداى تىَدابن- بۆ شوێنێكىتر ﴿لأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعاذاً إِلَى الْيَمَنِ قالَ لَهُ: أَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَـرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيـائِهِمْ فَتُـرَدُّ عَلَـى فُقَـرَائِهِمْ﴾ رواه‌الشيخان، چونكه پێغهمبهر ﷺ (معاذ)ى نارده (يَمَنْ)و، پێى فهرموو: به خهڵكى (يَمَنْ) بڵێ: خوا زهكاتى له سهر دهوڵهمهندهكانيان واجب كردوه، ئهدرێتهوه ههژارهكانى خۆيان.

بهلاّم له مهزههبى ئيمامى (حنفي)دا: دروسته زهكات بگواسترێتهوه، ههروهها ئهگهر خزمێكى ههژارى ههبێ، سوننهته زهكاتهكهى بۆ بنێرێ.

﴿ئاگادارى﴾: دروست نيه ئهو قهرزهى له سهر ههژارهكهيه: به بهر زهكاتى بێخێ، واته: بڵێ: قهرزهكهم مهدهوه واى دائهنێم كه زهكاتم داوهته تۆ و زهكات نادهم.

ههروهها دروست نيه بڵێته ههژارهكه: بهو مهرجه زهكاتت ئهدهمێ: كه لهجياتى قهرزهكهم بيدهيهوه خۆم.

(وَخَمْسَةٌ) پێنج جۆره كهس ههنه (لاَيَجُوزُ) دروست نيه (دَفْعُهاإِلَيْهِمْ) زهكاتيان بدرێتێ: يهكهم: (اَلْغَنِيُّ) دهوڵهمهنده (بِمالٍ) له بهر ئهوهى بهشى خۆى ماڵى ههيه (أَوْ كَسْبٍ) يان له بهر ئهوهى ئهتوانێ ئيش‌وكار بكاو گوزهرانى ماڵو منداڵى پێ دابين بكا، جا-ئهو دهوڵهمهنده-ههرچهند خانوو و موڵكيشى نهبێ، زهكاتى ههر پێناشێ ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِـيٍّ وَلاَ لِـذِي‌مِرَّةٍ سَـوِيٍّ﴾ رواه‌اصحاب السنن، پێغهمبهر ﷺ فهرمووى: ئهو زهكاته حهڵاڵ نيه بۆ كهسێكى بهشى خۆى ماڵى ههبێ، يان لاشهيهكى بههێزو تهواوى ههبێ بۆ ئيش‌و كار.

دووهم: (وَالْعَبْدُ) كۆيلهيه، كه نووسراوى پێنهدرابێ.

سىٰيهم: (وَبَنُوهاشِمٍ) نهتهوهى هاشمو (وَبَنُوالْمُطَّلِبِ) ههروهها نهتهوهى موتتهليب، چونكه ئهوانه خزمى‌پێغهمبهرن ﷺ ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ الحارِثِ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّها لاتَحِلُّ لِمُحَمَّـدٍ وَلا لآلِ مُحَمَّـدٍ ﷺ﴾ رواه مسلم، پێغهمبهر ﷺ فهرمووى: ئهو زهكاته بۆ پێغهمبهر ﷺ حهڵاڵ نيهو بۆ خزمهكانيشى حهڵاڵ نيه.

﴿ئاگادارى﴾: ئهو سهيدانهى كه له كوردستان نيشتهجێن‌و نهتهوهى (فاطمة)ى كيژى پێغهمبهرن ﷺ دروست نيه زهكات وهربگرن.

بهلاّم ههندێ له زانايان فهرموويانه: چونكه خزمهكانى پێغهمبهر ﷺ ئێستا له پێنجێكى(بيت المال) بهشيان نيه، دروسته زهكات وهربگرن، كهوابوو: بهم فهرمودهيه سهيدهكانيش دروسته زهكات وهربگرن.

وَالْكافِرُ، وَمَنْ تَلْزَمُ الْمُزَكِّيَ نَفَقَتُهُ لاَ يَدْفَعُها إِلَيْهِمْ بِاسْمِ الْفُقَراءِ وَالْمَساكِينِ.

چـوارەم: (وَالْكـافِرُ) كـافر زەكـاتى پێناشـێ، بگـەڕێوە بۆحەديسـى موعـاز.
پێنجەم: (وَمَنْ تَلْزَمُ الْمُزَكِّيَ) كەسێكە كە لە سەر زەكاتدەرەكە واجب بێ (نَفَقَتُهُ) بەخێوى بكا: وەك ژن و باوك و كوڕو كيژو ئەو جۆرانە، كەوابوو: (لاَ يَدْفَعُها إِلَيْهِمْ) دروست نيە زەكاتدەرەكە زەكاتى خۆى بياندات (بِاسْمِ الْفُقَراءِ وَالْمَساكِينِ) بە ناوى هەژارو گەدايان، چونكە بەو زەكاتدانە بەخێوكردن لە سەر خۆى لائەدا، ئەمەش ئەبێتە فێڵبازى، بەلام بە ناوى قەرزدارو ڕێبوارو جەنگاوەرى ڕێگاى خوا، دروستە زەكاتيان بداتێ.

﴿ئاگادارى﴾: ١- دروستە ئافرەت زەكاتەكەى خۆى بداتە مێردەكەى‌خۆى، هەروەها دروستە باوك زەكاتى‌خۆى بداتە ئەو جۆرە كوڕەى كە منداڵ و خێزانى هەنەو پێى بەخێو ناكرێن.

٢- پێويستە كە كاتى زەكات واجببوون هات، بەزوترين كات زەكات بدا.

٣- هەروەها مەكروهە ئەوشتەى لە زەكات داويەتيە كەسێك، يان بە خێر داويەتيێ، لێى بكرێتەوە ﴿عَنْ عُمَرَ﴿ قالَ: حَمَلْتُ عَلى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ فَظَنَنْتُ أَنَّ صاحِبَهُ بائِعُهُ بِرُخْصٍ فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَتَبْتَعْهُ وَلَوْ أَعْطاكَهُ بِدِرْهَمٍ﴾ رواه‌الشيخان، ئيمامى (عمر) فەرمووى: بۆ ڕێگاى خوا ئەسپێكم دايە پياوێك، جاوام زانى بە هەرزان ئەيفرۆشێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: لێى مەكڕەوە هەرچەندە بە يەك ديرهەميش پێت بفرۆشێ.

٤- دروستـــه وەكيلگـــرتن بـــۆ زەكاتـــدان و بـــۆ زەكـــات وەرگـــرتن.

٥- كاركردن بە هەژارو گەدا، يان باسكردنى زەكات ڕووبەڕووى زەكاتوەرگرەكە، يان منەت لە سەركردنى، لە خێرەكەى كەم ئەكاتەوە.

﴿پاشكۆ﴾: ١- ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ﴿: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ سَأَلَ النّاسَ تَكَثُّراً فَإِنَّما يَسْأَلُ جَمْراً فَلْيَسْتَقِلَّ أَوْ يَسْتَكْثِرْ﴾ رواه‌مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: هەر كەسێك دەرۆزە بكاو زەكات وەربگرێ بۆ ئەوەى ماڵى زۆر ببێ، ئەوە پەنگرى جەهەنەم بۆ خۆى كۆ ئەكاتەوە، جا يا كەم بكا، يان زۆر بكا.

٢- ﴿عَنْ أَنَسٍ﴿:قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ الصَّدَقَةَ لَتُطْفِئُ غَضَبَ الرَّبِّ وَتَدْفَعُ مِيتَةَالسُّوءِ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: خێركردن تووڕەيى‌خوا ئەكوژێنێتەوەو مردنى نالەبار ئەگەڕێنێتەوە.

٣- ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ﴿: قالَ النَّبِيُّ ﷺ لِزَيْنَبَ: زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ﴾ رواه‌البخارى، پێغەمبەر ﷺ بە (زەينەب)ى فەرموو: مێردى خۆت و منداڵەكانى خۆت لە هەموو كەسێك موستەحەقترن خێريان پێ بكەى.

* * *

## (كـتـابُ الـصِّـيام)

وَشَـرائِطُ وُجُـوبُ الصِّـيامِ أَرْبَعَـةُ أَشْـياءَ: اَلإِسْـلامُ، وَالْبُلُـوغُ، وَالْعَـقْـلُ،

**﴿ كِتابُ الصِّيامِ: ئەم پەڕتووكە باسی ڕۆژوو ئەكا ﴾**

ڕۆژوو لە ئیسلامدا ئەمەیە: لە بەرەبەیانەوە تا ڕۆژئاوابوون خۆی قەدەغە بکا لەو شتانەی ڕۆژوو بە تاڵ ئەکەنەوە. ڕۆژووی مانگیڕەمەزان چوارەمین ڕوکنی ئیسلامە، لە مانگی (شعبان) ساڵی دووەمی کۆچی واجب کراوە.

ئینجا بزانە: بەڕۆژووبوونی مانگیڕەمەزان واجب ئەبێ: بە دیتنی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان، یان بە تەواوبوونی سی ڕۆژی مانگی شەعبان ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِیَ اللهُ عَنهُما: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صُومُوا لِرُؤْيَتِه وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِه فَإِنْ حالَتْ دُونَهُ غَيابَةٌ فَأَكْمِلُوا ثَلاثِينَ يَوْماً﴾ رواه الترمذی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کە مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانتان بینی بەڕۆژوو بن، هەروەها ئەگەر مانگی یەکشەوەی شەووالتان بینی بیکەنە جەژن، بەڵام ئەگەر مانگی یەکشەوەتان نەبینی، سی ڕۆژی شەعبان، یان ڕەمەزان تەواو بکەن.

دیسان بزانە: بە شاهیدیی پیاوێکی دادپەروەر-(عَدْل)-کە بڵێ: (من مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانی ئەم ساڵم دیتوە).- ئەبێتە ڕەمەزان.

هەروەها ئەگەر فەرمانڕەوایەکی موسوڵمانان بڕیاری بڵاوکردەوەو گوتی: (بە شەرع بۆم دەرکەوتوە سبەینێ ڕەمەزانە). ئەوە هەرکەسێك لە ژێر فەرمانی ئەودا بێ، واجبە بیکاتە ڕەمەزانو بەڕۆژوو بێ.

**﴿ئاگاداری﴾**: جگە لە مەزهەبی(شافعي) هەرسێك مەزهەبەکەیتر ئەفەرموون: ئەگەر لە وڵاتێکی ئیسلامدا مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان بینرا، لە هەموو وڵاتانیتر ئەبێتە ڕەمەزان، هەرچەند دووریش بن.

(وَشَرائِطُ وُجُوبِ الصِّيامِ) مەرجەکانی واجببوونی ڕۆژوویڕەمەزان (أَرْبَعَةُ أَشْياءَ) چوار مەرجن:

یەکەم: (الإِسْلامُ) ئیسلامەتییە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَىالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ ئەی خاوەن باوەڕان ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە سەر ئێوە واجب کراوە، هەروەك لە سەر ئۆممەتەکانی پێش ئێوەش واجب کراوە.

دووەم: (وَالْبُلُوغُ) بلوغبوونە، واتە: لە سەر منداڵ واجب نیە. سێیەم: (وَالْعَقْلُ) عەقڵی هەبێ، واتە: لە سەر شێتو بێهۆش واجب نیە ﴿عَنْ عائِشَةَرَضِیَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ: عَنِ النّائِمِ حَتّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتّى يُفِيقَ﴾ رواه احمد والنسائي، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نوسینی تاوان لە سەر سێ کەسان هەڵگیراوە: لە سەر نوستوو تا هەشیار ئەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا بلوغی ئەبێ، لە سەر شێت تا چاك ئەبێتەوە.

وَالْقُـــــدْرَةُ عَلَى الصَّـــــوْمِ. وَفَـــــرَائِضُ الصَّـــــوْمِ أَرْبَعَـــــةُ أَشْـــــيَاءَ: اَلنِّيَّةُ، وَالإِمْسَاكُ: عَنِ الأَكْلِ وَالشُّرْبِ، وَالْجِمَاعِ، وَتَعَمُّدِ الْقَيْءِ.

---

چوارهم: (وَالْقُدْرَةُ عَلَى الصَّوْمِ) توانای ڕۆژووگرتنی هەبێ، هەروەك لەمەودوا باسی ئەكەین.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر منداڵ توانای ڕۆژووی هەبوو، واجبە لە حەفت ساڵیەوە فەرمانی پێ بكرێ ڕۆژوو بگرێ، وە لە دە ساڵی لێی بدرێ ئەگەر بەڕۆژوو نەبو.

(وَفَـــرَائِضُ الصَّـــوْمِ) واجبـــەكانی ڕۆژوو (أَرْبَعَـــةُ أَشْـــيَاءَ) چـــوارن:

یەكەم: (اَلنِّيَّةُ) نیەتهێنانە هەموو شەوێك، واتە: لە ڕۆژ ئاوابوونەوە تا پێش بەیان ماوەی هەیە كە بە دڵ نیەت بێنێ و بڵێ: (نیەتم وەیە سبەینێ بەڕۆژوو بم لە واجبی ڕەمەزانی ئەم ساڵ).

كەواتە: ئەگەر بە شەو نیەتی لە بیرچو، ڕۆژووەكەی دروست نیەو ئەبی قەزای بكاتەوە ﴿عَنْ حَفْصَةَ رضي الله عنها: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلا صِيَامَ لَـهُ﴾ رواه ابنا خزيمة وحبان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك تا پێش بەیانی نیەتی ڕۆژووی نەهێنابێ، ڕۆژووەكەی قەبوڵ نابێ.

﴿ئاگاداری﴾: ڕۆژووی سوننەت تا پێش نیوەڕۆ ماوەی نیەتهێنانی هەیە، بەو مەرجەی لە بەیانەوە تا نیەت ئەهێنێ هیچی وای نەكردبێ: ڕۆژووی پێ بەتاڵ ببێ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ قُلْنَا: لاَ. قَالَ: فَإِنِّي إِذاً صَائِمٌ﴾ رواه مسلم، (عائشـة)-خوا لێی ڕازی بێ- فەرموویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ماڵەوەو فەرمووی: ئایا شتێك هەیە بیخۆم؟ گوتمان: هیچمان نیە. جا فەرمووی: كەوابێ: من بەڕۆژووم، واتە: بەڕۆژوو ئەبم.

ئینجا بزانە: هەر ئەو حەدیسە بەڵگەی ئیمامی(حنفی)یە كە ئەفەرموێ: لە ڕۆژئاوابوونەوە تا كاتی چێشتەنگاو دروستە: نیەتی ڕۆژووی ڕەمەزان بێنێ.

هەروەها بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(مالك)دا: دروستە هەر لە یەكەم شەوی ڕەمەزانەوە یەك جار نیەت بێنێ بۆ هەموو ڕەمەزان، ئیتر نایەوێ هەموو شەوێك نیەت بێنێ، جا ئەو فەرموودەیە زۆر بە سودەو پێویستە ڕەفتاری پێ بكرێ، بۆ ئەوەی لە قەزاكردنەوەی ڕۆژوو ڕزگار ببین، هەروەها ئەو فەرموودەیە بۆ ڕۆژوەكانی تری كەففارەتیش -كە بە سەر یەكدا واجبن- ئیشی پێ ئەكرێ.

﴿ئاگاداری﴾: واجبە: لە نیەتهێناندا ناوی ڕۆژووەكە دیاری بكرێ: ئایا ڕەمەزان بێ، یان نەزر بێ، یان قەزا بێ، یان كەففارەت بێ.

دووەم: (وَالإِمْسَاكُ) خۆ قەدەغەكردنە (عَنِ الأَكْلِ) لە خواردن و (وَالشُّرْبِ) لە خواردنەوە سێیەم: (وَالْجِمَاعِ) خۆ قەدەغەكردنە لە جیماع كردن. چوارەم: (وَتَعَمُّدِ الْقَيْءِ) خۆ قەدەغەكردنە لە خۆڕشاندنەوە. جا ئەو سێیانە لە بەیانەوە تا ڕۆژئاوابوون قەدەغەنە.

وَالَّذي يُفْطِرُ بِه الصَّائِمُ عَشَرَةُ أَشْياءَ: مـا وَصَـلَ عَمْـداً إِلىَ الْجَـوْفِ أَوِالــرَّأسِ، وَالْحُقْنَةُ فِي أَحَدِالسَّبِيلَيْنِ، وَالْقَيْءُ عَمْداً،

---

## ﴿ باسی بەتاڵبوونی ڕۆژوو ﴾

(وَالَّذي يُفْطِرُ بِهِ الصَّائِمُ) ئەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ ئەکەن (عَشَرَةُ أَشْياءَ) دە شتن، هـەر یەکێك لەو دەیانە ڕوویدا، ئەبێ ڕۆژووەکە قەزا بکاتەوە:

یەکەم: (ما وَصَلَ عَمْداً) گەیاندنی شتێکە بە قەسدی (إِلَى الْجَوْفِ) بۆ نـاو بۆشـایی لـەش: وەك سینگو زگو میزدانە (أوالرَّأسِ) یان بۆشاییەکانی سەری: وەك گـەروو و لـووتو گوێو نـاو مێشکدان، ئینجا ئەو شتە: خواردنو خواردنەوە بێ، یان دەرمان بێ، یان شتێکیتر بـێ: وەك قوتدانی دوکەڵیجگەرەو بەڵغەمو، تێنانی پەنجەی دەستو داروچکە...هتد.

بەڵام ئەگەر یەکێکی لەوانە بە هەڵە کرد، یان بە زۆر پێیـان کـرد، یـان لـەبیری چـوبو کـە بەڕۆژووە، ئەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵ نابێو قەزاکردنـەوەی نـاوێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صائِمٌ فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّما أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَـقاهُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: هـەر کەسـێك لەبیریچـو کـە بـەڕۆژووەو شـتێکی خوارد، یان شـتێکی خـواردەوە، بـا ڕۆژووەکـەی تـەواو بکـا، چـونکە خـوای گـەورە ئـەو خواردنو خواردنەوەی داوەتێ.

﴿ئاگاداری﴾ مەرجە: شتەکە لە کونێکیکراوەڕا بچێتە ناو بۆشایی، کەواتە: هەر شتێك لە ڕێگای دەمارەوە، یان لە ڕێگای پێستەوە بچێتە ناو لەشی مرۆڤ -جگە لە بۆشایی- ئەوە ڕۆژووی پێ بەتاڵ نابێ، هەرچەند تێنووەتیو برسیەتیش لاببا: وەکو شرونقە لێدانو خۆ چەورکردنو خوێن تێکردنیدەمارو ئاو تێکردنیدەمـار ﴿قالَ بَعْضُ أَصْحابِ النَّبِـيِّ ﷺ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ الْماءَ وَهُوَ صائِمٌ مِنَ الْحَرِّ أَوِالْعَطَشِ﴾ رواه أبوداود، واتە: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەڕۆژوو بوو، لە بەر گـەرما، یـان تێنـووەتی ئـاوی بـە سەری خۆیدا ئەکرد.

هەروەها بە تێچوونیپێشوولەو دوکەڵو تۆزیخۆڵو تۆزیئـاردو بـۆنکردنو تـف قوتـدانو دەرمانیچاو-بە هیچێکیان- ڕۆژوو بەتاڵ نابێ.

دووەم: (وَالْحُقْنَةُ) تێکردنی شتێکە بە ترومپا (فِي أَحَدِ السَّبِيلَيْنِ) لە ناو یـەکێك لـە کونی پێشەوە، یان پشتەوە: جا دەرمان بێ، یان نا، وەك پەنجە تێنان لە کاتی تارەت کـردن، ئەوە ڕۆژوو بەتاڵ ئەکا.

سێیەم: (وَالْقَيْءُ عَمْداً) خۆ ڕشاندنەوەیە بە قەسدی ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ وَهُوَ صائِمٌ فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضاءٌ، وَإِنِ اسْتَقاءَ فَلْيَقْضِ﴾ رواه اصحاب السنن

والحاكم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك بەڕۆژوو بێ‌و بە دەست خۆی نەبو ڕشاوە، قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر بەخۆی خۆی ڕشاندەوە، با ڕۆژووەکە قەزا بکاتەوە.

چوارەم: (وَالْوَطْءُ عَمْداً فِي الْفَرْجِ) جیماع کردنە بە قەسدی، واتە: ئەگەر نەیزانی بەڕۆژووە، یان نەیزانی حەرامە ڕۆژووەکەی بەتاڵ نابێ.

پێنجەم: (وَالْإِنْزالُ) هێنانی ئاوی خۆیەتی، واتە: خۆ ڕەحەتکردنە (عَنْ مُباشَرَةٍ) بە هۆی دەستبازی لەگەڵ یەکێکیتر، یان بە هۆی دەست تێوەردانی عەورەتی‌خۆی ﴿عَنْ عائِشَةَرَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ النَّبِيُّﷺ يُقَبِّلُ وَيُباشِرُ وَهُوَ صائِمٌ، وَكانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ﴾ رواه الشیخان، حەزرەتی(عائِشَة) فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ لەو کاتەی کە بەڕۆژوو بوو، خێزانەکانی خۆی ماچ ئەکردن‌و دەستبازیی لەگەڵ ئەکردن، بەڵام لە هەمووتان خۆڕاگرتر بوو، لەشی پیس نەئەبو. واتە: ئەگەر مەترسی ئاوهاتنی هەبایە وای‌نەئەکرد.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر کەسێك بە شەو جیماعی کرد، بەڵام تا دوای بانگی سبەینێ خۆی نەشۆرد، یان بە ڕۆژ نوست‌و تووشی جەنابەت بوو، واتە: لەشی پیس بوو، ئەوانە هیچیان ڕۆژوویان بەتاڵ نابێ ﴿عَنْ عائِشَةَرَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ النَّبِيُّﷺ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ مِنْ رَمَضانَ مِنْ غَيْرِ حُلُمٍ فَيَغْتَسِلُ وَيَصُومُ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەرﷺ لەشی بە جەنابەت دەبو، بەیان دائەهات‌و بەڕۆژوو بوو، ئینجا خۆی ئەشۆرد‌و ڕۆژووەکەی تەواو ئەکرد.

شەشەم: (وَالْحَيْضُ) هاتنی خوێنی‌حەیزە هەرچەندە یەك پشکیش بێ. حەفتەم: (وَالنِّفاسُ) هاتنی خوێنی دوای منداڵبوونە. هەشتەم: بە منداڵبوونیش ڕۆژوو بەتاڵ ئەبێ، هەرچەند خوێنیش نەبینێ ﴿سُئِلَتْ عائِشَةُرَضِيَ اللهُ عَنها: ما بالُ الْحائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ؟ قالَتْ: كانَ يُصِيبُنا ذَلِكَ فَنُؤْمَرُ بِقَضاءِ الصَّوْمِ وَلاَنُؤْمَرُ بِقَضاءِ الصَّلاَةِ﴾ رواه الشیخان، حەزرەتی (عائِشَة) فەرموویەتی: کاتێ تووشی حەیز ئەبوین، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێ‌ئەکردین ڕۆژوو قەزا بکەینەوە، بەڵام فەرمانی نەئەکرد نوێژ قەزا بکەینەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ئافرەت بە شەو پاك بۆوە: لە حەیز، یان لە نیفاس، واجبە نیەت بێنێ‌و سبەینێ بەڕۆژوو بێ، هەرچەند فریاش نەکەوێ خۆی بشۆرێ.

نۆیەم: (وَالْجُنُونُ) شێت بوونە: واتە: ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش شێت بێ، ڕۆژووەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، بەڵام قەزاکردنەوەی لە سەر نیە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر کەسێك لە بەیانەوە تا ڕۆژ ئاوابوون نووست، یان لە هۆش خۆی چوو، بەڵام بۆ ماوەیەکی کەم بە هۆش هاتەوە، هەردووکیان ڕۆژووەکەیان دروستە.

دەیەم: (وَالرِّدَّةُ) کافربوونە، واتە: ئەگەر موسوڵمانی بەڕۆژوو یەك کوفر بکا، ڕۆژووەکەی

وَيُسْتَحَبُّ فِي الصَّوْمِ ثَلاَثَةُ أَشْيَاءَ: تَعْجِيلُ الْفِطْرِ، وَتَأْخِيرُ السُّحُورِ، وَتَرْكُ الْهُجْرِ مِنَ الْكَلاَمِ.

---

بەتاڵ ئەبێو واجبە قەزای بکاتەوە، بەڵام کافری بنەڕەتی-کە موسوڵمان ئەبێ- لە سەری واجب نیە ڕۆژووەکان قەزا بکاتەوە.

﴿ باسی سوننەتەکانی ڕۆژوو ﴾

(وَيُسْتَحَبُّ) سوننەتە (فِي الصَّوْمِ) لە هەموو جۆرە ڕۆژووەکدا (ثَلاَثَةُ أَشْيَاءَ) سێ شت:
یەکەم: (تَعْجِيلُ الْفِطْرِ) بە پەلە فەتار بکاتەوە، واتە: کە دڵنیابو ڕۆژ ئاوا بووە، شتێك بخوا، (ئەم شێوەیە پێی ئەگوترێ: بەربانگ).
دووەم: (وَتَأْخِيرُ السُّحُورِ) درەنگ پاشیو بخوا بەو مەرجەی گومانی لێپەیدا نەبێ: ئایا بەیان بووە، یان نا ﴿عَنْ سَهْلِ بنِ سَعْدٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَيَزالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ ما عَجَّلُوا الْفِطْرَ وَأَخَّرُوا السُّحُورَ﴾ رواه احمد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: موسوڵمانان هەر لە باشیدا ئەژین تا بەردەوام ئەبن لە سەر فەتارکردنەوەی زوو و پاشیوخواردنی درەنگ.
ئینجا بزانە: سوننەتە فەتار بە خورما بکاتەوە، ئەگەر نەبوو، بە ئاو فەتار بکاتەوە ﴿عَنْ سَلْمانَ بنِ عامِرٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إذا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ فَإِنَّهُ بَرَكَةٌ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى ماءٍ فَإِنَّهُ طَهُورٌ﴾ رواەاصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کاتێ فەتارتان کردەوەبە قەسپ فەتار بکەنەوە، چونکە هێزتان زیاد ئەکا، ئەگەر قەسپ دەست نەکەوت، بە ئاو فەتار بکەنەوە، چونکە ئاو پاککەرەوەیە.
هەروەها سوننەتە: لە کاتی بەربانگ بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ أَللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ﴾ رواه الطبراني.
﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر پاشیوی خوارد، دوایێ ئاشکرا بوو لە کاتی پاشیوخواردن نوێژی سبەینێ بووە، ئەوە ئەبی تا ئێوارە بەڕۆژوو بێو قەزاشی بکاتەوە.
هەروەها ئەگەر وایزانی ڕۆژ ئاوا بووەو فەتاری کردەوە، دوایێ ئاشکرا بوو ڕۆژ ئاوا نەبوە، هەر ئەبی قەزای بکاتەوە.
سێیەم: (وَتَرْكُ الْهُجْرِ مِنَ الْكَلاَمِ) واز هێنانە لە قسەی ناشیرین‌و پڕوپووچ‌و جنێودان‌و غەیبەتکردن‌و درۆکردن، چونکە بەم جۆرە شتانە خێری ڕۆژوو کەم ئەبێتەوە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إذا أَصْبَحَ أَحَدُكُمْ يَوْماً صائِماً فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَجْهَلْ فَإِنْ امْرُؤٌ شاتَمَهُ أَوْ قاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي صائِمٌ﴾ رواەالشیخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر ڕۆژێك یەکێك لە ئێوە بەڕۆژوو بوو، با قسەی ناشیرین‌و پڕوپووچ نەکاو کردەوەی ناشیرین نەکا، جا ئەگەر کەسێك جنێوی پێدا، یان لەگەڵی کەوتە شەڕ، با بڵێ: من بەڕۆژووم. واتە: لەمە زیاتر وەڵامی نەداتەوە.

وَيَحْـــرُمُ صِـــيامُ خَمْسَـــةِ أَيَّــامٍ: اَلْعِيـــدانِ، وَأَيَّـــامُ التَّشْـــرِيقِ الثَّلاثَـــةُ.
وَيُكْرَهُ صَوْمُ يَوْمِ الشَّكِّ إِلاَّ أَنْ يُوافِقَ عادَةً لَهُ.

---

## ﴿ باسی ڕۆژووەکانی قەدەغەکراو ﴾

(وَيَحْرُمُ) حەرامە (صِيامُ خَمْسَةِ أَيّامٍ) بەڕۆژووبوون لە پێنج ڕۆژاندا: بە نیەتی سوننەت و نەزر و قەزا و کەففارەت:

یەکەم و دووەم: (اَلْعِيدانِ) بەڕۆژووبوونی جەژنی ڕەمەزان و قوربان ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ: عَنْ صِيامِ يَوْمِ الأَضْحَى وَيَوْمِ الْفِطْرِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا بەڕۆژوو ببین.

سێیەم و چوارەم و پێنجەم: (وَأَيّامُ التَّشْرِيقِ الثَّلاثَةُ) سێ ڕۆژەکانی دوای جەژنی قوربان حەرامە بەڕۆژووبوون ﴿عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَيّامُ التَّشْرِيقِ أَيّامُ أَكْـلٍ وَشُـرْبٍ وَذِكْرِ اللهِ تَعالَى﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَيّامُ التَّشْرِيقِ) هەر سێك ڕۆژەکانی دوای جەژنی قوربان، ڕۆژی خواردن و خواردنەوە و ڕۆژی زیکری خوای گەورەنە.

(وَيُكْرَهُ) مەکروهە، بەڵام بە فەرموودەی ڕاستتر حەرامە: (صَوْمُ يَوْمِ الشَّكِّ) بەڕۆژووبوونی ڕۆژی گومانلێکراو، واتە: ئەو ڕۆژەی کە گومان هەیە: ئایا ڕەمەزانە، یان نا؟ کە ڕۆژی سییەمی مانگی شەعبانە، دەنگو باس بڵاو ئەبێتەوە و ئەڵێن: مانگیان دیتوە، بەڵام بە گوێرەی شەرع کەس شاهیدیی نەداوە ﴿عَنْ عَمّارٍ ﷺ: مَنْ صامَ يَوْمَ الشَّكِّ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ﴾ رواه أصحاب السنن، هەر کەسێك لە ڕۆژی گومانلێکراودا بەڕۆژوو ببێ، ئەوە تاوانی کردوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ.

(إِلاَّ أَنْ يُوافِقَ عادَةً لَهُ) بەڵام ئەگەر ڕۆژی گومان لێکراو لەگەڵ عادەتی خۆی تێکی ئەکردەوە، ئەوە دروستە بەڕۆژوو بێ: وەك کەسێك عادەتی بوو دوو شەممە، یان پێنج شەممە بەڕۆژوو ئەبو، یان قەزای لە سەر بوو، ئەوە بۆ ئەو کەسە حەرام نیە.

﴿ئاگاداری﴾: حەرامە لە دوای نیوەی شەعبان ڕۆژووی سوننەت بگرێ، بەڵام ئەگەر پێش نیوەش بەڕۆژوو بوبێ، یان قەزای لە سەر بوو، یان دوو شەممە و پێنج شەممە بوو، ئەوە دروستە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذا انْتَصَفَ شَعْبانُ فَلاَ تَصُومُوا﴾ رواه أصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ نیوەی شەعبان ڕۆیی بەڕۆژوو مەبن.

هەروەها مەکروهە ڕۆژی هەینی بە تەنها بەڕۆژوو ببێ، یان ڕۆژی شەممە بە تەنها ﴿قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَيَصُمْ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلاَّ أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ کەستان لە ڕۆژی هەینیدا بەڕۆژوو ببێ، مەگەر ڕۆژێکیش لە پێشی، یان لە دوای بەڕۆژوو بێ.

وَمَنْ وَطِىءَ فِي نَهارِ رَمَضَانَ عامداً فِي الْفَرْجِ فَعَلَيْــهِ الْقَضــاءُ وَالْكَفّــارَةُ، وَهِــيَ: عِتْــقُ رَقَبَــةٍ مُؤْمِنَــةٍ، فَــإِنْ لَــمْ يَجِــدْ فَصِــيامُ شَــهْرَيْنِ مُتَتــابِعَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدٌّ.

## ﴿ باسی (فِدْيَة) و (كَفّارَة)ی ڕۆژوو ﴾

(وَمَنْ وَطِىءَ) هەر كەسێك جیماع بكا (فِي نَهارِ رَمَضَانَ) لە ڕۆژانی مانگی ڕەمەزاندا، بەو مەرجەی بەڕۆژوو بێ (عامداً) بە قەسدی (فِي الْفَرْجِ) بەو جۆرەی سەری ئامێری خۆی بخاتە ناو كونی پێشەوە، یان پشتەوە (فَعَلَيْهِ الْقَضاءُ) واجبە ئەو ڕۆژووە قەزا بكاتەوەو هەم (وَالْكَفّارَةُ) واجبە: كەففارەتیش بدا بەو شێوەیداهاتوو.

﴿ئاگاداری﴾: ١- ئەم كەففارەتە هەر لە سەر پیاوەكە واجبەو لە سەر ئافرەتەكە واجب نیە، بەڵام ئەبی ئافرەتەكەش ڕۆژووەكە قەزا بكاتەوە.

٢- هەر كەسێك نەزانێ جیماع كردن حەرامە؟ چونكە لە زانایانی ئایینی دوور بوو، یان تازە موسوڵمان بوو، یان لەبیری بچێ كە بەڕۆژووەو جیماع بكا، كەففارەتی لە سەر نیە.

٣- جگە لە مانگی ڕەمەزان لە هیچ مانگێكیتردا كەففارەت واجب نابێ بە جیماع كردن، تەنها ڕۆژووەكە بەتاڵ ئەبێ.

٤- هەروەها ئەو كەسەی بەڕۆژوو نیە لە مانگی ڕەمەزاندا، یان پێش جیماعكردن ڕۆژووەكەی بە شتێكیتر شكاندبو، ئەویش كەففارەتی لە سەر نیە.

(وَهِــيَ) كــەففارەتی جیمـــاعی مـــانگی ڕەمـــەزان بـــەم شـــێوەیە:

یەكەم: (عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ) ئەگەر دەست بكەوێ ئەبی كۆیلەیەكی موسوڵمان ئازاد بكا.

دووەم: (فَإِنْ لَمْ يَجِدْ) ئەگەر دەستی نەكەوت (فَصِيامُ شَهْرَيْنِ مُتَتابِعَيْنِ) ئەبی دوو مانگ بە سەر یەكدا بەڕۆژوو بێ، واتە: نابێ یەك ڕۆژ نێوانی بخاتێ.

سێیەم: (فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ) ئەگەر توانای نەبو دوو مانگ بە سەر یەكدا بەڕۆژوو بێ: لە بەر پیری، یان لە بەر نەخۆشییەكی بەردەوام، ئەوكاتە (فَإِطْعامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً) ئەبی خواردن بداتە شەست هەژارو گەدا (لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدٌّ) هەر هەژارێك، یان هەر گەدایەك، مستێك دانەوێڵەی بداتێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ: فَقالَ وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضانَ؟ قالَ ﷺ: هَلْ تَجِدُ ما تُعْتِقُ رَقَبَةً؟ قالَ: لا. قالَ: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَــهْرَيْنِ مُتَتابِعَيْنِ؟ قالَ: لا. قالَ: فَهَلْ تَجِدُ مَا تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِيناً؟ قالَ: لا. ثُــمَّ جَلَــسَ فَــأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، فَقالَ ﷺ: تَصَدَّقْ بِهَــذا...﴾ رواه الشيخان، پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: جیماعم لەگەڵ ژنی خۆم كردوە لە مانگی ڕەمەزاندا كە بەڕۆژوو بووم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا كۆیلەیەكت دەست ئەكەوێ ئازادی بكەی؟ گوتی: نا. فەرمووی: ئایا ئەتوانی دوو مانگ بە سەر یەكدا بەڕۆژوو بیی؟ گوتی: نا. فەرمووی:

وَمَنْ ماتَ وَعَلَيْهِ صِيامٌ مِنْ رَمَضانَ أَطْعَمَ عَنْهُ وَلِيُّهُ لِكُلِّ يَوْمٍ مُدُّ طَعامٍ، وَالشَّيْخُ إِنْ عَجَزَ عَنِ الصَّوْمِ

ئايا خواردەمەنیت بەشی شەست هەژارو گەدا دەست ئەکەوێ؟ گوتی: نا. ئینجا پیاوەکە هەر لە خزمەتی پێغەمبەرﷺ دانیشت، هەندێك قەسپیان بۆ پێغەمبەرﷺ هێنا، ئەویش دایە پیاوەکەو فەرمووی: ئەوە لەجیاتی کەففارەتەکەت بکە خێر.
جا ئەو حەدیسە وا ئەگەیەنێ: کەففارەت تا مردن لە ئەستۆی ئەمێنێ‌و بە نەبوونی لە سەری لاناچێ.
﴿ئاگاداری﴾: ئەندازەی (کەففارەت) لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: نیو ساعە-کە ئەکاتە (١٨١٥) گرام، واتە: نزیکەی دوو کیلۆ- بۆ هەر هەژارێك.
هەروەها لە لای ئیمامی (حنفی) دروستە: نرخی ئەو سی ساعە پارە بداتە ئەو شەست گەداو هەژارانە: هەر یەکێ نرخی نیو ساعی بداتێ.

﴿ (فِدْيَة)ی مردوو و ئەو کەسانەی بۆیان دروستە بەڕۆژوو نەبن ﴾

(وَمَنْ ماتَ) هەر موسوڵمانێك مرد (وَعَلَيْهِ صِيامٌ) ڕۆژووی لە سەر بون (مِنْ رَمَضانَ) لە ڕۆژووەکانی مانگی ڕەمەزان، یان هی کەففارەت، یان هی نەزر (أَطْعَمَ عَنْهُ وَلِيُّهُ) خزمێکی مردووەکە لە ماڵی مردووەکە خواردن ئەداتە گەداو هەژاران (لِكُلِّ يَوْمٍ) لەجیاتی هەر ڕۆژووەك (مُدُّ طَعامٍ) مستێك خواردەمەنی.
﴿ئاگاداری﴾: ئەوە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافعي)یە، بەڵام بەڵگەکەی بێ‌هێزە، کەواتە: فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعي) بەهێزترە کە فەرموویەتی: دروستە خزمی مردووەکە، یان بێگانەیەك بە ئیزنی خزمی مردووەکە: لەجیاتی مردووەکە ڕۆژووەکان قەزا بکەنەوە، هەم دروستە خواردنیش بدەنە هەژاران، چونکە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە بەهێزە کە ئەمەیە: ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّﷺ: مَنْ ماتَ وَعَلَيْهِ صِيامٌ صامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك مرد و ڕۆژووی لە سەر بون، با خزمەکەی لەجیاتی وی ڕۆژووەکانی قەزا بکاتەوە.
ئینجا بزانە: هەر کەسێك لە ڕەمەزاندا نەخۆش بوو و لە دوای ڕەمەزان فریا نەکەوت -لە بەر نەخۆشی- ڕۆژووەکان قەزا بکاتەوە، یان بە ماوەیەکی کەم لە دوای ڕەمەزان مرد، ئەوە ڕۆژووی ناکەونە سەر، واتە: نایەوێ بۆی قەزا بکرێنەوە.
هەروەها فەرموودەیەکی ئیمامی(شافعي) هەیە کە دروستە: نوێژ لەجیاتی مردوو قەزا بکرێنەوە، جا خزمەکانی قەزای بکەنەوە، یان بێگانەیەك بە ئیزنی خزمەکانی.
(وَالشَّيْخُ) پیرەمێردو پیرەژن، هەروەهاش ئەو نەخۆشەی چاوەڕوانی چاکبوونەوەی ناکرێ (إِنْ عَجَزَ عَنِ الصَّوْمِ) هەر یەکێك لەوانە ئەگەر نەیتوانی بەڕۆژوو بێ؟ لە بەر ئەوەی

يُفطِرُ وَيُطْعِمُ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مُدّاً، وَالْحامِلُ وَالْمُرْضِعُ إِنْ خافَتا عَلَى أَنْفُسِهِما أَفْطَرَتا، وَعَلَيْهِما الْقَضاءُ، فَإِنْ خافَتا عَلَى أَوْلادِهِما أَفْطَرَتا وَعَلَيْهِما الْقَضاءُ وَالْكَفّارَةُ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مُدٌّ، وَهُوَ رِطْلٌ وَثُلُثٌ بِالْعِراقِيِّ، وَالْمَرِيضُ وَالْمُسافِرُ سَفَراً طَوِيلاً يُفطِران وَيَقضِيان.

ئەكەوتە مەترسی (يُفطِرُ) بۆی دروستە بەڕۆژوو نەبێو (وَيُطْعِمُ) خواردەمەنی بداتە گەدا، یان هەژار (عَنْ كُلِّ يَوْمٍ) لەجیاتی هەر ڕۆژووەك (مُدّاً) مستێك دانەوێڵە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ واجبە لە سەر ئەو كەسانەی كە توانای ڕۆژووگرتنیان نەماوە: (فِدْيَةٌ) بدەنە هەژار.

(وَالْحامِلُ) ئافرەتی ئاوس (وَالْمُرْضِعُ) ئافرەتی شیردەر (إِذا خافَتا) هەر كاتێ ترسان (عَلَى أَنْفُسِهِما) كە زیان بەخۆیان بگا (أَفْطَرَتا) واجبە فەتار بكەنەوەو بەڕۆژوو نەبن (وَعَلَيْهِما الْقَضاءُ) تەنها قەزاكردنەوەیان لە سەرە ﴿عَنْ أَبِي قِلابَةَ رضي الله عنه: عَنْ رَجُلٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسافِرِ نِصْفَ الصَّلاةِ وَالصَّوْمَ، وَرَخَّصَ لِلْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە ڕۆژوو و نیوەی نوێژی لە سەر ڕێبوار لاداوەو ڕێگای ڕۆژوونەگرتنی بۆ ئاوسو شیردەر داوە.

(وَإِنْ خافَتا عَلَى أَوْلادِهِما) بەڵام ئەگەر ئافرەتی ئاوسو ئافرەتی شیردەر ترسی منداڵەكەیان هەبوو: كە بار باوێ، یان منداڵەكە برسی ببێ (أَفْطَرَتا) با بەڕۆژوو نەبن (وَعَلَيْهِما الْقَضاءُ) لە سەریان واجبە ڕۆژووەكان قەزا بكەنەوەو هەم (وَالْكَفّارَةُ) واجبە (فیدیە)ش بدەن (عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مُدٌّ) لەجیاتی هەر ڕۆژێك مستێك خواردەمەنی ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: الْحُبْلَى وَالْمُرْضِعُ إِذا خافَتا أَفْطَرَتا وَأَطْعَمَتا﴾ رواه ابوداود، (ابن عباس) فەرموویەتی: ئاوسو شیردەر كاتێ ترسیان گەیشتێ، با بەڕۆژوو نەبنو خواردن ببەخشنە هەژاران.

﴿ئاگاداری﴾: هەر كەسێك ڕۆژوو بشكێنێ بۆ ڕزگاركردنی گیانی خۆی، یان ماڵی خۆی، ئەوە تەنها قەزاكردنەوەی لە سەرە، بەڵام ئەگەر ڕۆژوو بشكێنێ بۆ ڕزگاركردنی گیانی كەسێكیتر، یان ماڵی كەسێكیتر، یان گیانی ئاژەڵێك: جا هی خۆی بێ، یان نا، ئەوە قەزاكردنەوەو فیدیەی ئەكەوێتە سەر.

(وَهُوَ) ئەندازەی ئەو مستەی بۆ فیدیەو كەففارەتی ڕۆژوو داندراوە (رِطْلٌ وَثُلُثٌ بِالْعِراقِيِّ) ڕیتلێكو سێیەكەڕیتلێكە بە ڕیتلیعێراق: كە ئەكاتە (٦٠٥) گرام.

﴿ئاگاداری﴾: دروستە گشت (فیدیە)كەی بداتە یەك هەژار، یان یەك گەدا.

(وَالْمَرِيضُ) ئەو نەخۆشەی چاوەڕوانی چاكبوونەوەی ئەكرێ (وَالْمُسافِرُ) وە ئەو كەسەی لە سەفەرە (سَفَراً طَوِيلاً) كە سەفەرەكەی (٨٠) هەشتا كیلۆمەتر درێژ بێ (يُفطِرانِ) بۆیان دروستە بەڕۆژوو نەبن (وَيَقْضِيانِ) بەڵام واجبە ڕۆژووەكە قەزا بكەنەوە، كە سەفەرو

نەخۆشی نەمان، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ هەر کەسێك نەخۆش بوو، یان ڕێبوار بوو، بۆی دروستە بەڕۆژوو نەبێو بە ژمارەی ئەو ڕۆژانەی نەیگرتون ڕۆژوو قەزا بکاتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: بزانە: هەر کەسێك بە هۆی ڕۆژووگرتن تووشی ئازار ببێ: وەك جووتیارو باغەوانو دروێنەچیو ئاوبێرو هەر کارێکیتر–جا بۆ خۆی بێ، یان بۆ کەسێکیتر– یان لە بەر گەرما، یان لە بەر سەرما، یان لە بەر تێنوویوونو برسیبوون، ئەوانە گشتیان لە سەریان واجبە: نیەتی ڕۆژوو بێنن و بەڕۆژوو بن، بەڵام هەر کاتێك بێهێز بون، بۆیان دروستە: ڕۆژووەکە بشکێنن، بەو مەرجەی ئازارەکەیان لە ئەندازە زیاتر بێو ترسی نەخۆشبوونیان هەبێ، ئینجا لە کاتێکیتردا ڕۆژووەکە قەزا ئەکەنەوەو (فیدیە)یان لە سەر نیە.

هەروەها بزانە: هەر کەسێك لەبەر کەمتەرخەمی ڕۆژووی ڕەمەزان قەزا نەکاتەوە تا ڕەمەزانێکیتر دادێ، ئەوە–جگە لە قەزاکردنەوە– بە ژمارەی هەر ڕۆژێك مستێك دانەوێڵەی ئەکەوێتە سەر لە فیدیەی ئەو دواخستنە.

## ﴿ باسی ڕۆژووی سوننەت ﴾

بەڕۆژووبوون لەو ڕۆژانەدا سوننەتە:

١– ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە زۆر خێرە بەڕۆژوو ببێ ﴿عَنْ أُسامَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: تُعْرَضُ الأَعْمالُ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنا صائِمٌ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کردەوەکانی ئادەمیزاد لە ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە ئەنێردرێنە خزمەت خوایگەورە، لە بەر ئەوە من پێم خۆشە کە کردەوەکانم ئەنێردرێن بەڕۆژوو بم.

٢– ڕۆژی عالفە–(عَرَفَة)، واتە: نۆیەمینی(ذي الْحِجَّة)، بەو مەرجەی لە حەج نەبێ ﴿عَنْ أَبِي قَتادَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: صِيامُ يَوْمِ عَرَفَةَ إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕۆژووبوونی ڕۆژی (عَرَفَة) تکام وایە لە خوایگەورە: گوناهەکانی ساڵی رابردوو و داهاتوو لاببا.

٣– ڕۆژی (تاسوعاء)و (عاشوراء)–نۆیەمینو دەیەمینی(مُحَرَّم)، ﴿عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: صامَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ عاشُوراءَ وَأَمَرَ بِصِيامِهِ وَقالَ: إِذا كانَ الْعامُ الْمُقْبِلُ–إِنْ شاءَ اللهُ– صُمْنَا الْيَوْمَ التّاسِعَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی دەیەمینی (مُحَرَّم) بەڕۆژوو بوو و فەرمووی: ساڵیداهاتوو–إنْ شاءَ الله–ڕۆژی نۆیەمینیش بەڕۆژوو ئەبین.

٤– شەش ڕۆژ لە مانگی شەشەلان–مانگی دوای ڕەمەزان ﴿عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ صامَ رَمَضانَ وَأَتْبَعَهُ سِتّاً مِنْ شَوّالٍ فَكَأَنَّما صامَ الدَّهْرَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ

فەرمووی: هەر کەسێك لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بێ‌و شەش ڕۆژیتریش لە مانگی (شوّال) بە دوای ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بێ، وەك سەر تا سەری‌سالّ بەڕۆژوو بوبێ، وای بۆ ئەنووسرێ.

٥- بەڕۆژووبوونی سێ ڕۆژان لە هەموو مانگێکدا ﴿عَنْ عَبدالله بن عُمَرَرَضِيَ اللهُ عَنْهُما: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صُمْ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاثَةَ أَيّامٍ فَإنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِأَمْثالِها وَذلِكَ مِثْلُ صِيامِ الدَّهْرِ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەرﷺفەرمووی: لە هەموو مانگێك سێ ڕۆژان بەڕۆژوو ببە، چونکە چاکە یەك بە دەیە: وەك سەر تا سەری‌سالّ بەڕۆژوو ببی، ئەوها بۆت ئەنووسرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر سێزدەو چواردەو پانزەی مانگ بەڕۆژوو بوو-کە پێیان ئەگوترێ: (أَيّامُ الْبِيض)- دوو جۆرە خێری بۆ ئەنووسرێن، بڕوانە (الترمذي).

﴿پاشکۆ﴾: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لايَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُها شاهِدٌ إِلاّ بِإِذْنِهِ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: دروست نیە ئافرەتی بە مێرد ڕۆژووی سوننەت بگرێ لەو کاتەی مێردی لە ماڵەوەیە، تا مێردەکەی ئیزنی ئەدا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (إِعْتِكاف) ﴾

واتە: مانەوە لە ناو مزگەوت بە نیازی خواپەرستی. (وَالإِعْتِكافُ) مانەوە لە ناو مزگەوت بە نیازی خواپەرستی (سُنَّةٌ مُسْتَحَبَّةٌ) سوننەتێکی زۆر بەخێرە لە هەموو کاتێکدا، بەلاّم لە دە شەوەکانی کۆتایی‌ڕەمەزاندا لە هەموو کاتێکی‌تر خێری زۆرترە ﴿عَنْ عائِشَةَرَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَالأَواخِرَ مِنْ رَمَضانَ حَتَّى تَوَفّاهُ اللهُ تَعالَى﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەرﷺ هەموو ساڵێك لە دە شەوەکانی کۆتایی‌ڕەمەزاندا لە مزگەوت ئەمایەوە تا وەفاتی کرد.

ئینجا بزانە: مانەوەی ئەو دە شەوانە لە بەر ئەوە زۆر خێرە: تاکو خێری (لَيْلَةُالْقَدْرِ)ی دەست بکەوێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ قامَ لَيْلَةَالْقَدْرِ إِيماناً واحْتِساباً غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ﴾رواه‌الشیخان، پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: هەر کەسێك لە (لَيْلَةُالْقَدْرِ)دا خوا پەرستی بکاو باوەڕی بەو شەوە هەبێ‌و داوای پاداشتی لە خوا بکا، خوای گەورە لە گوناهی ڕابردووی خۆش ئەبێ.

دووبارە بزانە: دڵی ئیمامی(شافعي) بۆ ئەوە ڕۆیشتوە: کە (لَيْلَةُالْقَدْرِ) شەوی بیست‌و یەك، یان بیست‌وسێی ڕەمەزانە. هەندێ زانای‌تر فەرموویانە: شەوی بیست‌وحەفتی ڕەمەزانە، هەندێکی‌تر فەرموویانە: لە دە شەوەکانی‌ئاخیری‌ڕەمەزان لە تاکەکانە.

هەروەها بزانە: خێری (لَيْلَةُالْقَدْرِ) دەستگیر ئەبێ: بە ئیعتیکاف کردن لە مزگەوت، یان قورئان خوێندن، یان نوێژکردن، یان زیکرکردن، جا لە هەر شوێنێك بێ، وە سوننەتە لە (لَيْلَةُالْقَدْرِ)دا بڵێ: ﴿أَللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي﴾ رواه الترمذي.

وَلَهُ شَرْطانِ: اَلنِّيَّةُ، وَاللُّبْثُ فِي الْمَسْجِد. وَلاَ يَخْرُجُ مِنَ الإِعْتِكافِ الْمَنْذُورِ إِلاّ لِحاجَةِ الإِنْسانِ أَوْ عُذْرٍ: مِنْ حَيْضٍ أَوْ مَرَضٍ لاَ يُمْكِنُ الْمُقامُ مَعَهُ، وَيَبْطُلُ بِالْوَطْءِ.

---

(وَلَهُ شَرْطانِ) ئیعتیکاف دوو مەرجی هەنە (النِّيَّةُ) یەکەم: نیەتهێنانە، واتە: بە نیازی خواپەرستن بچێتە ناو مزگەوت. (وَاللُّبْثُ فِي الْمَسْجِدِ) دووەم: نەختێك لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، واتە: جگە لە مزگەوت ئیعتیکاف لە هیچ شوێنێکی تردا دروست نیە، چونکە پێغەمبەرﷺ (صحابة) هەر لە مزگەوتدا ئیعتیکافیان کردوە، هەم لە بەر ئەو ئایەتەی لەمەو دوا دێ.

ئینجا بزانە: ئیعتیکاف هیچ زیکرێکی تایبەتی نیە، کەوابوو: بە تەنها مانەوە لە ناو مزگەوتدا–ئەگەر جگە لە نیازی خواپەرستی هیچیتریش نەکا–خێری بۆ ئەنوسرێ.

(وَلاَ يَخْرُجُ) دروست نیە لە مزگەوت بچێتە دەرەوە (مِنَ الإِعْتِكافِ الْمَنْذُورِ) لەو ئیعتیکافەی کە لە سەر خۆی نەزری کردوە، تا ماوە نەزرکراوەکە کۆتایی دێ (إِلاّ لِحاجَةِ الإِنْسانِ) بەلام لە بەر پێویستیەکانی ئادەمیزادی: وەك میز کردن، یان پیسایی، یان جەنابەت دروستە بچێتە دەرەوە (أَوْ عُذْرٍ) یان عوزرێکیتری هەبێ (مِنْ حَيْضٍ) وەك حەیزو منداڵبوون (أَوْ مَرَضٍ) یان نەخۆش بێ (لاَ يُمْكِنُ الْمُقامُ مَعَهُ) کە نەگونجێ لەگەڵ ئەو نەخۆشیەیە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە.

(وَيَبْطُلُ بِالْوَطْءِ) ئیعتیکاف بە جیماع کردن بەتاڵ ئەبێتەوە، هەروەها بە دەستبازیش بەتاڵ ئەبێتەوە ئەگەر ئاوی بێتە دەر، واتە: لەشی پیس بێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَتُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾ واتە: دەستبازیو جیماع لەگەڵ ئافرەتەکانتان مەکەن لەو کاتەی لە مزگەوتەکاندا ئیعتیکاف ئەکەن. کەوابوو: ئیعتیکاف بە بێدەستنوێژیی بچووك بەتاڵ نابێ.

﴿پاشکۆ﴾: سوننەتە لە مانگیرەمەزاندا زۆر خێر بکاو یارمەتی هەژاران بدلو لە کاتی فەتاردا خواردەمەنی بداتە ئەو کەسانەی بەرۆژوون، هەروەها سوننەتە بە شەو و بە رۆژ زۆر قورئان بخوێنێ ﴿عَنِ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: كانَ النَّبِيُّ ﷺ أَجْوَدَ النّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكانَ أَجْوَدُ ما يَكُونُ فِي رَمَضانَ حِينَ يَلْقاهُ جِبْرِيلُ، وَكانَ جِبْرِيلُ يَلْقاهُ كُلَّ لَيْلَةٍ فِي رَمَضانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ يَعْرِضُ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ الْقُرْآنَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە هەموو کەسێك سەخیتر بوو، بەلام لە مانگی رەمەزاندا زیاتر سەخیتر بوو، زۆر خێری ئەکرد لەو کاتەی حەزرەتی (جوبرائیل) لە هەموو شەوێکی رەمەزاندا ئەهاتە لایو پێغەمبەرﷺ قورئانی لە لا ئەخوێندەوە تا کۆتایی رەمەزان ئەهات.

* * *

## ( كِـتابُ الْـحَـجِّ )

**وَشَـرائِطُ وُجُـوبِ الْحَـجِّ، سَبْـعَـةُ أَشْـياءَ: اَلإِسْـلاَمُ، وَالْبُلُـوغُ، وَالْعَـقْلُ،**

---

**﴿ كِتابُ الْحَجِّ: ئەم پەرتووكە باسی حەج و عومرە ئەكا ﴾**

**حەج و عومرە** ئەوەیە: بچێتە ماڵیخوا لە (مَكّة)ی پیرۆز، بۆ ئەو خواپەرستیانەی باسیان ئەكەین لەم پەرتووكەدا. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِلّٰهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ خوایگەورە واجبێكی لە سەر خەڵك هەیە: كە حەج كردنی ماڵیخوایە لە سەر ئەو كەسە واجبە كە توانای ڕێگەی هەبێ.

حەج پێنجەمین ڕوكنی ئیسلامەو لە ساڵی شەشەمینی كۆچیدا واجب كراوە. **ئینجا بزانە:** حەج و عومرە لە تەمەندا یەك جار واجبن ﴿قالَ الأَقْرَعُ بن حابس ﷺ: يَا رَسُولَ الله اَلْحَجُّ فِي كُلِّ سَنَةٍ أَوْ مَرَّةً واحدَةً؟ قَالَ: بَلْ مَرَّةً واحدَةً، فَمَنْ زَادَ فَهُوَ تَطَوُّعٌ﴾ رواه أحمد والحاكم وغيرهما، (ئەقرەع)ی كوڕی (حابیس) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەج كردن هەموو ساڵێك واجبە، یان تەنها یەك جار؟ فەرمووی: تەنها یەك جار واجبەو زیاتر سوننەتە.

(وَشَرائِطُ وُجُوبِ الْحَجِّ) مەرجەكانی واجببوونی حەج (سَبْعَةُ أَشْياءَ) حەفت مەرجن:

یەكەم: (الإِسْلاَمُ) ئیسلامەتییە، چونكە حەج كردنی كافر دروست نیە.

دووەم: (وَالْبُلُوغُ) بلۆغبوونە، واتە: منداڵ حەجی لە سەر نیە، بەڵام دروستە بەخێوكەری منداڵەكە -لە سەر ئەركیخۆی- لەگەڵ خۆیا بیبا بۆ حەج، جا ئەگەر منداڵەكە چاكەو خراپەی لێك جیا ئەكردەوە، پێی ئەڵێ: كە بەخۆی ئیحرام ببەستێ و حەجی لەگەڵ ئەكا، بەڵام ئەگەر زۆر بچووك بوو، ئەوە هەر بەخۆی لە جیاتی منداڵەكە نیەتی ئیحرام ئەهێنێ و ئەیخاتە ژێر ئیحرام و حەجی پێئەكا، واتە: ئەڵێ (ئیحرامی ئەم منداڵەم بەست بە حەج). ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: رَفَعَتِ امْرَأَةٌ صَبِيّاً إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ﴾ رواه مسلم، ئافرەتێك منداڵێكی لە بەر چاوی پێغەمبەر ﷺ بەرز كردەوەو گوتی: ئایا حەجی ئەم منداڵە دروستە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، خێری حەج پێكردنیشی بۆ تۆ ئەنووسرێ.

سێیەم: (وَالْعَقْلُ) عاقڵ بێ، واتە: شێت حەجی لە سەر نیە ﴿عَنْ عائشةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ﴾ رواه أحمد والنسائي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نووسینی تاوان لادراوە: لە سەر نووستوو تا هەشیار ئەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا بلۆغی ئەبێ، لە سەر شێت تا چاك ئەبێتەوە.

وَالْحُرِّيَّةُ، وَوُجُودُ الزَّادِ وَالرَّاحِلَةِ، وَتَخْلِيَةُ الطَّرِيقِ، وَإِمْكَانُ الْمَسِيرِ.

ئینجا بزانە: حەج پێکردنی شێت وەك منداڵی بچووك وایە.

چوارەم: (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازاد بێ، واتە: لە سەر کۆیلە حەج واجب نیە.

﴿ئاگاداری﴾: حەج کردنی منداڵو شێتو کۆیلە بە بەر ڕوکنی‌ئیسلام ناکەوێ، کەواتە: کە منداڵ بلۆغی‌بوو و شێت چاك بۆوەو کۆیلە ئازاد کرا-ئەگەر حەجیان لە سەر واجب بوو- ئەبێ حەجی ڕوکنی ئیسلام بکەن ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: أَيُّما غُلَامٍ حَجَّ بِهِ أَهْلُهُ ثُمَّ بَلَغَ فَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى﴾ رواه البيهقي والخطيب، هەر منداڵێك حەجیان پێ‌کردبێ، ئینجا بلۆغی بوو، ئەبێ حەجێکی‌تر بکا.

بەڵام ئەگەر گەدلو هەژار حەجیان کرد، ئەوە حەجەکەیان بە بەر ڕوکنی ئیسلام ئەکەوێو ئەگەر دەوڵەمەندیش بون، واجب نیە حەجێکی‌تر بکەن.

پێنجەم: (وَوُجُودُ الزَّادِ) خواردەمەنی ئەو سەفەرەی هەبێ بۆ چوونو گەڕانەوە (وَالرَّاحِلَةِ) هەروەها شتێکی سواری دەست بکەوێ بۆ چوونو گەڕانەوە، جا فڕۆکە بێ، یان ئۆتۆمبیل بێ، یان وڵاغ بێ.

﴿ئاگاداری﴾: مەرجە مەسرەفی چوونە حەجو گەڕانەوەی، زیادبێ: لە قەرزو لە مەسرەفی ماڵو منداڵی تا ئەگەڕێتەوە لایان، هەروەها زیاد بێ: لە خانوو و پێویستیەکانی ناو ماڵ.

شەشەم: (وَتَخْلِيَةُ الطَّرِيقِ) ڕێگەی بێ‌ترس بێ: لە ڕێگرو پیاو خراپو مەترسی‌گرتنی لە لایەن کاربەدەستەکان نەبێو کاربەدەست قەدەغەی نەکا لە چوونە حەج.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ئافرەت مێردەکەی ئیزنی نەدا بۆ حەج، یان هیچ مەحرەمێك نەبێ لەگەڵی بچێ، یان کۆمەڵە ئافرەتێکی دەست نەکەوت لەگەڵیان بچێ بۆ حەج، ئەوە حەجی لە سەر نیە.

حەفتەم: (وَإِمْكَانُ الْمَسِيرِ) ئەوەندە ماوە مابێ: کە بگونجێ بگاتە وەستانی عەرەفە، واتە: ئەگەر ئەو مەرجانە هاتنە جێ، بەڵام ئەوەندە ماوە نەمابو بگاتە حەج، ئەوە حەجی لە سەر نیە، کەوابوو: پێویستە ئەو مەرجانە لە مانگەکانی حەجدا بێنە جێ.

### ﴿ باسی حەجی مردوو و پەککەوتوو ﴾

١- هەر کەسێك بمرێو حەجی نەکردبێ، ئەوە ئەگەر لە ژیانیا حەجی لە سەر واجب بوبێ، واجبە لە میراتەکەی حەجی لەجیاتی بکرێ، واتە: نابێ میراتەکەی بەش بکرێ تا حەجی بۆ ئەکرێ، یان کرێی حەج کردن دیاری ئەکرێ، بەڵام ئەگەر میراتی لە پاش بەجێ نەمابو، یان میرات هەبوو، بەڵام لە ژیانیا حەجی لە سەر واجب نەبو، ئەوە سونەتە میراتگرەکەی، یان بێگانەیەك حەجی لەجیاتی بکا ﴿عَنْ بريدة ﷺ: جاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقالَتْ: إِنَّ أُمِّي ماتَتْ وَلَمْ تَحُجَّ أَفَأَحُجُّ عَنْها؟ قالَ: نَعَمْ حُجِّي عَنْهَا﴾ رواه‌مسلم، ئافرەتێك گوتی:

دایکم مردووەو حەجی نەکردوە، ئایا حەجی لەجیاتی بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ حەجی لەجیاتی بکە.

٢- مرۆڤی پەککەوتوو بەو شێوەیەی نەگاتە حەج: لە بەر پیری، یان نەخۆشی یەکی بەردەوام، ئەگەر مەرجەکانی واجیبوونی حەجی لێهاتنە جێ، واجبە یەکێك بە کرێ بگرێ بۆ ئەوەی بچێ حەجی لەجیاتی بکا، هەروەها ئەگەر یەکێك ئامادە بوو بە خۆڕایی حەجی بۆ بکا، واجبە ئیزنی بدا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: قَالَتْ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ إِنَّ فَرِيضَةَ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً لاَ يَثْبُتُ عَلَى الرَّاحِلَةِ أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ﴾ رواه الشيخان، ئافرەتێك گوتی: واجبی خوای گەورە -حەج- لە سەر باوکم واجب بووە، بەڵام پیرێکی وایە خۆی ڕاناگرێ لە سەر وولاغ کە بچێ بۆ حەج، ئایا دروستە حەجی لەجیاتی بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو کەسەی بۆ خۆی حەجی نەکردبێ، دروست نیە لەجیاتی مردوو، یان پەککەوتوو حەج بکا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً يَقُولُ: لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ. قَالَ: مَنْ شُبْرُمَةُ؟ قَالَ: أَخٌ لِي أَوْ قَرِيبٌ لِي. قَالَ: حَجَجْتَ عَنْ نَفْسِكَ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبْرُمَةَ﴾ رواه البيهقي، پێغەمبەرﷺ گوێی لە پیاوێك بوو ئەیگوت: (لَبَّيْكَ) لەجیاتی (شوبرومە). پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (شوبرومە) کێیە؟ گوتی: برایەکی خۆمە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ خۆت حەجت کردوە؟ گوتی: نا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: حەجی خۆت بکە، ئینجا لەجیاتی (شوبرومە) حەج بکە.

## ﴿ باسی ڕوکنەکانی حەج ﴾

(وَأَرْكَانُ الْحَجِّ) ڕوکنەکانی حەج (أَرْبَعَةٌ) چوار ڕوکنن -بەڵام بە فەرموودەی بەهێزتر: پێنجن- ئەگەر یەکێکیان نەبو، حەجی دروست نابێ:

## ١- ﴿ ئیحرامبەستن ﴾

(اَلإِحْرَامُ) ڕوکنی یەکەمی حەج: چوونە ژێر ئیحرامە (مَعَ النِّيَّةِ) لەگەڵ نیەتهێنانی ئیحرامبەستن، واتە: بە دڵ و زوبان بڵێ: (نیەتم وەیە حەج بکەمو ئیحرامم بەست بە حەج بۆ خوای گەورە).

وە ئەگەر لەجیاتی کەسێکی‌تر حەجت ئەکرد، بڵێ: (نیەتم وەیە لەجیاتی فڵان حەج بکەمو ئیحرامم بەست بە حەج لەجیاتی‌فڵان بۆ خوای گەورە).

﴿عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَاتِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کردەوەیەکی خواپەرستی بێ، بە نیازی ناو دڵ نەبێ دانامەزرێ.

وَالْوُقُوفُ بِعَرَفَةَ، وَالطَّوَافُ بِالْبَيْتِ،

﴿ئاگاداری﴾: ئیحرامبەستن بە حەج، واجبە لە مانگەکانیحەجدا بێ: کە (شوّال)و (ذوالقعدة)و دە شەوی (ذیالحِجّة) یە، ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِیَاللهُ عَنهُما: أَشْهُرُالْحَجِّ شَوّالٌ وَذُوالْقَعدَةِ وَعَشْرٌ مِنْ ذِیالْحِجَّةِ﴾ رواهالبخاری، واتە: جگە لەو دوو مانگو دە شەوە، ئیحرامبەستن بە حەج لە هیچ کاتێکیتردا دروست نیە.

هەروەها خۆ شۆردن سوننەتە بۆ ئیحرامبەستن ﴿عَنْ زَیْدٍ: رَأَیْتُ النَّبِیَّ ﷺ تَجَرَّدَ لإِهْلاَلِهِ وَاغْتَسَلَ﴾ رواه الترمذی، (زَیْد) فەرموویەتی: پێغەمبەرم بینی ﷺ خۆی ڕووت کردەوە بۆ ئیحرامبەستنو خۆی شۆرد.

ئینجا کە خۆی شۆرد سوننەتە دوو ڕەکعەت نوێژ بکا بە نیەتی (سوننەتی ئیحرامبەستن)، ئینجا کە سەلامی دایەو کەوتە ڕێ، نیەتی ئیحرامبەستن بێنێو (لَبَّیْكَ) بڵێ.

﴿ئاگاداری﴾: بۆ مرۆڤی لەش بە جەنابەتو بێدەستنوێژو، ئافرەتی بە حەیزو نیفاس دروستە: نیەتی ئیحرام بێنێو ئیحرام ببەستن، هەروەهاش کردارەکانیتری حەجو عومرە –جگە لە تەواف– گشتیان بە حەیزو جەنابەتو بێدەستنوێژیەوە دروستن.

## ٢-﴿ وەستان لە عەرەفە ﴾

(وَالْوُقُوفُ بِعَرَفَةَ) ڕوکنیدووەمیحەج: وەستانە لە عەرەفە، (شوێنێکە لە ڕۆژهەڵاتی مەککە)، کاتی وەستانیعەرەفە: لە نیوەڕۆی ڕۆژیعالفە=(عَرَفَة)–کە نۆیەمی (ذیالحجة)یە– دەست پێئەکا، تا بەیانیی ڕۆژی جەژنی قوربان دەرنەکەوێ، هەر بەردەوامە، سوننەتە–ئەگەر ڕێبوار بێ–نوێژی نیوەڕۆو عەسر لەوێ بە (جمعالتقدیم) بکا.

جا بزانە: واجبی وەستان هەر ئەوەندەیە لەو ماوەیەدا کاتێکیکەم لە خاکی عەرەفەدا بێ، بەو مەرجەی لە ژێر ئیحرامدا بێ، جا سوننەتە بەردەوام بڵێ: ﴿لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِیكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِیرٌ﴾ رواهالترمذي.

ئیتر پێویست نیە دەستنوێژی هەبێ، یان لەشی پاك بێ، یان شەو و ڕۆژ بە یەکەوە لەوێ بمێنێتەوە، بەڵام سوننەتە: ڕۆژ ئاوا ببێ، ئینجا عەرەفە بەجێ بهێڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْحَجُّ یَوْمُ عَرَفَةَ مَنْ جاءَ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ لَیْلَةِ جَمْعٍ فَتَمَّ حَجُّهُ﴾ رواه اصحاب السنن، حەج کردن بریتییە لە وەستانیعەرەفە، جا هەر کەسێك فریای عەرەفە بکەوێ پێش نوێژی بەیان لە شەویجەژن ، ئەوە حەجی تەواوە.

## ٣-﴿ تەواف کردن ﴾

(وَالطَّوَافُ بِالْبَیْتِ) ڕوکنیسێیەمیحەج: تەواف کردنە، واتە: سوڕانەوە بە دەوورەی ماڵی خوادا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلْیَطَّوَّفُوا بِالْبَیْتِ الْعَتِیقِ﴾ با تەوافی ماڵی خوا بکەن کە ئازادکراوە لە هەموو زۆردارێك.

بزانە: بەم تەوافە ئەگوترێ: (طَوافُ الإفاضَة)، چونکە لە دوای وەستانی عەرەفە تۆبەتی دێ، وە پێیشی ئەگوترێ: (طَوافُ الرُّكْن)، چونکە ڕوکنێکی حەجە، ئینجا-جگە لەم تەوافە-تەوافێکیتر هەیە بە ناوی (طَوافُ القُدُوم)، وە یەکێکیتر هەیە بە ناوی (طَوافُ الْوَداع)، کە لەمەودوا باسیان ئەکەین.

**پێویستیەکانی تەواف:** هەر جۆرە تەوافێك هەبێ، واجبە ئەو هەشت مەرجانەی لێبێنەجێ:

یەکەم: داپۆشینی عەورەت بە جلێکی پاك وەك لە نوێژدا باسمان کرد.

دووەم: دەستنوێژی هەبێو پاك بێ: لە جەنابەتو حەیزو نیفاسو لە هەموو جۆرە پیسیەك ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: اَلطَّوافُ مِثْلُ الصَّلاَةِ﴾ رواه الترمذي، تەواف کردن وەك نوێژ وایە.

سێیەم: (بَيْت) بکەوێتە لای چەپەی لەو کاتەی بە دەورەیدا ئەسوڕێتەوەو، ئەبی بەرەو پێشەوە بڕوا.

چوارەم: سوڕانەکەی لە (اَلْحَجَرُالأسْوَد)، واتە: لە بەردە ڕەشەکەوە دەست پێبکا. جا بزانە: دەست لێدانو ماچ کردنی(الْحَجَرُالأسْوَد) واجب نیە، بەڵکو سوننەتە، جا ئەگەر نەگونجا ماچی بکا، با هەر لە دوورەوە ئامازەی بۆ بکا: بە دەستی ڕاستە، یان چەپە.

پێنجەم: حەفت جار بە دەورەی(بَيْت)دا بسوڕێتەوەو کۆتایی لە (اَلْحَجَرُالأسْوَد) بێ، جا ئەگەر لە حەفت جار زیاتری کرد، زیانی نیە، بەڵام ئەگەر کەمتر بوو، تەوافی دروست نیە.

شەشەم: سوڕانەوەی لە دەرەوەی (بَيْت) بێ، واتە: ئەگەر چووە ناو (حِجْرِ إسْماعيل)و بە لای ئەو لادا چووە دەرەوە، تەوافی دروست نیە.

حەفتەم: هەر حەفت خولەکەی بە مەبەستی تەواف کردن بێ، واتە: ئەگەر بە شوێن کەسێکا ڕایکرد، یان لە بەر کەسێك ڕایکرد، ئەوە تەوافی دروست نیە.

هەشتەم: تەواف کردن لە ناو (اَلْمَسْجِدُالْحَرامْ)دا بێ.

﴿ئاگاداری﴾: لە بەر تێکەڵبوونی ئافرەت و پیاو لە کاتی تەوافدا وا باشە پیاو و ئافرەت بە مەزهەبی ئیمامی(حنفي) ڕەفتار بکەن: کە دەستنوێژی پیاو و ئافرەت لێك ناشکێ، بەڵام ئەبی دەستنوێژەکەیان وەك مەزهەبی(حنفي) بشۆن، واتە: چوارێکیسەر مەسح بکەن.

﴿ئاگاداریەکیتر﴾: ئەگەر لە کاتی(طَوافُ الإفاضَة) ئافرەت تووشی حەیز بوو و مەترسی هەبوو هاوڕێکانی بەجێی بهێڵن، ئەو ئافرەتە بۆی دروستە بە فەرموودەکەیتری ئیمامی (شافعي) ڕەفتار بکا، کە فەرموویەتی: لە ماوەی حەیزدا ئەو ڕۆژانەی ئافرەت خوێنی نایێ، بە خاوێنی ئەژمێردرێن، کەواتە: لەو ڕۆژانەی ئافرەت خوێنی نایێ، بۆی دروستە خۆی

وَالسَّعْيُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ.
وَأَرْكَانُ الْعُمْرَةِ أَرْبَعَةٌ:

بشۆرێو تەوافەکە بکاو بۆی بە تەواوی ڕوکن ئەژمێردرێ، ئەم فەرموودەیە لەگەڵ مەزهەبی ئیمام (مالك)و ئیمام (احمد) تێك ئەکاتەوەو (إبن حجر) لە (حاشيةالإيضاح)دا باسی کردوە. هەروەها دروستە: ئافرەت حەیزیخۆی بە دەرمان پێش بخا، یان دوای بخا، لە بەر تەواف کردن.

## ٤-﴿ سەعی سەفا و مەروە ﴾

(وَالسَّعْيُ) ڕوکنیچوارەمیحەج: (سەعی)یە، واتە: هاتوچۆکردنە (بَيْنَ الصَّفا وَالْمَرْوَة) لە نێوان سەفا و مەروەدا ﴿قالَ النَّبِيُّ ﷺ: ياأَيُّها النّاسُ إسْعَوْا فَإِنَّ اللهَ تَعالَى كَتَبَ عَلَيْكُمُ السَّعْيَ﴾ رواه الدارقطني والبيهقي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵکینە هاتوچۆی نێوان سەفاو مەروە بکەن، چونکە خوای گەورە لە سەر ئێوەی واجب کردوە.

**پێویستیەکانیسەفا و مەروە:** سێ مەرجن: یەکەم: لە سەفاوە دەست بە هاتوچۆ بکا. دووەم: حەفت جار هاتوچۆ بکا، جا ڕۆیشتنی لە سەفا تا ئەکاتە مەروە جارێکە، وە گەڕانەوەی لە مەروە بۆ سەفا جارێکیترە. سێیەم: سەفا و مەروە لە دوای تەواف کردن بکرێن، جا ئەگەر لەدوای(طَوافُ الْقُدُومِ) سەفا و مەروەی کردبو، پێی ناوێ کە لە عەرەفە گەڕاوە لە دوای(طَوافُ الإفاضَةِ) دووبارەی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر نەیکردبو، ئەوە واجبە: کە لە عەرەفە گەڕاوەو (طَوافُ الإفاضَةِ)ی کرد، سەفا و مەروە بکا، **ئینجا بزانە:** دەستنوێژو لەش پاکی مەرج نیە بۆ سەفا و مەروە.

## ٥-﴿ سەر تاشین ﴾

ڕوکنیپێنجەمیحەج: تاشینی، یان بڕینی هەندێ لە مووەکانی سەری خۆیەتی: بە گوێزان، یان بە مەقەس، جا ئەندازەی واجب بە لای کەمی سێ دانە مووە، بەڵام تاشین بۆ پیاو و بڕین بە مەقەس بۆ ئافرەت سوننەتە.

**ئینجا بزانە:** ئەوە لە سەر فەرموودەیەکی بەهێزی ئیمامی(شافعي) بە ڕوکن داندراوە ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: لَمَّا رَمَى رَسُولُ اللهِ ﷺ الْجَمْرَةَ وَنَحَرَ نُسُكَهُ ناوَلَ الْحَلاَّقَ رَأْسَهُ فَحَلَقَهُ فَأَعْطاهُ أَباطَلْحَةَ فَوَزَّعَهُ بَيْنَ النَّاسِ﴾ رواه‌الشيخان، کە پێغەمبەر ﷺ شەیتانی ڕەجم کردو قوربانیی کوشتەوە، سەریخۆی خستە بەردەستیسەرتاشو سەری تاشیو مووەکانی دانە (أبوطلحة)، ئەویش دابەشی کردن بە ناو سەحابەکاندا تاکو بۆ بەرەکەت لە لایان بن.

## ﴿ باسی ڕوکنەکانی عومرە ﴾

(وَأَرْكانُ الْعُمْرَةِ) ڕوکنەکانی عومرە (أَرْبَعَةٌ) چوار ڕوکنن، ئەگەر یەکێکیان نەکا، عومرەکەی دروست نابێ:

اَلإِحْــرَامُ، وَالطَّــوَافُ، وَالسَّــعْيُ، وَالْحَلْــقُ أَوِ التَّقْصِــيرُ فِــي أَحَــدِ الْقَــوْلَيْنِ. وَواجِباتُ الْحَجِّ -غَيْرُ الأَرْكانِ- ثَلاثَةُ أَشْياءَ: اَلإِحْرَامُ مِنَ الْمِيقاتِ،

---

یەکەم: (اَلإِحْرَامُ) ئیحرام بەستنە لەگەڵ نیەتی ئیحرام، واتـە: بڵـێ: (نیـەتم وەیـە عـومرە بکەمو ئیحـرامم بەست بـە عـومرە بـۆ خـوای گـەورە). وە ئەگـەر لـەجیاتی کەسـێکیتر عومرەی ئەکرد، بڵێ: (نیەتم وەیە لەجیاتیفلان عومرە بکەمو ئیحرامم بەست بە عـومرە لەجیاتیفلان بۆ خوای گەورە).

دووەم: (وَالطَّــوَافُ) تــــەواف کردنــــە بــــەو جــــۆرەی باسمــــان کــــرد.

سـێیەم: (وَالسَّـعْيُ) هاتوچـۆی نێـوان سـەفا و مەروەیـە بـەو جـۆرەی باسمـان کـرد.

چوارەم: (وَالْحَلْقُ) سەرتاشینە (أَوِالتَّقْصِيرُ) یان بڕینی مـووی سـەرە بـە مەقـەس (فِـي أَحَـدِ الْقَـوْلَيْنِ) لـە یـەکێك لـە دوو فـەرموودەکانی ئیمـامی (شـافعي)، فەرموودەکـەیتریش ئـەڵێ: سەرتاشین ڕوکن نیە، بەڵکو واجبە.

﴿ئاگاداری﴾: ئیحرامبەستن بە عومرە کاتی دیارکراوی نیە، واتە: لە هەر دوانزە مانگەکانی ساڵ لە هەر ڕۆژێکدا بێ، دروستە نیەتی ئیحرامی عومرە بێنێ و عومرە بکا.

هەروەها وەستانی عەرەفە ڕوکن نیە لە عومرەدا، واجبیش نیە، سوننەتیش نیـە، کەوابوو: تەنها بەو چوار ڕوکنانە عومرە تەواو ئەبێو پێویستی بە هیچیتر نیە.

﴿ باسی واجبەکانی حەج ﴾

(وَواجِباتُ الْحَجِّ) واجبەکانی حەج (غَيْرُ الأَرْكانِ) جگە لەو ڕوکنانەی باسمان کـردن (ثَلاثَـةُ أَشْياءَ) سێ واجبن -بەڵام بە فەرموودەکانیبەهێزتر: پێـنجن- ئەگـەر یـەکێکیانی نـەکرد، حەجی دروست ئەبێ، بەڵام خوێنینەکردنی لە سەر واجب ئەبێ:

واجبییەکـەم: (اَلإِحْـرَامُ مِـنَ الْمِيقـاتِ) ئیحرامبەسـتنە لـەو شـوێنەی کـە دیـارکراوە بـۆ ئیحرامبەستن ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذاالْحُلَيْفَــةِ، وَلأَهْلِ الشَّامِ اَلْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ الْمَنازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، وَقالَ: هُنَّ لَهُمْ وَلِكُلِّ آتٍ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ مِمَّنْ أَرادَالْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمَنْ كانَ دُونَ ذلِكَ فَمِــنْ حَيْثُ أَنْشأَ حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ﴾ رواەالشیخان، پێغەمبەر ﷺ شوێنی ئیحرامبەستنی دیاری کرد: بۆ دانیشتووانی مەدینە (ذاالحلیفة)، واتـە: (بیریعـەلی) دیـاری کـرد، وە بـۆ دانیشتووانی شام (جُحْفَة)ی دیاری کرد، وە بۆ دانیشتووانی نەجد (قرن المنازل)ی دیـاری کرد، وە بۆ دانیشتووانی یەمەن (يَلَمْلَم)ی دیاری کرد، ( لە حەدیسێکیتردا فەرموویـەتی: بۆ دانیشتووانی ڕۆژهەڵات (ذاتُ عِرق)ی دیاری کرد)، وە فەرمووی: ئـەو شـوێنانە شـوێنی ئیحرام بەستنن بۆ دانیشتووانی ئـەو شـوێنانەی باسمـان کردنو بـۆ ئـەو کەسـانەی بـەو ڕێگایانەدا دێن بۆ حەجو عومرە، وە هەر کەسێك لەو شوێنانەی ئیحرام مـاڵی نـزیکتر بـوو

له (مكة)، ئەوە هەر لە ماڵی خۆی ئیحرام ئەبەستێ، کەوابوو: دانیشتووانی (مكة) هەر لە ناو (مكة)دا ئیحرام ئەبەستن.
ئینجا بزانە: شوێنی ئیحرامی(عومرە)ش هەر ئەو شوێنەیە کە بۆ ئیحرامی حەج دیاری کراوە، بەڵام ئەگەر کەسێك لە ناو شاری (مكة)دا بوو و ویستی عومرە بکا، واجبە بۆ ئیحرامبەستنیعومرە بچێتە دەرەوەی سنووری حەرەمی(مكة)، جا لە مەدا جیاوازی خەڵکی (مكة)و بێگانە نیە.
﴿ئاگاداری﴾: هەر کەسێك بە سەر یەکێك لەو شوێنانەدا رابردو مەبەستی عومرە، یان حەجی هەبوو، بەڵام ئیحرامی لە شوێنەکەوە نەبەست، ئەوە واجبە بگەڕێتەوە ئەو شوێنە، جا ئەگەر نەگەڕاوە، خوێنی لە سەر واجب ئەبێ، وەك لەمەودوا باسی ئەکەین، جا بەمە بۆمان روون بۆوە: کە ئیحرامبەستن روکنە، بەڵام ئیحرامبەستن لە شوێنی دیارکراودا واجبە.
## ﴿ رەجمی شەیتانەکان ﴾
واجبی دووەمیحەج: (وَرَمْيُ الْجِمارِ الثَّلاثِ) بەردبارانکردنی هەرسێك شەیتانەکانە لە رۆژی جەژنی قوربان و دوو رۆژەکەی دوای جەژندا، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ هەر کەسێك لەو دوو رۆژانەی دوای جەژندا شەیتانەکانی بەردباران کردن و ویستی (مِنَی) بەجێ بهێڵێ، ئەوە دروستە و گوناهی ناگاتێ، وە هەر کەسێك ویستی بۆ رۆژی سێیەمیدوای جەژن بمێنێتەوە، ئەمەش دروستەو گوناهی ناگاتێ.
ئینجا بزانە: بەردبارانکردنی شەیتانەکان بەم جۆرەیداهاتووە:
یەکەم: لە رۆژی جەژنی قورباندا تەنها شەیتانی گەورە بەردباران بکا، کە ئەکەوێتە لای (مكة)ی پیرۆز، سنووری (مِنَى)ش لەوێ کۆتایی دێ.
﴿ئاگاداری﴾: کاتی ئەو بەردبارانەی رۆژیجەژن و کاتی(طَوافُ الإِفاضَةِ) و کاتی سەرتاشین، گشتی لە نیوەی شەوی جەژنەوە دەست پێئەکا، ئینجا کە حاجی دووانی لەو سێیانە کردن، لە ژێر ئیحرام دەرئەچێ و بەرگی خۆی ئەکاتەوە بەر، وە هەر کامیان لەو سێیانە پێش ئەویتریان بکرێ زیانی نیە ﴿عَنْ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: ما سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاأُخِّرَ؟ إِلاَّ قالَ: إِفْعَلْ وَلاحَرَجَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە رۆژی جەژندا لە هەر شتێك: کە پێش خرابێ، یان دواخرابێ، پرسیاریان لێکردبایە؟ هەر ئەیفەرموو: بیکەو گوناه نیە.

دووەم: لـە ڕۆژی یەکـەم‌و دووەمـی دوای جـەژن واجبـە: هەرسـێك شـەیتانەکان بـە ڕیـز بەردباران بکرێن.
سـێیەم: یەکـەم جـار دەسـت بـە شـەیتانی بچـوك بکـا-کـە لـە لای عەرەفەیـە- ئینجـا شەیتانی ناوەنجی، ئینجا شەیتانی گەورە.
چوارەم: هەر شەیتانێك حەفت بەردی لێبدرێ، یەکە یەکە، جا ئەگـەر هـەر حـەفتی بـە کۆمەڵ لێدان، ئەوە هەر بە یەك جار ئەژمێردرێ.
پێنجەم: بـەردەکان بکەونـە نـاو حەوزەکـە، بـەڵام مانـەوەیان مـەرج نیـە، واتـە: ئەگـەر بەردەکەی لێداو کەوتە خوارەوە، ئەوە دروستە.
﴿ئاگاداریەکی‌تر﴾: کاتی بـەردبارانکردنی هەرسـێك شـەیتانەکان لـە نیوەڕۆی‌ڕۆژەکـانی دوای جەژنـەوە دەسـت پـێ‌ئـەکاو تـا ڕۆژئـاوابوونی ڕۆژی سـێیەمی دوای‌جـەژن هـەر بەردەوامە، واتە: دروستە بەردبارانی ڕۆژی جەژن و ڕۆژەکانی‌دوای جەژن دوابخا بۆ ڕۆژی دووەمی، یان سێیەمی دوای‌جەژن.
ئینجا بزانە: بە لەبیرکردنی لێدانی بـەردێك: مستە گـەنمێك واجبـە، بـە دوو بـەرد: دوو مست، بە سێ بەرد، یان زیاتر: (فِدْیَة)ی تەواو واجب دەبێ.
دیسان بزانە: هەر کەسێك لەو ماوەیەدا نەخۆش بوو، بە جۆرێکی وەها: نەیئـەتوانی بـە پێوە نوێژ بکاو تا کۆتایی ڕۆژی سێیەمی‌دوای جەژن چاوەڕوانی چاکبوونەوەی نەئـەکرا، یان ئەوەندە پەککەوتوو بوو: بە پێوە خۆی ڕانەئەگرت، ئەوانە بۆیـان دروسـتە وەکیلێـك بگـرن کـە شـەیتانەکانیان لـەجیاتی بـەردباران بکـا، بـەڵام ئـەبێ وەکیلەکـە بـەردبارانی شەیتانەکان بۆ خۆی تەواو بکا، ئینجا لەجیاتی نەخۆشەکەش بەردباران بکا.
هەروەها بزانـە: ئیمامی (اَلْحَرَمَیْن)و ئیمامی (اَلرَّافِعِي) فەرموویانە: دروستە پێش نیوەڕۆ شـەیتانەکان بـەردباران بکـرێن. کـەوابوو: نـەخۆش‌و پەککـەوتوو ئـەتوانن سـود لـەم فەرموودەیە وەربگرن.
واجبی سێیەمی حەج: (وَالْحَلْقُ) سەرتاشینە، بـەڵام گوتمـان:-بـە فەرموودەی‌بـەهێزتر- ئەمەیان ڕوکنی حەج‌و عومرەیە.
واجبی‌چوارەمی‌حەج: شەو مانەوەیە لە (مُزْدَلِفَة)، کە لە عەرەفـە گەڕایـەوە، واتـە: لـە دوای نیوەشـەوی‌جەژن تـا بـەیانی مـاوەی هەیـە، واجبەکـەش بـە ماوەیـەکی کـەم پێـك دێ، سوننەتە-ئەگەر ڕێبوار بێ- نوێژی مەغریب‌و عیشا لەوێ بە (جمع التَّأْخِیر) بکـا، هـەروەها سوننەتە بەردەکانی ڕەجمی شەیتان لەوێ هەڵبگرێتەوە بۆ هەرسێك ڕۆژەکان.
واجبی پێنجەمی حـەج: شـەو مانەوەیـە لـە (مِنَـی)، واتـە: شـەوی یەکـەم‌و دووەمـی دوای جەژن واجبە لە (مِنَـی) بمێنێتـەوەو بـە ڕۆژیـش شـەیتانەکان بـەردباران بکـا وەکـو

گوتمان، ئینجا كە ڕۆژی دووەمی دوای جەژن شەیتانەكانی بەردباران كردن، بۆی دروستە (مِنَى) بەجێ بهێڵێو بچێتەوە(مكة)، بەڵام ئەگەر تا ڕۆژئاوابوون نەڕۆیشت، واجبە شەوی سێیەمیش هەر لە (مِنَى) بمێنێتەوەو ڕۆژی سێیەمیش شەیتانەكان بەردباران بكا.

## ﴿ باسی سوننەتەكانی حەج ﴾

(وَسُنَنُ الْحَجِّ) سوننەتەكانی حەج (سَبْعٌ) حەفتن: (اَلإِفْرادُ) یەكەم: ئیفرادە (وَهُوَ) مانای ئیفراد ئەمەیە: (تَقْدِيمُ الْحَجِّ عَلَى الْعُمْرَةِ) حەج لە پێش عومرەدا بكا، واتە: بە تەنها نیەتی حەج بێنێو ڕوكنو واجبەكانی حەج تەواو بكا –وەكو گوتمان– ئینجا بچێتە دەرەوەی سنوری حەرەم، لەوێ ئیحرام بە عومرە ببەستێو عومرەش بكا، جا ئەمەیان شێوەی یەكەمی حەج كردنەو لە شێوەی دووەم و سێیەم خێرترە.

شێوەی دووەم: پێی دەگوترێ: (قِرانٌ)، واتە: ئیحرام بە حەجو عومرە ببەستێ بە یەكەوە، جا تەنها واجب و ڕوكنەكانی حەج بكا، ئەوە حەجو عومرەی –وێكڕا– بۆ ئەنووسرێن.

شێوەی سێیەم: پێی دەگوترێ: (تَمَتُّع)، واتە: ئیحرام بە عومرە ببەستێو عومرە بكا، ئینجا هەر لە (مكة)–لە دوای تەواوبوونی عومرە– ئیحرام بە حەج ببەستێو حەج بكا.

﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَداعِ: مَنْ أَرادَ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَرادَ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ فَلْيُهِلَّ، وَمَنْ أَرادَ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهِلَّ، وَأَهَلَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْحَجِّ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا فەرمووی: هەر كەسێك ئەیەوێ ئیحرام بە حەجو عومرە–وێكڕا–ببەستێ با وا بكا، وە هەر كەسێك ئەیەوێ ئیحرام–تەنها– بە حەج ببەستێ با وا بكا، هەر كەسێك ئەیەوێ ئیحرام–تەنها– بە عومرە ببەستێ با وا بكا، پێغەمبەرﷺ ئیحرامی‌خۆی–تەنها–بە حەج بەست.

﴿ئاگاداری﴾: لە شێوەی (قِرانٌ و تَمَتُّع)دا حاجی خوێنی ئەكەوێتە سەر، بەو مەرجەی – بۆ ئیحرامی‌حەج– نەگەڕێتەوە بۆ شوێنی ئیحرام بەستنو ماڵیشی هەشتا كیلۆمەتر لە سنوری حەرەم دوورتر بێ.

(وَالتَّلْبِيَةُ) سوننەتی دووەم: گوتنی (لَبَّيْكَ)یە، بەردەوام تا لە ژێر ئیحرامدایە، واتە: بڵێ: ﴿لَبَّيْكَ اللّٰهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاشَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاشَرِيكَ لَكَ﴾ رواه‌الشيخان.

(وَطَوافُ الْقُدُومِ) سوننەتی سێیەم: (طَوافُ الْقُدُومِ)ە، واتە: هەر كە گەیشتە (مكة)ی پیرۆز، كەلوپەلی‌خۆی دابەزرێنێ، ئەگەر برسی بوو نان بخوا، ئەگەر كاتی نوێژ بوو نوێژ بكا، ئینجا یەكسەر دەست بە تەواف بكا، ئەم تەوافە سەلامكردنە لە ماڵی خوا، وە مەرجەكانی وەك (طَوافُ الإِفاضَةِ)یە: كە باسمان كردن.

وَالْمَبِيتُ بِمُزْدَلِفَةَ، وَرَكْعَتَا الطَّوافِ، وَالْمَبِيتُ بِمِنَى، وَطَوافُ الْوَدَاعِ.
وَيَتَجَرَّدُ الرَّجُلُ عِنْدَ الْإِحْرامِ عَنِ الْمَخِيطِ، وَيَلْبَسُ إِزَاراً وَرِداءً أَبْيَضَيْنِ.

---

(وَالْمَبِيتُ بِمُزْدَلِفَةَ) چوارەم: شەو مانەوەیە لە (مزدلفة)، بەلام بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەمە واجبە، ئەگەر نەیکا خوێنی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك باسمان کرد.

(وَرَكْعَتَاالطَّوافِ) سوننەتی پێنجەم: دوو ڕەکعەت نوێژە بە نیەتی (سوننەتی‌تەواف) لە دوای تەواوکردنی هەر تەواف کردنێك، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ لە لای مەقامی ئیبراهیمﷺ نوێژ بکەن.

(وَالْمَبِيتُ بِمِنًى) شەشەم: شەو مانەوەیە لە (منی)، بەلام بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەمە واجبە، ئەگەر نەیکا خوێنی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك باسمان کرد.

(وَطَوافُ الْوَدَاعِ) حەفتەم: (طَوافُ الْوَدَاع)ە، واتە: تەوافی ماڵئاوایی، بەلام بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەو تەوافە واجبە، ئەگەر نەیکا خوێنی لە سەر واجب دەبێ ﴿عَنِ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ أُمِرَالنَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ إِلاَّ أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الْمَرْأَةِالْحَائِضِ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەرﷺ فەرمانی داوەتە خەڵك: کە کۆتایی پەیمانیان بە ماڵی‌خوا بێنن-واتە: کە لە (مکة) دەرئەچن تەواف بکەن-بەلام ئەو ئافرەتەی کە لە حەیزدایە ئیزنی دراوە بە بێ‌تەواف کردن (مکة) بەجێ بهێڵێ. جا ئەگەر لە دوای ئەو تەوافە زۆر مایەوە، ئەبی دووبارەی بکاتەوە.

**﴿ بەرگی ئیحرام ﴾**

(وَيَتَجَرَّدُ الرَّجُلُ) واجبە پیاو خۆی ڕووت بکاتەوەو جلەکانی خۆی دابنێ (عِنْدَالْإِحْرامِ) هەر لەو کاتەوە کە نیەتی ئیحرام دێنێ (عَنِ الْمَخِيطِ) لە هەر جلێکی دوورابێ، یان چنرابێ‌و دەورە لە لاشەی بدا، واتە: نابێ بیکاتە بەر (وَيَلْبَسُ) دەبەر خۆی ئەکا (إِزَاراً) پەشتەماڵێك لە ناوك بەرەوخوار (وَرِداءً) وە پەشتەماڵێکی‌تریش بۆ سەر پشت‌و شانەکانی (أَبْيَضَيْنِ) سوننەتە هەردوو پەشتەماڵەکان سپی بن، بەلام ئافرەت هەر بە جلەکانی خۆیەوە ئیحرام ئەبەستێ.

﴿پاشکۆ﴾: سوننەتە ئاوی (زمزم) بخواتەوە ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: شَرِبَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ زَمْزَمَ مِنْ دَلْوٍ مِنْها وَهُوَ قائِمٌ﴾ رواه‌مسلم، پێغەمبەرﷺ بە پێوە بە دۆڵچەیەك ئاوی زەمزەمی خواردەوە. هەروەها سوننەتە بۆ هەموو کەسێك-حاجی بێ، یان هەر ڕێبوار بێ-ئاوی (زمزم) لەگەڵ خۆیا بێنێتەوە بۆ وڵاتی خۆی ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يَحْمِلُهُ﴾ رواه‌الترمذي، پێغەمبەرﷺ ئاوی زەمزەمی ئەهێنا لەگەڵ خۆیا بۆ (مَدينة).

(فَصلٌ) وَيَحْرُمُ عَلَىالْمُحْرِمِ عَشَرَةُ أَشياءَ: لُبْسُ الْمَخيطِ، وَتَغطِيَةُ الرَّأْسِ مِنَ الرَّجُــلِ، وَالْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ مِنَ الْمَرْأَةِ، وَتَرْجِيلُ الشَّعَرِ بالدُّهْنِ،

---

## ﴿ فَصلٌ: لە باسی ئەو شتانەی حەرامن لە كاتی ئیحرامدا ﴾

(وَيَحْرُمُ) حەرامە (عَلَى الْمُحْرِمِ) لە سەر ئەو كەسەی لە ژێر ئیحرامدایە (عَشَرَةُ أَشْياءَ) دە شت:

یەكەم: (لُبْسُ الْمَخِيطِ) حەرامە لە سەر پیاو كردنەبەری جلێك كە دوورابێ، یان چنرا بێ‌و بە خۆی دەورە لە ئەندامەكانی پیاو بدا، یان گرێی بدا، جا بۆ هەموو ئەندامەكانی ئەوە حەرامە ﴿عَنْ إِبْنِ عُمَرَرَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ سُئِلَ النَّبيُّﷺ: ما يَلْبسُ الْمُحْرِمُ مِــنَ الثِّيــابِ؟ قالَ: لاَ يَلْبَسِ الْقُمُصَ وَلاَ الْعَمَائِمَ وَلاَ السَّراويلاتِ وَلاَ الْبَرانِسَ وَلاَ الْخِفَــافَ﴾ رواه الشيخان، دەربارەی ئەو پیاوەی لە ژێر ئیحرامە، پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێكرا؟ لە وەڵامدا فەرمووی: نابێ هیچ جۆرە كراسێك دەبەر بكا، نابێ مێزەر بنێتە سەری، نابێ هیچ جۆرە دەرپێیەك بكاتە بەری، نابێ هیچ جۆرە كەوایەك بكاتە بەری، نابێ هیچ جۆرە گۆرەوییەك بكاتە پێی.

﴿ئاگاداری﴾: بزانە: دروستە تەكبەند لە پشتی ببەستێ‌و جانتا بكاتە شانی، یان بە شتێكی وەكو دۆخین پەشتەماڵەكەی خوارەوە قایم بكا، هەروەها لیچكەكانی پەشتەماڵەكەی سەرەوەش بخاتە ناو تەكبەندەكە، یان دۆخینەكە.

هەروەها بزانە: ئەو جۆرە كەوشەی پیاو ئەیكاتە پێی، واجبە: سەرەپەنجەكانی‌و پاشنەی پێی بە دەرەوە بێ، ئەگەر نا: فیدیەی ئەكەوێتە سەر.

هەروەها بزانە: ئەو شتانەی رابردوو هەمووی لە سەر پیاو حەرامن نەك لە سەر ئافرەت.

دووەم: (وَتَغْطِيَةُ الرَّأْسِ) داپۆشینی سەر حەرامە (مِنَ الرَّجُلِ) بۆ پیاو ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّــاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ النَّبيُّﷺ فِي الْمُحْرِمِ الَّذی مَاتَ: كَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ وَلاَ تُمسُّــوهُ بِطِيــبٍ وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيامَةِ مُلَبِّياً﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەرﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی لە ژێر ئیحرامدا مردبو، فەرمووی: هەر لە ناو پەشتەماڵەكانی خۆیدا كفنی بكەن‌و بۆنی خۆشی لێمەدەن‌و سەری دامەپۆشن، چونكە رۆژی قیامەت هەر بە شێوەی ئیحرامەوە زیندوو ئەكرێتەوە.

سێیەم: (وَالْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ مِنَ الْمَرْأَةِ) داپۆشینی رووخسارو لەپە دەستی ئافرەت لە كاتی ئیحرامدا حەرامە ﴿عَنْ ابنِ عُمرَرَضِيَ اللهُ عَنهُما: نَهَى‌النَّبيُّﷺ النِّساءَ فِــي إِحْــرامِهِنَّ: عَــنِ الْقُفَّازَيْنِ وَالنِّقابِ﴾ رواه‌اصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی كردوە لە ئافرەتان: لە كاتی ئیحرامدا دەستەوانە بكەنە دەستیان‌و رووی خۆیان داپۆشن.

چوارەم: (وَتَرْجِيلُ الشَّعَرِ) شانەكردنی مووی سەرو رووخسارە (بِالدُّهْنِ) بە هەر جۆرە رۆنێكی هەبێ، بۆ پیاو و ئافرەت ﴿قالَ النَّبيُّﷺ: اَلْحاجُّ اَلشَّعِثُ التَّفِلُ﴾ رواه الترمذي

وَحَلْقُهُ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفارِ، وَالطِّيبُ، وَقَتْلُ الصَّيْدِ،

وابن ماجه، پێغەمبەرﷺفەرمووی: حاجی لە کاتی ئیحرامدا موو قرژو تۆزاوی‌و چڵکنە.
واتە: بە چەورکردنی‌موو ئەو شێوەیە لا ئەچێ، بەڵام ئەگەر لە سەرو ڕووخسار بەو لاوە هەر ئەندامێکی‌تری چەور بکا، یان بە بۆن مووەکانی شانە بکا، ئەوە (فدیة)ی ناکەوێتە سەر، ئەگەر مووەکان هەڵنەکەنێ.
**پێنجەم:** (وَحَلْقُهُ) حەرامە بۆ پیاو و ئافرەت: تاشینی موو، یان سوتاندنی، یان هەڵکەندنی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَاتَحْلِقُوا رُؤُوسَكُمْ﴾ لە کاتی ئیحرامدا سەری خۆتان مەتاشن.
**شەشەم:** (وَتَقْلِيمُ الأَظْفارِ) حەرامە بۆ پیاو و ئافرەت: نینۆك کردن، چونکە ئەمەش وەکو موو تاشین جوانی‌ی تێدایە.
جا بزانە: بە لابردنی یەك موو، یان یەك نینۆك: مستە گەنمێك (فِدية)ی ئەکەوێتە سەر، هەروەها بە لابردنی دوو موو، یان دوو نینۆك: دوو مستی ئەکەونە سەر، بەڵام ئەگەر سێ موو، یان سێ نینۆك، یان زیاتری لابرد: ئەوە (فِدْية)ی گەورەی ئەکەوێتە سەر: کە باسی ئەکەین.
**حەفتەم:** (وَالطِّيبُ) حەرامە بۆ پیاو و ئافرەت: خۆیان بۆنخۆش بکەن لە ماوی ئیحرامدا ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَاللهُعَنهُما: قَالَ النَّبِيُّﷺ: وَلَاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيابِ مــا مَسَّــهُ زَعْفَــرانٌ أَوْ وَرْسٌ﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئەو جۆرە جلانە مەکەنە بەر: کە زەعفەرانی پێوە بێ، یان وەرسی لێدرابێ: کە بۆنی خۆشە.
**هەشتەم:** (وَقَتْلُ الصَّيْدِ) حەرامە لە سەر پیاو و ئافرەت لە ماوەی ئیحرامدا: ڕاوکردنی باڵندەو ئاژەڵی‌کێوی=چۆلەواری کە گۆشتی بخورێ، خوای‌گەورە فەرموویەتی: ﴿حُــرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُالْبَرِّ مَادُمْتُمْ حُرُمًا﴾ حەرام کراوە لە ئێوە: ڕاوکردنی نێچیری چۆلەواری لەو ماوەی لە ژێر ئیحرامدان.
کەوا بوو: باڵندەو ئاژەڵی خۆماڵی: وەك مریشك‌و بزن‌و مەڕ، حەرام نیە بیکوژێتەوە، هەروەها کوشتنی مارو دووپشك‌و مشك‌و قەلە بەڵەك‌و کۆلارەو سەگی‌هار خێرە لە هەموو شوێن‌و کاتێکدا.
﴿**ئاگاداریەکی زۆر گرنگ**﴾: هەر کەسێك کە ئەچێتە حەج، لە ماڵەوە گیانلەبەرێکی ڕاوکراوی هەبێ: وەکو قەتێ، یان کەو، یان ئاسك، یان هەر شتێکی‌تر، ئەبێ بیفرۆشێ، یان بیداتە کەسێکی‌تر، یان بەرەڵڵای بکا، هەرچەند کەبیش بوبێ، چونکە لە کاتی ئیحرامبەستن‌و بەو لاوە ئەگەر هیچی لێبێ، وای لە سەر ئەژمێردرێ کە بە خۆی کوشتویەتی‌و تۆڵەی ئەکەوێتە سەر.

وَعَقْدُ النِّكاحِ، وَالْوَطْءُ، وَالْمُباشَرَةُ بِشَهْوَةٍ. وَفي جَميعِ ذَلِكَ الْفِدْيَةُ إلاّ عَقْدَ النِّكاحِ فَإنَّهُ لايَنْعَقِدُ، وَلاَ يُفْسِدُهُ إلاّ الْوَطْءُ فِي الْفَرْجِ، وَلاَ يَخْرُجُ مِنْهُ بِالْفَسادِ، وَمَنْ فاتَهُ الْوُقُوفُ بِعَرَفَةَ تَحَلَّلَ بِعَمَلِ عُمْرَةٍ،

---

نۆیەم: (وَعَقْدُ النِّكاحِ) حەرامە لە ماوەی ئیحرامدا مارەبڕینی ژن ﴿عَنْ أَبانَ ﷺ: قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لايَنْكِحُ الْمُحْرِمُ وَلاَ يُنْكِحُ وَلاَ يَخْطُبُ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دروست نیە لە ماوەی ئیحرامدا ژن لە خۆی مارە بکا، یان لە کەسێکی‌تری مارە بکا، یان داخوازی‌ی بکا.

دەیەم: (وَالْوَطْءُ) حەرامە جیماع کردن (وَالْمُباشَرَةُ) هەروەها حەرامە دەستبازی‌کردن لەگەڵ ئافرەت، یان لەشی خۆی (بِشَهْوَةٍ) بە شێوەیەکی وا: کە دەماری هەڵبستێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾ نابێ لە حەجدا جیماع‌و دەستبازی بکرێ‌و نابێ قسەی ناشیرین‌و ناڕێك‌و ململانە بکرێ.

(وَفي جَميعِ ذَلِكَ) لەو هەموو شتانەی کە حەرامن‌و باسمان کردن (الْفِدْيَةُ) واجبە (فدیة) بدا ئەگەر یەکێکیانی کرد (إلاّ عَقْدَالنِّكاحِ) تەنها بە مارەبڕینی‌ئافرەت (فدیة) واجب نابێ؟ (فَإنَّهُ) چونکە ئەو مارەبڕینە (لاَيَنْعَقِدُ) هەر دانامەزرێ، واتە: مارەبڕینەکە نایێ‌و ئافرەتەکە حەڵاڵ نابێ.

(وَلاَ يُفْسِدُهُ) لەو هەموو شتانە هیچیان حەج‌و عومرە بەتاڵ ناکەن (إلاّ الْوَطْءُ فِي الْفَرْجِ) تەنها جیماعکردن حەج‌و عومرە بەتاڵ ئەکاتەوە، بەو مەرجەی بزانن: جیماع حەرامەو بە خۆشی خۆیان بێ‌و بە قەسدی بێ، ئینجا بەم جیماع کردنە حەجی پیاو و ئافرەت بە تاڵ ئەبێتەوە، بەڵام (فدیة)ی‌جیماعەکە هەر لە سەر پیاوەکەیە.

(وَلاَ يَخْرُجُ مِنْهُ) دروست نیە لە ژێر ئیحرام دەرچێ (بِالْفَسادِ) لە بەر ئەوەی حەج، یان عومرەی بەتاڵ بووە، بەڵکو ئەبی هەر تەواویان بکاو ساڵێکی‌تریش قەزایان بکاتەوە ﴿سُئِلَ عُمَرُ وَعَلِيٌّ وَأَبوهُرَيْرَةَ ﷺ: عَنْ رَجُلٍ أَصابَ أَهْلَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ بِالْحَجِّ؟ فَقالُوا: يَنْفُذانِ لِوَجْهِهِما حَتَّى يُتِمَّا حَجَّهُما ثُمَّ عَلَيْهِما حَجٌّ قابِلٌ وَالْهَدْيُ﴾ رواەالإمام مالك، پرسیار لە ئیمامی(عمر)و ئیمامی(علی)و (أبوهریرة) کرا: ئەگەر پیاوێك جیماع لەگەڵ ئافرەتەکەی خۆی بکا لە ماوەی ئیحرامدا؟ لە وەڵامدا فەرموویان: ئەبی حەجەکەیان تەواو بکەن، ساڵێکی‌تریش ئەو حەجە قەزا بکەنەوەو فیدیەش بدەن.

### ﴿ لەدەستچوونی عەرەفات ﴾

(وَمَنْ فاتَهُ الْوُقُوفُ بِعَرَفَةَ) هەر کەسێك فریای وەستانی‌عەرەفە نەکەوت‌و لەدەستی چوو (تَحَلَّلَ) واجبە خۆی لە ژێر ئیحرامی حەج دەر بیبا (بِعَمَلِ عُمْرَةٍ) بە کردنی ڕوکنەکانی

وَعَلَيْهِ الْقَضاءُ وَالْهَدْيُ، وَمَنْ تَرَكَ رُكْناً لَمْ يَحِلَّ مِنْ إِحْرامِهِ حَتَّى يَأْتِيَ بِهِ، وَمَنْ تَرَكَ وَاجِباً لَزِمَهُ الدَّمُ، وَمَنْ تَرَكَ سُنَّةً لَمْ يَلْزَمْهُ بِتَرْكِها شَيْءٌ.

---

عومرە، (واتە: تەواف ئەکاو سەفاو مەڕوە ئەکاو سەری ئەتاشێ، نیەتی دەرچوونیش لە ئیحرام لەگەڵ ئەو سێیانە ئەهێنێ)، ئیتر نایەوێ شەیتان ڕەجم بکاو لە(منی) بمێنێتەوە، بەڵام (وَعَلَيْهِ الْقَضاءُ) واجبە ئەو حەجە قەزا بکاتەوە، جا حەجەکە واجب بێ، یان سوننەت بێ (وَالْهَدْيُ) هەروەها واجبە (فدْيَة)ش بدا لە ساڵێکیتردا کە چوو حەجەکەی قەزا بکاتەوە:

﴿جاءَ هَبَّارُ بنُ الأَسوَدِ إلى عُمَرَ فَقالَ: أَخطَأْنا الْعِدَّةَ: كُنَّا نُرَى أَنَّ هَذا الْيَوْمَ يَوْمُ عَرَفَةَ؟ فَقالَ عُمَرُ: طُفْ أَنْتَ وَمَنْ مَعَكَ وَانْحَرُوا ثُمَّ احْلِقُوا وَارْجِعُوا فَإِذا كانَ قابِلٌ فَحُجُّوا وَأَهْدُوا فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيامُ ثَلاثَةٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذا رَجَعَ﴾ رواه الإمام مالك، (هَبَّار) بە ئیمامی(عمر)ی گوت: ئێمە بە هەڵەدا چووین: وامانزانی ئیمڕۆ عەرەفەیە، کە چی ئیمڕۆ جەژنە؟ ئیمامی عومەر فەرمووی: بڕۆن تەواف بکەنو سەرتان بتاشنو بگەڕێنەوە، ئینجا ساڵێکیتر حەجەکەتان قەزا بکەنەوەو ئەگەر دەستتان کەوت ئاژەڵێک لە (فدْيَة) سەربڕن، جا ئەگەر نەبو، سێ ڕۆژان لە حەج بەڕۆژوو بنو حەفت ڕۆژیتریش کە گەڕانەوە بەڕۆژوو بن.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کەسێك ئیحرامی بەست، بەڵام قەدەغەیان کرد، یان ڕێگەیان لێگرت کە حەج، یان عومرە بکا، ئەوە بۆی دروستە ئیحرامی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە بەم جۆرە: هەر لەو شوێنەی قەدەغە کراوە، نیەتی دەرچوون لە ئیحرام دێنێو هەر بەو نیەتەش مەڕێك، یان بزنێك سەر ئەبڕێ، ئینجا سەری خۆی ئەتاشێ، جا ئەگەر مەڕی دەست نەکەوت، بە ئەندازەی نرخی مەڕەکە گەنم، یان جۆ بۆ هەژارانی ئەو شوێنە ئەکڕێ، ئەگەر نەبیو، ئەو کاتە بە ئەندازەی مستەکانیدانەوێڵەکە بەڕۆژوو ئەبێ، جا ئەگەر حەجەکەی سوننەت بوو، واجب نیە قەزای بکاتەوە.

## ﴿ باسی جیاوازی ڕوکنو واجب ﴾

(وَمَنْ تَرَكَ رُكْناً) هەر کەسێك ڕوکنێك نەکا لە ڕوکنەکانی عومرە، یان لە ڕوکنەکانی حەج، جگە لە وەستانی عەرەفە (لَمْ يَحِلَّ مِنْ إِحْرامِهِ) ئەوە لە ژێر ئیحرام دەرناچێو حەجو عومرەی تەواو نابێ (حَتَّى يَأْتِيَ بِهِ) تا ئەو ڕوکنە ئەکا.

(وَمَنْ تَرَكَ وَاجِباً) هەر کەسێك واجبێك لە واجبەکانیحەج، یان عومرە نەکا (لَزِمَهُ دَمٌ) خوێنی ئەکەوێتە سەر، بەڵام حەجو عومرەی دروستەو لە ئیحرامدا نامێنێتەوە.

(وَمَنْ تَرَكَ سُنَّةً) هەر کەسێك سوننەتێك نەکا لە سوننەتەکانی حەج، یان عومرە (لَمْ يَلْزَمْهُ بِتَرْكِها شَيْءٌ) هیچی ناکەوێتە سەر، واتە: بە نەکردنی سوننەت: نە فیدیەی ئەکەوێتە سەر، نە گوناهبار ئەبێ.

(فَصْلٌ) وَالدِّماءُ الْوَاجِبَةُ فِي الإِحْرامِ خَمْسَةُ أَشْياءَ، أَحَدُهَا: اَلدَّمُ الْوَاجِبُ بِتَرْكِ نُسُكٍ، وَهُوَ عَلَى التَّرْتِيبِ: شاةٌ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيامُ عَشَرَةِ أَيَّامٍ ثَلاثَةٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذا رَجَعَ إِلَىٰ أَهْلِهِ. وَالثَّانِي: اَلدَّمُ الْوَاجِبُ بِالْحَلْقِ وَالتَّرَفُّهِ، وَهُوَ عَلَى التَّخْيِيرِ: شاةٌ، أَوْ صَوْمُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ،

---

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی خوێن‌و (فِدْيَة)ى حه‌ج ﴾

(وَالدِّماءُ الْوَاجِبَةُ) ئه‌و خوێنانه‌ى واجب ئه‌بن (فِي الإِحْرامِ) له‌ ماوه‌ى ئیحرامدا (خَمْسَةُ أَشْياءَ) پێنج جۆرن:

(أَحَدُها) خوێنى یه‌كه‌میان: (اَلدَّمُ الْوَاجِبُ) ئه‌و خوێنه‌یه‌ كه‌ واجب ئه‌بێ (بِتَرْكِ نُسُكٍ) به‌ نه‌كردنى فه‌رمان پێكراوێك: وه‌ك به‌ردبارانى‌شه‌یتانه‌كان، مانه‌وه‌ى‌شه‌وێ له‌(مِنَى)و له‌(مُزْدَلِفَة)، ئیحرامبه‌ستن له‌ شوێنى دیاركراو، (طَوافُ الْوَداع)، له‌ده‌ستچوونى وه‌ستانى عه‌ره‌فه‌، پێشخستنى عومره‌ له‌ سه‌ر حه‌ج، پێكه‌وه‌كردنى حه‌ج‌و عومره‌.

(وَهُوَ) ئه‌و خوێنه‌ى ئه‌یكه‌وێته‌ سه‌ر به‌ هۆى ئه‌و هه‌شتانه‌ى باسمان كردن (عَلَى التَّرْتِيبِ) ریزى بۆ داندراوه‌و دیاركراوه‌ به‌م جۆره‌:

(شاةٌ) ئه‌بى مه‌ڕێك، یان بزنێك بكوژێته‌وه‌و گۆشته‌كه‌ى بداته‌ هه‌ژاره‌كانى حه‌ره‌مى‌مه‌ككه‌ (فَإِنْ لَمْ يَجِدْ) جا ئه‌گه‌ر مه‌ڕ، یان بزنى ده‌ست نه‌كه‌وت، یان تواناى نه‌بو بیكڕێ (فَصِيامُ عَشَرَةِ أَيَّامٍ) واجبه‌ ده‌ ڕۆژان به‌ڕۆژوو ببێ: (ثَلاثَةٍ فِي الْحَجِّ) سێ ڕۆژان له‌و ده‌یانه‌ له‌ حه‌جدا به‌ڕۆژوو ده‌بێ‌و (وَسَبْعَةٍ إِذا رَجَعَ إِلَىٰ أَهْلِهِ) حه‌فت ڕۆژه‌كه‌ى‌تریش كاتێ گه‌یشته‌وه‌ ماڵه‌وه‌، خواى گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تى: ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ هه‌ر كه‌سێك مه‌ڕى ده‌ست نه‌كه‌وت، ئه‌بى سێ ڕۆژان له‌ حه‌جداو حه‌فت ڕۆژانیش له‌ ماڵه‌وه‌ به‌ڕۆژوو ببێ، ئه‌وه‌ ده‌ى ته‌واوه‌.

﴿ئاگادارى﴾: له‌م خوێنه‌ى به‌شى یه‌كه‌مدا جیاوازى نیه‌ له‌ نێوان كه‌سێك: كه‌ به‌ ویستى خۆى فه‌رمان پێكراوه‌كه‌ى نه‌كردبێ، یان به‌ نه‌زانى نه‌یكردبێ.

(وَالثَّانِي) خوێنى‌دووه‌م: (اَلدَّمُ الْوَاجِبُ) ئه‌و خوێنه‌یه‌ كه‌ واجب ئه‌بى (بِالْحَلْقِ) به‌ تاشین، واته‌: لابردنى سێ موو، یان زیاتر، یان سێ نینۆك، یان زیاتر (وَالتَّرَفُّهِ) هه‌روه‌ها ئه‌و خوێنه‌ واجب ئه‌بێ به‌ دڵفراوان كردن: به‌ هۆى جل ده‌به‌ركردن‌و خۆ چه‌وركردن‌و سه‌ر داپۆشین‌و خۆ بۆنخۆشكردن‌و له‌ش پیسبوون: به‌ هۆى ده‌ستبازى‌كردن له‌گه‌ڵ له‌شى خۆى، یان له‌گه‌ڵ ئافره‌ت.

(وَهُوَ) خوێنى ئه‌و جۆره‌ شتانه‌ى باسمان كردن (عَلَى التَّخْيِيرِ) به‌ گوێره‌ى دڵى خوێنده‌ره‌كه‌یه‌، به‌ڵام دیاركراوه‌: (شاةٌ) ئه‌بى مه‌ڕێك، یان بزنێك سه‌ر ببڕێ‌و گۆشته‌كه‌ى بداته‌ هه‌ژارانى حه‌ره‌مى مه‌ككه‌ (أَوْ صَوْمُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ) یان سێ ڕۆژان به‌ڕۆژوو ببێ، جا له‌ هه‌ر شوێنێ

أَوِالتَّصَدُّقُ بِثَلاَثَةِ آصُعٍ عَلَى سِتَّةِ مَساكِينَ. وَالثَّالِثُ: اَلدَّمُ الْواجِبُ بِالْإِحْصارِ، فَيَتَحَلَّلُ وَيُهْدِى شاةً. وَالرَّابِعُ: اَلدَّمُ الْواجِبُ بِقَتْلِ الصَّيْدِ، وَهُوَ عَلَى التَّخْيِيرِ: إِنْ كانَ الصَّيْدُ مِمَّا لَهُ مِثْلٌ أَخْرَجَ الْمِثْلَ مِنَ النَّعَمِ،

---

بەڕۆژوو بێ دروستە (أَوِالتَّصَدُّقُ بِثَلاَثَةِ آصُعٍ) یان سێ ساع دانەوێڵە بکاتە خێر (عَلَى سِتَّةِ مَساكِينَ) بداتە شەش گەدا، یان شەش هەژار لە حەرەمی مەککەی پیرۆزدا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ هەر کەسێك نەخۆش بوو و جلی کردە بەر، یان لە بەر ناچاری سەری تاشی، با (فِدْيَة) بدا بەم جۆرە: یان بەڕۆژوو بێ، یان خێر بکا، یان مەڕ سەر ببڕێ.

﴿ئاگاداری﴾: لە لابردنی موو و نینۆك جیاوازی نیە لە نێوان زاناو نەزانو لە نێوان ئەو کەسەی لەبیری بێ لە ژێر ئیحرامە، یان لەبیری نەبێ، واتە: ئەوانە (فِدْيَة)یان ئەکەوێتە سەر، بەڵام لە جلوبەرگو خۆ بۆنخۆش کردنو خۆ چەورکردنو دەستبازی کردن، (فِدْيَة) تەنها لە سەر ئەو کەسە واجب ئەبێ: کە بزانێ حەرامەو بە قەسدی وا بکاو بزانێ لە ژێر ئیحرامە، کەواتە: ئەگەر کەسێك لەبیری بچێ، یان نەزانێ حەرامە، یان بە هەڵە ئەوانەی کرد، ئەوە (فِدْيَة)ی ناکەوێتە سەر.

(وَالثَّالِثُ) خوێنی‌سێیەم: (اَلدَّمُ الْواجِبُ) ئەو خوێنەیە کە واجب ئەبێ (بِالْإِحْصارِ) بە قەدەغەکردن لە تەواوکردنی حەج، یان عومرە (فَيَتَحَلَّلُ) ئەو قەدەغەکراوە ئیحرامی‌خۆی هەڵئەوەشێنێتەوەو (وَيُهْدِى شاةً) مەڕێك، یان بزنێك ئەکاتە (فِدْيَة)و هەر لەو شوێنەی کە لێی قەدەغەکراوە-بە نیەتی‌خۆحەلاڵکردن- ئەیکوژێتەوەو ئەیداتە هەژارەکانی ئەو شوێنە، ئینجا -لە دوای(فِدْيَة)کە- سەری خۆی ئەتاشێ بە نیەتی لە ئیحرام دەرچوون.

جا ئەگەر مەڕ، یان بزنی دەست نەکەوت، بە ئەندازەی نرخی‌مەڕەکە دانەوێڵە ئەکڕێو ئەیداتە هەژارەکانی‌ئەو شوێنە، جا ئەگەر دەستی نەکەوت، یان پارەی نەبو بیکڕێ، ئەوە لەجیاتی هەر مستێکی ئەو دانەوێڵەیە ڕۆژێك بەڕۆژوو ئەبێ لە هەر شوێنێك کە خۆی پێی خۆش بێ، خوای‌گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَااسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەگەر قەدەغە کران لە تەواوکردنی حەج، یان عومرە، هەر (فِدْيَة)کی ڕێك کەوت بیدەن.

(وَالرَّابِعُ) خوێنی‌چوارەم: (اَلدَّمُ الْواجِبُ) ئەو خوێنەیە کە واجب ئەبێ (بِقَتْلِ الصَّيْدِ) بە هۆی کوشتنی نێچیر، یان بڕینی درەختی حەرەمی (مَكَّة)ی پیرۆز (وَهُوَ) ئەو خوێنەی بەو دوو شتانە واجب ئەبێ (عَلَىالتَّخْيِيرِ) بە گوێرەی‌دڵی خوێندەرەکەیە:

(إِنْ كانَ الصَّيْدُ) ئەگەر نێچیرەکە (مِمَّا لَهُ مِثْلٌ) لەو جۆرە بوو: کە وێنەی هەبوو لە ئاژەڵی خۆماڵی، ئەوە (أَخْرَجَ الْمِثْلَ مِنَ النَّعَمِ) وێنەی ئەو نێچیرە ئەکاتە (فِدْيَة) لە بزنو

أَوْ قَوَّمَهُ وَاشْتَرَى بِقِيمَتِهِ طَعاماً وَتَصَدَّقَ بِهِ، أَوْ صامَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْماً، وَإِنْ كانَ الصَّيْدُ مِمَّا لاَمِثْلَ لَهُ أَخْرَجَ بِقِيمَتِهِ طَعاماً أَوْ صامَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْماً. وَالْخامِسُ: اَلدَّمُ الْواجِبُ بِالْوَطْءِ وَهُوَ عَلَى التَّرْتِيبِ: بَدَنَةٌ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْها فَبَقَرَةٌ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْها فَسَبْعٌ مِنَ الْغَنَمِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْها قَوَّمَ الْبَدَنَةَ وَاشْتَرَى بِقِيمَتِها طَعاماً وَتَصَدَّقَ بِهِ،

---

مەڕو ووشترو گاجووت، واتە: لە تۆڵەی نەعامە: ووشترێك سەر ئەبڕێ، لە تۆڵەی كەرە كێویو چێڵیكێوی: گاجووتێك سەر ئەبڕێ، لە تۆڵەی ئاسك، یان كۆتر: مەڕێك ئەكوژێتەوە (أَوْ قَوَّمَهُ) یان ئەو وێنەیە لە ئاژەڵی خۆماڵی ئەفرسێنێ (وَاشْتَرَى بِقِيمَتِهِ طَعاماً) بە ئەندازەی نرخی ئەو ئاژەڵە دانەوێڵە ئەكڕێو (وَتَصَدَّقَ بِهِ) ئەو دانەوێڵەیە ئەكاتە خێرو دابەشی ئەكا بە سەر هەژارانی حەرەمی(مَكَّة)دا (أَوْ صامَ) یان بەڕۆژوو دەبێ (عَنْ كُلِّ مُدٍّ) لەجیاتی هەر مستێكی ئەو دانەوێڵەیە (يَوْماً) ڕۆژێك.

(وَإِنْ كانَ الصَّيْدُ) بەلاّم ئەگەر ئەو نێچیرە (مِمَّا لاَ مِثْلَ لَهُ) وێنەی نەبو لە ئاژەڵی خۆماڵی: وەكو هەموو باڵندەیەك، جگە لە كۆتر (أَخْرَجَ بِقِيمَتِهِ طَعاماً) ئەوە بە ئەندازەی نرخی ئەو نێچیرە دانەوێڵە ئەداتە هەژارانی حەرەمی مەككە (أَوْ صامَ) یان بەڕۆژوو ئەبێ (عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْماً) لەجیاتی هەر مستێك ڕۆژێك، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا لاَتَقْتُلُواالصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنْكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَاقَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَاعَدْلٍ مِنْكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا﴾ ئەی خاوەن باوەڕان نێچیر مەكوژن لە ماوەی ئیحرامدا، هەر كەسێك لە ئێوە نێچیر بكوژێ بە قەسدی، سزای ئەكەوێتە سەر: ئەبێ بە وێنەی ئەو نێچیرە ئاژەڵێكی خۆماڵی لە (فِدْيَة) بدا، لە حەرەمی(مكة)دا بیكوژێتەوەو هەر لە وێشدا بەشی بكا، دوو كەسیدادپەروەر وێنەی ئەو نێچیرە دیاری ئەكەن، یان بە ئەندازەی نرخی ئەو ئاژەڵە ئەبێ دانەوێڵە دەرخواردی هەژاران بدا لە (مكة)دا، یان بە ژمارەی مستەكانی ئەو دانەوێڵەیە بەڕۆژوو ببێ.

(وَالْخامِسُ) خوێنی پێنجەم: (اَلدَّمُ الْواجِبُ) ئەو خوێنەیە كە واجب ئەبێ (بِالْوَطْءِ) بە جیماع كردن (وَهُوَ) ئەو خوێنە (عَلَى التَّرْتِيبِ) بەم ڕیزەیە:

(بَدَنَةٌ) یەكەم جار ووشترێكی پێنج ساڵە ئەكوژێتەوە (فَإِنْ لَمْ يَجِدْها) جا ئەگەر ووشتری دەست نەكەوت (فَبَقَرَةٌ) مانگایەكی دوو ساڵە ئەكوژێتەوە (فَإِنْ لَمْ يَجِدْها) جا ئەگەر مانگای دەست نەكەوت (فَسَبْعٌ مِنَ الْغَنَمِ) حەفت مەڕ، یان حەفت بزن ئەكوژێتەوە (فَإِنْ لَمْ يَجِدْها) جا ئەگەر مەڕو بزنی دەست نەكەوتن (قَوَّمَ الْبَدَنَةَ) ووشترەكە ئەفرسێنێ (وَاشْتَرَى بِقِيمَتِها طَعاماً) بە ئەندازەی نرخی ووشترەكە دانەوێڵە ئەكڕێ (وَتَصَدَّقَ بِهِ) ئەو گۆشتەو دانەوێڵەیە ئەكاتە خێر بە سەر هەژارانی حەرەمی(مَكَّة)دا

فَإِنْ لَمْ يَجِدْهُ صَامَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْماً، وَلاَ يُجْزِئُهُ الْهَـدْيُ وَلاَ الإِطْعَـامُ إِلاَّ بِـالْحَرَمِ، وَيُجْزِئُهُ أَنْ يَصُومَ حَيْثُ شاءَ، وَلاَ يَجُوزُ قَتْلُ صَيْدِ الْحَرَمِ وَلاَ قَطْعُ شَجَرِهِ، وَالْمُحِـلُّ وَالْمُحْرِمُ فِي ذَلِكَ سَوَاءٌ.

---

(فَإِنْ لَمْ يَجِدْهُ) جا ئەگەر دانەوێڵەی دەست نەکەوت، یان پارەی نـەبو (صامَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْمـاً) لـەجیاتی هـەر مستێك ڕۆژێـك بـەڕۆژو ئـەبی، بەڵگـە: فتـوای ئیمـامی(عمـر)و ئیمامی(علی)یە، كە باسمان كرد.

(وَلاَ يُجْزِئُهُ الْهَدْيُ) ئەو ئاژەڵەی لـە(فدْيـة)و خوێنیحـەج ئـەدرێ، یـان بـە دیـاری هێناویـە بۆ(مكّة)، دروست نیە لە هیچ شوێنێكدا بیكوژێتەوە تەنها لە حەرەمی(مكّة)دا نەبێ.

(وَلاَ الإِطْعَامُ) هەروەها بەشكردنی گۆشتو دانەوێڵەی(فدْية)ش لە هیچ شوێنێكدا دروست نیە (إِلاَّ بِالْحَرَمِ) تەنها لە حەرەمی(مكّة)دا نەبێ، واتە: گۆشتەكەو دانەوێڵەكە، ئەبی بدرێتـە ئـەو گەدلو هەژارانە كـە لـە حـەرەمی (مكّـة)دانـە، هەرچـەند خـەڵكی (مكّـة)ش نـەبن، كـەوابوو: دروست نیە بە خۆی هیچی لێبخواو، نابێ بیداتە دەوڵەمەندان.

﴿ئـاگاداری﴾: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: تەنها سەربڕینی(فدْية)كە لە (مكة)دا واجبە، بەڵام بەشكردنی گۆشتەكەو دانەوێڵەكە لە هەموو شوێنێكدا دروستە.

(وَيُجْزِئُهُ) دروستە (أَنْ يَصُومَ) بەڕۆژووبێ لە جیاتی (فدْية)ی حەج (حَيْـثُ شـاءَ) لـە هـەر شوێنێك كە بەخۆی پێی خۆشە.

(وَلاَ يَجُوزُ) دروستە نیە (قَتْلُ صَيْدِ الْحَرَمِ) كوشتنی نێچیری حەرەمی(مكّة)، هەرچەند لە ژێر ئیحرامیش نەبێ (وَلاَ قَطْعُ شَجَرِهِ) هەروەها دروست نیە بـڕینو هەڵكەنـدنی درەخـتو گیـای حەرەمی مەككە (وَالْمُحِلُّ) ئەو كەسـەی كـە حەڵاڵـەو لـە ژێـر ئیحرامـدا نیـە (وَالْمُحْرِمُ) ئـەو كەسەی لە ژێر ئیحرامە (فِي ذَلِكَ) لەو قەدەغەكردنەدا (سَوَاءٌ) یەكسانن، واتە: وەكو یەكتری تۆڵەیان ئەكەوێتە سەر، هەروەها جیاوازی نیە لە نێوان كەسێك: كـە نـەزانێ حەرامـە، یـان لەبیری چوبێ، یان بە هەڵە بیكا، ئەوانە كشتیان (فدية)یان ئەكەوێتە سەر.

﴿ئـاگاداری﴾: خواردنی گۆشتی نێچیری(مكّة)و ئەو نێچیرەی حـاجی لـە مـاوەی ئیحرامـدا كوشتویەتی، یان سەری بڕیوە–وەكو گۆشتی مردار–حەرامە، هەر چەند نێچیرەكەش هی (مكّة) نەبێ، بەڵام نێچیری دەریا بە هەموو شێوەیەك حەڵاڵـە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَـالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَلا وَإِنَّها مِنْ ساعَتِي هَذِه حَرامٌ لاَ يُخْتَبَطُ شَوْكُها وَلا يُعْضَدُ شَجَرُها وَلا يُنَفَّرُ صَيْدُها﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئاگادار بن: لە ئێستا بەولاوە لـە (مكّـة)ی پیرۆزدا حەرامە: درەختو گیا ببڕدرێو نێچیرەكانی ئازار بدرێنو بفرێندرێن.

ئینجا بزانـە: ئەگـەر یـەك دانـەگیا هەڵكـەنێنێ: ئـەبی نرخەكـەی بـدا، بـەو مەرجـەی ئادەمیزاد ئەو گیایەی نەچاندبێ، واتە: هەر بەخۆی ڕوابـێ، بـەڵام لـە درەختـدا جیـاوازی

نیه: ئادەمیزاد بیچێنێ، یان هەر بە خۆی ڕوابێ، ئەبی تۆڵەی هەر بدا، واتە: لە تۆڵەی درەختێکی گەورە مانگایەك ئەکوژێتەوە، لە تۆڵەی درەختێکی بچووك مەڕێك ئەکوژێتەوە، وە لە تۆڵەی درەختی زۆر بچوك نرخەکەی ئەدا.

﴿پاشکۆ﴾: هەر کەسێك نیازی حەج کردنی هەبوو: ئەبی تۆبەیەکی بە ڕاستی بکاو ماف خەڵك بداتەوەو گەردەنی خۆی بە خەڵك ئازاد بکا، ئامۆژگاری ماڵو منداڵی بکا، وە لەگەڵ هاوڕێکانی باش بێو ململانەو ڕووگرژییان لەگەڵ نەکا، ئینجا لەو ماوەیەی کە لە(مَكَّة)ی پیرۆزە زۆر عومرە بکا، جگە لە عومرەی واجب ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ﷛: قَـالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِما بَيْنَهُما﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەم عومرەیە تا عومرەکەیتر، ئەبێتە داپۆشەری تاوانەکانی نێوانیان. هەروەها: با زۆر تەواف بکا، جگە لە تەوافەکانی حەجو عومرە.

هەروەها سوننەتە بۆ ئەو کەسەی لە (مَكَّة)یە، یان لە مەدینەیە—ئایا حاجی بێ، یان تەنها ڕێبوار بێ—کاتی خۆی بە فیڕۆ نەداو خۆی خەریك بکا: بە ئیعتیکافو قورئان خوێندنو نوێژکردن لە مزگەوتی(الْحَرام)، واتە: لە ماڵیخواو، هەم لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ:

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ﷛: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: صَلاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاةٍ فِيما سِواهُ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرامَ﴾ رواه الشيخان، وزاد ابن ماجه: ﴿وَصَلاةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرامِ أَفْضَلُ مِـنْ مِأَةِ أَلْفِ صَلاةٍ فِيماسِواهُ﴾ وزاد البيهقي: ﴿صَلاةٌ فِي الْبَيْتِ الْمُقَدَّسِ خَمْسُـمِأَةِ صَـلاةٍ﴾ پێغەمبەر ﷺ فەمووی: یەك نوێژ لە مزگەوتی من—لە (مَدينَة)—خێری زۆرترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانیتر، جگە لە مزگەوتی(الْحَرامْ)—واتە: ماڵیخوا لە(مَكَّة)— وە یەك نوێژ لە مزگەوتی ماڵیخوادا— لە (مَكَّة)— خێری زۆرترە لە سەد هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانیتر، وە یەك نوێژ لە مزگەوتی(بَيْتُ الْمُقَدَّسْ)دا—لە(فَلَسْطِين)—خێری پێنج سەد نوێژی هەیە.

## ﴿ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ ﴾

سوننەتە بۆ هەموو کەسێك:—حاجی بێ، یان نا— زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بکا، بەم شێوەیە: یەکەم جار دوو ڕەکعەت (تَحِيَّةُ الْمَسْجِد) بکا لە مزگەوتەکەی سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، ئینجا بڕواتە لای گۆڕی پێغەمبەر ﷺ پشت لە قیبلە بکاو ڕوو بکاتە سەری پێغەمبەر ﷺو سەلام بکاو بڵێ: (اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ الله).

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ﷛: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: ما مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ﴾ رواه ابوداود والبيهقي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك سەلامم لێبکا، خوای گەورە گوفتارم ئەداتەوە تا وەڵامی سەلامەکەی ئەدەمەوە.

(كِـتابُ الْـبُيُوعِ وَغَـيْرِهـا مِـنَ الْـمُـعـامَـلاَتِ)

اَلْـبُـيُـوعُ ثَـلاَثَـةُ أَشْـياءَ: بَـيْـعُ عَـيْـنٍ مُـشـاهَـدَةٍ فَـجـائِـزٌ،

ئینجا نەختێك بەرەو ڕاستە ئەڕواو سەلام لە ئیمامی(ابوبكر) ئەكا، ئینجا نەختێكیتر بەرەو ڕاستە ئەڕواو سەلام لە ئیمامی(عمر) ئەكا، چونكە هەردووكیان بەم شێوەیە لەو ژوورەدا نێژراون كە پێغەمبەری ﷺ تێدا نێژراوە.

ئینجا دێتەوە شوێنەكەی خۆیو ڕوو لە قیبلە ئەكاو دەست بە دوعا ئەكا، بەلام ئاگاداربە: دەست لێدانو ماچكردنی تاقو دیوار دروست نیە.

ئینجا بزانە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ حَجَّ للهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَومِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ﴾ رواه‌الشيخان، هەر كەسێك بۆ خوا حەج بكاو قسەو كاری بێدینی نەكا، كە دەگەڕێتەوە، وەك ئەو ڕۆژەی لە دایكیبووە لە گوناه پاك ئەبێتەوە.

كەوابوو: ئەی موسوڵمان: كە لە حەج گەڕایەوە، تۆبەی خۆت ڕابگرەو شەرم لە خوا بكەو مەگەڕێوە سەر بێدینیو گوناهباری، وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وآلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ.

* * *

﴿ كِتابُ الْبُيُوعِ: ئەم پەڕتووكە باسی كڕینو فرۆشتن ئەكا ﴾

(وَغَيْرِها مِنَ الْمُعامَلاَتِ) جگە لە كڕینو فرۆشتن باسی شتیتریش ئەكا: لەو ئاڵوگۆڕیانەی لە نێوان خەڵكدا هەنە. خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ خوای گەورە كڕینو فرۆشتنی حەلاڵ كردوەو ڕیبای حەرام كردوە.

ئینجا بزانە: مەرجە بۆ حەلاڵبوونی كڕینو فرۆشتن: گفتوگۆیەك لە نێوان كڕیارو فرۆشیاردا ڕوو بدا كە ببێتە نیشانەی ڕازیبوونیان ﴿قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّمَا الْبَيْعُ عَنْ تَراضٍ﴾ رواه‌ابن ماجه وابن حبان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كڕینو فرۆشتنێك هەبێ، ئەبی لە رووی ڕەزامەندیەوە بێ.

بەلام كۆمەڵێك لە زانایانی ئاینی ئەو فەرموودەیان هەڵبژاردوە كە ئەفەرموێ: ئەو گفتوگۆیە پێویست نیە ئەگەر نیشانەیەكیتری ڕازیبوون هەبێ، بە تایبەتی لەو شتانەی نرخیان كەمە.

(الْبُيُوعُ) كڕینو فرۆشتنەكان (ثَلاَثَةُ أَشْياءَ) سێ جۆریان هەنە: یەكەم: (بَيْعُ عَيْنٍ) فرۆشتنی شتێكە (مُشاهَدَةٍ) كە لە بەرچاوی كڕیارو فرۆشیار بێ، یان لەمەو پێش دیتبیان (فَجائِزٌ) ئەو جۆرە كڕینو فرۆشتنە دروستە، وەك بڵێ: ئەم پەڕتووكەم بە تۆ فرۆشت بە یەك دینار. ئەویش بڵێ: وا لێتم كڕی بە دینارێك، یان بڵێ: ڕازیمە.

وَبَيْعُ شَيْءٍ مَوْصُوف فِي الذِّمَّةِ فَجائِزٌ إِذا وُجِدَت الصِّفَةُ عَلَى مَا وُصِفَ بِهِ، وَبَيْعُ عَيْنٍ غائِبَة لَمْ تُشاهَدْ فَلاَ يَجُوزُ. وَيَصِحُّ بَيْعُ كُلِّ طاهِرٍ، مُنْتَفَعٍ بِهِ، مَمْلُوكٍ، وَلاَ يَصِحُّ بَيْعُ عَيْنٍ نَجِسَةٍ وَلاَ مَا لاَ مَنْفَعَةَ فِيه.

---

دووهم: (وَبَيْعُ شَيْءٍ) فرۆشتنی شتێکە (مَوْصُوفٍ فِي الذِّمَّةِ) کە لەبەر چاو نەبێ، بەڵام ناوونیشانی بڵێ کە چەندەو چۆنە (فَجائِزٌ) ئەم جۆرە فرۆشتنەش دروستە (إِذا وُجِدَتِ الصِّفَةُ) بەو مەرجەی شێوەو چەندو چۆنیەتی بێتەجێ (عَلَى مَا وُصِفَ بِهِ) بەو جۆرەی باسی کردوە بە بێ کەموکوڕی-ئەوە پێی ئەگوترێ: (سَلَم)، لەمەودوا باسی ئەکەین- وەك بڵێ: پێنج کیلۆ گەنمی قەندەهاریم بە تۆ فرۆشت بە پێنج دینار. کڕیارەکەش بڵێ: ڕازیمە، یان لێتم کڕی، ئەمەش پارەکەت برۆ بۆم بێنە.

سێیەم: (وَبَيْعُ عَيْنٍ) فرۆشتنی شتێکە (غائِبَةٍ) کە لە بەرچاو نەبێ و (لَمْ تُشاهَدْ) لە پێشدا کڕیارو فرۆشیار نەیاندیتبێ (فَلاَ يَجُوزُ) ئەم فرۆشتنە دروست نیە، چونکە فریودانی تێدایە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: نَهى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: هەر فرۆشتنێك فریودانی تێدا بێ.

کەوابوو: پێویستە پارەکەو فرۆشراوەکە-لە کاتی کڕین‌وفرۆشتندا، یان لە پێشدا بەگوێرەی لێوەشانەوە- بدیترێن‌و چەندو چۆنیان بزاندرێ.

## ﴿ باسی مەرجەکانی پارەو فرۆشراو ﴾

یەکەم: پاك بێ (وَيَصِحُّ) دروستە (بَيْعُ كُلِّ طاهِرٍ) فرۆشتنی هەر شتێکی کە لە بنچینەی خۆی پاك بێ. دووەم: (مُنْتَفَعٍ بِهِ) سودی لێوەربگیرێ، هەرچەندە سودەکەش لەمەودوا بێ: وەك بێچووە هێسترێك کە تازە بوبێ. سێیەم: (مَمْلُوكٍ) مولکی خۆی بێ. چوارەم: توانای هەبێ بیداتە دەست کڕیارەکە. پێنجەم: بزانێ فرۆشراوەکە چی‌یە.

جا ئەگەر ئەو مەرجانە-لە پارەو فرۆشراوەکەدا-نەبون، فرۆشتنەکە دروست نیە. کەوابوو: (وَلاَ يَصِحُّ) دروست نیە (بَيْعُ عَيْنٍ) فرۆشتنی شتێك (نَجِسَةٍ) کە لە بنچینەی خۆی پیس بێ، چونکە مەرجی‌یەکەمی لێنەهاتۆتە جێ: وەك سەگو بەرازو مردارو قشپلو ڕیخ‌و جیقنەو هەر شتێکی پاك نەکرێتەوە ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالْأَصْنامِ﴾ رواەالشيخان، خواو پێغەمبەرﷺ حەرامیان کردوە: فرۆشتنی شەرابو مردارو بەرازو بت.

(وَلاَ ما) هەروەها دروست نیە فرۆشتنی شتێك (لا مَنْفَعَةَ فِيهِ) کە سودی نەبێ: وەك مارو دوپشك‌و قالۆچەو مێش‌و مەگەز ﴿عَنِ الْمُغِيرَةِ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ اللهَ كَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقالَ وَكَثْرَةَ السُّؤالِ وَإِضاعَةَ الْمالِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوای گەورە

پـێی ناخۆشـه بڵـێن: گـوتراو گـوتی، پـێی ناخۆشـه زۆر پرسـیاری بێسـود بکـەن، پێی ناخۆشه ماڵ به فیرۆ بدەن.

هەروەها دروست نیه: فرۆشتنی ماڵیکەسێکیتر، کڕینی شتێك بۆ کەسێکیتر، به بێئیزن ﴿عَنْ عَمْرو بن شُعَيب: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَلا بَيْـعَ إلاَّ فِيمـا تَمْلِـكُ﴾ رواهابوداود والترمذی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فرۆشتنی ئەوشته دروست نیه که هی خۆت نیه.

بەڵام له فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعي)دا دروسته: مـاڵی کەسێکیتر بفرۆشـێ، یـان شتێکی بۆ بکڕێ، ئەگەر پێی ڕازی بوو ﴿عَنْ عُرْوَةالْبارِقِيِّ: أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ أَعْطـاهُ ديناراً يَشْتَرِي بِهِ شاةً، فَاشْتَرى بِهِ شاتَيْنِ، فَباعَ أَحَدَهُما بِدِينارٍ، فَأَتاهُ بِشـاةٍ وَدينـارٍ، فَدَعا لَهُ بِالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ﴾رواه الترمذی، پێغەمبەر ﷺ دینـارێکی دایه (عروةالبـارقي) بـۆ ئەوەی مـەڕێکی پـێبکڕێ، ئـەویش دوو مـەڕی بـەو دینـارە کـڕین، ئینجـا یـەکێکیانی بـە دینارێـك فرۆشـتەوەو مەڕەکەیتریشـی لەگـەڵ دینارەکـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ هێنـاوە، پێغەمبەر ﷺ دوعای بەرەکەتی بۆ کرد.

هەروەها دروست نیه شتێك بفرۆشـی کـه توانـای نـەبێ بیداتـه دەست کڕیارەکە: وەکو شتێك که لێی گوم بوبێ، یان زەوت کرابێ، بەڵام ئەگەر کڕیارەکه توانـای وەرگرتنـەوەی هەبێ، فرۆشتنەکە دروسته.

﴿ مەرجەکانی کڕیارو فرۆشیار ﴾

نابێ هیچیان شێت بن، نابێ منداڵ بن، نابێ کڕینەکە، یان فرۆشتنەکە به زۆرلێکردن بـێ، کەوابوو: کڕینو فرۆشتن لەگەڵ منداڵو شـێت دروسـت نیـە، بـەڵام لـە مەزهـەبی ئیمـامی (حنفی)دا: کـڕینو فرۆشـتن لەگـەڵ منـداڵ دروسـته، بـەو مەرجـەی سەرپەرشـتکارەکەی ئیزنی بداو قازانجو زەرەریش بزانێ.

﴿ فَصْلٌ: له باسی (رِبا) ﴾

ڕیبا ئەمەیە: زێڕ و زیـو و پـارەو پـول، یـان خواردەمـەنی بـە یـەکتری بگۆڕدرێتـەوە بـە پێچەوانەی یاسای ئیسلام.

جا بزانه: ڕیبا له گوناهه گەورەکانه ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مَسْعُودٍ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلرِّبا ثَلاثَةٌ وَسَبْعُونَ باباً أَيْسَرُها مِثْـلُ أَنْ يَـنْكِحَ الرَّجُـلُ أُمَّـهُ﴾ رواهابـن ماجـه والحـاکم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕیبا حەفتاو سێ بەشه، له هەموویان کـەم گونـاهتر: وەکـو زینـا کردنی پیاوە لەگەڵ دایکیخۆی.

(وَالرِّبا) ڕیبا حەرامە (فِي الذَّهَبِ) له زێڕیدا (وَالْفِضَّةِ) وە لـە زیـویدا، هـەروەها ڕیبـا لـە پارەو پولی ئەم سەردەمەشدا حەرامە، چونکە لە جێگەی زێڕ، یان زیو داندراوە.

وَالْمَطْعُومات، وَلاَ يَجُوزُ بَيْعُ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، وَالْفِضَّةِ كَذَلِكَ إِلاَّ مُتَماثِلاً، نَقْداً، وَلاَ بَيْعُ مَاابْتاعَهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ،

---

(وَالْمَطْعُومات) هەروەها ڕیبا حەرامە لە هەموو جۆرێکی خواردەمەنی، ئایا بۆ ژیانی ئادەمیزاد بێ: وەکو دانەوێڵەو ئاو، یان بۆ دەرمان بێ: وەکو خوێو بیبەرو ڕەشکەو شملّیو چایە، یان هەر میوە بێ: وەکو سێو و هەنارو ڕێواسو کەنگرو، هەر شلەیەکی هەبێ: وەکو دۆشاو و سرکە.

﴿ئاگاداری﴾: تاوانی ڕیبا ئەم کەسانە ئەگرێتەوە: ﴿عَنْ جابِر ﷺ قالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ آكِلَ الرِّبا وَمُوكِلَهُ وَكاتِبَهُ وَشاهِدَيْهِ، وَقالَ: هُمْ سَواءٌ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەعنەتی خوا لەو کەسەی ڕیبا وەرئەگرێ، لەو کەسەی ڕیبا ئەدا، لەو کەسەی ئەینووسێو ژمارەکەی دیاری ئەکا، لەو کەسەی ئەبێتە شاهیدی ڕیبا، وە فەرمووی: گوناهی ئەوانە وەکو یەکتری وایە.

(وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیە (بَيْعُ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ) زێڕ بە زێڕ بفرۆشرێ، واتە: بگۆڕدرێتەوە (وَالْفِضَّةِ كَذَلِكَ) هەروەها دروست نیە زیو بە زیو بگۆڕدرێتەوە، هەروەها دروست نیە: پارەی وڵاتێك بە پارەی هەمان وڵات بگۆڕدرێتەوە (إِلاَّ مُتَماثِلاً) مەگەر بە ئەندازەی یەکتری بنو کەمو زیادییان نەبێ، هەرچەندە یەکێکیشیان لەویتر باشتر بێ (نَقْداً) وە ئەبی دەستبەجێ بێو پێش ئەوەی هەردوو لا لێك جیاببنەوە: زێڕەکە، یان زیوەکە، یان پارەکە، بدەنە دەست یەکتری ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ وَزْناً بِوَزْنٍ مِثْلاً بِمِثْلٍ فَمَنْ زادَ أَوْ اسْتَزادَ فَهُوَ رِبا﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زێڕ بە زێڕ، زیو بە زیو، ئەبی بە کێشانەی یەکتری بنو هەندی یەکتری بن، هەر کەسێك زێدە بدا، یان زێدە وەربگرێ، ئەوە بۆ هەردوو لا ئەبێتە ڕیبا. واتە: هەرچەند پاش ماوەیەکیش ئەو زێدەیە وەربگرێ هەر ڕیبایە.

﴿ باسی شتی فرۆشراو پێش وەرگرتنی ﴾

(وَلاَ بَيْعُ مَا ابْتاعَهُ) دروست نیە فرۆشتنی ئەو شتەی کە کڕیویەتی بەڵام وەری نەگرتوە (حَتَّى يَقْبِضَهُ) تا وەری ئەگرێ، یان ئەیگوازێتەوە بۆ شوێنێکیتر ﴿عَنْ حَكِيم بن حزام ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذا اشْتَرَيْتَ شَيْئاً فَلاَ تَبِعْهُ حَتَّى تَقْبِضَهُ﴾ رواه أحمد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کاتێك شتێکت کڕی، مەیفرۆشە تا وەری ئەگری.

﴿ئاگاداری﴾: شتی فرۆشراو تا کڕیارەکە وەری نەگرێ، هەر لە ئەستۆی فرۆشیارەکەیە، واتە: ئەگەر لە ناو چوو، فرۆشتنەکە هەڵئەوەشێتەوەو ئەبی پارەکە بداتەوە کڕیارەکە. جا بزانە: مەبەست بە وەرگرتن ئەمەیە: فرۆشراوەکە بخرێتە ژێر دەسەڵاتی کڕیارەکە

وَلاَ بَيْعُ اللَّحْمِ بِالْحَيَوانِ، وَيَجُوزُ بَيْعُ الذَّهَبِ بِالْفِضَّةِ مُتَفاضِلاً نَقْداً، وَكَذَلِكَ الْمَطْعُوماتُ لاَ يَجُوزُ بَيْعُ الْجِنْسِ مِنْها بِمِثْلِهِ إِلاَّ مُتَماثِلاً، نَقْداً، وَيَجُوزُ بَيْعُ الْجِنْسِ مِنْها بِغَيْرِهِ مُتَفاضِلاً، نَقْداً،

---

ئەگەر خانوو، یان زەوییو شتێکی وا بێ: کە نەگوازرێتەوە، چونکە ئەگەر بگوازرێتەوە، ئەبی لە شوێنی خۆی بیباتە شوێنێکیتر.

(وَلاَ بَيْعُ اللَّحْمِ) هەروەها دروست نیە فرۆشتنی گۆشت (بِالْحَيَوانِ) بە ئاژەڵی زیندوو، جا گۆشتی بخورێ، یان نا ﴿نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ اللَّحْمِ بِالشَّاةِ﴾رواه الحاكم، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: گۆشت بە مەڕ بفرۆشرێ.

(وَيَجُوزُ) دروستە (بَيْعُ الذَّهَبِ) فرۆشتنی زێڕ (بِالْفِضَّةِ) بە زیو (مُتَفاضِلاً) هەرچەندەش یەکێکیان لەویتر زیاتر بێ (نَقْداً) بەو مەرجەی دەستبەجێ بێ، هەروەها دروستە پارەی وڵاتێك بە پارەی وڵاتێکیتر بفرۆشرێ، هەرچەندەش یەکێکیان لەویتر زیاتر بێ، بەو مەرجەی دەستبەجێ بێ، واتە: پێش لێك جیابوونەوە—هەردوو لا— پارەکە بدەنە یەکتر، چونکە هەر یەکەیان جۆرێکی جیاوازە لەویتر ﴿عَنْ عُبادَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَإِذا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذا كانَ يَداً بِيَدٍ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کاتێك جۆری ئەو شتانە لێك جیاواز بوو، بە هەر شێوەیەك پێتان خۆشە بیفرۆشن، ئەگەر دەست بە دەست بێ.

(وَكَذَلِكَ الْمَطْعُوماتُ) خواردەمەنیش وەکو زێڕو زیوە: (لاَ يَجُوزُ) دروست نیە (بَيْعُ الْجِنْسِ مِنْها) رەگەزێك لە خواردەمەنی بفرۆشرێ (بِمِثْلِهِ) بە وێنەی خۆی: وەکو گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، هەرچەندەش یەکێکیان لەویتر باشتر بێ (إِلاَّ مُتَماثِلاً) مەگەر بە ئەندازەی یەکتری بن (نَقْداً) وە دەستبەجێ بێ، واتە: پێش لێکجیابوونەوە—هەردوو لا— شتەکە بدەنە یەکتری.

(وَيَجُوزُ) دروستە (بَيْعُ الْجِنْسِ مِنْها) رەگەزێك لە خواردەمەنی بفرۆشرێ (بِغَيْرِهِ) بە رەگەزێکی جیاواز (مُتَفاضِلاً) هەرچەندەش یەکێکیان لەویتر زیاتر بێ: وەك کیلۆیەك گەنم بە دوو کیلۆ جۆ (نَقْداً) بەو مەرجەی دەستبەجێ بێ ﴿عَنْ عُبادَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ مِثْلاً بِمِثْلٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ يَداً بِيَدٍ، فَإِذااخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذا كانَ يَداً بِيَدٍ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زێڕ بە زێڕ، زیو بە زیو، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، قەسپ بە قەسپ، خوێ بە خوێ، ئەبی بە ئەندازەی یەك بن و دەست بەدەست بێ، بەڵام ئەگەر جۆری ئەوانە لێك جیاواز بوو، ئەو کاتە چۆنی پێتان خۆشە بیفرۆشن، ئەگەر دەست بەدەست بێ.

وَلاَ يَجُوزُ بَيْعُ الْغَرَرِ.

(فَصْلٌ) وَالْمُتَبَايِعانِ بِالْخِيارِ ما لَمْ يَتَفَرَّقا، وَلَهُما أَنْ يَشْتَرِطَا الْخِيارَ إِلىَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، وَإِذَا وُجِدَ بِالْمَبِيعِ عَيْبٌ

---

﴿ئاگاداری﴾: هەر شتێك بە قەرز بدا بەو مەرجەی لە ئەندازەی خۆی زیاتر، یان باشتری بداتەوە، ئەوە دروست نیەو ڕیبایە، حەدیسی﴿فَمَنْ زادَ أَوْ اسْتَزادَ فَهُوَ رِبا﴾ بەلگەیە، هەروەك باسمان کرد.

جا بزانە: لەو زیادە وەرگرتنەی‌قەرز، جیاوازی نیە لە نێوان زێڕو زیو و پارەو خواردەمەنی‌و ئاژەڵو دارو ئاسن‌و شتی‌تر.

(وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیە (بَيْعُ الْغَرَرِ) فرۆشتنێك کە فریودانی تێدا بێ، وەك شتەکەی نەدیتبێ، یان نەزانێ چەندەو چۆنە، هەروەك باسمان کرد.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی پەشیمانبوونەوە لە کڕین‌و فرۆشتن ﴾

پەشیمانبوونەوە سێ جۆرە:

یەکەم پێی ئەگوترێ: (خِيارُالْمَجْلِس)=پەشیمانبوونەوەی دانیشگا (وَالْمُتَبايِعانِ) کڕیارو فرۆشیار (بِالْخِيارِ) بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە (ما لَم يَتَفَرَّقا) لەو ماوەی کە لێك جیا نەبوبنەوە، بەو مەرجەی هەردوو لا نەڵێن: پەشیمانبوونەوەمان نەبێ. جا ئەگەر هەر یەکێکیان گوتی: پەشیمانبوونەوەم نەبێ. تەنها هەر ئەو مافی پەشیمانبوونەوەی لە دەست ئەچێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِیَ‌اللهُ عَنهُما: قالَ النَّبِیُّ ﷺ: اَلْبَيِّعانِ بِالْخِيارِ مالَمْ يَتَفَرَّقا أَوْ يُخَيِّرَ أَحَدُهُما الْآخَرَ﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە تا لێك جیا ئەبنەوە، یان تا یەکێك بە وی‌تر ئەڵێ: پەشیمانبوونەوە نەبێ.

دووەم: پێی ئەگوترێ:(خِيارُالشَّرْط)=پەشیمانبوونەوەی مەرج (وَلَهُما) دروستە بۆ هەردوو لا (أَنْ يَشْتَرِطا الْخِيارَ) کڕین‌و فرۆشتنەکە بکەن بە مەرجی پەشیمانبوونەوە (إِلى ثَلاثَةِ أَيّامٍ) تا سێ ڕۆژی تەواو، بەڵام زیاتر دروست نیە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِیَ‌اللهُ عنهُما: قالَ النَّبِیُّ ﷺ لِرَجُلٍ: إِذا بايَعْتَ فَقُلْ: لاَخِلاَبَةَ، ثُمَّ أَنْتَ بِالْخِيارِ فِی كُلِّ سِلْعَةٍ ابْتَعْتَها ثَلاَثَ لَيالٍ﴾ رواه‌البيهقی وغيره، پێغەمبەرﷺ بە پیاوێکی فەرموو: کاتێ کڕین‌و فرۆشتنت کرد، بڵێ: فێڵبازی نیە. ئینجا تا ماوەی سێ شەوان مافی پەشیمانبوونەوەت هەیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر پەشیمانبوونەوە بۆ هەردوو لا هەبوو، قازانج‌و زەرەری فرۆشراوەکە لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژانەدا: ئەگەر بووە هی کڕیارەکە ئەوە بۆ کڕیارەکەیە، ئەگەر نا: بۆ خاوەنەکەیەتی.

سێیەم: (خِيارُالْعَيْب)=پەشیمانبوونەوەی کەموکوڕی (وَإِذا وُجِدَ) هەر کاتێك ئاشکرا بوو (بِالْمَبِيعِ) لە شتەفرۆشراوەکە، یان لە پارەکە (عَيْبٌ) کەموکوڕییەکی وەها: کە پێش

وەرگرتنی هەبوبێ‌و لە نرخی کەم بکاتەوە، ئەوە (فَلِلْمُشْتَرِي رَدُّهُ) کڕیارەکە بۆی دروستە بیگەڕێنێتەوە سەر خاوەنەکەی، هەروەها ئەگەر مەرجێکیش لە فرۆشراوەکەدا نەهاتە جێ: وەك بە مەرجی ئاوسی کڕیبێتی‌و ئاوس نەبێ، هەر بۆی دروستە بیداتەوە.

ئینجا بزانە: ئەبی گەڕاندنەوەی‌فرۆشراوەکە، یان هی پارەکە دەستبەجێ بێ‌و بە پەلە بێ، واتە: ئەگەر گەڕاندنەوەی دوا خست، یان شتەکەی بە کار هێنا، مافی گەڕاندنەوەی نامێنێ، کەوابوو: یا بە پەلە بیداتەوە دەست خاوەنەکەی، یان وەکیلی‌خاوەنەکەی، جا ئەگەر هیچیانی دەست نەکەوتن، یا بیداتە دەست (قازی)، ئەگەر (قازی)ش نەبو، یان نەگونجا بیداتەوە دەست (قازی)، ئەبی لای دوو شاهید بڵێ: ئەم کڕینەم هەڵوەشاندەوە.

ئینجا دروست نیە شتەکە بە کار بێنێ:

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنِ اشْتَرَى شاةً مُصَرَّاةً فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْلُبَها: إِنْ شاءَ أَمْسَكَها، وَإِنْ شاءَ رَدَّها وَصاعاً مِنْ تَمْرٍ﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك مەڕێکی کڕی کە بە فێڵ شیریان لە ناو گوانەکاندا ڕاگرتبو، با سەرپشك بێ: ئەگەر پێی خۆشە با بیهێڵێتەوە، ئەگەر نا: با بیداتەوە خاوەنەکەی لەگەڵ ساعێکی قەسپ.

﴿ئاگاداری﴾: پێش هەڵوەشاندنەوەی کڕین‌و فرۆشتنەکە: قازانج‌و زەرەری فرۆشراوەکە هی کڕیارەکەیە، قازانج‌و زەرەری پارەکەش هی فرۆشیارەکەیە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: اَلْخَراجُ بِالضَّمانِ﴾ صححه‌الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەرهەمی فرۆشراوەکە بۆ کڕیارەکەیە چونکە لە تۆڵەی ئەودایە.

جا بزانە: ئەرکی‌گەڕاندنەوەی فرۆشراوەکە لە بەر هەر هۆیەك بێ، لە سەر کڕیارەکەیە تا ئەو شوێنەی لێی وەرگرتوە، ئەرکی گەڕانەوەی پارەکەش لە سەر فرۆشیارەکەیە.

هەروەها بزانە: هەر لایەنێك لە بەر هەر هۆیەك پەشیمان بۆوە، بەڵام بە شەرع مافی پەشیمانی نەبو، سوننەتە: لایەنەکەی‌تر یارمەتی بداو لێی وەربگرێتەوە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ أَقالَ مُسْلِماً أَقالَهُ اللهُ عَثْرَتَهُ﴾ رواه ابوداود، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك وەڵامی پەشیمانبوونەوەی موسوڵمانێك بداتەوە، خوای گەورە چاو پۆشی لە گوناهەکانی ئەکا.

## ﴿ فرۆشتنی میوە ﴾

(وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیە (بَيْعُ الثَّمَرَةِ) فرۆشتنی هیچ میوەیەك کە هەر بە سەر درەختەوە بێ (مُطْلَقاً) بێ ئەوەی مەرجی‌بڕینەوەی بۆ دابنێ (إِلاَّ بَعْدَ بُدُوِّ صَلاَحِها) تەنها پاش ئاشکرابوونی پێگەیشتنی دروستە بیفرۆشێ، جا بە مەرجی بڕینەوە بێ، یان بە مەرجی

وَلاَ بَيْـــعُ مافيــــه الرِّبـــا بِجِنْسِــــهِ رَطْبــاً إلاَّ اللَّـــبَنَ.
(فَصْلٌ) وَيَصِحُّ السَّلَمُ حالاً وَمُؤَجَّلاً

هێشتنەوە بە سەر درەختەکەوە ﴿عَنْ أَنَس: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ الثَّمَرَةِ حَتَّى يَبْـدُوَ صَلاحُهَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: میوە-کە هەر بە درەختەوە بێ- بفرۆشرێ تا پێگەیشتنی دەرئەکەوێ. کەواتە: ئەگەر خاوەنەکەی بۆ خۆی لە درەختەکەی کردەوەو فرۆشتی، یان بە کڕیاری گوت: ئەبی لێی بکەیەوە. ئەو فرۆشتنە دروستە.
(وَلاَ بَيْعُ مافِيهِ الرِّبَا) هەروەها دروست نیە: فرۆشتنی ئەو خواردنەی ڕیبای تێدایە (بِجِنْسِهِ) هەر بە ڕەگەزی خۆی (رَطْباً) لە کاتی تەڕیدا: وەك فرۆشتنیتری بە تری، یان خورما بە خورما، یان تری بە مێوژ، یان خورما بە قەسپ، چونکە بە ووشککردنەوە کەم ئەبنەوە ﴿عَنْ سَعْد بن أَبِي وَقَاص: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ الرُّطَبِ بالتَّمْرِ؟ فَقَـالَ: أَيَـنْقُصُ الرُّطَبُ إِذا يَبِسَ؟ قالُوا: نَعَم. فَنَهَى عَـنْ ذلِـكَ﴾ رواهاصحاب السنن، پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد: ئایا دروستە تەڕەقەسپ بە قەسپ بفرۆشرێ؟ فەرمووی: ئایا بە ووشککردنەوە کەم ئەکاتەوە؟ گوتیان: بەڵێ. ئەویش قەدەغەی کرد.
کەوابوو: ئەبی مێوژ بە مێوژ، قەسپ بە قەسپ بدرێ، چونکە لەمە زیاتر کەم نابنەوە (إِلاَّ اللَّبَنَ) تەنها شیر دروستە بە شیر بفرۆشرێ، ماست بە ماست بفرۆشرێ.
﴿پاشکۆ﴾: حەرامە فرۆشتنی هەر شتێکی ببێتە هۆی گوناهباری: وەك فرۆشتنی چەك بە ڕێگر، یان تری بەو کەسەی ئەیکاتە مەی- شەراب، یان هەر دەرمانێکی ببێتە هۆی بێهۆشی: بە پیاو خراپ، چونکە خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَ تَعَـاوَنُوا عَلَـىالإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ یارمەتی یەکتری مەدەن بۆ گوناهباریو دوژمنکاری خوا.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (سَلَم) ﴾

واتە: فرۆشتنی شتێك کە لە بەرچاو نەبێو ناوونیشانی بگوترێو هەر لەم دانیشتنەشدا پارەکەی بدرێ، وەك بڵێ: ئەم پانزە دینارەم دا بە تۆ بە سەلەمی ڕیە گەنمێکی قەندەهاری لە فلاّنە ڕۆژەو لە فلاّنە شوێنە بمدەرێ. ئەوەیش وەریبگرێو ڕازی ببێ.
(وَيَصِحُّ السَّلَمَ) سەلەم دروستە (حالاً) هەر بۆ ئەم کاتە، ئەگەر شتە سەلەم تێکراوەکە دەست بکەوێ، واتە: بتوانێ یەکسەر لە دوای پارە وەرگرتن بچێ بیهێنێ.
(وَمُؤَجَّلاً) هەروەها سەلەم بۆ کاتی لە مەودواش دروستە، واتە: لەمەودوا لە کاتی دیارکراودا شتەکە بداتە کڕیارەکە ﴿عَنْ ابْنِ عَبَاس رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ اَلْمَدِينَةَ وَهُـمْ يُسْـلِفُونَ فِي الثِّمارِ اَلسَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ، فَقالَ ﷺ: مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُـومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ اِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ﴾ رواهالشیخان، پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ (مَدِينَة)، لەو کاتی

فيما تَكامَلَ فيه خَمْسَةُ شَرائطَ: أنْ يَكُونَ مَضْبُوطاً بالصِّفَة، وَأنْ يَكُونَ جِنساً لَمْ يَخْتَلِطْ بِهِ غَيْرُهُ، وَلَمْ تَدْخُلْهُ النَّارُ لإحَالَتِه، وَأنْ لاَ يَكُونَ مُعَيَّناً، وَلاَ مِنْ مُعَيَّنٍ، وَأنْ يَكُونَ مِمَّا يَصِحُّ بَيْعُهُ. ثُمَّ لِصِحَّةِ الْمُسْلَمِ فِيهِ ثَمانِيَةُ شَرائطَ: وَهُوَ أنْ يَصِفَهُ-بَعْدَ ذِكْرِ جِنْسِهِ وَنَوْعِه- بالصِّفَاتِ الَّتِي يَخْتلفُ بِهَا الثَّمَنُ، وَأنْ يَذْكُرَ قَدْرَهُ بِمَا يَنْفِي الْجَهالَةَ عَنْهُ،

---

خەڵکەکە لە ئێستاوە پارەیان ئەدا بۆ میوەی ساڵێکیتر، یان دوو ساڵیتر، ئەویش فەرمووی: هەر کەسێك سەلەم ئەکا، با پێوانەکەو کێشانەکە دیاریێ چەندە، ماوەکەشی دیاریێ.

(فیما تَکامَلَ فیه) سەلەم لە شتێکی وەهادا دروستە کە تێیدا کۆ ببێتەوە (خَمْسَةُ شَرائطَ) پێنج مەرج:

یەکەم: (أنْ یَکُونَ مَضْبُوطاً بِالصِّفَةِ) ئەوشتەی سەلەمی تێدا ئەکرێ ناوونیشانی بە تەواوی بگوترێ.

دووەم: (وَأنْ یَکُونَ جِنْساً) شتەکە یەك ڕەگەز بێ (لَمْ یَخْتَلِطْ بِهِ غَیْرُهُ) شتیتری تێکەڵ نەبوبێ، کەوابوو: سەلەم لە گەنمو جۆی تێکەڵکراودا دروست نیە.

سێیەم: (وَلَمْ تَدْخُلْهُ النَّارُ) ئەوشتەی سەلەمی تێدا ئەکرێ، نابێ ئاگر کاری تێکردبێ (لإحالَتِه) بۆ گۆڕینی، کەوابوو: سەلەم لە چێشتو شتی برژاو و کوڵێندراودا دروست نیە، بەڵام ئەگەر ئەندازەی ئاگرەکەی دیار بوو: وەك خشتو گەچو ساوار، ئەوە دروستە.

چوارەم: (وَأنْ لاَ یَکُونَ مُعَیَّناً) ئەو شتەی سەلەمی تێدا ئەکرێ، نابێ لە بەرچاو و دیارکراوبێ، بەڵکو ئەبی پەنهان بێو قەرزبێ، کەوابوو: دروست نیە بڵێ: ئەم پارەیەم دایە تۆ بە سەلەمی ئەم گەنمە.

پێنجەم: (وَلاَ مِنْ مُعَیَّنٍ) نابێ ئەوشتەی سەلەمی تێدا ئەکرێ هی شوێنێکی دیارکراوبێ: کە مەترسی دەست نەکەوتنی لێبکرێ، وەك بڵێ: ئەم پارەیەم دایە تۆ بە سەلەمی گەنمی فلان زەویە، بەڵام ئەگەر بڵێ: بە سەلەمی گەنمی فلان شارە ئەوە دروستە.

(وَأنْ یَکُونَ مِمَّا یَصِحُّ بَیْعُهُ) هەروەها ئەبی ئەوشتەی سەلەمی تێدا ئەکرێ، لەو جۆرە شتانەبێ کە فرۆشتنیان دروستە، کەوابوو: سەلەم لە سەگو زبڵدا دروست نیە.

(ثُمَّ لِصِحَّةِالْمُسْلَمِ فِیهِ) ئینجا بۆ دروستبوونی سەلەم لە هەموو شتێکدا پێویستە (ثَمانِیَةُ شَرائطَ) هەشت مەرج بێنە جێ (وَهُوَ) ئەو مەرجانە ئەمەنە:

یەکەم: (أنْ یَصِفَهُ) ناوونیشانی بڵێ (بَعْدَ ذِکْرِ جِنْسِهِ وَنَوْعِهِ) پاش دیاریکردنی ڕەگەزو جۆرەکەی (بِالصِّفاتِ الَّتِی) بەو ناوونیشانانەی (یَخْتَلِفُ بِها الثَّمَنُ) کە نرخەکەیان پێ ئەگۆڕێ، وەك بڵێ: گەنمەکەم گەنمە بەهارییەو هی مەهابادە.

دووەم: (وَأنْ یَذْکُرَ قَدْرَهُ) ئەندازەکەشی بڵێ (بِما یَنْفِی الْجَهالَةَ عَنْهُ) بەو جۆرەی نەزانیو فێڵبازی ڕوونەدا، وەك بڵێ: ئەوەندە کیلۆیە، یان ئەوەندە ڕیەیە بە ڕیەی فلانە شوێن.

وَإِنْ كانَ مُؤَجَّلاً ذَكَرَ وَقْتَ مَحلِّـه، وَأَنْ يَكُـونَ مَوْجُـوداً عنْـدَ الإسْـتحْقاق فـي الْغالـبْ، وَأَنْ يَـذْكُرَ مَوْضـعَ قَبْضـه، وَأَنْ يَكُـونَ الـثَّمَنُ مَعْلُومـاً، وَأَنْ يَتقابَضَا قَبْلَ التَّفَرُّق، وَأَنْ يَكُونَ عَقْدُ السَّلَمِ ناجِزاً لاَ يَدْخُلُـهُ خِيـارُ الشَّـرْط.
(فَـصْـلٌ):

---

سێیەم: (وَإِنْ كانَ مُؤَجَّلاً) ئەگەر سەلەمەکە بۆ ماوەیەکی دواخراو بوو (ذَكَرَ وَقْتَ مَحِلِّه) ئەبی کاتی هاتنی ماوەکە دیاری بکا، وەك بڵێ: لە مانگی ڕەمەزان بۆم بێنە.
چوارەم: (وَأَنْ يَكُونَ مَوْجُوداً) شتەکە دەست بکەوێ (عِنْدَ الإِسْتِحْقاقِ) لە کاتی دیارکراودا (فِي الْغالِبِ) بە زۆری: وەك سەلەمی گوێز لە کاتی پایزدا.
پێنجەم: (وَأَنْ يَذْكُرَ مَوْضِعَ قَبْضِه) شوێنی وەرگرتنی بۆ دیاری بکا، وەك بڵێ: بۆم بێنە خانووی خۆمان لە گەڕەکی ئازادی.
شەشەم: (وَأَنْ يَكُونَ الـثَّمَنُ مَعْلُومـاً) پارەکـە ئاشـکرا بـێ بـۆ هـەردوو لا: کـە چـەندەو هی کام وولاتە.
حەفتەم: (وَأَنْ يَتَقابَضا) پارەکە بداتە دەست فرۆشیارەکەو ئەویش وەری‌بگرێو قبوڵی بکا (قَبْلَ التَّفَرُّقِ) پێش ئـەوەی لـەو دانیشـتنەدا لێك جیـا ببنـەوە، واتـە: ئەگـەر گوتی: بەیانی دە دینارت ئەدەمێ بە سەلەمی ڕیە گەنمێك، ئینجا ڕۆیشت، ئەوە دروست نیە.
هەشـتەم: (وَأَنْ يَكُونَ عَقْدُالسَّلَمِ نـاجِزاً) پێکهاتنەکـەی سـەلەم بـە یـەکجاری ببڕێتـەوە، واتە: (لاَ يَدْخُلُهُ خِيارُالشَّرْطِ) نابێ مەرجی پەشیمانبوونەوە دابنێن، بەڵام تا لەو دانیشتنە لێك جیا ئەبنەوە، بۆ هەردوو لا دروستە پەشیمان ببنەوە.
﴿پاشـکۆ﴾: یەکـەم: ئەگـەر شـوێنی دیـارکراو کـەلکی نـەما بـۆ ئـەوەی ماڵـە سـەلەم تێکراوەکە بێنێو بیداتە کڕیارەکە، ئەبی بیهێنێتە شوێنێکی‌تر کە لەوێ نزیك بێ.
دووەم: ئەگەر پێش هاتنی کاتی دیارکراو ماڵەکەی هێنـا، ئـەوە تێبینی ئـەکرێ: ئەگـەر کڕیارەکە بە وەرگرتنی ئەم شتە زەرەری لێ‌ئەکەوت، واجـب نیـە وەریبگرێ، ئەگـەر نـا: واجبە وەری‌بگرێ.
سێیەم: ئەگەر لە کاتی دیارکراودا شـتەکە بڕایـەوەو دەسـت نەکـەوت، کڕیارەکـە بـۆی دروستە ڕێککەوتنەکە هەڵبوەشێنێتەوەو پارەکەی وەربگرێتەوە، یان با چاوەڕوان بکا تا دەست ئەکەوێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (رَهْن) ﴾

واتە: قەرزدارێك شتێك بکاتە بارمەتـەی قـەرزێك، بـۆ ئـەوەی ئەگـەر قەرزەکـەی نـەداوە، لەو شتە بدرێتەوە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا

وَكُلُّ مـا جـازَ بَيْعُـهُ جـازَ رَهْنُـهُ فِي الـدُّيُون، إذا اسْـتَقَرَّ ثُبُوتُهَـا فِي الذِّمَّـة، وَلِلرّاهِنِ اَلرُّجُوعُ فِيه مالَمْ يَقْبِضْهُ الْمُـرْتَهِنُ، وَلاَ يَضْـمَنُهُ الْمُـرْتَهِنُ إلاَّ بِالتَّعَـدِّى، وَإذا قَضَى بَعْضَ الْحَقِّ لَمْ يَخْرُجْ شَيْءٌ مِنَ الرَّهْنِ حَتَّى يَقْضِيَ جَمِيعَهُ.

---

فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾ ئەگەر لە سەفەر بونو شتێكتان لێكتر قەرز كردو كەس نەبو بینووسێ، شتێك بكەنە بارمتەی قەرزەكەو قبوڵی بكەن.

(وَكُلُّ ما جازَ بَيْعُهُ) هەر شتێك دروست بێ بفرۆشرێ (جازَ رَهْنُـهُ) دروستە بـە رەهـن دابنـدرێ (فِي الدُّيُونِ) بە هۆی گشت قەرزێك (إذا اسْتَقَرَّ ثُبُوتُهـا) بـەو مەرجـەی قەرزەكـە جێگیر بوبـێ (فِي الذِّمَّةِ) لە ئەستۆی قەرزدارەكەدا، واتە: قەرزەكە قبوڵ بكا، ئینجا رەهنەكە دابنێ.

(وَلِلرَّاهِنِ) دروسـتە بـۆ دانـەری رەهنەكـە-كـە قەرزدارەكەیـە- (اَلرُّجُـوعُ فِيـهِ) پەشـیمان ببێتەوە لە دانانی رەهنەكە (مالَمْ يَقْبِضْهُ الْمُرْتَهِنُ) بەو مەرجەی وەرگری رەهنەكە قبـوڵی نـەكردبێ، واتـە: ئەگـەر قبـوڵی كـردو وەریگـرت، پەشـیمانبوونەوەی بـۆ نیـەو ماڵـە رەهنكراوەكـەش ئەبەسـترێتەوەو نابـێ بیفرۆشـێو نابـێ بیبەخشـێ بـە بێپرسـی رەهنوەرگرەكە: كە خاوەنی قەرزەكەیە.

﴿ئـاگـاداری﴾: بـەكارهێنانو گشـت سـودێكیتری ماڵەرەهنكراوەكـە-تـەنها-بـۆ خاوەنەكەیەتیو بەخێوكردنیشی هەر لە سەر خاوەنەكەیـەتی ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ:قـالَ النَّبِيُّ ﷺ:اَلظَّهْرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِه إذاكانَ مَرْهُوناً، وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ بِنَفَقَتِه إذاكانَ مَرْهُوناً﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پشتی وڵاغی رەهنكراو بۆ سواری بە كـار ئەهێنـدرێ بە هۆی بەخێوكردنی، شیری گوانی رەهنكراو ئەخورێتەوە بە هۆی بەخێوكردنی.

كەوابوو: ئەگەر خاوەن قەرزەكە، واتـە: رەهنوەرگرەكـە سودی لێوەرگرتو بۆ خۆی بـە كاری هێنا، حەرامەو ئەبێتە ریبا، چونكە لە مافیخۆی زیاتر سودی پێئەگا.

(وَلاَ يَضْمَنُهُ الْمُرْتَهِنُ) تۆڵەی ماڵە رەهنكراوەكە ناكەوێتە سەر رەهنوەرگرەكە (إلاَّ بِالتَّعَدِّي) تەنها ئەگەر كەمتەرخەمی بكاو ماڵەكە لە دەست بدا، ئەوە ئەبی تۆڵەی بژمێرێ.

﴿ئاگاداری﴾: ماڵە رەهنكراوەكە ئەبی لـە ژێـر دەسـتی رەهنوەرگرەكـە دابنـدرێ، ئینجـا خاوەنەكەیخۆی بـۆ سـود لێوەگـرتن لێی وەرئەگرێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر بـۆ خۆیـان رێـك كەوتن كە بە یەكجاری لە لای خاوەنەكەی دابندرێ، ئەوە دروستە.

(وَإذا قَضَى بَعْضَ الْحَقِّ) ئەگەر قەرزدارەكە هەندێك قەرزی دایەوە (لَـمْ يَخْـرُجْ) دەرناچـێو رزگار نابێ (شَيْءٌ مِنَ الرَّهْنِ) هیچ بەشێك لـە ماڵـە رەهنكراوەكـە، واتـە: گشـتی هـەر بـە رەهن ئەمێنێتەوە (حَتَّى يَقْضِيَ جَمِيعَهُ) تا گشت قەرزەكە ئەداتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر كاتی قەرزدانەوە هات، واجبە قەرزدارەكە: یـان قەرزەكـە بداتـەوە، یان ماڵە رەهنكراوەكە بە ئیزنیخاوەن قەرزەكە بفرۆشێو قەرزەكەی پێ بداتەوە.

﴿ پاشكۆ: لەبارەی قەرزدان ﴾

قەرزدان سوننەتێكی گەورەیە پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: ﴿مَنْ نَفَّسَ عَنْ أَخِيهِ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيامَةِ﴾ رواەمسلم، هەر كەسێك دڵتەنگیەك لە برای خۆی لابیا، خوایگەورە دڵتەنگیەكیقیامەتی بۆ لائەبا.

ئینجا بزانە: ئەگەر قەرزدارەكە ئەیتوانی قەرزەكە بداتەوە، ئەوە حەرامە قەرزدانەوە دوا بخا، بەڵام ئەگەر هەژار بوو و نەیئەتوانی بیداتەوە، ئەوە واجبە خاوەن قەرزەكە چاوەڕوانی هەبوونیی بكا، جا ئەگەر نەختێك باری قەرزی بۆ سوك كرد، یان لە گشتی گەردەنی ئازاد كرد، ئەوە جێگەی ڕەزامەندی خوایە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَاللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ رواەمسلم، هەر كەسێك قەرزێك بۆ یەكێكی هەژار بداتەوە، یان لێی خۆش ببێ، یان ماوەی بۆ دوابخا، خوای گەورە كاری دونیاو قیامەتی بۆ ئاسان ئەكا.

دیسان بزانە: هەر كاتێك قەرزدارەكە-یان میراتگرەكانیقەرزدارەكە-قەرزەكەیان بۆ خاوەن قەرزەكە هێناوە، واجبە: یان وەریبگرێتەوە، یان گەردەنیقەرزدارەكە ئازاد بكا، بەو مەرجەی بەوەرگرتنەوەی تووشی زەرەر نەبێ، جا هەركاتێك قەرزدارەكە قەرزەكەی لە بەردەم خاوەنەكەی دانا بە شێوەیەكی وەها: كە ئەیتوانی هەڵیبگرێ، ئەوە بەوەرگرتنەوە دائەندرێ، هەرچەند قبوڵیش نەكا.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (حَجْر) ﴾

واتە: قەدەغەكردن لە دەستكاریكردنی مڵكو ماڵ (وَالْحَجْرُ) قەدەغەكردن لە دەستكاری كردنی مڵكو ماڵ (عَلَى سِتَّةٍ) لەسەر شەش جۆرە كەسانە، جیاوازی نێر و مێ نیە:

یەكەم: (اَلصَّبِيُّ) لە سەر منداڵە، واتە: نابێ منداڵ دەستكاری مڵكو ماڵی خۆی بكا: نە بە فرۆشتن، نە بە بەخشین، نە بە هیچ جۆرێكیتر، تا بلۆغی ئەبێ، بەو شێوەی لە بەشی (حەیز)دا باسمان كرد، وە ئەبی لە دوای بلۆغبوونیش عەقڵی هەبێو بۆ دینو دونیای خۆی بسازێ، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَابْتَلُوا الْيَتَامَى حَتَّى إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ منداڵە یەتیمەكان تاقی بكەنەوە كە نزیكە بلۆغیان ببێ، ئینجا كە بلۆغیان بوو و گونجانی دینو دونیاتان لێڕەچاو كردن، ماڵەكەی خۆیان بدەنەوە دەستیان.

دووەم: (وَالْمَجْنُونُ) لە سەر شێتە، ئەویش وەكو منداڵ نابێ دەستكاری ماڵیخۆی بكا تا چاك ئەبێتەوە، چونكە بیرو هۆشی ناتەواوە.

وَالسَّفِيهُ الْمُبَذِّرُ لِمالِه، وَالْمُفلسُ الَّذى إرْتَكَبَتْهُ الدُّيونُ، وَالْمَريضُ فِيما زادَ عَلَى الثُّلُث، وَالْعَبْدُ الَّذى لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فِي التِّجارَةِ. وَتَصرُّفُ الصَّبِيِّ وَالْمَجْنُونِ وَالسَّفِيهِ غَيْرُ صَحِيحٍ،

---

سىٰيەم: (وَالسَّفِيهُ) لە سەر سەفيهە، واتە: (الْمُبَذِّرُ لِمالِهِ) ئەو كەسەی ماڵیخۆی بە فیڕۆ ئەدا: وەك ماڵی خۆی بە زەرەرێكی زۆر بفرۆشێ، یان بكڕێ، یان فڕێی بدا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإنْ كانَ الَّذى عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لاَيَسْتَطِيعُ أَنْ يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ﴾ ئەگەر ئەو كەسەی مافی لە سەرە، (سَفِيه) بوو، یان بێهێز بوو: وەك منداڵ، یان نەیئەتوانی بڵێ؟ لە بەر لاڵی، با سەرپەرشتكارەكەی لەجیاتیی بڵێ نووسەرەكەش بنووسێ.

چوارەم: (وَالْمُفْلِسُ الَّذِی) لە سەر قەرزدارێكی وەهایە (إرْتَكَبَتْهُ الدُّيُونُ) كە قەرزەكە هەموو ماڵەكەی دابگرێ‌و ماڵەكەی بەرووەستی قەرزەكان نەكا، واتە: (قازی)ی شەرع قەدەغە دائەنێتە سەر گشت ملكو ماڵەكەی، ئینجا خانوو و زەویو ئاژەڵو ناوماڵی ئەفرۆشێ‌و قەرزەكانی لێئەداتەوە ﴿عَنْ ابن كَعْبِ عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَجَرَ عَلَى مُعاذ مالَهُ وَباعَهُ فِي دَيْنٍ كانَ عَلَيْهِ﴾ رواه الدارقطني، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لە سەر ماڵی (مُعاذ) داناو فرۆشتی، لە بەر ئەو قەرزەی لە سەری بوو.

پێنجەم: (وَالْمَرِيضُ) لە سەر نەخۆشێكی وەهایە: كە مەترسی مردنی لێبكرێ (فيما) قەدەغە ئەكرێ لەو خێرو بەخشینەی (زادَ عَلَى الثُّلُث) كە زیاتر بێ لە سێیەكی ماڵەكەی ﴿عَنْ سَعْد بن أَبِي وَقاص ﷺ قُلْتُ: يارَسُولَ الله ﷺ أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مالي؟ قالَ: لا. قُلْتُ: بِشَطْرِه؟ قالَ: لا. قُلْتُ: بِثُلُثِه؟ قالَ: اَلثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إنَّكَ إنْ تَذَرْ وَرَثَتَكَ أَغْنِياءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ﴾ رواه الشيخان، (سَعْد) لە كاتی نەخۆشیدا گوتی: (يارسول الله) ﷺ دوو بەشی ماڵەكەم بكەمە خێر؟ فەرمووی: نا. گوتی: ئەدی نیوەی؟ فەرمووی: نا. گوتی: ئەدی سێیەكی؟ فەرمووی: سێیەك بكە خێر، سێیەك زۆرە، بە ڕاستی ئەگەر تۆ میراتگرەكانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی باشترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بهێڵیو دەرۆزە لە خەڵك بكەن.

شەشەم: (وَالْعَبْدُ الَّذِی) ئەو جۆرە كۆیلەیە (لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فِي التِّجارَةِ) كە ئیزنی نەدرابێ كڕینو فرۆشتن بكا.

(وَتَصَرُّفُ الصَّبِيِّ) دەستكاریكردنی منداڵ و (وَالْمَجْنُونِ) دەستكاریكردنی شێت و (وَالسَّفِيهِ) دەستكاریكردنی (سَفِيه): لە ماڵیخۆیاندا (غَيْرُ صَحِيحٍ) دروست نییە، جا ئەو دەستكاریكردنە: كڕینو فرۆشتن بێ، یان خێركردن بێ، یان ژن مارەكردن، یان تەڵاقدان بێ، بەڵام ئەگەر سەرپەرشتكار ئیزنی بدا، دروستە (سَفِيه) كڕینو فرۆشتن بكا.

وَتَصَرُّفُ الْمُفْلسِ يَصِحُّ فِي ذِمَّته دُونَ أَعْيانِ ماله، وَتَصَرُّفُ الْمَرِيضِ فِيما زادَ عَلَى الثُّلُثِ مَوْقُوفٌ عَلَى إِجازَةِ الْوَرَثَةِ مِنْ بَعْده، وَتَصَرُّفُ الْعَبْدِ يَكُونُ فِي ذِمَّته يُتْبَعُ به إِذا عُتِقَ.

﴿ئاگاداری﴾: دروست نیە سەرپەرشتکاری شێت‌و منداڵ: ماڵەکەیان بفرۆشێ تەنها لە بەر بەرژەوەندی‌ئاشکرای ئەوان نەبێ، جا بە ئەندازەی پێویست ئەیفرۆشێ، هەروەها زەکاتیشیان بۆ ئەدا.

(وَتَصَرُّفُ الْمُفْلِسِ) دەستکاری‌کردنی قەرزدار لە ماڵی خۆی‌دا (يَصِحُّ فِي ذِمَّتِهِ) هەر ئەو دەستکارییەی دروستە کە بە قەرز بێ (دُونَ أَعْيانِ مالِهِ) نەك لە خودی ئەو ماڵەی قەدەغەی لە سەر دانراوە، چونکە ئەمەیان بۆ قەرزدارەکانە.

(وَتَصَرُّفُ الْمَرِيضِ) خێرو وەسێتی نەخۆش (فِيما زادَ) لەو ئەندازەی کە زێترە (عَلَى الثُّلُثِ) لە سێیەکی ماڵی‌خۆی (مَوْقُوفٌ) ئەوەستێندرێ (عَلَى إِجازَةِ الْوَرَثَةِ) لە سەر رێگادانی گشت میراتگرەکانی (مِنْ بَعْدِهِ) لە پاش مردنی‌نەخۆشەکە، واتە: ئەگەر رێگایان دا، ئەوە چەندی بەخۆی دایناوە، بۆی ئەکرێتە خێرو وەسێت، وە ئەگەر رێگایان نەدا، ئەوە تەنها سێیەکەکە ئەکرێت‌و زێدەکەش ئەگەڕێتەوە بۆ میراتگرەکان، هەر وەك لە باسی (وەسێت)دا ڕوونی ئەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.

﴿ئاگاداری﴾: هەر بەخشینێکی لە نەخۆشی‌مردنی‌دا بیکا: وەکو نەزرو وەقفو گەردەن ئازادکردن، ئەوە گشتی لە سەر سێیەك ئەژمێردرێ.

(وَتَصَرُّفُ الْعَبْدِ) کڕین‌وفرۆشتنی‌کۆیلە (يَكُونُ فِي ذِمَّتِهِ) لەئەستۆی‌خۆی‌دا بە قەرز ئەمێنێتەوە، واتە: (يُتْبَعُ بِهِ) داوای ئەو شتەی لێئەکرێ کە کڕیویەتی‌و لە دەستی چووە (إِذا عُتِقَ) کاتێ کە ئازاد کرا، کەوابو: پێش ئەوەی ئازاد بکرێ نابێ فرۆشیارەکە داوای هیچی لێبکا.

## ﴿ پاشکۆ: دەربارەی سەرپەرشتی و ماڵ چاککردنەوەی یەتیم ﴾

(وَلِيِ أَمْر)، واتە: سەر پەرشتکاری‌منداڵ‌و شێت: یەکەمجار باوکە، ئینجا باپیرەو بەرەو سەرەوە، ئینجا ئەو پیاوەی ئەوان دیارییان کردوە، ئینجا (قازی)، ئینجا ئەگەر (قازی) نەبو، یان بێ‌دین‌و ستەمکار بوو، واجبە پیاوماقوڵانی ئەو شوێنە سەرپەرشتی‌ی بکەن، واتە: یەکێك دیاری بکەن بۆ سەرپەرشتی منداڵ‌و شێت، هەرچەند بە کرێش بێ.

ئینجا بزانە: لە فەرموویەکی ئیمامی(شافعي)دا: لە دوای باوك‌و باپیرە، دایك لە هەموو کەسێك لە پێشترە، کەوابوو: پیاوماقوڵان با هەر دایکەکە دیاری بکەن، بۆ سەرپەرشتی شێت‌و منداڵەکان، ئینجا ئەویش بە بەرژەوەندی منداڵەکان دەستکاری لەو ماڵەدا ئەکا، جا ئەگەر داوای کرێی کرد، پیاوماقوڵان کرێیەکە لەو ماڵە دیاری ئەکەن.

ئینجا بزانە: دروستە بۆ سەرپەرشتکاری شێت‌و منداڵەکان: خواردەمەنی ئەوان‌و هی خۆیان تێکەڵ بکا ئەگەر بەرژەوەندی شێت‌و منداڵەکانی تێدا بێ، وە هەروەها بۆیان

(فَصْلٌ) وَيَصِحُّ الصُّلْحُ مَعَ الإِقْرارِ فِي الأَمْوالِ وَمَا أَفْضَى إِلَيْهَا، وَهُوَ نَوْعانِ: إِبْراء، وَمُعاوَضَة، فَالإِبْراءُ إِقْتِصارُهُ مِنْ حَقِّهِ عَلَى بَعْضِهِ، وَلاَ يَجُوزُ تَعْلِيقُهُ عَلَى شَرْطٍ. وَالْمُعاوَضَةُ عَدُولُهُ عَنْ حَقِّهِ إِلَى غَيْرِهِ،

---

دروستە میواندارى بەو خواردنە بکەن ئەگەر زیان بە شێتو منداڵەکان نەگا، ئەم تێکەڵکردنە لە کوردەواریدا پێی ئەڵێن: (ماڵ چاککردنەوە).

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (صُلْح) ﴾

واتە: پێکهاتن بۆ نەهێشتنی کێشەی نێوان دوو کەس، یان زیاتر. (وَيَصِحُّ الصُّلْحُ) پێکهاتن دروستە لە نێوان دلوکارو دلوالێکرلو (مَعَ الإِقْرارِ) بەو مەرجەی دلوالێکرلو دان بنێ بە مافی دلواکار، یان شاهید هەبێ، یان سوێند بخوێ (فِي الأَمْوالِ) لەو جۆرە شتانەدا: کە ملکو ماڵن (وَما أَفْضَى إِلَيْها) هەم لەو شتانەدا: کە سەر ئەکێشنەوە لای ماڵ، وەك بڵێ: لە تۆڵەی باوکت مەمکوژە ئەوەندە ماڵەت ئەدەمێ. ئەوە دروستە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلصُّلْحُ جائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ الاّ صُلْحاً حَرَّمَ حَلالاً أَوْ أَحَلَّ حَراماً﴾ صححه ابن حبان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێکهاتن لە نێوان موسوڵمانانندا دروستە، تەنها پێکهاتنێك دروست نیە: کە حەرامی پێ حەڵاڵ بکرێ، یان حەڵاڵی پێ حەرام بکرێ.

کەوابوو: ئەگەر پێکهاتنەکە لە بارەی ملکو ماڵ نەبو، وەك بڵێ: (لە سزای زینا بەردبارانم مەکەن تۆڵە ئەدەم). ئەوە دروست نیە، چونکە بە پێچەوانەی یاسای ئیسلامە.

(وَهُوَ) پێکهاتن (نَوْعانِ) دوو جۆرە (إِبْراء) یەکەم: سولحی بەخشینە، یان گەردەن ئازادکردنە. (وَمُعاوَضَة) دووەم: سولحی گۆڕینەوەیە، واتە: وەرگرتنی شتێك لەجیاتی شتێکیتر:

(فَالإِبْراءُ) سولحی گەردەن ئازادکردنو بەخشین ئەمەیە: (إِقْتِصارُهُ) دلواکار واز بێنێ (مِنْ حَقِّهِ) لە بەشێکی مافیخۆی (عَلَى بَعْضِهِ) بۆ وەرگرتنی بەشەکەیتر، واتە: بڵێ: (ڕاست ئەکەی ئەم چوار مەڕە هی تۆیە). ئەویش بڵێ: (ئەم دوو مەڕەم بدەوەو دووەکانیتریش بۆ تۆ). ئەوە بەخشینە، یان بڵێ: (ڕاست ئەکەی سەد دینار قەرزداری تۆم). ئەویش بڵێ: (پەنجا دینارم بدەوەو لە پەنجاکەیتر ئەتبورم). ئەمەش گەردەن ئازادکردنە، کەوابوو: ئەتوانێ لە هەمووی گەردەنی ئازاد بکا.

بەڵام (وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیە (تَعْلِيقُهُ) بەستنی ئەو گەردەن ئازادکردنە (عَلَى شَرْطٍ) بە هیچ مەرجێکەوە، وەك بڵێ: لە سەری مانگ گەردەنت ئازاد ئەکەم، ئەوە دروست نیە.

(وَالْمُعاوَضَةُ) سولحی گۆڕینەوە ئەمەیە: (عَدُولُهُ عَنْ حَقِّهِ) دلواکار لابدا لە مافی خۆی (إِلَى غَيْرِهِ) بۆ وەرگرتنی شتێکیتر، وەك بڵێ: (ئەم باغەمی منە)، یان بڵێ: (هەزار دینار

وَيَجْرِي عَلَيْهِ حُكْمُ الْبَيْعِ، وَيَجُوزُ لِلإِنْسَانِ أَنْ يُشْرِعَ رَوْشَناً فِي طَرِيقٍ نافذ بِحَيْثُ لاَ يَتَضَرَّرُ الْمارُّ بِهِ، وَلاَ يَجُوزُ فِي الدَّرْبِ الْمُشْتَرَكِ إِلاَّ بِإِذْنِ الشُّرَكَاءِ، وَيَجُوزُ تَقْدِيمُ الْبابِ فِي الدَّرْبِ الْمُشْتَرَكِ، وَلاَ يَجُوزُ تَأْخِيرُهُ إِلاَّ بِإِذْنِ الشُّرَكَاءِ.

---

قەرزداری منی). ئەویش بڵێ: (ڕاست ئەکەی، بەڵام لەجیاتی باغەکە، یان لە جیاتی هەزار دینارەکە، ئەم خانووەم لێوەربگرە). ئەویش بڵێ: باشە.

(وَيَجْرِي عَلَيْهِ) دێتە سەر ئەو پێکهاتنەی بە کڕینەوە (حُكْمُ الْبَيْعِ) گشت بڕیارەکانی کڕین و فرۆشتن، واتە: ئەبێ شتەکان پاك بن و ملکی خۆیان بن، تا سێ ڕۆژ دروستە مەرجی پەشیمانبوونەوە دابنێن، ئەگەر شتەکە کەموکوڕی‌ی هەبوو ئەیگەڕێنێتەوە.

(وَيَجُوزُ) دروستە (لِلإِنْسانِ) بۆ کەسێکی خاوەن خانوو (أَنْ يُشْرِعَ) لە سەر دیواری خانووەکەی بهێنێتە دەر (رَوْشَناً) زێدە بانێك (فِي طَرِيقٍ) بە سەر ئاسمانی ڕێگەیەکی وەهادا: (نافِذٍ) کە هەردوو سەری دەربچێ (بِحَيْثُ) بە شێوەیەکی وەها دروستی بکا: (لاَ يَتَضَرَّرُ الْمارُّ بِهِ) زیان بەو کەسانە نەگەیەنێ کە بە بن ئەو زێدە بانەدا هاتوچۆ ئەکەن، واتە: ئەوەندە بەرز بێ: شتی بارکراوی بە بندا بڕوا، جا ئۆتۆمبیل بێ، یان وڵاغ، یان ئادەمیزاد، بەگوێرەی ڕێگایەکە.

(وَلاَيَجُوزُ) دروست نیە ئەو زێدە بانە بهێنێتە دەرەوە (فِي الدَّرْبِ الْمُشْتَرَكِ) لە کۆڵانێکی هاوبەش، واتە: ڕێگەکە لە سەری‌کۆڵان ببڕێتەوەو دەرنەچێ (إِلاَّ بِإِذْنِ الشُّرَكاءِ) تەنها بە ئیزنی خاوەنەکانی ئەو کۆڵانە دروستە، کە لە خانووی وی بە دواوەترن، لەم بەرەو لەو بەر.

(وَيَجُوزُ) دروستە (تَقْدِيمُ الْبابِ) دەرگای خانوو بباتە تەنیشتی پێشەوە، واتە: بەرەو سەری کۆڵان (فِي الدَّرْبِ الْمُشْتَرَكِ) لەو کۆڵانەی کە هاوبەشەو سەرەکەی‌تری دەرناچێ (وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیە (تَأْخِيرُهُ) دەرگاکە بباتە تەنیشتی‌دواوە، واتە: بەرەو کۆتایی کۆڵان (إِلاَّ بِإِذْنِ الشُّرَكاءِ) تەنها بە ئیزنی خاوەنەکانی ئەو کۆڵانە دروستە، کە لە خانووەکەی وی بە دواوەترن، لەم بەرەو لەو بەر.

﴿پاشکۆ﴾: ئەگەر لکی‌درەختەکانی چووە سەر موڵکی کەسێکی‌تر، یان چووە سەر ڕێگەیەك‌و زیانی بە هاتوچۆکردن ئەگەیاند، واجبە: لکەکان ببڕێ، یان لایان ببا، هەروەها ئەگەر دیوارێك، یان دارێك خوار بۆوە بۆ سەر ڕێگە، یان بۆ سەر موڵکی کەسێکی‌تر، واجبە: لای‌ببا، هەروەها دروست نیە تخووبی موڵکی‌خۆی، یان دیواری خۆی بێنێتە ناو ڕێگە، هەرچەند ڕێگەش تەنگ نەبێ ﴿عَنْ سَعِيد بن زَيد رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ اقْتَطَعَ شِبْراً مِنَ الأَرْضِ ظُلْماً طَوَّقَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ إِيَّاهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك بستێك بە ناهەق لە شوێنێك داگیر بکا، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خوا ئەیکاتە تۆق و ئەیخاتە ملی لە هەر حەفت زەمینەکان.

(فَصْلٌ) وَشَرَائِطُ الْحَوالةِ أَرْبَعَةُ أَشياءَ: رِضَا الْمُحِيلِ، وَقُبُولُ الْمُحْتَـالِ-لاَ الْمُحَـالِ عَلَيْهِ-، وَكَوْنُ الْحَقِّ مُسْتَقِرّاً فِي الذِّمَّةِ، وَاتِّفاقُ مَا فِي ذِمَّةِ الْمُحِيلِ وَالْمُحَـالِ عَلَيْـهِ: فِي الْجِنْسِ وَالنَّوْعِ وَالْحُلُولِ وَالتَّأْجِيلِ. وَتَبْرأُ بِها ذِمَّةُ الْمُحِيلِ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (حَوالَة)﴾

واتە: گواستنەوەی قەرزێك لـە ئەستۆیقەرزدارێك بـۆ ئەستۆیقەرزدارێکیتر، وەك بڵـێ: (کاك ئازاد من دە دینار قەرزداری تۆم، وە کاك نەوزادیش دە دینـار قـەرزداری منـە، بـڕۆ لای کاك نەوزاد قەرزەکەی منی لێوەربگرەوە بۆ خۆت لەجیاتی قەرزەکەی لای من).

(وَشَـرائِطُ الْحَوالَـةِ) مەرجـەکانی دروسـتبوونی حەواڵـە (أَرْبَعَـةُ أَشْـياءَ) چـوارن:

یەکەم: (رِضاالْمُحِيلِ) حەواڵەکەر-واتە: ئەو قەرزدارەی خاوەن قەرزەکە ئەنێرێ- ڕازی بێ.

دووەم: (وَقُبُـولُ الْمُحْتَـالِ) حەواڵـەکراو-واتـە: خـاوەن قـەرزی نێـردراو- ڕازی بـێ (لاَالْمُحالِ عَلَيْهِ) بـەڵام حەواڵـە بـۆ سـەرکراو-واتـە: ئـەو قـەرزدارەی خـاوەن قەرزەکـەی ناردراوەتە سەر- پێویست ناکا ڕازی بێ، چونکە ئەبێ قەرزەکە هەر بداتـەوە: ئـەم، یـان ئەو، کەوابوو: ئەگەر مردوویش بێ، هەر دروستە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيُتْبَعْ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: دواخستنی دانەوەی قەرز ستەمەو زۆرداریيە، وە هەرکەسێك نێردرا بـۆ لای قـەرزدارێکی هەبوویی، بـا بچـێ. واتـە: بـۆ ئـەوەی قەرزەکـەی خـۆی لـە ئـەو وەربگرێتـەوە لـەجیاتی قەرزدارەکەی خۆی.

سێیەم: (وَكَوْنُ الْحَقِّ) هەر دوو قەرزەکان (مُسْتَقِرّاً) جێگیر بوبن (فِيالذِّمَّةِ) لـە ئەستۆی هەر دوو قەرزدارەکاندا، واتە: ئەگەر نەچەسپابێ، وەك بڵێ: (پێنج دینارم بە قـەرز بـدێ، ئینجا بڕۆ لای قەرزدارەکەم لێی وەربگرەوە). ئەوە دروست نیە.

چـوارەم: (وَاتِّفـاقُ مـا فـِي ذِمَّـةِ الْمُحِيـلِ) وەکـو یـەك بـن: ئـەو قـەرزەی لـە ئەسـتۆی حەواڵەکەردایەو (وَالْمُحالِ عَلَيْهِ) وە ئەوەی لە ئەستۆی حەواڵە بۆ سەرکراودایە (فِي الْجِنْسِ) واتە: قەرزەکان لە یەك ڕەگەز بن (وَالنَّوْعِ) وە لە یەك جۆر بن، واتە: ئەگەر ئەوە گەنم بوو، ئەبێ ئەویتریشیان هەر گەنم بێ، ئەگەر یەکێکیان جۆ بوو و ئەویتر گـەنم بـوو، حەواڵەکە دروست نیـە (وَالْحُلُولِ) ئـەبێ هـەر دوو قـەرزەکان وەکـو یـەکتری کـاتی دانـەوەیان هاتبـێ (وَالتَّأْجِيلِ) ئەگەر ماوەیان مابوو، ماوەکەیان وەکو یەکتر بێ.

(وَتَبْـرَأُ بِهـا) ڕزگـار ئـەبێ بـەم حەواڵەیـە (ذِمَّـةُ الْمُحِيـلِ) ئەسـتۆی حەواڵەکـەر، هـەروەها حەواڵـە بۆسـەرکراویش قەرزەکـەی حەواڵەکـەری لـە ئەسـتۆ ئەبێتـەوە، چـونکە واجیبـە بیداتەوە حەواڵەکراو.

(فَصْلٌ) وَيَصِحُّ ضَمانُ الدُّيُونِ الْمُسْتَقِرَّةِ فِي الذِّمَّةِ إِذا عُلِمَ قَدْرُها، وَلِصاحِبِ الْحَقِّ مُطالَبَةُ مَنْ شاءَ: مِنَ الضَّامِنِ وَالْمَضْمُونِ عَنْهُ إِذا كانَ الضَّمانُ عَلَى ما بَيَّنَّا، وَإِذا غَرِمَ الضَّامِنُ رَجَعَ عَلَى الْمَضْمُونِ عَنْهُ إِذا كانَ الضَّمانُ وَالْقَضاءُ بِإِذْنِه،

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (ضَمان) زامینی ﴾

واتە: قەرزی کەسێکیتر بخاتە ئەستۆیخۆی ئەگەر ئەو کەسە نەیدایەوە، خۆی بیداتەوە.

(وَيَصِحُّ) دروستە (ضَمانُ الدُّيُونِ) ببێتە زامینی ئەو قەرزانەی (الْمُسْتَقِرَّةِ) کە جێگیر بوبن (فِي الذِّمَّةِ) لە ئەستۆی قەرزداردا (إِذا عُلِمَ قَدْرُها) بەو مەرجەی ئەندازەی قەرزەکان بزاندرێ: چەندەو چ جۆرە ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: قالَ: لَزِمَ رَجُلٌ غَرِيماً لَهُ بِعَشَرَةِ دَنانِيرَ، فَتَحَمَّلَ بِها النَّبِيُّ ﷺ فَقَضاها عَنْهُ﴾ رواهأبوداود وابن ماجه، پیاوێك پیاوێکیتری گرتبو، چونکە دە دیناری قەرزدار بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بووە زامینی، بەڵام لە ماوەی دیارکراودا پیاوەکە بۆی نەگونجا قەرزەکە بداتەوە، جا پێغەمبەر ﷺ لەجیاتیی دایەوە.

(وَلِصاحِبِ الْحَقِّ) دروستە بۆ خاوەن قەرزەکە (مُطالَبَةُ مَنْ شاءَ) داوای قەرزەکە لە هەر کامیان بکا: (مِنَ الضَّامِنِ) لە زامینەکە (وَالْمَضْمُونِ عَنْهُ) یان لە قەرزدارەکە (إِذا كانَ الضَّمانُ) بەو مەرجەی زامینییەکە (عَلَى ما بَيَّنَّا) بەو شێوەیە بێ: کە باسمان کرد، واتە: بزانێ قەرزەکە چەندەو چۆنەو جێگیر بوبێ.

هەروەها پێویستە زامینەکەش خاوەن قەرزەکە بناسێ ﴿عَنْ أَبِي أُمامَةَ رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلزَّعِيمُ غارِمٌ﴾ رواهالترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زامین ئەبێ تۆڵە بژمێرێ، واتە: ئەگەر قەرزدارەکە نەیدا وە.

(وَإِذا غَرِمَ الضَّامِنُ) جا هەرکاتێك زامینەکە قەرزەکەی داوە لەجیاتی قەرزدارەکە (رَجَعَ) ئەگەڕێتەوە (عَلَى الْمَضْمُونِ عَنْهُ) بۆ سەر قەرزدارەکە: بۆ ئەوەی چەند قەرزی بۆ داوەتەوە، ئەوەندەی لێوەربگرێتەوە (إِذا كانَ الضَّمانُ) بەو مەرجەی زامینییەکەو (وَالْقَضاءُ) قەرزدانەوەکەش (بِإِذْنِه) بە ئیزنی قەرزدارەکە بوبێ.

بەڵام ئەگەر لەخۆیەوە بە بێئیزنیقەرزدارەکە بووە زامینو قەرزەکەی دایەوە، ئەوە لەکیس خۆی ئەڕواو ناتوانی لێی وەربگرێتەوە.

هەروەها ئەگەر زامین نەبو، بەڵام لەخۆیەوە قەرزی کەسێکیتری دایەوە: جا قەرزدارەکە زیندوو بێ، یان مردوو بێ، ئەمەش لەکیس خۆی ئەچێو ناتوانی لێی وەربگرێتەوە.

ئینجا بزانە: فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: ئەگەر بە ئیزنی قەرزدارەکە بووە زامینو بە بێپرس قەرزەکەی دایەوە، بۆی دروستە لە قەرزدارەکە وەریبگرێتەوە.

وَلاَ يَصِـــحُّ ضَـــمانُ الْمَجْهُـــولِ، وَلاَ مَـــالَمْ يَجِـــبْ إلاّ دَرْكَ الْمَبِيـــعِ.
(فَصْلٌ) وَالْكَفالَـــةُ بِالْبَـــدَنِ جـــائِزَةٌ إذا كـــانَ عَلَى الْمَكْفُـــولِ بِـــهِ حَـــقٌّ لآدَمِـــيٍّ.
(فَـــصْـــلٌ):

(وَلاَ يَصِحُّ) دروست نیه (ضَمانُ الْمَجْهُولِ) زامینیی ئەو قەرزەی کە نەزاندراوە چەندەو چۆنە (وَلاَ ما لَمْ يَجِبْ) هەروەها دروست نیە زامینیی قەرزێك کە هێشتا نەکەوتبێتە ئەستۆی قەرزدارەکە، بەلاّم لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعي)دا: دروستەو ئەبێتە زامین.
(إلاّ دَرْكَ الْمَبِيعِ) تەنها زامینیی داواکردنی ماڵەفرۆشراوەکە دروستە، پاش وەرگرتنی پارەکە، واتە: بڵێ: ئەگەر ئەو شتە بە ماڵی دزیاری دەرچوو، یان فێڵی تێدا کرابو، من زامینم پارەکەت ئەدەمەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (كَفالَة) ﴾

واتە: هێنانی ئادەمیزادێك بۆ شوێنێکی دیارکراو بخاتە ئەستۆی خۆی.
(وَالْكَفالَةُ) کەفیلایەتی (بِالْبَدَنِ) بە هێنانی لاشەی ئادەمیزادێك (جائِزَةٌ) دروستە، چونکە ئەمەش بەشێکە لە زامینی (إذا كانَ) بەو مەرجەی هەبێ (عَلَى الْمَكْفُولِ بِهِ) لە سەر ئەو کەسەی بووەتە کەفیلی (حَقٌّ لآدَمِيٍّ) مافی ئادەمیزادێکی لە سەربێ: وەکو قەرز، یان ماڵێکیتر، یان سزایەکی کوشتن، یان لێکردنەوەی ئەندامێك، یان بریندارکردنێك، بەلاّم لەو سزایانەی کە مافی خودانە، کەفیلایەتی دروست نیە: وەکو زیناو دزیو کافربوون.
ئینجا بزانە: واجبە کەفیلەکە لە کاتو شوێنی دیارکراودا ئادەمیزادەکە ئامادە بکا، جا بەم ئامادەکردنە لە کەفیلایەتی ڕزگاری ئەبێ، بەلاّم ئەگەر ئادەمیزادە داواکراوەکە لە کاتو شوێنی دیارکراودا ئامادە نەبو، کەفیلەکەش ئامادەی نەکردو مافەکەشی نەدا، ئەبی کەفیلەکە بەند بکرێ تا داواکراوەکە لە شوێنی دیارکراودا ئامادە ئەبێ، یان تا ئەزانین مردوە، یان ڕایکردوە بۆ شوێنێکی وەها: کە دەسەلاّتمان بە سەریدا نەبێ، واتە: ئەگەر یەکێك لەوانە هەبوو: کەفیلەکە ئازاد ئەکەین.
﴿ئاگاداری﴾: دروست نیە داوای مافەکە لە کەفیلەکە بکرێ، بەلاّم ئەگەر کەفیلەکە بە ویستی خۆی، یان لە ترسی بەندیخانە، ماڵەکەی داوە خاوەن ماف، ئەوە نابێ بەند بکرێ، ماڵەکەش وەکو قەرز ئەبێتە ملکی خاوەن ماف، واتە: هەر کاتێك داواکراوەکە هاتەوە، یان مرد، واجبە ماڵەکە بدرێتەوە کەفیلەکە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (شِرْكَة) شریکایەتی ﴾

واتە: هاوبەشیی دوو کەس، یان زیاتر لە شتێکدا. ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: قَالَ اللّٰهُ تَعالَى: أَنا ثالِثُ الشَّرِيكَيْنِ مالَمْ يَخُنْ أَحَدُهُما صاحِبَهُ فَإذا خانَ خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِما﴾ رواهأبوداود، خوای گەورە لە حەدیسێکی قودسیدا فەرموویەتی: من هاوڕێی سێیەمینم بۆ

وَلِلشَّرِكَةِ خَمْسَةُ شَرائِطَ: أَنْ تَكُونَ عَلَى نَاضٍّ مِنَ الدَّراهِمِ وَالدَّنانِيرِ، وَأَنْ يَتَّفِقَا فِي الْجِنْسِ وَالنَّوْعِ، وَأَنْ يَخْلِطا الْمالَيْنِ، وَأَنْ يَأْذَنَ كُلُّ واحِدٍ مِنْهُما لِصاحِبِهِ فِي التَّصَرُّفِ، وَأَنْ يَكُونَ الرِّبْحُ وَالْخُسْرَانُ عَلَى قَدْرِ الْمالَيْنِ.

---

ئەو دوو هاوبەشانەی خیانەت لەگەڵ یەکتری ناکەن، جا هەر کاتێ یەکێکیان خیانەتی لەگەڵ ئەوی‌تر کرد، من لە نێوانیان دەرئەچم.

(وَلِلشَّرِكَةِ) بۆ دروستبوونی شەریکایەتی (خَمْسَةُ شَرائِطَ) پێنج مەرج پێویستن:

یەکەم: (أَنْ تَكُونَ عَلَى نَاضٍّ) شریکایەتی لە پارەی لێدراوبێ، واتە: (مِنَ الدَّراهِمِ) یان دیرهەمی زیو بێ (وَالدَّنانِيرِ) یان دیناری زێڕ بێ.

بەڵام ئەو فەرموودەیە بێهێزەو فەرموودەی ڕاستر ئەمەیە: شریکایەتی دروستە لە هەموو شتێکی کە بە تەرازو بکێشرێ، یان بە ڕپە بپیورێ.

دووەم: (وَأَنْ يَتَّفِقَا) ماڵەکان وەك یەك بن (فِي الْجِنْسِ وَالنَّوْعِ) یەك ڕەگەزو یەك جۆر بن، بەڵام پێویست ناکا بە ئەندازەی یەکتر بن.

سێیەم: (وَأَنْ يَخْلِطا الْمالَيْنِ) هاوبەشەکان ماڵەکەیان تێکەڵ بکەن بە شێوەیەکی وەها: لە یەکتری جیا نەکرێنەوە.

چوارەم: (وَأَنْ يَأْذَنَ كُلُّ واحِدٍ مِنْهُما) هەردوو لا لە هاوبەشەکان ئیزن بدا (لِصاحِبِهِ) بۆ هاوبەشەکەی‌تر (فِي التَّصَرُّفِ) لە کڕینوفرۆشتن، واتە: پاش تێکەڵکردنی ماڵەکە هەردووکیان بڵێنە یەکتر: (وا بوومە شریکی تۆ و ئیزنم دای لە کڕینو فرۆشتنی ئەم ماڵە).

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر بە یەکەوە ماڵێکیان دەست کەوت: بە هۆی میرات، یان بە کڕین، یان بە بەخشین، ئەوە تەنها مەرجیچوارەمو مەرجیپێنجەم پێویستن.

پێنجەم: (وَأَنْ يَكُونَ الرِّبْحُ وَالْخُسْرَانُ) قازانجو زەرەری ئەو شریکایەتی‌یە (عَلَى قَدْرِ الْمالَيْنِ) بەگوێرەی ئەندازەی ماڵەکەیان بێ، هەر چەند یەکێکیشیان لەوی‌تر زیاتر ئیشی کردبێ:

کەوابوو: ئەگەر بەم مەرجە ڕێك کەوتن: کامەیان زیاتر ئیش بکا قازانجەکەی ئەویان زیاتربێ، ئەوە دروست نیەو ئەبێ قازانجەکەو زەرەرەکە هەر بەگوێرەیماڵەکان بێ:

بۆ وێنە: ئەگەر بەشی یەکێکیان سەد دینار بوو، بەشی ئەوی‌تریان پەنجا دینار بوو، ئەوە خاوەنی سەد دینارەکە دوو بەشی زەرەرو قازانجی بۆ دائەندرێ، خاوەنی پەنجایەکەش یەك بەشی زەرەرو قازانجی بۆ دائەندرێ.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا دروستە: بەشە ماڵەکانیان یەکسان بێ، بەڵام بەشە قازانجی یەکێکیان زیاتر بێ، چونکە لێزانترە، یان بەهێزترە، یان زیاتر کار ئەکا.

﴿ئاگاداری﴾: بۆ هیچێکیان دروست نیە–بە بێ‌ئیزنی هاوبەشەکەی‌تر– بە قەرز بفرۆشێ، یان بە پارەی وڵاتێکی‌تر بفرۆشێ، یان بە زەرەر بفرۆشێ، یان لەو شارە بیباتە شارێکی‌تر، چونکە تۆڵەی ئەکەوێتە سەر.

وَلِكُلِّ واحِـدٍ مِنْهُمـا فَسْـخُها مَتَـى شـاءَ، وَمَـتى مـاتَ أَحَـدُهُما بَطَلَـتْ.
(فَصْلٌ) وَكُلُّ ماجازَ لِلإِنْسانِ اَلتَّصَرُّفُ فِيه بِنَفْسِه

---

(وَلِكُلِّ واحِدٍ مِنْهُما) دروسته بۆ هەردوو لا (فَسْخُها) شریکایەتی‌یەکە هەڵبوەشێننەوە (مَتَى شاءَ) هەر کاتێ حەز بکا (وَمَتى ماتَ أَحَدُهُما) هەر کاتێك یەکێك لەو دوو شریکانە مرد (بَطَلَتْ) شریکایەتی‌یەکە هەڵئەوەشێتەوە، چونکە مەرجی هەردوو ماوبەشەکان ئەمەیە: ئەبێ بتوانن دەستکاری ماڵی خۆیان بکەن بە کڕین‌و فرۆشتن.

﴿ئاگاداری﴾: ئەوەی باسمان کرد، ماوبەشی بوو بە ماڵ، بەڵام ماوبەشی بە لەش دروست نیە، وەك بڵێ: (وەرە با بە یەکەوە ئەم کارە بکەین‌و هەر چی دەستمان کەوت، بە نیوەییمان). بەڵام ئیمامی(حنفی)و ئیمام(مالك)و ئیمام(أحمد)ﷺ ڕێگای ئەم جۆرە ماوبەشیەیان داوە، بەو مەرجەی کارەکە یەك جۆر بێ، بەڵگەیان ئەم حەدیسەیە: ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ مَسْعُودٍ﴾: قالَ اشْتَرَكْتُ أَنا وَعَمّارٌ وَسَعْدٌ فِيما نُصِيبُ يَوْمَ بَدْرٍ، فَجاءَ سَعْدٌ بِأَسِيرَيْنِ وَلَمْ أَجِيءْ أَنا وَعَمّارٌ بِشَـيْءٍ﴾ رواه النسائی، (عبدالله) فەرمووی: منو (عمّار)و (سعد) خۆمان کردە شەریکی یەکتر لەو شتەی لە غەزای (بَدْر) دەستمان ئەکەوێ، ئینجا (سعد) دوو دیلی گرتن‌و هێنانی، ئێمەش هیچمان دەست نەکەوت.

﴿پاشکۆ﴾: ئەگەر کەسێك مرد، کۆمەڵێك ماڵ‌و منداڵی گەورەو بچوکی لە پاش بەجێ‌ما‌و ماڵەکەیان بەش نەکرد، بەم جۆرە ڕەفتار ئەکەن:

هەر کامەیان بەو ماڵە ژنی هێنا، یان حەجی کرد، یان لە شتێکی‌تری سەرف کرد، ئەوە ئەبێ بەشی یەتیمەکان بداتەوە، هەروەها ئەبێ بەشی گەورەکانیش بداتەوە ئەگەر ئیزنیان نەدابو، یان بەو مەرجە ئیزنیان دابو: کە ئەوانیش بە ئەندازەی وی سەرف بکەن، بەڵام ئەگەر بە گەردەن ئازادی ئیزنیان دابو، ئەوە واجب نیە بەشی‌گەورەکان بداتەوە.

هەروەها: ئەگەر یەکێکیان شتێکی کڕیبو: ئەگەر تەنها بە نیازی خۆی کڕیبوی، ئەوە تەنها بۆ خۆیەتی، وە ئەگەر بە نیازی گشتیانی کڕیبو، یان بە ماڵی میراتەکە کڕیبوی، ئەوە گشتیان تێ‌یدا بەشدار ئەبن، جا ئەگەر باوەڕیان پێ‌نەکرد: ئایا بۆ خۆی کڕیبێ، یان بۆ گشتیان، ئەبێ سوێند بخوا، تاکو باوەڕی پێ‌بکرێ، هەروەها کێشەی ماوبەشەکانی‌تریش هەر بەم جۆرە ئەبڕێتەوە.

جا بزانە: دەربارەی زەرەرو لە ناوچوونی ماڵەکەو دزین‌و ئەو جۆرە شتانە باوەڕ بە ماوبەشە داوالێکراوەکە ئەکرێ بەو مەرجەی سوێند بخوا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (وَكالَة) وەکیلایەتی ﴾

واتە: ئیش‌و کاری خۆی بداتە دەست یەکێکی‌تر، تاکو لەجیاتی خۆی بۆی بکا. (وَكُلُّ ما جازَ) هەر شتێك کە دروست بێ (لِلإِنْسانِ) بۆ ئادەمیزاد (اَلتَّصَرُّفُ فِيهِ بِنَفْسِهِ)

جازَ لَهُ أنْ يُوَكِّلَ فيه أوْ يَتَوَكَّلَ عَنْ غَيْرِه، وَالْوَكالةُ عَقْدٌ جائزٌ وَلِكُلٍّ منْهُمَا فَسْخُهَا مَتَى شاءَ، وَتَنْفَسِخُ بِمَوْتِ أحَدِهِمَا، وَالْوَكِيلُ أمِينٌ فِيما يَقْبِضُهُ وَفِيما يَصْرِفُهُ، وَلاَيَضْمَنُ إلاَّ بِالتَّفْرِيطِ،

---

بەخۆی دەستكاری لەو شتەدا بكا: وەك كڕینو فرۆشتنو، ژن مارەكردنو تەلاقدانو ئەو جۆرە شتانە (جازَ لَهُ) بۆی دروستە (أنْ يُوَكِّلَ فِيهِ) يەكێكیتر بكاتە وەكیلی خۆی كە ئیشەكەی بۆ بكا (أوْ يَتَوَكَّلَ عَنْ غَيْرِهِ) یان بەخۆی ببێتە وەكیلی كەسێكیترو ئیشەكە لەجیاتی ئەو بكا ﴿عَنْ عُرْوَة الْبارِقِيﷺ: أنَّ النَّبِيَّﷺ بَعَثَ مَعَهُ بِدِينارٍ لِيَشْتَرِيَ لَهُ أُضْحِيَةً﴾ رواه‌البخاری، (عورووەیباریقی) فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ ناردمی مەڕێكی بۆ بكڕم بۆ قوربانی، واتە: بە وەكیلایەتی.

كەوابوو: دروست نیە منداڵو شێت: نە ببنە وەكیلی كەسێكیتر و نە كەسێك بكەنە وەكیلی خۆیان، بەڵام دروستە سەرپەرشتكاری ئەوان ببێتە وەكیلو وەكیلیش بگرێ بۆ كاروباری ئەوان.

﴿ئاگاداری﴾: هەر خواپەرستییەك تەنها بە زمانو لاشە بێ، دروست نیە وەكیلی بۆ بگیرێ: وەكو نوێژو ڕۆژوو، بەڵام ئەگەر هەر بە ماڵ بوو، یان تێكەڵ لە ماڵو لاشە بوو، ئەوە دروستە كەسێكیتر بكاتە وەكیلی خۆی: وەكو زەكاتو حەجو قوربانیو ئەو جۆرە شتانە ﴿عَنْ جابِرٍﷺ: أنَّ النَّبِيَّﷺ نَحَرَ ثَلاثاً وَسِتِّينَ بَدَنَةً، وَأمَرَ عَلِيّاًﷺ أنْ يَذْبَحَ الْباقِيَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ بە دەستی خۆی شەستو سێ ووشتری سەر بڕین بۆ قوربانیو بە ئیمامی (علی)ی فەرموو: سیو حەفتەكانیتر سەر ببڕێ لەجیاتی وی، واتە: سەد ووشتری كردنە قوربانی.

(وَالْوكالَةُ عَقْدٌ جائِزٌ) وەكیلایەتی مامڵەتێكی وەهایە: دروستە تەواو بكرێو دروستە نەكرێ، كەوابوو: (وَلِكُلٍّ واحِدٍ مِنْهُما) دروستە بۆ وەكیلەكەو بۆ وەكیلگرەكە (فَسْخُها) وەكالەتەكە هەڵبوەشێنێتەوە (مَتَىشاءَ) هەر كاتێ حەز بكا، جیاوازی نیە: بە كرێ بوبێتە وەكیل، یان نا.

(وَتَنْفَسِخُ) وەكالەتەكە هەڵئەوەشێتەوە (بِمَوْتِ أحَدِهِما) بە مردنی یەكێك لە هەردووكیان (وَالْوَكِيلُ أمِينٌ) وەكیل لە شەرعدا بە ئەمین دانراوە (فِيما يَقْبِضُهُ) لەو شتەی وەریئەگرێ بۆ وەكیلگرەكە (وَفِيما يَصْرِفُهُ) وەلەو شتەی سەرفی ئەكا لە ماڵی وەكیلگرەكە.

(وَلاَ يَضْمَنُ) كەوابوو: تۆڵەی ناكەوێتە سەر ئەگەر شتێكی لە دەست چوو، یان زەرەرێكی كرد (إلاَّ بِالتَّفْرِيطِ) تەنها بە كەمتەرخەمی تۆڵەی ئەكەوێتە سەر: وەك بیداتە دەست منداڵێك، یان شێتێك، یان پاسەی دزو درندەی لێنەكا.

وَلاَيَجُوزُ أَنْ يَبِيعَ وَيَشتَرِيَ إلاّ بِثَلاثَةِ شَرائطَ: أَنْ يَبِيعَ بِثَمَنِ الْمِثْلِ، وَأَنْ يَكُونَ نَقْـداً، بِنَقْدِ الْبَلَدِ. وَلاَ يَجُـوزُ أَنْ يَبِيـعَ مِـنْ نَفْسِـهِ، وَلاَ يُقِـرُّ عَلَى مُوَكِّلِـهِ إلاّ بِإذْنِـهِ. (فَصْلٌ) وَالْمُقَرُّبِه ضَرْبانِ: حَقُّ اللهِ تَعالى، وَحَقُّ الآدَمِيِّ،

---

(وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیـه (أَنْ يَبِيـعَ) وەکیلەکـه شت بفرۆشـێو (وَيَشتَرِيَ) شـت بکـڕێ بـه بێپرسی وەکیلگرەکه (إلاّ بِثَلاثَةِ شَرائِطَ) تەنها به سێ مەرج دروسته:

یەکەم: (أَنْ يَبِيعَ بِثَمَنِ الْمِثْلِ) به نرخی هاووێنەی خۆی بکڕێو بفرۆشێ، واته: به چـەند پـاره دەست ئەکەوت، نابێ به زیاتر بیکڕێ، هەروەها چەند پارەی ئەکرد، نابێ به کەمتر بیفرۆشێ.

دووەم: (وَأَنْ يَكُونَ نَقْداً) شته کڕاوەکه، یان پارەکه دەمو دەست وەریگرێو نابێ قـەرز بـێ.

سێیەم: (بِنَقْدِ الْبَلَدِ) به پارەی ئەو شوێنه بفرۆشی نەك به پارەی وولاتێکیتر.

(وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیه (أَنْ يَبِيعَ مِنْ نَفْسِـهِ) وەکیلەکـه شـتەکه بفرۆشـێته خـۆی، هـەروەها دروست نیه شتێکیش له خۆی بکڕێ بۆ وکیلگرەکەی.

هەروەها دروست نیه له مندالّی شێت، یان بچوکی خۆی بکڕێو پێی بفرۆشـێ، هـەر چـەند وەکیلگرەکەش ئیزنی بدا، بەلاّم دروسـته لـه مندالّـه گەورەکـەیو لـه بـاوکی خـۆی بکـڕێو پێیان بفرۆشێ.

(وَلاَ يُقِرُّ) دروست نیه دان به شتێك بنێ (عَلَى مُوَكِّلِهِ) له دژی وکیلگرەکەی خۆی (إلاّ بِإِذْنِـهِ) تەنها به پرسی وی دروسته، وەك بلّێ: وەکیلی من بـه، دان بنـێ بـەوە: کـه (مـن ده دینـار قەرزداری فلانم). بەلاّم فەرموودەی بەهێزتر ئەفەرموێ: به ئیزنیش هەر دروست نیه.

﴿پاشکۆ﴾: دروسته وەکیلەکه له بەرامبـەر وەکیلایـەتی کـرێ وەریگـرێ، بـەلاّم دروسـت نیه-به بێپرسی وەکیلگرەکـه- ئـەویش وەکیلێکیتـر بگـرێ، تـەنها ئەگـەر ئیشـەکه زۆر بـوو، یـان بـەخۆی توانـای نـەبو بیکـا، یـان لێی نەئـەهات، ئـەوە دروسـته بـه بـێئیزن وەکیلێکیتر بگرێ.

ئینجا بزانه: ئەگەر له وەکیلایەتیکەسێك گومانمان هەبوو، ئەبی به دوو شاهید بـاوەڕی پێ بکەین، جا ئەگەر وەکیلەکه گوتی: مالّەکـه دزراوه، یـان لـه نـاو چـووه، یـان گـوتی: داومەتەوه خاوەنی، هیچ شـاهیدیش نـەبو، ئـەوه بـه سـوێند بـاوەڕی پێئەکـەین، بـەلاّم ئەگەر گوتی: داومـەتەوه کەسێکیتر، ئەبی شاهید هەبێ.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی (إقْرار) ﴾

واته: دانهێنان به مافی کەسێکیتر له سەر خۆی. (وَالْمُقَرُّبِهِ) ئەو مافەی ئادەمیزاد له سەر خۆی ئاشکرای ئەکاو دانی پێدا ئەهێنێ (ضَرْبانِ) دوو بەشن:

یەکەم: (حَقُّ اللهِ تَعالَى) مافی خوای گەورەیه: وەکـو زینـاو زەکـاتو ئـەو جـۆرە شـتانه.

دووەم: (وَحَقُّ الآدَمِيِّ) مافی ئادەمیزاده: وەکو قەرزو مالّی زەوتکراو و ئەو جۆرە شتانه.

فَحَقُّ اللهِ تَعالى يَصِحُّ الرُّجُوعُ فِيهِ عَنِ الإقْرارِ بِهِ، وَحَقُّ الآدَمِيِّ لاَيَصِحُّ الرُّجُوعُ فِيهِ عَنْ الإقْرارِ بِهِ، وَتَفْتَقِرُ صِحَّةُ الإقْرارِ إلَى ثَلاثَةِ شَرائِطَ: اَلْبُلُوغِ، وَالْعَقْلِ، وَالإخْتِيـــارِ، وَإنْ كانَ بِمالٍ أُعْتُبِرَ فِيهِ شَرْطٌ رابِعٌ: وَهُوَ الرُّشْدُ،

---

ئینجا بزانە: ئادەمیزاد بە هەرکامیان لەو دووانە دانیهێنا، بەرپرسیار ئـەبێ، واتـە: لـە شەریعەتدا چی لە سەر داندراوە جێبەجێ ئـەکرێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِـــيُّ ﷺ: أُغْدُ يَا أُنَيْسُ إلَى امْرَأَةِ هذا فَإنْ اعْتَرَفَتْ فارْجُمْهَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرموویە سەحابەیەك-كە ناوی (أُنَيْس) بوو-: بـڕۆ لای ئـافرەتی ئـەم پیـاوە ئەگـەر دانیهێنـا بـە زیناکردن، بەردبارانی بکە.

(فَحَقُّ اللهِ تَعالَى) هەر شتێك تەنها مافی خوای گەورە بێ (يَصِحُّ الرُّجُوعُ فِيـهِ) دروسـتە لێی پەشیمان ببێتەوە (عَنِ الإقْرارِ بِهِ) پاش ئەوەی دانی پێدا هێناوە.

بۆ وێنە: ئەگەر بڵێ: من زینام کردوە، ئینجا بڵێ: پەشیمانم، یان بڵێ: بە درۆ وام گوت. ئەوە دروستەو وازی لێئەهێندرێ.

(وَحَقُّ الآدَمِيِّ) بەڵام مافی ئادەمیزاد (لاَ يَصِحُّ الرُّجُوعُ فِيـهِ) دروسـت نیـە پەشیمان ببێتـەوە (عَنِ الإقْرارِ بِهِ) لە دانپێداهێنانی، بۆ وێنە: ئەگەر بڵێ: من دە دیناری فڵان قەرزدارم. ئینجا بڵێ: درۆم کرد، یان بڵێ: پەشیمانم. ئەو پەشیمانیە دروست نیەو وازی لێناهێندرێ.

(وَتَفْتَقِرُ) پێویستی هەیە (صِحَّةُ الإقْرارِ) بۆ ئەوەی دان پێداهێنانەکە دروست بێ (إلَى ثَلاثَةِ شَرائِطَ) ئەبی سێ مەرج بێنەجێ (اَلْبُلُوغُ) یەکـەم: بلۆغی بوبێ. (وَالْعَقْلُ) دووەم: عـەقڵی هەبێ، واتە: منداڵو شێت دان بە هەرشتێکدا بێنن دروست نیـە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِـيَ اللهُ عَنهـا: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ﴾ رواه احمد وغيره، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سێ جـۆرە کـەس نوسینی تاوانیان لە سەر لادراوە، یەکەم: نوستوو تا هەشـیار ئەبێتـەوە. دووەم: منـداڵ تا گەورە ئەبێ. سێیەم: شێت تا چاك ئەبێتەوە.

(وَالإخْتِيارُ) سـێیەم: دان پێداهێنانەکەی بە خۆشی خۆی بێ، کەواتە: ئەگەر لە ترسـان، یان لە بەر لێدان قسەیەکی کردو دانی بە شـتێکدا هێنـا، ئـەوە دروسـت نیـەو بەرپرسـیار نابێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإيمَانِ﴾ کافربوون تـەنها لە سەر ئەو کەسە نانوسرێ: کە زۆری لێکراوەو دڵیشی پڕ لە باوەڕە.

(وَإنْ كـانَ بِمـالٍ) ئەگـەر دان پێداهێنانەکـە بـە مـاڵ بـوو (أُعْتُبِـرَ فِيـهِ شَـرْطٌ رابِـعٌ) ئـەبی مەرجێکی چوارەمینی تێدا بێ (وَهُوَ الرُّشْدُ) ئەویش گونجانی دینو دونیایە، واتە: ئەگـەر (سَفِيه) بڵێ: من قەرزداری فڵانم، بە هیچ داناندرێ.

وَإذا أَقَرَّ بِمَجْهُولٍ رُجِعَ إِلَيْهِ فِي بَيانِه، وَيَصِحُّ اْلإسْتِثْناءُ فِي الإِقْرارِ إِذاوَصَلَهُ بِه، وَهُوَ فِي حالِ الصِّحَّةِ وَالْمَرَضِ سَواءً.
(فَصْلٌ) وَكُلُّ مايُمْكِنُ اْلإنْتِفاعُ بِه مَعَ بَقاءِ عَيْنِه جازَتْ إِعارَتُهُ إِذا كانَتْ مَنافِعُهُ آثاراً، وَتَجُوزُ الْعارِيَةُ: مُطْلَقَةً، وَمُقَيَّدَةً بِمُدَّة،

---

(وَإذا أَقَرَّ بِمَجْهُولٍ) هەر کاتێك دانی هێنا بەشتێکی نەزانداو، وەك بڵێ: شتێکی فلان قەرزدارم (رُجِعَ إِلَيْهِ فِي بَيانِهِ) ئەبی هەر بە ئەو بڵێین بۆمان ڕوون بکاتەوە.
(وَيَصِحُّ الإِسْتِثْناءُ فِي الإِقْرارِ) جیاکردنەوە دروستە لەو شتەی دانی پێدا هێناوە (إِذا وَصَلَهُ بِهِ) بەو مەرجەی بە یەکەوە بیڵێ، واتە: دروستە بڵێ: من سەد دینار قەرزداری فلانم تەنها بیست دینار نەبێ. ئەوە دروستە.
(وَهُوَ) دانهێنان بە هەر مافێك (فِي حالِ الصِّحَّةِ) لەو کاتەی تەندروستی باشە (وَالْمَرَضِ) لەو کاتەی نەخۆشە (سَواءً) هەروەك یەکتری وایە، هەرچەند نەخۆشیەکەش مەترسی مردنی لێبکرێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (عارِيَة) خواستن ﴾

واتە: شتێك لە کەسێکیتر بخوازێ بۆ ئەوەی سودی لێوەربگرێ، ئینجا بیداتەوە.
﴿عَنْ اَنَسٍ ﷺ: كانَ فَزَعٌ بِالْمَدِينَةِ فاسْتَعارَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَساً مِنْ أَبِيطَلْحَةَ فَرَكِبَهُ﴾ رواه البخاري، مەترسیەك لە(مَدینة) ڕوویدا، جا پێغەمبەرﷺ ئەسپێکی لە (أبوطلحة) خوازتو بە سواری ئەسپەکە بەرەو ڕووداوەکە ڕۆیشت.
(وَكُلُّ ما يُمْكِنُ الإِنْتِفاعُ بِهِ) هەر شتێك بگونجێ سودی لێوەربگیرێ (مَعَ بَقاءِ عَيْنِهِ) لەگەڵ ئەوەشدا خودی شتەکە بمێنێ لە دوای بەکارهاتن (جازَتْ إِعارَتُهُ) دروستە بە خوازتن بیداتە کەسێکیتر (إِذا كانَتْ مَنافِعُهُ) بەو مەرجەی سودەکانی ئەو شتە (آثاراً) بمێنێتەوە تا شتەکە مابێ، نەك کۆتایی بێ، کەوابوو: خوازتنی مۆم بۆ داگیرساندن دروست نیە، چونکە بە هۆی بەکارهێنان لەناو ئەچێ.
﴿ئاگاداری﴾: هەر شتێك سود لێوەرگرتنی دروست بێ، بەخوازدانی خێرە، وە هەر شتێك سود لێوەرگرتنی حەرام بێ، بە خوازدانی گوناهە، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَتَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ یارمەتی یەکتری بدەن لە سەر چاکەو خواپەرستی، یارمەتی یەکتر مەدەن لە سەر گوناه و دوژمنکاری.
(وَتَجُوزُ الْعارِيَةُ) شت خوازتن دروستە (مُطْلَقَةً) بە بێماوەدانان (وَمُقَيَّدَةً بِمُدَّةٍ) هەروەها دروستە ببەسترێ بە ماوەیەکی دیارکراو، وەك بڵێ: بۆ ماوەی مانگێك لە لات بێ. ئینجا بزانە: ماوە دیار کرابێ، یان دیار نەکرابێ: بۆ هەردوو لا دروستە پەشیمان ببنەوە.

وَهِـــيَ مَضْـــمُونَةٌ عَلَـــى الْمُسْـــتَعِيرِ بِقِيمَتِهَـــا يَـــوْمَ تَلَفِهَـــا.
(فَـــصْـــلٌ):

(وَهِيَ) ماڵی‌خوازراو ئەگەر لەناو چوو، یان دزرا، یان کەم‌وکوڕی‌ی لێ‌پەیدا بوو (مَضْـمُونَةٌ) تۆڵەی بۆ دانراوە (عَلَى‌الْمُسْتَعِيرِ) لە سەر ئەو کەسەی خوازتویەتی، بەو مەرجەی مندالْ، یان شێت نەبێ (بِقِيمَتِهَا) تۆڵەی بەگوێرەی نرخەکەیەتی (يَوْمَ تَلَفِهَا) نرخی ئـەو ڕۆژەی تێ‌یدا لەناو چووە، هەرچەند کەمتەرخەمیشی نـەکردبێ ﴿عَنْ صَفْوَان بن أُمَيَّـةَ‌ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ‌ﷺ إِستَعارَ مِنْهُ أَدْرُعاً يَوْمَ حُنَيْنٍ فَقالَ: أَغَصْبٌ يَا مُحَمَّدُ‌ﷺ؟ قـالَ: بَـلْ عارِيَـةٌ مَضْمُونَةٌ﴾ رواه‌أبوداود، پێغەمبەرﷺ چەند زرێیەکی خـوازت لـە (سـەفوان) بـۆ جـەنگی (حونەین)، ئینجا (سەفوان) گوتی: ئایا زەوتی ئەکەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵکو بە خوازتن وەریان ئەگرم، ئەگەر لەناو چوون، تۆڵەیان ئەدەم.
﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر بە هۆی بەکارهێنانێکی‌ئیزندراو شتەکە لەناو چـوو، یـان کـەم‌وکوڕی‌ی هێنا، تۆڵەی ناکەوێتە سەر، بەو مەرجەی بەکارهێنانەکە لە سنوور تێنەپـەڕێ‌و لـە منـداڵ‌و شێت نەیخوازتبێ، واتە: ئەگەر داس لە کاتی دروێنەدا شکا، یان وولاغ لە بن باردا، یـان لـە کاتی کێڵاندا گیانی دەرچوو، یان قاچی شکا، تۆڵەی ناکەوێتە سەر، بەڵام: ئەگەر دزرا، یان گورگ خواردی، یان سووتا، یان لـە ڕادە بـەدەر بـە کـاری هێنـا، ئـەوە تۆڵـەی لـە سـەرە، هەروەها ئەگەر لە مندالْ، یان لە شێت خوازتبێتی، تۆڵەی هەر لە سەرە.
﴿پاشکۆ﴾: ئەگەر خاوەنەکەو ماڵخوازەکە بووە کێشەیان، خاوەنەکە ئـەیگوت: بـە کـرێ داومەتە تۆ. ماڵخوازەکەش ئەیگوت: بە خوازتن داوتە. یان خاوەنەکە ئەیگوت: ماڵەکـەت نەداومەوە. ماڵخوازەکەش ئەیگوت: داومەتـەوە. هـیچ شـاهیدیش نـەبو، ئـەوە بـاوەڕ بـە خاوەن ماڵەکە ئەکرێ بەو مەرجەی سوێند بخوا.
ئینجا بزانە: ئەرکی گەڕاندنەوەی ماڵە خوازراوەکە بۆ خاوەنەکەی لە سەر ماڵخوازەکەیە.
﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر بەردو خۆڵ‌و درەختی زەوی‌سەرەوە زەلی بۆ ناو زەوی‌خوارەوە ــ کە هی کەسێکی‌تر بوو ــ ئەوە بەردو خۆڵ‌و درەختەکە هەر هـی خاوەنەکەیـەتی، بـەڵام لە سەری واجبە: لای ببا، یان سولح بکا لەگەڵ خاوەنی خوارەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (غَصْب) ﴾

واتـە: زەوتکـردن‌و داگیرکردنـی مـاڵی کەسـێکی‌تر بـە نامـەق. زەوتکـردن لـە گوناهـە گەورەکانە، جا ماڵی گشتی بێ، یان تایبـەتی بـێ ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّـاسٍ‌رَضِيَ‌اللهُ‌عَنْهُمـا: قـالَ النَّبِيُّ‌ﷺ: إِنَّ دِمائَكُمْ وَأَمْوالَكُمْ وَأَعْراضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرامٌ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: خوێنتان‌و ماڵتان‌و ئابڕوو و ناموستان لە یەکتری حەرامە.

**وَمَنْ غَصَبَ مالاً لأَحَد لَزِمَهُ رَدُّهُ، وَأَرْشُ نَقْصِه، وَأُجْرَةُ مِثْلِه، فَإِنْ تَلِفَ ضَمِنَهُ بِمِثْلِــه إِنْ كانَ لَهُ مِثْلٌ، أَوْ بِقِيمَتِه إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مِثْلٌ: أَكْثَرَ ماكانَتْ مِنْ يَوْمِ الْغَصْبِ إِلَى يَوْمِ التَّلَف.**

---

کەوابوو: ئەگەر داوای شتێکی لە کەسێك کرد، ئەویش لە ترسان، یان لە شەرمان شتەکەی دایێ، یان بە بێ‌ئیزن سواری وولاغێك، یان ئۆتۆمۆبیلێك بوو، یان چووە خانووێك‌و خاوەنەکەی دەرکردە دەرەوە، یان ڕێگای نەدا خاوەنەکە سود لە خانووەکەی وەربگرێ، ئەوانە گشتی بە زەوتکردن دائەندرێن.

(وَمَنْ غَصَبَ مالاً لأَحَد) هەر کەسێك ماڵی کەسێکی‌تر زەوت بکا (لَزِمَهُ رَدُّهُ) واجبە بیداتەوە خاوەنەکەی ﴿عَنْ سَمُرَةَ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: عَلَى الْيَدِ ماأَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّيَهُ﴾ رواه‌أصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر دەستێك شتێکی وەرگرت: ئەبێ بیپارێزێ تا ئەیداتەوە خاوەنی.

﴿ئاگاداری﴾: کرێی گەڕاندنەوەی‌زەوتکراوەکە-بۆ خاوەنەکەی- لە سەر داگیرکەرەکەیە، هەر چەند زۆریش بێ.

(وَأَرْشُ نَقْصِه) هەروەها واجبە تۆڵەی گشت کەم وکوڕیەکیشی بداتێ (وَأُجْرَةُ مِثْلِه) ئەبێ کرێیەکەشی بداتێ بۆ ئەو ماوەیەی لە لای ماوەتەوە، هەر چەند بە کاریشی نەهێنابێ، وە ئەبێ تۆڵەی لە دەستچوونی بەروبومەکانی‌تریشی بژمێرێ کە لە دەست چوینە: وەك میوەی درەخت‌و شیری بزن‌و مەڕ.

(فَإِنْ تَلِفَ) جا ئەگەر شتە زەوتکراوەکە لە ناو چوو (ضَمِنَهُ) ئەبێ زەوتکەرەکە تۆڵەی بدا (بِمِثْلِه) با هەر وێنەی شتە زەوتکراوەکە لە تۆڵە بدا (إِنْ كانَ لَهُ مِثْلٌ) ئەگەر وێنەی هەبوو: بە کێشانی تەرازو، یان بە پێوانی ڕبە (أَوْ بِقِيمَتِه) یان نرخی زەوتکراوەکە لە تۆڵە بدا (إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مِثْلٌ) ئەگەر وێنەی نەبو، یان وێنەی هەبوو، بەڵام دەست نەئەکەوت (أَكْثَرَ ما كانَتْ) کام نرخ زۆرترە ئەبێ ئەو نرخە بدا (مِنْ يَوْمِ الْغَصْبِ) لە کاتی داگیرکردنیەوە (إِلَى يَوْمِ التَّلَفِ) تا کاتی لەناوچوونی:

واتە: ئەگەر لە کاتی داگیرکردنی نرخی پێنج دینار بوو، لە ڕۆژی لەناوچوونیشی نرخی شەش دینار بوو، ئەبێ شەش دینار لە تۆڵە بدا.

﴿پاشکۆ﴾: یەکەم: هەر کەسێك ماڵە زەوتکراوەکە لە داگیرکەرەکە وەربگرێ‌و مەبەستی ئەوە نەبێ بیداتەوە خاوەنەکەی، ئەویش بە داگیرکەر دائەندرێ، هەروەها ئەگەر بە زۆرلێکردن شتێکیان پێ داگیر کرد، ئەوە زۆرلێکراوەکەش بە داگیرکەر دائەندرێ، بەڵام کە تۆڵەی‌دا، ئەتوانێ بچێ ئەندازەی تۆڵەکە لە زۆردارەکە وەربگرێتەوە.

دووەم: ئەگەر داگیرکەرێك لە زەویەکی داگیرکراودا خانووی کرد، یان درەختی چاند، یان بیرێکی هەڵکەند، واجبە: خانووەکەو درەختەکە لابباو شوێنە تێکچووەکان‌و بیرەکە

پڕ بکاتەوە، هەر چەند زەرەرێکی زۆریش بکا، هەروەها ئەبی کرێیەکەو تۆڵەی کەموکوڕیش بدا ﴿عَنْ عُرْوةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَيْسَ لِعِرْقٍ ظالِمٍ حَقٌّ﴾ رواه أبوداود، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕەگی بە زۆرداری مافی مانەوەی نیە.

سێیەم: هەر کەسێك ماڵی کەسێکیتری بە حەرامی کەوتە لا: وەکو ماڵی ڕیباو شەرابیو دزیاریو زەوتکراو، ئەوانە گشتی ئەبی بدرێتەوە خاوەنەکانیان، جا ئەگەر شتەکان لە ناو چوبون، ئەبی تۆڵەیان بداتەوە خاوەنەکانیان، ئەگەر خاوەنەکانیان نەمابون، ئەبی بیداتەوە میراتگرەکانیان، ئەگەر هیچ میراتگریان نەبو، ئەبی بیداتە (قازی)ی ئیسلام، ئەگەر (قازی) نەبو، یان فاسق بوو، ئەبی بیداتە دەست پیاوێکی لێهاتووی دادپەروەر، جا ئەگەر نەبو، ئەبی بەخۆی سەرفی بکا لە بەرژەوەندی موسوڵمانان، یان دابەشی بکا بە سەر هەژاراندا، جا ئەگەر بە خۆیشی هەژار بوو، دروستە بە ئەندازەی هەژارێك بەشی خۆی دابنێ، ئینجا ئەگەر خاوەنەکەی ئاشکرا بوو، ئەبی تۆڵەی گشتی بداتێ.

چوارەم: ئەگەر بە ماڵی ڕیبا، یان شەرابی، یان دزیاری، یان زەوتکراو شتێکی کڕی، ئەو کڕینە دانامەزرێو دروست نیە، واتە: نابێتە ملکی کڕیارەکەو ناشبێتە ملکی خاوەنەکان، کەوابوو: شتە کڕاوەکە بە قازانجەوە هەر هی فرۆشیارەکەیە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (شُفْعَة) ﴾

واتە: یەکێك لە هاوبەشەکان بەشەکەی خۆی بفرۆشێ، ئینجا هاوبەشەکەیتر بچێ شتەکە لە کڕیارەکە بستێنێتەوە بەو پارەیەی پێی کڕیوە، هەرچەند پێشی خۆش نەبێ.

﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلشُّفْعَةُ في كُلِّ شِرْكٍ لَمْ يُقْسَمْ: في أَرْضٍ، أَوْ رَبْعٍ، أَوْ حائِط، لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبيعَ حَتَّى يَعْرِضَ عَلَى شَرِيكِهِ فَيَأْخُذَ أَوْ يَدَعَ، فَإِذا باعَ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شوفعە لە گشت شتێکی هاوبەشدا هەیە کە بەش نەکرابێ: زەوی بێ، یان باغ بێ، یان خانوو بێ، دروست نیە: خاوەن بەشەکە بە بێئیزنی هاوبەشەکەیخۆی بیفرۆشێ، جا بیەوێ، یان نەیەوێ، جا ئەگەر بە بێپرس فرۆشتی، ئەو کاتە هاوبەشەکەی مافی هەیە بە شوفعە وەریبگرێتەوە.

(وَالشُّفْعَةُ) وەرگرتنەوەی ماڵیفرۆشراو، بە شوفعە (وَاجِبَةٌ) لە شەرعدا هەیە (بِالْخُلْطَةِ) بە هۆی هاوبەشی (دُونَ الْجِوارِ) نەك بە هۆی دراوسێیەتی، واتە: ئەگەر دراوسێیەك خانووەکەی، یان زەوییەکەی فرۆشت، دراوسێیەکەیتر ناتوانێ بە شوفعە وەریبگرێتەوە، بەلام بە مەزهەبی ئیمامی(حنفی): ئەتوانێ وەریبگرێتەوە ﴿عَنْ أَبِي رافِعٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلْجارُ أَحَقُّ بِصَقَبِهِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دراوسێ لەپێشترە بە هۆی نزیکیی کە ماڵی دراوسێیەکەی وەریگرێتەوە.

فِيما يَنقَسِمُ دُونَ مَا لاَ يَنقَسِمُ، وَفِي كُلِّ مَا لاَيُنقَلَ مِنَ الأَرْضِ كَالْعَقارِ وَغَيْرِهِ، بِالثَّمَنِ الَّذِى وَقَعَ عَلَيْهِ الْبَيْعُ، وَهِيَ عَلَى الْفَوْرِ، فَإِنْ أَخَّرَها مَعَ الْقُدْرَةِ عَلَيْها بَطَلَتْ. وَإِذا تَزَوَّجَ امْرَأَةً عَلَى شِقْصٍ أَخَذَهُ الشَّفِيعُ بِمَهْرِ الْمِثْلِ، وَإِنْ كانَ الشُّفَعَاءُ جَماعَةً اسْتَحَقُّوها عَلَى قَدْرِ الْأَمْلاَكِ.

---

(فِيما يَنْقَسِمُ) شوفعه لەو شتەدا هەیە کە بگونجێ بەش بکرێ (دُونَ مالا يَنْقَسِمُ) نەك لەو شتەی کە بەش نەکرێ: وەکو ژوورێکی بچکۆلە، یان پارچە زەوییەکی کەم، واتە: ئەگەر بەش بکرێ سودی لێوەرنەگیرێ.

(وَفِي كُلِّ ما لاَ يُنْقَلُ مِنَ الأَرْضِ) هەروەها شوفعە لەو شتەدا هەیە کە نەگوازرێتەوە لە زەمین (كَالْعَقارِ) وەکو زەوی‌و (وَغَيْرِهِ) شتی‌تر: وەکو خانوو و درەختی تەڕ لە زەویە فرۆشراوەکەدا.

(بِالثَّمَنِ الَّذِي) هاوبەشەکە هەر بەو پارەیە بەشەکە ئەستێنێتەوە: کە (وَقَعَ عَلَيْهِ الْبَيْعُ) بەشەکەی پێ فرۆشراوە بە بێ کەم‌و زیاد، کەوابوو: ئەگەر بەشەکە نەفرۆشرابو، بەڵکو بەخشرابو، یان نەزر کرابو، یان وەقف کرابو، یان بە میرات چوبو، لەوانەدا– لە هیچیان– شوفعەی بۆ نیە.

(وَهِيَ) وەرگرتنەوەی بە شوفعە (عَلَى الْفَوْرِ) دەموودەستە (فَإِنْ أَخَّرَها) ئەگەر وەرگرتنەوەی دواخست (مَعَ الْقُدْرَةِ عَلَيْها) لەگەڵ ئەوەش توانای هەبوو (بَطَلَتْ) شوفعەکەی بەتاڵ ئەبێ‌و مافی ئەسوتێ، بەڵام ئەگەر توانای نەبو؟ چونکە لە شوێنێکی‌تر بوو، یان لە بەندیخانە بوو، یان نەیزانی ملکەکە فرۆشراوە، یان نەیزانی مافی شوفعەی هەیە، یان لە ترسان داوای نەکرد، ئەوە مافی ناسوتێ، کەوابوو: با وەکیلێك بگرێ تاکو داوای بۆ بکا، یان با لە لای دوو شاهید بڵێ: من داوای شوفعە ئەکەم.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر هاوبەشەکە منداڵ بوو، یان شێت بوو، یان مزگەوت بوو، ئەبێ سەرپەرشتکارەکەیان داوای شوفعەیان بۆ بکا، جا ئەگەر ئەو داوای نەکرد، ئەوان مافیان ناسوتێ، کەوابوو: کاتێ منداڵ گەورە بوو و شێت چاك بۆوە، بە شوفعە وەری‌ئەگرنەوە، بەڵام ئەگەر لە بەر بەرژەوەندیی ئەوان داوای نەکردبو، ئەو کاتە مافیان ئەسوتێ.

(وَإِذا تَزَوَّجَ امْرَأَةً) هەر کاتێك ئافرەتێکی مارە کرد (عَلَى شِقْصٍ) لە سەر بەشێکی ماڵە هاوبەشەکە، واتە: بەشەکەی‌خۆی کردە مارەیی‌ئافرەتەکە (أَخَذَهُ الشَّفِيعُ) هاوبەشەکەی‌تر لە ئافرەتەکەی ئەستێنێتەوە (بِمَهْرِ الْمِثْلِ) بە مارەیی هاوچەشنی ئافرەتەکە.

(وَإِنْ كانَ الشُّفَعاءُ جَماعَةً) ئەگەر هاوبەشەکان کۆمەڵێك بون (إِسْتَحَقُّوها) گشتیان مافی وەرگرتنەوەیان هەیە (عَلَى قَدْرِ الأَمْلاَكِ) بە ئەندازەی بەشە ملکەکەی‌خۆیان، واتە: ئەگەر یەکێك چوارێکی هەبوو، ئەوە چوارێکی بەشەفرۆشراوەکە وەرئەگرێتەوە، ئەگەر ئەوی‌تر

(فَصْلٌ) وَلِلْقِراضِ أَرْبَعَةُ شَرائِطَ: أَنْ يَكُونَ عَلَى نَاضٍ مِنَ الدَّراهِمِ وَالدَّنانِيرِ، وَأَنْ يَأْذَنَ رَبُّ الْمالِ لِلْعامِلِ فِي التَّصَرُّفِ مُطْلَقاً أَوْ فِيما لاَ يَنْقَطِعُ وُجُودُهُ غَالِباً، وَأَنْ يَشْتَرِطَ لَهُ جُزْأً مَعْلُوماً مِنَ الرِّبْحِ، وَأَنْ لاَ يُقَدَّرَ بِمُدَّةٍ.

---

سێیەکی هەبوو، ئەویش سێیەکێك وەرنەگرێتەوە، ئەوەی شەشێکی هەیە، ئەویش شەشێکێك وەرنەگرێتەوە. جا ئەگەر یەکێك گوتی: من بەشی خۆم وەرناگرمەوە. ئەبێ ئەوی‌تر گشت فرۆشراوەکە وەربگرێتەوە، یان واز لە گشتی بێنێ.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی (قِراض) مامەڵەتی قازانجی‌هاوبەش ﴾**

واتە: کەسێك پارە بداتە کەسێکی‌تر بۆ ئەوەی بازرگانی پێ بکاو قازانجەکەشی بۆ هەردووکیان بێ، بەڵام سەرمایەکە تەنها بۆ خاوەنەکەیەتی، جا ئەگەر نەختێکی نەمابو، یان هیچی نەمابو، نابێ تۆڵە لە کرێکارەکە وەربگرێ. ﴿عَنْ نُفَيْسَةَ بِنْت مُنَيَّة رَضِيَ اللهُ عَنها: ضارَبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِخَدِيجَةَ -رَضِيَ اللهُ عَنها- بِمالِها إِلَى الشَّامِ﴾ رواه أبو نعيم وغيره، پێغەمبەر ﷺ لە (مَكَّة)وە ماڵی (خَدِيجَة)ی بردە شام بۆ بازرگانی‌کردن. هەروەها سەحابەی پێغەمبەر ﷺ یەکدەنگن کە (قِراضْ) دروستە.

(وَلِلْقِراضِ) واجبە بۆ دروستبوونی (قِراضْ): (أَرْبَعَةُ شَرائِطَ) چوار مەرج بێنە جێ:

یەکەم: (أَنْ يَكُونَ عَلَى نَاضٍ) رێککەوتنەکە لە سەر پارەی لێدراو بێ (مِنَ الدَّراهِمِ) دیرهەم بێ‌و (وَالدَّنانِيرِ) دینار بێ، کەوابوو: دروست نیە-جگە لە پارە-کەلوپەلێکی‌تری بداتێ، وەك بڵێ: ئەم گەنمەم بۆ بفرۆشە قازانجمان بە نیوەیی.

دووەم: (وَأَنْ يَأْذَنَ رَبُّ الْمالِ) خاوەن پارەکە ئیزن بدا (لِلْعامِلِ) بۆ کرێکارەکە، واتە: ئەوەی بازرگانی بۆ ئەکا (فِي التَّصَرُّفِ مُطْلَقاً) کە بە بۆچوونی‌خۆی شت بکرێ‌و بفرۆشێ، واتە: نابێ بۆی دیاری بکا (أَوْ فِيما) یان ئەگەر بۆی دیاری‌کرد ئەبێ (لاَ يَنْقَطِعُ وُجُودُهُ غَالِباً) ئەو شتە بە درێژایی ساڵ نەبڕێتەوە: وەکو گەنم‌و جۆ، واتە: ئەگەر گوتی پارەت ئەدەمی تەنها بازرگانی لە گەنم‌و جۆدا بکە، ئەوە دروستە.

سێیەم: (وَأَنْ يَشْتَرِطَ لَهُ) واجبە خاوەنەکە دیاری بکا بۆ کرێکارەکە: (جُزْأً مَعْلُوماً) بەشێکی زانراو (مِنَ الرِّبْحِ) لە قازانجی ئەو بازرگانی‌یە، وەك بڵێ: نیوەی‌قازانج، یان سێیەکی قازانج بۆ تۆ.

چوارەم: (وَأَنْ لاَ يُقَدَّرَ بِمُدَّةٍ) نابێ ئەو پێکهاتنە بۆ ماوەیەکی دیارکراو بێ، بەڵکو ئەبێ بە بێ‌ماوەدانان پێك بێن، جا هەر کاتێك یەکێکیان ویستی هەڵیبوەشێنێتەوە، دروستە.

﴿ئاگاداری﴾: دروستە دوو کەس پارە بدەنە یەك کرێکار: جا هەر یەکەیان بەشە قازانجێکی بۆ دیاری بکا، هەروەها دروستە دوو کرێکار بازرگانی بۆ یەك خاوەن پارە بکەن، بەو مەرجەی بەشە قازانجی هەردووکیان دیاری بکرێ، هەرچەند یەکسانیش نەبن لە قازانجەکەدا.

ئینجا بزانە: دروست نیە کرێکارەکە پارە بداتە کرێکارێکیتر و بەشە قازانجێکی بۆ دیاری بکا، هەرچەند خاوەن پارەکەش ڕازی بێ، هەروەها دروست نیە خاوەن پارەکە بڵێ: ئەبی پارەکە لای خۆم بێ، یان بڵێ: ئەبی فڵانیش لەگەڵتا بێ.

(وَلاَ ضَمانَ عَلَى الْعامِلِ) تۆڵە ناکەوێتە سەر کرێکارەکە ئەگەر ماڵەکە لەناو چوو (إلاَّ بِعُدْوانٍ) تەنها بە دوژمنکاری‌و کەمتەرخەمی نەبێ، وەك کڕین‌و فرۆشتنی قەدەغەکراو بە بێ‌پرسی خاوەن پارەکە، یان ڕابردن بە ڕێگەی پڕ ترسدا، یان لە شارێك بیباتە شارێکیتر بە بێ‌ئیزن، هەروەها دروست نیە بە زەرەر، یان بە قەرز بکڕێ‌و بفرۆشێ بە بێ‌پرسی خاوەن پارەکە.

(وَإذا حَصَلَ رِبْحٌ) هەر کاتێك ئەو بازرگانی‌یە لە لایەك قازانجی دا (وَخُسْرانٌ) لە لایەکیتر زەرەری دا (جُبِرَالْخُسْرانُ بِالرِّبْحِ) زەرەرەکە بە قازانجەکە پڕ ئەکرێتەوە–ئەگەر قازانج هەبێ– واتە: ئەگەر جارێك سەد دیناری قازانج کرد، جارێکیتریش سەد دیناری زەرەر کرد، ئەبی ئەو سەد دینارە لەجیاتی ئەم سەد دینارە دابندرێتەوە، واتە: نابێ بەشی بکەن.

کەوابوو: ئەو پارەیەی لە گومرگ لێی وەرئەگرن‌و ئەو پارەیەی ئەیداتە کرێی بارکردن‌و گواستنەوەو هەرزانبوونی نرخی بازاڕو ئەو شتەی لێی ئەدزرێ، یان لەناو ئەچێ، ئەوانە گشتی بە زەرەر دائەنرێن‌و ئەبی قازانجەکەیان لە جێ دابندرێ.

﴿ئاگاداری﴾: هیچ جیاوازی نیە زەرەرەکە: لە پێش قازانج کردندا بێ، یان لە دوای قازانج کردن، واتە: هەر پێی پڕ ئەکرێتەوە.

دیسان ئاگاداربە: دروست نیە لە ماڵەوە بە پارەی (قِراض): نە خۆی‌و نە منداڵەکانی بەخێو بکاو نابێ خێریشی پێ‌بکا.

بەڵام لە کاتی بە سەفەرچوون بۆ کڕین‌و فرۆشتن، فەرموودەیەکی ئیمامی(شافعي) هەیە: کە ئەو مەسرەفەی بە هۆی سەفەر زیاد ئەکا، دروستە لە پارەی (قِراض) بیدا: وەکو پارەی ئۆتۆمبێل‌و میوانخانە، جا ئەمەش هەر بەزەرەر دائەندرێ‌و لە قازانج پڕ ئەکرێتەوە.

ئینجا بزانە: ئەو نیشانەی بازرگانەکان بە دەستی خۆیان ئەیکەن، ئەبی کرێکارەکەش بە دەستی خۆی بیکاو نابێ کرێی لێبدا.

﴿پاشکۆ﴾: ئەگەر کرێکارەکە گوتی: هیچ قازانجم نەکردوە. یان ئەم شتەم بۆ خۆم کڕیوە. یان بۆ بازرگانی کڕیومە. یان گوتی: هەر ئەوەندە پارەت داومێ. یان گوتی: ماڵەکەم لێدزراوە. یان لێیان سەندم. لەوانەدا–گشتی–بە سوێندخواردن باوەڕی پێ‌ئەکرێ.

(فَصْلٌ) وَالْمُسَاقَاةُ جائزَةٌ عَلَى النَّخلِ وَالْكَرْمِ، وَلَهَا شرْطان، أَحَدُهُما: أَنْ يُقَدِّرَها بِمُدَّة مَعْلُومَة، وَالثَّاني: أَنْ يُعَيِّنَ للْعاملِ جُزْأً مَعْلُوماً منَ الثَّمَرَة. ثُمَّ الْعَمَلُ فيها عَلَىضَرْبَيْنِ: عَمَلٌ يَعُودُ نَفْعُهُ إِلَى الثَّمَرَة فَهُوَ عَلَىالْعاملِ، وَعَمَلٌ يَعُودُ نَفْعُهُ إِلَى الأَرْضِ فَهُوَ عَلَى رَبِّ الْمالِ.

### ﴿ فَصْلٌ: له باسی(مُساقاة) باغەوانی ﴾

واته: خاوەن باغەكە يەكێكیتر بە كرێ بگرێ بۆ ئاودانو پەروەردەكردنی درەختەكانیو بەشێكی دیاركراوی لە میوەی درەختەكانی بداتێ.

(وَالْمُساقاةُ) باغەوانی (جائِزَةٌ) دروستە (عَلَى النَّخْلِ) لە سەر دارخورماو (وَالْكَرْمِ) لە سەر داریترێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَاللهُ عَنهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عامَلَ اَهْلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مايَخْرُجُ مِنْها مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ﴾ رواهالشيخان، پێغەمبەرﷺلەگەڵ دانیشتووانی(خَيْبَر) پێك هات: كە باغەكانی ئاو بدەنو پەروەردەی بكەن، نیوەی بەرهەمەكەی: میوە، یان كشتوكاڵیان بداتێ.

﴿ئاگاداری﴾: لە فەرموودەی كۆنی ئیمامی(شافعي)دا: ئەو باغەوانیە لە سەر گشت درەختێكی بەردەر دروستە.

(وَلَها شَرْطان) بۆ دروستبوونی باغەوانی دوو مەرج پێویستن (أَحَدُهُما) یەكەمیان: (أَنْ يُقَدِّرَها بِمُدَّةٍ مَعْلُومَةٍ) ئەبی ئەو باغەوانیە ماوەیەكی زاندراوی بۆ دابندرێ، كە لەو ماوەیەدا بەرەكەی پێبگا، وەكو ماوەی ساڵێك، یان نۆ مانگ، واتە: دروست نیە بڵێ: تا میوە پێئەگا.

(وَالثَّانِي) مەجی دووەم: (أَنْ يُعَيِّنَ لِلْعامِلِ) ئەبی خاوەن باغەكە دیاری بكا بۆ باغەوانەكە (جُزْءً مَعْلُوماً) بەشێكی زاندراو (مِنَ الثَّمَرَةِ) لە میوەی ئەو درەختانە، وەك بڵێ: نیوە، یان سێیەكی میوەكەت ئەدەمێ. جا ئەگەر درەختەكان میوەیان نەگرت، یان لەناو چون، ئەبی باغەوانیەكەی تەواو بكاو داوای هیچیش نەكا.

(ثُمَّ) ئینجا (الْعَمَلُ فِيها) كاركردن لەو باغانەدا (عَلَى ضَرْبَيْنِ) لە سەر دوو شێوەیە (عَمَلٌ يَعُودُ نَفْعُهُ إِلَى الثَّمَرَةِ) یەكەمیان: سودی ئەگەڕێتەوە بۆ میوەی درەختەكان (فَهُوَ عَلَى الْعامِلِ) ئەمەیان لە سەر كرێكارەكەیەو ئەبی بیكا: وەك ئاودانو پاككردنەوەی جۆگەو گوڵ لێدانو هەڵكەندنو لابردنی درِكو گیاو لێكردنەوەو وشككردنەوەی میوەو پاسەوانیو ئەو جۆرە شتانە.

(وَعَمَلٌ) دووەمیان: كاری واهەیە (يَعُودُ نَفْعُهُ) سودی ئەگەڕێتەوە (إِلَى الأَرْضِ) بۆ زەویەكە (فَهُوَ عَلَى رَبِّ الْمالِ) ئەمەشیان لە سەرخاوەن ملكەكەیە: وەك دیواردانانو هەڵكەندنیجۆگەو ئامێرو وڵاغی كێڵانو ئامێریئاوهێنانو ئەو جۆرە شتانە.

﴿ئاگاداری﴾: نیوە باغی دروست نیە، وەك بڵێ: (زەویەكەم درەختی تێدا بچێنە بە نیوەییمان). یان بڵێ: (ئەم درەختانەی من لە زەویەكەیخۆتدا بچێنە بە نیوەییمان). یان

(فَصْلٌ) وَكُلُّ مَا أَمْكَنَ الْإِنْتِفاعُ بِهِ مَعَ بَقاءِ عَيْنِه صَحَّتْ إجارَتُهُ، إِذا قُدِّرَتْ مَنْفَعَتُهُ بِأَحَدِ أَمْرَيْنِ: بِمُدَّةٍ، أَوْ عَمَلٍ، وَإِطْلاَقُها يَقْتَضِي تَعْجِيلَ الْأُجْرَةِ

---

بلّێ: (ئەم درەختانەی من لە زەویەکەی مندا بچێنە بە نیوەییمان). کەوابوو: ئەبی خاوەن درەخت کرێی زەویەکە بداو درەختەکانیش گشتی بۆ خۆی، جا ئەگەر درەختو زەوی هەردووکیان هی خۆی بوو، ئەبی کرێی ماندوبوونی کرێکارەکە بدا.

﴿پاشکۆ﴾: ئەگەر باغەوانەکە گوتی: هیچیتر کار ناکەم، یان رایکرد، یان نەخۆش بوو، یان خرایە بەندیخانە، با خاوەن باغەکە بچێتە لای (قازی)، بۆ ئەوەی لە کیسەی باغەوانەکە یەکێکیتر بە کرێ بگرێ، جا ئەگەر(قازی) نەبو، با خاوەنەکە بەخۆی یەکێکیتر بە کرێ بگری، یان هەر بەخۆی باغەوانیەکە بکا، بەڵام ئەبی دوو شاهید بگرێ بۆ ئەوەی بتوانێ کرێیەکە لە باغەوانەکە وەربگرێتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر باغەوانەکەی دیارکراو مرد، باغەوانیەکە هەڵئەوەشێتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (إجارة) بەکرێدان و بەکرێگرتن ﴾

(وَكُلُّ ما أَمْكَنَ الْإِنْتِفاعُ بِهِ) هەرشتێکێ بگونجێ سودی لێوەربگیرێو (مَعَ بَقاءِ عَيْنِهِ) خودی شتەکەش بمێنێ تا ماوەی بەکرێدان کۆتایی دێ (صَحَّتْ إِجارَتُهُ) دروستە بە کرێ بدرێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەگەر ئافرەتەکان منداڵیان بۆ ئێوە شیردا، کرێیەکەیان بدەنێ. ﴿وَعَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ إِسْتَأْجَرَ دَلِيلاً فِي الْهِجْرَةِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی شارەزای بە کرێ گرت لە کاتی کۆچکردن بۆ ئەوەی لە رێگەیان شارەزا بکا.

جا ئەگەر نەگونجا سودی لێوەربگیرێ: وەك بەکرێدانی شتی گومبوو، یان داگیرکراو، یان بەکرێگرتنی کوێر بۆ پاسەوانی، ئەوە دروست نیە، هەروەها ئەگەر خودی شتەکە نەئەماوە: وەك بەکرێدانی بەفر بۆ ساردکردنەوەی ئاو، یان بەکرێدانی گوڵاو بۆ خۆ بۆنخۆشکردن، ئەوەش دروست نیە.

(إِذا قُدِّرَتْ مَنْفَعَتُهُ) بەکرێدان بەو مەرجە دروستە کە ئەندازەی سودوەرگرتن دیاری بکرێ (بِأَحَدِ أَمْرَيْنِ) بە یەکێك لەم دوو شێوەیە:

(بِمُدَّةٍ) یان ئەبی ئەندازەکە بە ماوەیەکی دیارکراو بێ، وەك بڵێ: ئەم خانووەم بە کرێ دایە تۆ، بۆ ماوەی ساڵێك بە سەد دینار. (أَوْ عَمَلٍ) یان ئەبی بە کردنی کارێکی دیارکراو بێ، وەك بڵێ: ئەم جلەم بۆ بدوورە بە دە دینار. کەواتە: ئەگەر گوتی: ئەم خانووەم بە کرێ دایە تۆ، هەر مانگێك دە دینارم بدێ. ئەوە دروست نیە، چونکە ماوەی بۆ دیاری نەکراوە.

(وَإِطْلاَقُها) دیارینەکردنی کاتی دانی کرێیەکە، واتە: نەیانگوت: ئێستا کرێیەکە بدرێ، یان قەرز بێ (يَقْتَضِي) وا ئەگەیەنێ کە واجبە: (تَعْجِيلَ الْأُجْرَةِ) کرێیەکە

**إلاّ أنْ يُشْتَرَطَ التَّأجيلُ، وَلاَ تَبْطُلُ الإجارَةُ بِمَوْتِ أحَدِ المُتَعاقِدَيْنِ، وَتَبْطُلُ بِتَلَفِ العَيْنِ المُسْتَأجَرَةِ، وَلاَ ضَمانَ عَلَى الأجيرِ إلاّ بِعُدْوان.**

---

دەمودەست بدرێ (إلاّ أنْ يُشْتَرَطَ التَّأجيلُ) مەگەر بەو مەرجە پێك بێن: كە كرێیەكە قەرز بێ، بە مە ئەبێتە قەرز.

**﴿ئاگاداری﴾**: پێویستە بزانرێ: كرێیەكە چەندەو چۆنە؟ كەوابوو: ئەگەر گوتی: وا دامە تۆ بە كرێ، ئینجا لە مەودوا پێك دێین. یان گوتی: بە نیوەكاری ئەم دوو مەڕە بەخێو بكە، یان یەكێكیانی بۆ تۆ. یان گوتی: ئەم كارەم بۆ بكە نرخی بازار چەند بوو، ئەوەندەت دەدمێ. ئەوانە هیچیان دروست نیە.

(وَلاَ تَبْطُلُ الإجارَةُ) بەكرێدان هەڵناوەشێتەوە (بِمَوْتِ أحَدِالمُتَعاقِدَيْنِ) بە مردنی یەكێك لە بەكرێدەرو بەكرێگر، یان هەر دووكیان، كەوابوو: هەر كامیان مرد، میراتگرەكەیان لە شوێنیان دائەنیشێ.

(وَتَبْطُلُ) بەڵام بەكرێدان هەڵئەوەشێتەوە (بِتَلَفِ العَيْنِ المُسْتَأجَرَةِ) بە لەناوچوونی ئەوشتەی كە بەكرێگیراوە، واتە: ئەگەر خانووەكە تێك دڕا، یان وولاغەكە مرد، یان كرێكارەكە مرد، بەكرێدانەكە هەڵئەوەشێتەوە.

**﴿ئاگاداری﴾**: مەرجەكانی بەكرێدەرو بەكرێگر: وەكو كڕیارو فرۆشیارە، كەوابوو: نابێ هیچیان مندالْ، یان شێت بن.

(وَلاَ ضَمانَ عَلَى الأجيرِ) تۆڵەی شتە بەكرێدراوەكە لە سەر ئەو كەسە نیە كە بەكرێی گرتوە، ئەگەر لەناو چوو، یان كەموكوڕیی لێپەیدا بوو (إلاّ بِعُدْوانٍ) تەنها بە هۆی خیانەتكاریو كەمتەرغەمی نەبێ: وەك لە ئەندازە زیاتر كاری پێبكا، یان لە شوێنێكی بێپاسەوان دایبنێو بدزرێ، بە مە تۆڵەی ئەكەوێتە سەر.

هەروەها ئەگەر كەسێك بە كرێ گیرابێ بۆ كاركردنێك، یان بۆ پاراستنی شتێك، وەك شوانو بەرگدروو و پاسەوان، ئەو جۆرە كەسانە تۆڵەیان لە سەر نیە ئەگەر خیانەت نەكەن، جا ئەگەر سوێند بخۆن كە خیانەتیان نەكردوە، باوەڕیان پێئەكرێ.

**﴿پاشكۆ﴾**: ئەگەر بووە كێشەیان: ئایا ماوەی بەكرێدانەكە چەندە؟ یان كرێیەكە چەندەو چۆنە؟ یان ئەندازەی شتە بەكرێدراوەكە چەندە؟ ئەبی هەردووكیان سوێند بخۆن-ئەگەر شاهید نەبو- ئینجا بەكرێدانەكە هەڵئەوەشێتەوە، جا ئەگەر بەكرێگرەكەش هیچ سوودێكی وەرگرتبو، ئەبی كرێی هاوێنەی ئەو سودە بدا.

جا بزانە: ئەگەر بەكرێگرەكە گوتی: شتە بەكرێگراوەكەم گەڕاندۆتەوە. ئەوە بە بێشاهید باوەڕی پێناكرێ، هەروەها كرێی گەڕاندنەوەی بەكرێدراوەكە لە سەر خاوەنەكەیەتی، واتە: لە سەر بەكرێگرەكە نیە.

(فَصْلٌ) وَالْجَعالةُ جائِزَةٌ، وَهِيَ أَنْ يَشْتَرِطَ فِي رَدِّ ضالَّتِه عِوَضاً مَعْلُوماً، فَإِذا رَدَّها اسْتَحَقَّ ذَلِكَ الْعِوَضَ الْمَشْرُوطَ.
(فَصْلٌ) وَإِذَا دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ أَرْضاً لِيَزْرَعَها وَشَرَطَ لَهُ

---

﴿ فَصْلٌ: له باسى (جَعالَة) ﴾

واتە: بلێ: هەر کەسێك ئەم کارەم بۆ بکا ئەو شتەی ئەدەمێ. (وَالْجَعالَةُ جائِزَةٌ) جەعالە دروستە ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدالْخُدْرِيِّﷺ: أَنَّ سَيِّدَ حَيٍّ لُدِغَ، فَشَرَطَ عَلَيْهِم بَعْضُ أَصْحابِ النَّبِيِّﷺ ثَلاثِينَ شاةً عَلَىأَنْ يَرْقِيَهُ، فَرَقاهُ وَأَخَذَ الْجُعْلَ، فَقالَ النَّبِيُّﷺ: أَصَبْتُمْ إِقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ﴾ رواەالشیخان، گەورەیەکیعەرەب دووپشك پێیوەداو داوای دوعایان لە هاوڕێکانی پێغەمبەرﷺ کرد، جا یەکێکیان گوتی: بەو مەرجەی سی مەڕمان بدەنێ، ئینجا دوعای بۆ کردو مەڕەکانیان وەرگرتنو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باشتان کرد، مەڕەکان بەش بکەنو بەشی منیش بدەن.

(وَهِيَ) جەعالە ئەمەیە (أَنْ يَشْتَرِطَ) بە مەرج بگرێ بۆ کەسێکیتر (فِي رَدِّ ضالَّتِه) لە بەرانبەر هێنانەوەی شتە ونبووەکەی، یان لە بەرانبەر کردنیکارێکیتر (عِوَضاً مَعْلُوماً) کرێیەکی زاندراو.

(فَإِذا رَدَّها) جا هەر کاتێ شتەکەی هێناوە، یان کارەکەی بە تەواوی کرد (اسْتَحَقَّ) مافی هەیە (ذَلِكَ الْعِوَضَ) ئەو کرێیە وەربگرێ (الْمَشْرُوطَ) کە بۆی بە مەرج گیراوە، بەڵام نابێ پێش تەواوکردنی کارەکە داوای کرێیەکە بکا.

کەوابوو: ئەگەر تەنها نیوەی کارەکەی کردو تەواوی نەکرد، ئەوە تەنها کرێی هاوێنەی ئەو کارەی ئەدرێتێ، جا ئەگەر ئەو کارەی کردویەتی هیچ سودی نەبو: وەك شتەکە بدۆزێتەوە، بەڵام پێش ئەوەی بیداتەوە خاوەنەکەی، بمرێ، یان لێی ون ببێتەوە، ئەوە مافی هیچ جۆرە کرێیەکی نیە.

﴿ئاگاداری﴾: مەرج نیە کرێکارەکە، یان ماوەی کارەکە دیاری بکرێ، کەوابوو: ئەگەر گوتی: هەر کەسێك لە بەندیخانە ڕزگارم بکا سەد دیناری ئەدەمێ، یان گوتی: هەر کەسێك کوڕەکەم فێرە خوێندنیقورئان بکا سەد دیناری ئەدەمێ. ئەوە دروستەو پاش تەواوکردنی کارەکە ئەبی کرێیەکەیان بداتێ.

﴿پاشکۆ﴾: ئەگەر بووەکێشەیان: ئایا کرێیەکە چەندەو چۆنە؟ هەردووکیان سوێند ئەخۆنو پێکهاتنەکە تێك ئەچێ، کرێکارەکەش کرێی هاوێنەیکارەکەی ئەدرێتێ.

﴿ فَصْلٌ: له باسى سەپانی ﴾

بە بنەتۆو، واتە: نیوەتۆو (وَإِذَا دَفَعَ إِلَى رَجُلٍ أَرْضاً) هەر کاتێك زەویەکی دایە دەست پیاوێك (لِيَزْرَعَها) بۆ ئەوەی دایبچێنێ (وَشَرَطَ) خاوەن زەویەکە بە مەرجی گرت (لَهُ) بۆ

جُــزْءاً مَعْلُومــاً مِــنْ رَيْعِهــا لَــمْ يَجُــزْ، وَأَنْ أَكْــراهُ إِيَّاهَــا بِــذَهَبٍ أَوْ فِضَّــةٍ، أَوْ شَـــرَطَ لَـــهُ طَعَامـــاً مَعْلُومـــاً فِـــي ذِمَّتِـــهِ جَـــازَ.
(فَصْلٌ) وَإِحْيَاءُ الْمَوَاتِ جائِزٌ بِشَرْطَيْنِ:

---

سەپانەکە (جُزْءً مَعْلُوماً) بەشێکی زانراو (مِنْ رِيعِها) لە بەرهەمی زەویەکە، وەك بڵێ: نیوەی، یان سێیەکی، یان چواریەکی بەرهەمەکە بۆ تۆ بێ (لَمْ يَجُنْ) ئەو جۆرە نیوە تۆوکردنە دروست نیە، وە هیچ جیاوازیش نیە تۆیەکە: هی خاوەن زەویەکە بێ، یان هی سەپانەکە بێ ﴿عَــنْ ثابت﷛: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْمزُارَعَةِ وَأَمَــرَ بِــالْمُؤَاجَرَةِ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: زەوی بە بنەتۆو بدرێ و فەرمانی داوە: بە کرێ بدرێ.
﴿ئاگـاداری﴾: ئـەوەی باسمـان کـرد فـەرموودەی زۆرتـرین ئیمامـانی ئـاینن بـوو، بـەڵام ئیمامی(النواوي)و چەندانی تر-خوالێیان ڕازی بێ- ئەم فەرموودەیان هەڵبژاردوە: (کە داچاندنی زەوی بە بنەتۆو دروستە). وە جیـاوازی نیـە تۆیەکـە: هـی خـاوەن زەوی بـێ، یـان هـی سەپان بێ، وە بەرهەمەکە بە نیوەیی بێ، یان بە سێیەك و چواریەك بێ.
ئینجا بزانە: ئەو شێوە داچاندنە لە ناو کوردەواریدا پێی ئەڵێن: سەپانی بە نیوەتـۆو، یان بە بنەتۆو.
(وَإِنْ أَكْراهُ إِيَّاها) ئەگەر خاوەنەکە زەویەکەی بە کرێ دایە سەپانەکە (بِذَهَبٍ) بە زێـڕ (أَوْ فِضَّةٍ) یان بە زیو، یان بە پارە، یان بە شتێکیتر، ئەوە دروستە.
(أَوْ شَرَطَ) یـان خـاوەن زەویەکـە بـە مـەرجی گـرت (لَـهُ) بـۆ سـەپانەکە (طَعاماً مَعْلُوماً) دانەوێڵەیەکی زانراو (فِي ذِمَّتِـهِ) لـە ئەسـتۆی خـۆیدا، واتـە: گـوتی: ئـەم زەویـەم بـۆ دابچێنە سەد تەنەکە گەنمت ئەدەمێ (جازَ) ئەوە دروستە.
﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر زەویەکەی داچاند -بـە تۆوی خـۆی، یـان بـە تۆوی خاوەنەکـەی- نابـێ هیچیان بەشی خۆیان لە بەرهەمەکە ببەن تا زەکاتی لێدەرنەکەن؟ چونکە زەکاتوەرگرەکان -بە ئەندازەی زەکات- لە بەرهەمەکەدا هاوبەشن، کەواتە: ئەنـدازەی زەکـات نابێتـە مڵکـی سەپانەکەو خاوەن زەویەکە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی(إِحْيَاءُ الْمَوَاتِ) زیندووکردنەوەی زەمینی مردوو ﴾

واتە: ئاوەدانکردنەوە (وَإِحْيَاءُ الْمَوَاتِ) ئاوەدانکردنەوەی زەمینیمردوو، واتە: هیچ کاتێك لەمـەوپێش ئـاوەدان نـەکرابێ و مـاڵی هـیچ کەسـێکی بـە سـەرەوە نـەبێ (جـائِزٌ) دروسـتە ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهـا: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ عَمَّرَ أَرْضاً لَيْسَتْ لأَحَدٍ فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك زەویەك ئاوەدان بکاتـەوە کـە مـاڵی کەسـی بە سەروە نەبێ، ئەبێتە هی خۆی. (بِشَرْطَيْنِ) ئەو ئاوەدانکردنەوە بە دوو مەرج دروستە:

أَنْ يَكُونَ الْمُحْيِي مُسْلِماً، وَأَنْ تَكُونَ الأَرْضُ حُرَّةً لَمْ يَجْرِ عَلَيْهَا مِلْكٌ لِمُسْلِمٍ. وَصِفَةُ الإِحْيَاءِ: مَاكَانَ فِي الْعَادَةِ عِمَارَةً لِلْمُحْيَا. وَيَجِبُ بَذْلُ الْمَاءِ بِثَلاَثَةِ شَرَائِطَ: أَنْ يَفْضُلَ عَنْ حَاجَتِهِ، وَأَنْ يَحْتَاجَ إِلَيْهِ غَيْرُهُ لِنَفْسِهِ أَوْ لِبَهِيمَتِهِ، وَأَنْ يَكُونَ مِمَّا يُسْتَخْلَفُ فِي بِئْرٍ أَوْ عَيْنٍ.

---

یەکەم: (أَنْ يَكُونَ الْمُحْيِي مُسْلِماً) ئەو کەسەی ئاوەدانی ئەکاتەوە ئەبی موسوڵمان بێ، ئەگەر لە خانەیئیسلامدا بێ.

دووەم: (وَأَنْ تَكُونَ الأَرْضُ حُرَّةً) ئەو زەویە ئازاد بێ، واتە: (لَمْ يَجْرِ عَلَيْهَا مِلْكٌ لِمُسْلِمٍ) لە هیچ کاتێکدا ملکی هیچ موسوڵمانێك نەبوبێ، چونکە ئەگەر لەمەوپێش ملکی کەسێك بوبێ، ئەوە هەر هی خۆیەتی هەر چەند وێرانیش بوبێ، جا ئەگەر زاندرا لە پێشان ئاوەدان بووە، بەڵام خاوەنی نەئەزاندرا، ئەوە وەك ماڵی لەدەستچوو ئەبێتە ملکی (بيت المال)ی موسوڵمانان.

﴿ئاگاداری﴾: هەر شوێنێك مافی خەڵکی تێدا بێ، دروست نیە ئاوەدان بکرێتەوە: وەك کەناری جۆگەو ڕوبارو کانیو بیرو، قەراغی لادێو شارو، گۆڕەپانەکانی ناو دێو ناو شارو، یاریگەی منداڵانو، شوێنی دارهێنانو، لەوەڕگەی ئاژەڵێو، کانگای بەردو خۆڵی خانوو، ئەوانە هیچیان دروست نیە دەستیان بە سەردا بگیرێ، چونکە مافێکی گشتی دانیشتووانی ئەو شوێنانەنە.

(وَصِفَةُ الإِحْيَاءِ) شێوەی ئاوەدانکردنەوە (مَا كَانَ فِي الْعَادَةِ) ئەوەیە بەگوێرەی ڕەووشتی ئەو شوێنە (عِمَارَةً لِلْمُحْيَا) ببێتە نیشانەی ئاوەدانکردنەوە، واتە: ئەگەر مەبەستی خانوو بێ، ئەبی نەختێك دیواری بۆ بکا، ئەگەر باغ بێ، ئەبی خاکەکە ڕێك بخاو دەورەی بگرێو نەختێك درەختی تێدا بچێنێ.

(وَيَجِبُ بَذْلُ الْمَاءِ) واجبە ئاو بداتە خەڵکیتر (بِثَلاَثَةِ شَرَائِطَ) بە سێ مەرج: یەکەم: (أَنْ يَفْضُلَ عَنْ حَاجَتِهِ) ئاوەکە لە پێویستیخۆی زیادبێ، واتە: لە خواردنەوەی خۆیو ئاژەڵەکانیو ئاودانی شینایی.

دووەم: (وَأَنْ يَحْتَاجَ إِلَيْهِ غَيْرُهُ) کەسێکیتر پێویستی بەم ئاوە هەبێ (لِنَفْسِهِ) بۆ خواردنەوەی خۆی (أَوْ لِبَهِيمَتِهِ) یان بۆ ئاژەڵەکانی، بەڵام ئەگەر بۆ شینایی ئەیویست، واجب نیە بیداتێ.

سێیەم: (وَأَنْ يَكُونَ مِمَّا يُسْتَخْلَفُ) ئاوەکە ئاویتری بێتەوە جێ (فِي بِئْرٍ) لە ئاوی بیر (أَوْ عَيْنٍ) یان لە سەرچاوەو ڕوبار، واتە: ئەگەر نەیئەهاتەوە جێ: وەکو ئاوی کوندەو تانکەر، ئەوە واجب نیە بیدا، مەگەر مەترسی مردنی لێبکرێ، ئەوە لەو کاتە واجبە لە مردن ڕزگاری بکا.

(فَصْلٌ) وَالْوَقْفُ جائِزٌ بِثَلاثَةِ شَرائِطَ: أَنْ يَكُونَ مِمَّا يُنْتَفَعُ بِهِ مَعَ بَقاءِ عَيْنِهِ، وَأَنْ يَكُونَ عَلَى أَصْلٍ مَوْجُودٍ

---

﴿ئاگاداری﴾ یەكەم: ئەوەی باسمان كرد، ئەو ئاوە بوو كە تایبەتی خۆی بێ، بەڵام ئاوی گشتی، هەموو كەسێك تێیدا هاوبەشە: وەكو ئاوی ڕووبارو سەرچاوەو گەلی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلنّاسُ شُركاءُ فِي الْكَلأِ وَالْماءِ وَالنّارِ﴾ رواه احمد وأبوداود، خەڵك لە سێ شتدا هاوبەشن: لە گیاو ئاو و ئاگر.

دووەم: دروست نیە بەشە ئاوی ئەم زەوییەی ببا بۆ زەویەكیتر-كە بەشی لەو ئاوەدا نەبێ-جا دێمەكار بێ، یان بەراو بێ، چونكە مەترسی هەیە ئەوە بكاتە بەڵگە بۆ ئەوەی لەمەودوا بڵێ: بۆ ئەم زەویەش بەشم لەو ئاوەدا هەیە.

﴿پاشكۆ﴾: ئەو ڕەووشتەی لە لای ئاغاو دەرەبەگو زۆردارەكانی كوردستان هەیە: كە هەر كەسێك لە شوێنێكی دیاركراودا ئاژەڵ بلەوەڕێنێ، یان شینایی بچێنێ، پارەی لێئەستێنن، یان مەڕێكی لێئەستێنن و پێی ئەڵێن: (پووشانە)، ئەوە حەرامەو مەڕەكەش نابێتە ملكی ئەوان، هەر چەند بە ناوی زەكاتیش وەریبگرن ﴿عَنْ ابن عَباس رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ النَّبيُّﷺ: لاَحِمَى إلاّ لِلّهِ وَلِرَسُولِهِ﴾ رواه البخاری، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پاوانكردنی لەوەڕگەی گشتی-جگە لە خواو پێغەمبەرﷺ-هیچ كەسێك مافی نیە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (وَقْف) ﴾

واتە: وەستاندنی شتێك لە سەر ڕووەكی حەڵاڵ تاكو نەفرۆشرێ و نەبەخشرێ، بۆ ئەوەی سودی لێوەربگیرێ، وەك بڵێ: ئەم خانووەم وەقف كردە سەر ئەم مزگەوتە.

(وَالْوَقْفُ جائِزٌ) وەقفكردن دروستە، ئەگەر ماڵە وەقفكراوەكە ملكیخۆی بێ و خاوەن ملكەكەش مندال و شێت نەبێ ﴿عَنْ أَبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه:قالَ النَّبيُّﷺ: إذا ماتَ ابْنُ آدَمَ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إلاّ مِنْ ثَلاثٍ: صَدَقَةٍجارِيَةٍ اَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ اَوْ وَلَدٍصالِحٍ يَدْعُو لَـهُ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر كاتێ ئادەمیزاد مرد، خێری كردەوەكانیخۆی ئەبڕێ تەنها لە سێ شت نەبێ، یەكەم: خێرێكی نەبڕاوە وەكو وەقف. دووەم: زانستێكی سودبەخش بۆ دونیاو قیامەت. سێیەم: مندالێكی خۆی كە پیاوی چاك بێ و دوعای بۆ بكا.

(بِثَلاثَةِ شَرائِطَ) بە سێ مەرج وەقف دروستە:

یەكەم: (أَنْ يَكُونَ مِمَّا يُنْتَفَعُ بِهِ) شتە وەقفكراوەكە سودی لێوەربگیرێ (مَعَ بَقاءِعَيْنِهِ) لەگەڵ ئەوەش خودی شتەكەش بمێنێ، وەك: زەوی و خانوو و ئاژەڵ و ئۆتۆمۆبیل، كەوابوو: وەقفكردنیخواردەمەنی دروست نیە.

دووەم: (وَأَنْ يَكُونَ عَلَى أَصْلٍ مَوْجُودٍ) وەقفكردنەكە لە سەر شتێكی هەبوویی بێ لە كاتی وەقفكردن و بشگونجێ ببێتە خاوەن ملك، وەك بڵێ: وەقف بێ بۆ سەر ئەم فەقیرە، یان

وَفَــــرْعٍ لاَ يَنْقَطِــــعُ، وَأَنْ لاَ يَكُــــونَ فِــــي مَحْظُــــورٍ.
وَهُوَ عَلَى ماشَرَطَ الْوَاقِفُ: مِنْ تَقْدِيمٍ أَوتَأْخِيرٍ، أَوْ تَسْوِيَةٍ أَوتَفْضِيلٍ.

---

ئەم مزگەوتە. کەواتە: دروست نیە وەقف بکاتە سەر منداڵی ناو زگ، یان مزگەوتێکی کە لەمەودوا دروست ئەکرێ.

(وَفَرْعٍ) هەروەها وەقفەکە بۆ سەر لقێکی وا بێ (لاَ يَنْقَطِعُ) کە نەبڕێتەوە، وەك بڵێ: وەقفم کردە سەر مزگەوتەکانی ئەو شارە. کەوابوو: ئەگەر بڵێ: بۆ ماوەی ساڵێك وەقفم کرد. ئەوە دروست نیە.

سێیەم: (وَأَنْ لاَ يَكُونَ فِي مَحْظُورٍ) نابێ وەقفکردنەکە لە سەر ڕووەکی گوناهباری بێ: وەك وەقفکردن بۆ سەر دێرو مەیخانەو ئەو جۆرە شوێنانە.

﴿ئاگاداری﴾: مەرج نیە وەقفکردن مەبەستی خواپەرستی تێدا ئاشکرابێ، کەواتە: دروستە وەقف بکاتە سەر دەوڵەمەند، یان وەقف بکاتە سەر منداڵی نێرینەی خۆی.

(وَهُوَ) وەقفکردن (عَلَى مَا شَرَطَ الْوَاقِفُ) بەگوێرەی مەرج دانانی وەقفکەرەکەیە: (مِنْ تَقْدِيمٍ) لە بە پێشخستن (أَوْ تَأْخِيرٍ) یان لە بە دواخستن، وەك بڵێ: ئەم شتەم وەقف کردە سەر مامۆستایانی ئایینی، بەڵام لە پێشدا بدرێتە ئەوانەی دەرسی حەدیس ئەڵێنەوە، ئینجا ئەوانەی تەفسیر ئەڵێنەوە.

(أَوْ تَسْوِيَةٍ) لە یەکسانی (أَوْ تَفْضِيلٍ) یان لە زێدە بەشی، وەك بڵێ: دوو بەشی بۆ ئەم ڕووەبێ‌و بەشێکی بۆ ئەوی‌تر.

﴿پاشکۆ﴾: یەکەم: ئەگەر مزگەوتێك وێران کرا، یان شوێنێك وێران کراو وازیان لە مزگەوتەکەی هێنا، ئەبی کەلوپەل‌و وەقفەکەی بۆ هەڵبگیرێ‌و چاوەڕوانی ئاوەدانکردنەوەی بکەن، جا ئەگەر هیچ گومان لەوەدا نەبو: کە ئاوەدان ناکرێتەوە، ئەبی بۆ مزگەوتێکی‌تر سەرف بکرێ، جا ئەگەر نەبو، یان پێویستی پێ نەبو؛ ئەو کاتە دروستە بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف بکرێ.

دووەم: درەختی گۆڕستان ئەگەر سەوز بوو، نابێ ببڕدرێ، بەڵام ئەگەر ووشك بوو، دروستە ببڕدرێ‌و بفرۆشرێ‌و لە بەرژەوەندیگۆڕستانەکە سەرف بکرێ.

سێیەم: ئەو کەسەی سەرپەرشتی ماڵە وەقفکراوەکە ئەکا، ئەبی دادپەروەربێ‌و بتوانێ چاودێری بکاو بزانێ چۆن سەرفی ئەکا.

جا بزانە: ئەرکی سەرشانی وی بەکرێدانەو کۆکردنەوەی بەرهەمەکەیەو چاککردنەوەی وێرانبووەکەیە.

کەوابوو: دروستە لە بەرانبەر ئەو ماندوبوونە کرێی بۆ دیاری بکرێ بۆ ئەوەی وەقفکراوەکە بەردەوام بمێنێ، چونکە فرۆشتنی وەقفکراو بەهیچ جۆرێك دروست نیە.

(فَصْــلٌ) وَكُــلُّ ماجــازَ بَيْعُــهُ جــازَ هِبَتُــهُ، وَلاَ تَلْــزَمُ الْهِبَــةُ إلاَّ بِــالْقَبْضِ، وَإذا قَبَضَهَا الْمَوْهُوبُ لَهُ لَمْ يَكُنْ لِلْواهِبِ أَنْ يَرْجِعَ فِيها إلاَّ أَنْ يَكُونَ والِداً،

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (هِبَة) بەخشین و دیاری ﴾

هەر شتێك بداتە یەكێكیتر بێئەوەی هیچی لە بەرانبەر لێوەربگرێ، پێی ئەگوترێ: بەخشین. ئینجا ئەگەر لە ڕێگای‌خوا بیداتێ، هەم پێی ئەگوترێ: خێر. ئینجا ئەگەر لە شوێنێك بینێرێ بۆ شوێنێكیتر، هەم پێی ئەگوترێ: دیاری.

جا بزانە: بەخشین بە هەر ناوێك بێ، هەر سوننەتە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: تَهَادَوْا تَحابُّوا﴾ رواه أبويعلى، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دیاری بۆ یەكتری ببەن، چونكە دیاری ئەبێتە هۆی خۆشەویستیتان.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر شتێك بداتە كاربەدەستێك بۆ ئەوەی لە كارێكی ناڕەوادا یارمەتی‌ی بدا، یان مافی كەسێكیتری بداتێ، ئەوە پێی ئەگوترێ: بەرتیل ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لَعَنَ اللهُ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ وَالــرَّائِشَ﴾ رواه احمد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەعنەتی خوا لە بەرتیلدەرو لە بەرتیلخۆرو لە پێكهێنەرەكەیان بدا.

بەڵام ئەگەر كارەكەی ڕەوا بوو و مافی كەسی‌تری لە دەست نەئەدا، بەڵام كاربەدەستەكە بە بێ‌بەخشیش بۆی نەئەكرد، ئەوە تەنها بۆ كاربەدەستەكە حەرامە.

(وكُلُّ ما جازَ بَيْعُهُ) هەر شتێك فرۆشتنی دروست بێ بەو جۆرەی باسمان كرد (جازَ هِبَتُـهُ) بەخشینی دروستە (وَلاَ تَلْـزَمُ الْهِبَـةُ) شتی بەخشراو و دیاری‌و خێر نابێتە ملكی پێبەخشراوەكە (إلاَّ بِالْقَبْضِ) تا پێبەخشراوەكە وەری‌نەگرێ، كەوابوو: پێش وەرگرتن دروستە خاوەن ماڵەكە پەشیمان ببێتەوە ﴿عَنْ أُمِّ كَلْثُومٍ رَضِيَ اللهُ عَنها: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ هَدِيَّةً إلَى النَّجاشِيِّ، فَماتَ قَبْلَ أَنْ تَصِلَ إلَيْهِ، فَاسْتَرَدَّهَا﴾ رواه‌الحاكم والبيهقي، پێغەمبەر ﷺ دیاریەكی بۆ (نەجاشی) نارد، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە دەستی، (نەجاشی) مرد، جا پێغەمبەر ﷺ دیاری‌یەكەی گەڕاندەوە.

(وَإذا قَبَضَها الْمَوْهُوبُ لَهُ) هەر كاتێك پێبەخشراوەكە بەخشراوەكەی، یان دیاریەكەی، یان خێرەكەی وەرگرت (لَمْ يَكُنْ لِلْواهِبِ) دروست نیە بۆ خاوەن شتەكە (أَنْ يَرْجِعَ فِيها) شتەبەخشراوەكە وەربگرێتەوە.

(إلاَّ أَنْ يَكُونَ والِداً) تەنها ئەگەر دایك‌و باوك، یان داپیره‌و باپیره بێ، دروستە وەری‌بگرێتەوە ﴿عَنِ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهما: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لاَيَحِلُّ لِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَنْ يُعْطِيَ الْعَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعَ فِيها إلاَّ الْوالِدَ فِيما يُعْطِي وَلَــدَهُ﴾ رواه‌أصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دروست نیە مرۆڤی موسوڵمان شتێك ببەخشێ، ئینجا وەری‌بگرێتەوە، تەنها باوك بۆی دروستە ئەو شتەی بەخشیویەتیە منداڵی‌خۆی: وەری‌بگرێتەوە.

وَإذا أعْمَرَهُ شَـيْئاً أوْ أرْقَبَـهُ كـانَ لِلْمُعْمَـرِ أوْ لِلْمُرْقَـبِ وَلِوَرَثَتِـهِ مِـنْ بَعْـدِه. (فَصْـلٌ) وَإذا وَجَـدَ لُقْطَـةً فِـي مَـواتٍ أوْطَرِيـقٍ فَلَـهُ أخْـذُهَا وَتَرْكُهَـا، وَأخْذُها أوْلَى مِنْ تَرْكِها إنْ كانَ عَلَى ثِقَةٍ مِنَ الْقِيامِ بِها،

---

﴿ئاگاداری﴾: سوننەتە باوكو دایك بە یەكسانی شت ببەخشنە منداڵەكانیان، بەڵام كۆمەڵە زانایەك فەرموویانە: یەكسانی واجبە ﴿عَنِ النُّعْمانِ بنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إتَّقُوا اللهَ واعْدِلُوا بَيْنَ أوْلادِكُمْ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە خوا بترسن‌و دادپەروەر بن لە نێوان منداڵەكانتان.

(وَإذا أعْمَرَهُ شَيْئاً) هەر كاتێك بە درێژایی تەمەن شتێكی بەخشی‌یە یەكێكی‌تر، واتە: گوتی: ئەم شتەم بەخشی‌یە تۆ بە درێژایی تەمەنت، ئینجا كە مردی بۆ خۆم بگەڕێتەوە (أوْ أرْقَبَهُ) یان بە چاوەڕوانی پێ‌ی بەخشی، واتە: گوتی: وا ئەم شتەم بەخشی‌یە تۆ، ئەگەر من پێشدا مردم هەر بۆ خۆت، ئەگەر تۆ پێشدا مردی بگەڕێتەوە بۆ خۆم (كانَ لِلْمُعْمَرِ) ئەو شتە هەر بۆ پێبەخشراوەكەیە بەدرێژایی تەمەن (أوْ لِلْمُرْقَبِ) یان بۆ پێبەخشراوەكەیە بە چاوەڕوانی (وَلِوَرَثَتِهِ) بۆ میراتگرانی ئەو پێبەخشراوەیە (مِنْ بَعْدِهِ) لە دوای مردنی، واتە: بە هیچ جۆرێك ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنەكەی.

﴿پاشكۆ﴾: ئەگەر پیاوێك خشڵی زێڕو زیوی كڕی‌و دایە ئافرەتەكەی خۆی بۆ ئەوەی خۆی پێ برازێنێتەوە، ئەو خشڵە نابێتە هی ئافرەتەكە تا مێردەكە بە زوبان ئەڵێ: وا بەخشیمە تۆ. ئەویش قبوڵی بكا، جا ئەگەر ئافرەتەكەو مێردەكە، یان میراتگرەكانیان بووە كێشەیان، مێردەكە ئەیگوت: ئەم بەخشیوەو هەر بۆ ڕازاندنەوە داومەتێ. ئافرەتەكەش ئەیگوت: پێت بەخشیوم. هیچ شاهیدیش لە نێوانیاندا نەبو، ئەوە باوەڕ بە مێردەكەو میراتگرەكانی مێردەكە ئەكرێ ئەگەر سوێند بخۆن.

## ﴿ فَصْلٌ: لەباسی (لُقْطَة) هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو ﴾

(وَإذا وَجَدَ) هەر كاتێك دۆزی‌یەوە (لُقْطَةً) شتێكی وەها كە لە خاوەنەكەی ون بوبێ، یان لە شوێنێك لێ‌ی بەجێمابێ (فِي مَواتٍ) لە شوێنێكی وەهادا كە ملكی هیچ كەس نەبێ (أوْ طَرِيقٍ) یان لە ڕێگەیەكدا بیدۆزێتەوە (فَلَهُ أخْذُها) بۆی دروستە هەڵیبگرێتەوەو (وَتَرْكُها) هەروەها بۆی دروستە وازی لێبێنێ.

(وَأخْذُها أوْلَى) بەڵام هەڵگرتنەوەی باشترە (مِنْ تَرْكِها) لە وازلێهێنانی (إنْ كانَ عَلَى ثِقَةٍ) ئەگەر باوەڕی بەخۆی هەبێ (مِنَ الْقِيامِ بِها) كە بە پێویستیەكانی ئەو شتە هەڵئەستێ ﴿عَنْ زَيْدِ بنِ خالِدٍ الْجُهَنِيِّ رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ آوَى ضالَّةً فَهُوَ ضالٌّ مالَمْ يُعَرِّفْهَا﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك شتێكی ونبوو هەڵبگرێتەوە، ئەوە سەرلێشێواوە ئەگەر بانگەوازی‌ی بۆ نەكا.

وَإذا أَخَذَها وَجَبَ عَلَيْهِ أَنْ يَعْرِفَ سِتَّةَ أَشْياءَ: وِعاءَها، وَعِفاصَها، وَوِكاءَها، وَجِنْسَها، وَعَدَدَها، وَوَزْنَها. وَيَحْفَظُها في حِرْزِ مِثْلِها، ثُمَّ إذا أَرادَ تَمَلُّكَها عَرَّفَها سَنَةً عَلَى أَبْوابِ الْمَساجِد، وَفِي الْمَوْضِعِ الَّذي وَجَدَها فِيه، فَإنْ لَمْ يَجِدْ صاحِبَها كانَ لَهُ أَنْ يَتَمَلَّكَها بِشَرْطِ الضَّمان،

---

(وَإذا أَخَذَها) جا هەر كاتێك شتە ونبووەكەی هەڵگرتەوە (وَجَبَ عَلَيْهِ) لە سەری واجبە (أَنْ يَعْرِفَ) بەناس بكا (سِتَّةَ أَشْياءَ) شەش نیشانەی ئەو شتە:

(وِعاءَها) بزانێ شتەكە لە ناو چیدایە (وَعِفاصَها) بزانێ سەرقەپاغی چییە (وَوِكاءَها) بزانێ ئەو دلوەی پێی پێچراوە چۆنە (وَجِنْسَها) بزانێ شتەكە ڕەگەزی چییە (وَعَدَدَها) بزانێ ژمارەی چەندە (وَوَزْنَها) بزانێ كێشانەی چەندە.

(وَيَحْفَظُها) واجبە-ئەو شتەی دۆزیویەتیەوە-دایبنێ و بیپارێزێ (فِي حِرْزِ مِثْلِها) لەو جۆرە شوێنەی ئەو جۆرە شتەی لێدادەنرێ، جا ئەگەر كەمتەرخەمی كردو لەناو چوو، ئەبی تۆڵەی بدا.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر منداڵ، یان شێت شتێكیان دۆزیەوە، واجبە: سەر پەرشتكارەكەیان لە دەستیان وەریگرێ و بانگەوازی بۆ بكا، جا ئەگەر لە دەستیانی وەرنەگرت و لە دەست چوو، ئەبی بەخۆی تۆڵەی بدا، جا ئەگەر خاوەنەكەی دەست نەكەوت، دروستە بیكاتە ملكی منداڵەكە، یان شێتەكە، ئەگەر بەرژەوەندیئەوانی تێدا بێ.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای هەڵگرتنەوە (إذا أَرادَ تَمَلُّكَها) ئەگەر ویستی بیكاتە ملكی خۆی و لە خۆی حەلاڵ بكا (عَرَّفَها سَنَةً) ئەبی ساڵێكی تەواو بانگەوازی بكاو هەندێك پێناسەكانی بڵێ (عَلَى أَبْوابِ الْمَساجِدِ) لە بەر دەرگەی مزگەوتەكان كاتێ خەڵك لە نوێژ دەرئەچن (وَفِي الْمَوْضِعِ الَّذي) هەروەها لەو شوێنەی (وَجَدَها فِيهِ) كە لێی دۆزیوەتەوە، هەم لەو شوێنانەی خەڵكی لێ كۆ ئەبێتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەركی بانگەوازی لە (بيت المال) ئەدرێ، جا ئەگەر نەبو، یان (قازی) نەبو، هەر بەخۆی لە لای دوو شاهید-بە سەر خاوەنەكەی-بە قەرز ئەیدلو لە خاوەنەكەی وەریئەگرێتەوە، یان بەشێكی لێئەفرۆشێ، بەڵام ئەگەر بۆ ئەوە هەڵیگرتبێوە: كە لە دوای ساڵێك بیكاتە ملكی خۆی، ئەوە ئەركەكەی هەر لە سەر خۆیەتی، واتە: هەر چەند خاوەنەكەشی دەست بكەوێتەوە، نابێ لێی وەریگرێتەوە.

(فَإنْ لَمْ يَجِدْ صاحِبَها) جا ئەگەر لە دوای بانگەوازیی ساڵێك خاوەنەكەی دەست نەكەوت (كانَ لَهُ) دروستە بۆ ئەو كەسەی دۆزیویەتیەوە (أَنْ يَتَمَلَّكَها) بیكاتە ملكی خۆی (بِشَرْطِ الضَّمانِ) بە مەرجی تۆڵەدان، واتە بڵێ: (وا ئەم شتەم كردە ملكی خۆم هەر كاتێ خاوەنەكەی هات تۆڵەی ئەدەمێ). ئینجا دروستە بۆ خۆی بە كاری بێنێ و بیخوا، بەڵام ئەگەر

وَاللُّقْطَةُ عَلَى أَرْبَعَة أَضْرُب، أَحَدُها: ما يَبْقَى عَلَى الدَّوام، فَهَذا حُكْمُهُ. وَالثَّاني: ما لاَ يَبْقَى كالطَّعامِ الرَّطْب، فَهُوَ مُخَيَّرٌ بَيْنِ أَكْله وَغُرْمه، أَوْ بَيْعه وَحفظ ثَمَنه، أَوْ تَجْفيفه وَحفْظه. وَالثَّالثُ: مَا يَبْقَى بعلاَجٍ كَالرُّطَب، فَيَفْعَلُ مَافيه الْمَصْلَحَةُ:

---

بۆ خاوەنەکەی هەڵیبگرێ، بانگەوازی ناوێ ﴿عَنْ زَيدالْجُهَني رضي الله عنه: سُئِلَ النَّبيُّ ﷺ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقالَ: إعْرِفْ عِفاصَها وَوِكائَها ثُمَّ عَرِّفْها سَنَةً، فإنْ جاءَ صاحِبُها، وَإلاّ: فَشَأنَكَ بِهَا﴾ رواه الشيخان، پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا دەربارەی هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو؟ ئەویش فەرمووی: بزانە لە ناو چیدایە، بە چی پێچراوە، ئینجا بۆ ماوەی ساڵێك بانگەوازی بکە، جا ئەگەر خاوەنەکەی هات بیدەوە، ئەگەر نەهات: چی لێتەکەی بیکە.

﴿ئاگاداری﴾: یەکەمجار بانگەوازی هەموو رۆژێك دوو جارە تا حەفتەیەك، ئینجا هەر رۆژێك جارێك تا حەفتەیەکیتر، ئینجا حەفتەی جارێك تا حەفت حەفتە، ئینجا هەر مانگێك جارێك تا ساڵ تەواو ئەبێ، بەڵام شتی کەم نرخ ساڵێکی ناوێ، بەڵکو یەك جار، یان دوو جار، یان سێ رۆژ.

ئینجا بزانە: ئەگەر خاوەنەکەی دەرکەوتو شتەکەش لەناو چوبو، ئەوە تێبینی ئەکرێ: ئەگەر لە پێش ئەوەی بیکاتە ملکیخۆی لەناو چوبو و هیچ خیانەتی نەکردبو، ئەوە تۆڵەی ناکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر خیانەتی کردبو، یان لە دوای ئەوەی کە کردبویە ملکی خۆی لەناو چوبو، یان فرۆشتبوی، ئەوە تۆڵەی لە سەرە، بەڵام ئەگەر شتەکەی لە لا مابو، ئەبی شتەکە بداتەوە خاوەنەکەی، ئینجا کرێی گەڕاندنەوەی شتەکەش: ئەگەر پێش کردنەملك بێ، ئەوە لە سەر خاوەنەکەیە، ئەگەر لە دوای کردنەملك بێ، لە سەر هەڵگرەوەکەیە.

(وَاللُّقْطَةُ) ئەو شتەی هەڵئەگیرێتەوە (عَلَى أَرْبَعَةِ أَضْرُبٍ) چوار جۆرە: (أَحَدُها) یەکەمیان: (ما يَبْقَى عَلَى الدَّوامِ) ئەوەیە بەردەوام بمێنێ: وەکو جلوبەرگو پارەو زێرو زیو (فَهَذا) ئەو شێوەیەی باسمان کرد (حُكْمُهُ) بڕیاری ڕەفتار لەگەڵکردنیەتی.

(وَالثَّاني) دووەم: (ما لاَ يَبْقَى عَلَى الدَّوامِ) ئەوەیە بەردەوام نەمێنێ (كالطَّعامِ الرَّطْبِ) وەکو خواردەمەنی تەڕ (فَهُوَ) ئەو کەسەی هەڵیگرتۆتەوە (مُخَيَّرٌ) کراوەتە سەر پشك: (بَيْنَ أَكْلِهِ) لە نێوان ئەوەی هەر ئەودەم بیکاتە ملکی خۆیو بیخوا (وَغُرْمِهِ) ئینجا تۆڵەی بداتە خاوەنەکەی (أَوْ بَيْعِهِ) یان بیفرۆشێو (وَحِفظِ ثَمَنِهِ) پارەکەی بۆ خاوەنەکەی هەڵبگرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر ویستی پارەکە بکاتە ملکی خۆی، با ساڵێك بانگەوازی خواردەمەنیەکە بکا، ئینجا پارەکە بکاتە ملکی خۆیو تۆڵەی بداتە خاوەنەکەی.

(وَالثَّالثُ) سێیەم: (ما يَبْقَى بِعلاجٍ) ئەو جۆرە شتەیە کە بە چارەکردن بمێنێتەوە (كَالرُّطَبِ) وەکو خورماو تری (فَيَفْعَلُ ما فِيهِ المَصْلَحَةُ) ئەبی بەگوێرەی بەرژەوەندی کار بکا:

مِنْ بَيْعِهِ وَحِفْظِ ثَمَنِهِ، أَوْتَجْفِيفِهِ وَحِفْظِهِ، وَالرَّابِعُ: مَا يَحْتَاجُ إِلَى نَفَقَةٍ كَالْحَيَوَانِ، وَهُوَ ضَرْبَانِ: حَيَوَانٌ لايَمْتَنِعُ بِنَفْسِهِ، فَهُوَ مُخَيَّرٌ بَيْنَ أَكْلِهِ وَغُرْمِ ثَمَنِهِ، أَوْ تَرْكِهِ وَالتَّطَوُّعِ بِالإِنْفَاقِ عَلَيْهِ، أَوْ بَيْعِهِ وَحِفْظِ ثَمَنِهِ،

---

(مِنْ بَيْعِهِ) ئەگەر بەرژەوەندی لە فرۆشتنیدا بوو، با بیفرۆشێ و (وَحِفْظِ ثَمَنِهِ) پارەکەی بۆ خاوەنەکەی هەڵبگرێ (أَوْ تَجْفِيفِهِ) یان ووشکی بکاتەوەو (وَحِفْظِهِ) بە ووشککراوەیی هەڵیبگرێ بۆ خاوەنەکەی، ئینجا ئەگەر ویستی بیکاتە ملکی خۆی، با بانگەوازی بکا، ئینجا شتە ووشککراوەکە، یان پارەکەی بکاتە ملکی خۆی و بیخواو تۆڵەی بداتە خاوەنەکەی.

(وَالرَّابِعُ) چوارەم: (ما يَحْتاجُ إِلىنَفَقَةٍ) ئەو جۆرە شتەیە کە پێویستی بە خواردن و بەخێوکردن هەیە (كَالْحَيَوانِ) وەکو ئاژەڵ: جا گۆشتی بخورێ، یان نا (وَهُوَ) ئاژەڵی دۆزراوەیە (ضَرْبانِ) دوو جۆرە:

(حَيَوانٌ لايَمْتَنِعُ) جۆری یەکەمیان: ئاژەڵێکە ناتوانێ خۆی بپارێزێ لە درندە (بِنَفْسِهِ) بە هێزی خۆی: وەکو مەڕو بزن و گوێلک و مریشک و مراوی (فَهُوَ) ئەو کەسەی ئەیدۆزێتەوە (مُخَيَّرٌ) کراوەتە سەرپشک لە نێوان چوار ڕێگادا:

(بَيْنَ أَكْلِهِ) یەکەم: یان هەر ئەودەم بیکاتە ملکی خۆی و -ئەگەر گۆشتی بخورێ- بیخوا (وَغُرْمِ ثَمَنِهِ) جا بە ئەندازەی نرخەکەی تۆڵەی بداتە خاوەنەکەی.

(أَوْ تَرْكِهِ) دووەم: یان نەیخواو بۆ خاوەنەکەی هەڵیبگرێ و (وَالتَّطَوُّعِ بِالإِنْفاقِ عَلَيْهِ) بە خێری خۆی بۆی بەخێو بکا، جا ئەگەر بە خێری خۆی بەخێوی نەکرد، با بە ئیزنی (قازی) بە قەرز بەخێوی بکا، جا ئەگەر (قازی) نەبو، با دوو شاهید بگرێ، ئینجا مەسرەفەکە لە خاوەنەکەی وەربگرێتەوە.

(أَوْ بَيْعِهِ) سێیەم: یان بیفرۆشێ و (وَحِفْظِ ثَمَنِهِ) پارەکەی بۆ خاوەنەکەی هەڵبگرێ، جا ئەگەر ساڵێك بانگەوازی کردو خاوەنەکەی دەست نەکەوت، دروستە پارەکە بکاتە ملکی خۆی و بیخوا.

چوارەم: یان هەر ئەودەم بیکاتە ملکی خۆی و بیهێڵێتەوە بۆ شیرو خوری و بێچووەکانی، ئینجا ئەگەر خاوەنەکەی دەرکەوت تەنها ئاژەڵەکەی ئەداتەوە، شیرو خوری و بێچووەکانیش بۆ خۆی ئەمێنێتەوە ﴿عَنْ زَيْدٍالجُهَنِيِّ ﷺ: قالَ سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ضالَّةِ الْغَنَمِ؟ قالَ: هِيَ لَكَ أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی بزن و مەڕی دۆزراوە پرسیاری لێکرا؟ ئەویش فەرمووی: یان بۆ تۆیە، یان بۆ برای تۆیە، یان بۆ گورگ و درندەیە. واتە: ئەگەر وازی لێبێنی گورگ ئەیخوا، ئەگەر هێناتەوەو خاوەنی نەبو، بۆ خۆت ئەمێنێتەوە.

وَحَيَوانٌ يَمْتَنِعُ بِنَفْسِهِ، فَإِنْ وَجَدَهُ فِي الصَّحْراءِ تَرَكَهُ، وَإِنْ وَجَدَهُ فِي الْحَضَرِ فَهُوَ مُخَيَّرٌ بَيْنَ الْأَشْياءِ الثَّلاثَةِ فِيهِ.
(فَصْلٌ) وَإِذا وُجِدَ لَقِيطٌ بِقارِعَةِ الطَّرِيقِ فَأَخْذُهُ وَتَرْبِيَتُهُ وَكَفالَتُهُ واجِبَةٌ عَلَى الْكِفايَةِ،

---

﴿ئاگاداری﴾: ئەو چوار ڕێگایانە دەربارەی ئەو ئاژەڵە بوو، کە لە چۆڵو بیاباندا ئەدۆزرێتەوە، چونکە ئەگەر لە ئاوەدانیدا بیدۆزێتەوە، تەنها ڕێگای دووەمو سێیەمی بۆ دروستن، بەڵام لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ڕێگای یەکەمیشی بۆ دروستە.

(وَحَيَوانٌ) جۆری دووەمیان: ئاژەڵێکە (يَمْتَنِعُ بِنَفْسِهِ) بەخۆی خۆی ئەپارێزێ لە درندەی بچووك: وەکو ووشترو ئەسپو کەر و هێستر (فَإِنْ وَجَدَهُ فِي الصَّحْراءِ) ئەگەر ئەو جۆرە ئاژەڵەی لە بیاباندا دۆزیەوە (تَرَكَهُ) واجبە وازی لێبێنێو نەیهێنێتەوە.

بەڵام ئەگەر بۆ پاراستن هێنایەوە، ئەوە دروستە، ئینجا: یان بیفرۆشێو پارەکە هەڵبگرێ بۆ خاوەنەکەی، یان با ئاژەڵەکە بەخێو بکا، واتە: دروست نیە بیکاتە ملکی خۆی ﴿عَنْ زَيْدالجُهَنِيرضي الله عنه: قالَ سُئِلَ النَّبِيُّﷺ عَنْ ضالَّةِ الإبِلِ؟ قالَ: ما لَكَ وَلَها؟ مَعَها سِقاؤُها وَحِذاؤُها، تَرِدُ الْماءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ حَتَّى يَلْقاها رَبُّها﴾ رواه‌الشیخان، دەربارەی ووشتری ونبوو پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکراو فەرمووی: چیت بەسەردایە؟ بەخۆی ئاو ئەخواتەوەو خواردن ئەخوا تا خاوەنەکەی ئەیگاتێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر کاتەکە کاتی ڕاوڕوتو تاڵان بوو، دروستە ئەو جۆرە ئاژەڵەش لە بیابانو لە ئاوەدانیدا بگیرێتەوە بۆ ئەوەی بیکاتە ملکی خۆی، بەو جۆرەی باسمان کرد.

(وَإِنْ وَجَدَهُ فِي الْحَضَرِ) ئەگەر ئەو ئاژەڵەی لە ناو ئاوەدانیدا دۆزیەوە (فَهُوَ مُخَيَّرٌ) ئەوە سەرپشکە (بَيْنَ الأشْياءِ الثَّلاثَةِ فِيهِ) لە نێوان ئەو سێ ڕێگایانەی لە جۆری یەکەمدا باسمان کردن. واتە: یان بیفرۆشێ، یان بۆ خاوەنەکەی بەخێوی بکا، یان بیکاتە ملکی خۆیو بیخوا. بەڵام ئەو فەرموودەی ڕێگای خواردنی داوە بێهێزە.

﴿پاشکۆ﴾: هەر کاتێك خاوەنەکەی هاتو داوای شتەکەی کرد، ئەگەر نیشانەکانی گوتنو باوەڕی پێ کرد، یان دوو شاهیدی هێنان، یان شاهیدێك و سوێندیشی خوارد، با ماڵەکەی بداتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (لَقِيط) منداڵی فڕێدراو ﴾

(وَإِذا وُجِدَ لَقِيطٌ) هەر کاتێك منداڵێکی فڕێدراو دۆزراوە (بِقارِعَةِ الطَّرِيقِ) لە ڕێگەیەك، یان لە شوێنێکیتر، جا لە ترسی بەخێوکردن فڕێدرا بێ، یان چونکە بیژی بوو و ئافرەتەکە لە ترسان، یان لە شەرمان فڕێیدابێ (فَأَخْذُهُ) هەڵگرتنەوەی ئەو منداڵەو (وَتَرْبِيَتُهُ) پەروەردەکردنیو (وَكَفالَتُهُ) پاراستنو بەخێوکردنی (واجِبَةٌ) گشتی واجبن (عَلَى الْكِفايَةِ) بە (فَرْضُ الْكِفايَةِ)، واتە: ئەگەر یەکێك ئەو سێیانەی کردن، خێری ئەگاتێو گوناهەکەش

وَلاَ يُقَرُّ إِلاَّ فِي يَدِ أَمِينٍ، فَـإِنْ وُجِـدَ مَعَـهُ مَـالٌ أَنْفَـقَ عَلَيْـهِ الْحَـاكِمُ مِنْـهُ، وَإِنْ لَـمْ يُوجَـدْ مَعَـهُ مَـالٌ فَنَفَقَتُـهُ فِـي بَيْـتِ الْمَـالِ.
(فَصْلٌ) وَالْوَدِيعَةُ أَمَانَةٌ، وَيُسْتَحَبُّ قَبُولُهَا لِمَنْ قَامَ بِالأَمَانَةِ فِيهَا، وَلاَ يَضْمَنُ إِلاَّ بِالتَّعَدِّي،

---

له سەر گشت دانیشتووانی ئەو شوێنە لائەچێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا﴾ واتە: هەر کەسێك گیانێکی ئادەمیزاد لە مردن ڕزگار بکا، وەك هەموو خەڵکی ڕزگار کردبێ وەهایە، چونکە بووەتە هۆی لابردنی تاوان لە سەر هەموویان.
(وَلاَ يُقَرُّ) ئەو منداڵە نامێنترێتەوە (إِلاَّ فِي يَدِ أَمِينٍ) تەنها لە دەست مرۆڤێکی موسوڵمانو ئەمینو ئایین پەروەر نەبێ.
﴿ئاگاداری﴾: واجبە دوو شاهید ئاگادار بکا: کە ئەم منداڵە هی خۆی نیەو دۆزراوەتەوە، ئینجا بزانە: بە هۆی بەخێوکردن ئەو منداڵە نابێتە هی خۆیو میرات لە یەکتری ناگرنو لەگەڵ ژنو خوشکو کچی خۆی هەر بە بێگانە دائەندرێ.
(فَإِنْ وُجِدَ مَعَهُ مَالٌ) جا ئەگەر منداڵەکە هیچ ماڵی لەگەڵ داندرابو (أَنْفَقَ عَلَيْهِ الْحَاكِمُ مِنْهُ) ئەو کاتە (قازی)، یان یەکێکی‌تر بە ئیزنی(قازی) لەو ماڵە بەخێوی ئەکا (وَإِنْ لَمْ يُوجَدْ مَعَهُ مَالٌ) ئەگەر هیچ ماڵی لەگەڵدا نەبو (فَنَفَقَتُهُ) ئەرکی بەخێوکردنی ئەو منداڵە (فِي بَيْتِ الْمَالِ) لە (بيت المال)ی موسوڵمانان ئەدرێ، جا ئەگەر (بيت المال) نەبو، واجبە موسوڵمانانی دەوڵەمەند مەسرەفی بەخێوکردنی بدەن، کەوابوو: ئەو منداڵەش بە ئیسلام ئەژمێردرێو لە سەر ڕەووشتی ئیسلام پەروەردە ئەکرێ، هەروەك لە پەڕتووکی (جهاد)دا باسی ئەکەین، إن شاءَ الله تعالى.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (وَدِيعَة) سپاردن ﴾

واتە: دانانی شتێك لە لای کەسێك بۆ ئەوەی بیپارێزێ. (وَالْوَدِيعَةُ) شتی سپاردراو (أَمَانَةٌ) بە ئەمانەت دائەندرێو پێی ئەگوترێ: ئەمانەت (وَيُسْتَحَبُّ) سوننەتە (قَبُولُهَا) وەرگرتنی شت بە ئەمانەت (لِمَنْ) بۆ هەر کەسێکی (قَامَ بِالأَمَانَةِ) کە بتوانێ بە ئەرکی ئەمانەت هەڵبستێ (فِيهَا) دەربارەی ئەو شتە داندراوە، واتە: بتوانێ بیپارێزێو خیانەتیش نەکا ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: واللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مادامَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە هەموو کات یارمەتی بەندەی خۆی ئەدا، مادام بەندە یارمەتی برای خۆی بدا.
(وَلاَ يَضْمَنُ) ئەمینداڕەکە تۆڵەی ئەمانەتەکەی ناکەوێتە سەر، ئەگەر لەناو چوو، یان کەمو کوڕی هێنا (إِلاَّ بِالتَّعَدِّي) تەنها بە دوژمنکاریو کەمتەرخەمی تۆڵەی ئەکەوێتە سەر: وەك بە بێ‌عوزرو بە بێ‌پرسی خاوەنەکەی لە لای یەکێکی‌تر دایبنێ، یان لەگەڵ خۆیا بیباتە سەفەر، یان لە شوێنێك بیگوازێتەوە بۆ شوێنێکی‌تر: کە شتەکەی تێدا

وَقَوْلَ الْمُودَعِ مَقْبُولٌ فِي رَدِّها عَلَى الْمُودِعِ، وَعَلَيْهِ أَنْ يَحْفَظَها فِي حِرْزِ مِثْلِها، وَإِذا طُولِبَ بِها فَلَمْ يُخْرِجْها مَعَ الْقُدْرَةِ عَلَيْها حَتَّى تَلِفَتْ ضَمِنَ.

---

نەپارێزرێ، یان پاسی ی لێنەکا، یان لە لای دزو پیاوخراپ ئاشکرای بکا، یان بۆ خۆی بە کاری بێنێ، بە هەر یەکێك لەوانە تۆڵەی ئەکەوێتە سەر.

(وَقَوْلُ الْمُودَعِ) قسەی ئەمیندارەکە، کە ئەمانەتەکەی لە لا دانراوە (مَقْبُولٌ) وەرئەگیرێو باوەری پێئەکرێ ئەگەر سوێند بخوا (فِي رَدِّها) لەبارەی گەراندنەوەی (عَلَى الْمُودِعِ) بۆ خاوەنەکەی، هەروەها بە سوێندخواردن باوەری پێئەکرێ ئەگەر بڵێ: ماڵەکە دزراوە، یان لە ناو چووە، یان لێیان سەندم.

کەواتە: ئەگەر گوتی: ماڵەکەم داوەتەوە خاوەنەکەی. هیچ شاهیدیشی نەبو، بە سوێند باوەری پێئەکەین، بەڵام ئەگەر گوتی: ئەمانەتەکەم داوەتەوە میراتگرەکانی خاوەنەکە. یان میراتگرەکانی ئەمیندارەکە گوتیان: ئەمانەتەکەمان داوەتەوە خاوەنەکەی. یان گوتی: داومەتە یەکێکی تر. ئەوانە بە سوێند باوەریان پێناکرێو ئەبی شاهید هەبێ.

(وَعَلَيْهِ) واجبە لە سەر ئەمیندارەکە (أَنْ يَحْفَظَها) ئەمانەتەکە بپارێزێ (فِي حِرْزِ مِثْلِها) لەو شوێنەی ئەو جۆرە شتەی لێدائەنرێو ئەپارێزرێ، کەوابوو: ئەگەر لە شوێنێکی نالەبار دایناو، ئینجا دزرا، یان لەناو چوو، یان کەموکوری ی هێنا، ئەوە تۆڵەی ئەکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر لە شوێنێکی باش دایناو دزرا، یان زۆردارێك بردی، تۆڵەی ناکەوێتە سەر.

(وَإِذا طُولِبَ) هەر کاتێك داوای لێکرا (بِها) کە ئەمانەتەکە بداتەوە، ئینجا خاوەنەکەی داوای لێبکا، یان میراتگرەکانی خاوەنەکە (فَلَمْ يُخْرِجْها) ئەویش ئەمانەتەکەی نەداوە (مَعَ الْقُدْرَةِ عَلَيْها) لەگەڵ ئەوەش توانای هەبوو بیداتەوە (حَتَّى تَلِفَتْ) هەر نەیداوە تا لەناو چوو (ضَمِنَ) تۆڵەی ئەکەوێتە سەر، چونکە بە پێچەوانەی ئەم ئایەتە رەفتاری کردوە: ﴿إِنَّ اللهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ واتە: خوای گەورە فەرمانتان پێئەکا: ئەمانەتەکان بدەنەوە خاوەنەکانیان.

﴿ئاگاداری﴾: ئەرکی گەراندنەوەی ئەمانەتەکە لە سەر خاوەنەکەیەتی.

﴿پاشکۆ﴾: ئەگەر خاوەنی ئەمانەتەکە مرد، یان قەرزی کەسێکی لە سەر بوو و خاوەن قەرزەکە مرد، یان ماڵێکی لە زۆردارێك وەرگرتەوە، یان لە ناو دەریا، یان لە ناو لافاو شتێکی هەلگرتەوە، ئەگەر خاوەنی ئەو جۆرە شتانە، یان میراتگری خاوەنەکەی دیار بوو، ئەیاندرێتەوە، ئەگەر هیچیان نەبون، ئەیداتەوە دەست (قازی) تاکو بۆ (بيت المال) سەرفی بکا، ئەگەر (قازی) نەبو، یان (فاسق) بوو، ئەیداتەوە دەست پیاوێکی دادپەروەرو لێهاتوو، یان با هەر بەخۆی لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی بکا. وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وآلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ.

## (كتابُ الْفَرائِضِ وَالْوَصَايَا)

وَالْوارِثُونَ مِنَ الرِّجالِ عَشَرَةٌ: اَلإِبْنُ، وَابْنُ الإِبْنِ وَإِنْ سَفَلَ، وَالأَبُ، وَالْجَدُّ وَإِنْ علاَ، وَالأَخُ، وَابْـــنُ الأَخِ وَإِنْ تَرَاخَـــى، وَالْعَـــمُّ، وَابْـــنُ الْعَـــمِّ وَإِنْ تَبَاعَـــدَا، وَالزَّوْجُ، وَالْمَوْلَى الْمُعْتِقُ. وَالْوارِثَاتُ مِنَ النِّساءِ سَبْعٌ: اَلْبِنْتُ، وَبِنْتُ الإِبْنِ وَإِنْ سَفَلَ،

---

﴿(كتابُ الْفَرائِضِ) ئەم پەرتووکە باسی بەشکردنی میرات ئەکا﴾

﴿(وَالْوَصَايا) وە باسی ئامۆژگاری خێر بۆ کردنی دوای مردن ئەکا﴾

بزانە: زانستیبەشکردنیمیرات زۆر گرنگەو بۆ فێربوونی پێویستی بە کۆششێکیزۆر هەیە، پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: ﴿اَلْعِلْمُ ثَلاثَةٌ وَما سِوَىذٰلِكَ فَهُوَ فَضْلٌ: آيَةٌ مُحْكَمَـــةٌ، أَوْ سُنَّةٌ قائِمَةٌ، أَوْ فَرِيضَةٌ عادِلَةٌ﴾ رواهالحاكم، زانستی زۆر پێویست سیّنە، ئەویتر زیّدە زانستیيە: ڕوونکردنەوەی قورئانی پیرۆز، وە ڕوونکردنەوەی حەدیسی پێغەمبەرﷺ، وە فێربوونی بەشکردنی میرات. ئینجا بزانە: لەم پەرتووکەدا کورتەیەکی میرات باس کراوە، ئێمەش درێژەی پێنادەین.

﴿ئاگاداری﴾: ئەبی لە پێش هەموو شتێکدا کاروباری مردووەکە تەواو بکریّو بنێژریّ، ئینجا ئەبی قەرزەکانی بدرێنەوە، جا قەرزەکان هی ئادەمیزاد بن، یان هی خوای گەورە بن: وەکو زەکاتو حەجو کەفارەت، واتە: پێش قەرزدانەوە نابیّ میراتەکە بەش بکریّ، وە نابیّ بەهیچ جۆرێك دەستکاریی بکریّ، ئینجا لە دوای قەرزدانەوە، وەسیّتی مردووەکە جیّبەجیّ بکرێن، ئینجا ئەوەی ئەمێنێتەوە، میراتگرەکان لە نێوان خۆیاندا بەشی ئەکەن.

﴿باسی میراتگرەکان﴾

(وَالْوارِثُونَ) میراتگرەکان (مِنَ الرِّجالِ) لە چینی نێرینە (عَشَرَةٌ) دەکەسن: (اَلإِبْنُ) یەکەم: کوڕی مردووەکەیە. (وَابْنُ الإِبْنِ) دووەم: کوڕیکوڕی مردووەکەیە (وَإِنْ سَفَلَ) هەر چەند کوڕیکوڕ بەرەو خوارتریش بێ. (والأَبُ) سیّیەم: باوکی مردووەکەیە. (وَالْجَدُّ) چوارەم: باپیرەی مردووەکەیە (وَإِنْ علاَ) هەر چەند باپیرە بەرەو سەرەوەتریش بیّ. (وَالأَخُ) پێنجەم: برای مردووەکەیە، جا لە یەك دایكو باوك بن، یان دایك، یان باوکیان جیا بیّ. (وَابْنُ الأَخِ) شەشەم: کوڕیبرای مردووەکەیە (وَإِنْ تَرَاخَى) هەر چەند کوڕەبرایەکەش بەولاوە بەرەو خوارتریّ. (وَالْعَمُّ) حەفتەم: مامیمردووەکەیە، جا لە یەك دایكو باوك بن، یان هەر دایکیان جیا بیّ. (وَابْنُهُ) هەشتەم: کوڕیمامی مردووەکەیە (وَإِنْ تَبَاعَدَا) هەر چەند مامو ماموّزایەکە دووریش بن. (وَالزَّوْجُ) نۆیەم: مێردی ئافرەتە مردووەکەیە. (وَالْمَوْلَىالْمُعْتِقُ) دەیەم: ئازادکەری کۆیلەمردووەکەیە.

(وَالْوارِثَاتُ) میراتگرەکان (مِنَ النِّساءِ) لە چینی مێیینە (سَبْعٌ) حەفتن: (اَلْبِنْتُ) یەکەم: کیژی مردووەکەیە. (وَبِنْتُ الإِبْنِ) دووەم: کیژەکوڕی مردووەکەیە (وَإِنْ سَفَلَ) هەرچەند

وَالأمُّ، وَالْجَدَّةُ وإنْ علَتْ، وَالأُخْتُ، وَالزَّوْجَةُ، وَالْمَوْلاَةُالْمُعْتِقَةُ. وَمَنْ لاَ يَسْقُطُ بحال خَمْسَةٌ: اَلزَّوْجان، وَالأَبوان، وَوَلَدُ الصُّلْب. وَمَنْ لاَيَرِثُ بِحالٍ سَبْعَةٌ: اَلْعَبْدُ، وَالْمُدَبَّرُ، وَأُمُّ الْوَلَد، وَالْمُكَاتَبُ، وَالْقَاتِلُ، وَالْمُرْتَدُّ، وَأَهْلُ مِلَّتَيْنِ.

---

كوڕەكە بەرەوخوارتریش بێ. (وَالأمُّ) سێیەم: دایكی مردووەكەیە. (وَالْجَدَّةُ) چوارەم: داپیرەی مردووەكەیە (وإنْ علَتْ) هەرچەند داپیرەكە بەرەو سەرەوەتریش بێ.

(وَالأُخْتُ) پێنجەم: خوشكی مردووەكەیە، جالە یەك دایكو باوك بن، یان دایك، یان باوكیان جیا بێ. (وَالزَّوْجَةُ) شەشەم: ژنی مێردەمردووەكەیە. (وَالْمَولاَةُالْمُعْتِقَةُ) حەفتەم: ئازادكەری كۆیلە مردووەكەیە.

(وَمَنْ لاَ يَسْقُطُ بِحالٍ) ئەو میراتگرانەی بە هیچ كەسێك بێبەش نابن لە میرات (خَمْسَةٌ) پێنجن: (الزَّوْجانِ) یەكەمو دووەم: ژنو مێرد. (وَالأَبَوانِ) سێیەمو چوارەم: دایكو باوك. (وَوَلَدُ الصُّلْبِ) پێنجەم: ڕۆڵەی مردووەكە، جا نێر بێ، یان مێ بێ. ئەو پێنجانە بە هیچ كەسێك بێبەش نابن، بەڵام وا ڕو ئەدا: بەشیان كەم ئەبێتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ژنو مێرد بە تەنها مارەبڕین میرات لە یەكتری ئەگرن، كەوابوو: مەرج نیە بلۆغیان بوبێ، یان مێردەكە لێی ببێتە زاوا، بەڵام ئەگەر بە یەكجاری تەڵاقی دابو، ئەوە هیچیان میرات لە یەكتری ناگرن.

هەروەها كۆرپەی ناو زگ میرات ئەگرێ، بەومەرجەی لە كاتی مردن لە ناو زگدابێو بە زیندوویش بێتە دەرەوە.

(وَمَنْ لاَ يَرِثُ بِحالٍ) ئەو جۆرە كەسەی میرات ناگرێ بە هیچ جۆرێك (سَبْعَةٌ) حەفت كەسن: (اَلْعَبْدُ) یەكەم: كۆیلەیە. (وَالْمُدَبَّرُ) دووەم: ئەو كۆیلەیە كە لە دوای مردن ئازادی دراوەتێ. (وَأمُّ الْوَلَدِ) سێیەم: ئەو كۆیلەیە كە لە گەورەی خۆی منداڵی بووە. (وَالْمُكاتَبُ) چوارەم: ئەو كۆیلەیە كە نوسراوی ئازادكردنی دراوەتێ.

(وَالْقاتِلُ) پێنجەم: میراتگری كوشندەیە، واتە: هەر كەسێك یەكێكیتر بكوژێ: جا بە هەڵە بێ، یان بە قەسدی بێ، بە هەق بێ، یان بە ناهەق بێ، ئەوە نابێ میرات لە كوژراوەكەی بگرێ.

(وَالْمُرْتَدُّ) شەشەم: ئەو كەسەیە كە لە ئایین وەرگەڕابێو بوبێتە كافر. (وَأَهْلُ مِلَّتَيْنِ) حەفتەم: ئەوانەی ئایینیان لێك جیاوازە میرات لە یەكتری ناگرن: وەكو موسوڵمانو كافر.

﴿ئاگاداری﴾: مەرجە بۆ میراتگرتن: ئەبێ میرات لێگیراوەكە پێش میراتگرەكە بمرێ، واتە: ئەگەر بە یەكەوە مردن، یان نەمانزانی كامیان پێش كامیان مردوە: وەك مردنی بە كۆمەڵی بە لافاو و سوتانو ئۆتۆمبیل، ئەوانە هیچیان میرات لە یەكتری ناگرن، هەروەها ئەوەی زووتر ئەمرێ میرات لەو كەسە ناگرێ كە لە دوای خۆی ئەمرێ.

وَأَقْرَبُ الْعَصَبات: اَلإبْنُ، ثُمَّ ابْنُهُ، ثُمَّ اْلأَبُ، ثُمَّ أَبُوهُ، ثُمَّ اْلأَخُ لِلأَبِ وَاْلأُمِّ، ثُمَّ اْلأَخُ لِلأَبِ، ثُمَّ ابْنُ اْلأَخِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، ثُمَّ ابْنُ الأَخِ لِلأَبِ، ثُمَّ الْعَمُّ عَلَى هَذا التَّرْتِيبِ، ثُمَّ ابْنُهُ، فَإنْ عُدِمَتِ الْعَصَباتِ فَالْمَوْلَىالْمُعْتِقُ.

---

(وَأَقْـرَبُ الْعَصَباتِ) نـزيكترين عەسـەبە، واتـە: ئـەو میراتگرانـەی بەشـی دیارکراویـان بـۆ دانەندراوە (اَلإِبْنُ) کوڕی مردووەکەیـە (ثُـمَّ) ئینجـا ئەگـەر مردووەکـە کـوڕی نـەبو (إِبْنُـهُ) کوڕیکوڕی مردووەکەیە، هەرچەند بەرەوخواریش بێ (ثُمَّ) ئینجـا ئەگـەر کوڕیکـوڕ نـەبو (الأَبُ) باوکی مردووەکەیە (ثُمَّ أَبُوهُ) ئینجا لە دوای باوك، باوکیباوکی مردووەکەیـە (ثُـمَّ الأَخُ لِلأَبِ وَالأُمِّ) ئینجا لە دوای باپیر، برایمردووەکەیە کە لە دایكو بـاوکی بـێ (ثُـمَّ الأَخُ لِلأَبِ) ئینجا برای مردووەکەیە کـە تـەنها لـە بـاوکی بـێ (ثُـمَّ إِبْـنُ الأَخِ لِـلأَبِ وَالأُمِّ) ئینجا کوڕیبرای مردووەکەیە لەدایكو باوکی (ثُمَّ إِبْنُ الأَخِ لِلأَبِ) ئینجـا کـوڕیبرای مردووەکەیـە تەنها لەباوکی (ثُمَّ الْعَمُّ) ئینجا مامی مردووەکەیە (عَلَى هَذاالتَّرْتِيبِ) بەو شێوەیەی لە برای مردووەکەدا باس کرا، واتە: مامی مردووەکە کە لە باوكو دایکی بێ، لەپێشترە لـە مـامی کە تەنها لە باوکی بێ (ثُمَّ إِبْنُهُ) ئینجـا کوڕیمـامی مردووەکـە، بـەو شـێوەیەی لـە کـوڕی برادا باسمان کردن، ئەوانە گشتیان پێیان ئەگوترێ: عەسەبە، واتە: یان گشـت میراتەکـە ئەبەن، یان ئەوەی لە بەر میراتگرەکان ئەمێنێتەوە، جا کەم بێ، یـان زۆر ﴿عَـنْ ابْـنِ عَبَّاسٍ رَضِيَاللهُ عَنْهُما: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَلْحِقُوا الْفَرائِضَ بِأَهْلِها فَما بَقِيَ فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَـرٍ﴾ رواه الشـيخان، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: میراتگرەکـان بەشـی خۆیـان بـدەنێ، ئینجـا ئەوەندەی مایەوە، بیدەنە نزیکترین میراتگری نێرینە.

(فَإِنْ عُدِمَتِ الْعَصَباتِ) جا ئەگەر ئەو عەسـەبانە نـەبون (فَـالْمَوْلَىالْمُعْتِقُ) ئـەو گەورەیـەی کۆیلەکەی ئازاد کردوە، عەسەبەیە (ثُمَّ عَصَبَتُهُ) ئینجا میراتگرە نێرینەکانی وی.

ئینجا ئەگەر ئەوانەی باسمان کردن هیچیان نەبون، میراتەکە ئەدرێتـە (بیت المـال)، جـا ئەگەر (بیت المال) نەبو، یان کاربەدەستەکان خائینو ستەمکار بـون، ئەوەنـدە میراتـەی ماوەتەوە، دووبـارە ئەدرێتـەوە ئـەو میراتگرانـەی بەشـیان بـۆ دیـارکراوە –جگـە لـە ژنو مێرد– جا ئەگەر هیچ میراتگرێك نەبو، میراتەکە ئەدرێتە (ذَوِيالأَرْحامِ)، واتـە: خزمـی لـە بەرێ: وەکو باوکیدایكو، داپیرەی بێبەش لە میراتو، کیژو کوڕیکیژو، کیژەکانی بـراو، کیژو کوڕیخوشكو، کوڕەکـانیبرای لـە دایکـیو، کیـژی مـامو، خوشـکیدایكو، خوشـکی باوكو، خاڵیمردووەکە.

ئینجا ئەگەر ئەو جۆرە خزمانەش نەبون، میراتەکە بۆ بەرژەوەنـدی موسـوڵمانان سـەرف ئەکرێ، کەوابوو: دوو پیاوماقوڵی دادپەروەری ئـەو شـوێنە ئـەم کـارە ئەخەنـە ئەسـتۆی خۆیانو جێبەجێی ئەکەن.

وَالْفُرُوضُ الْمَذْكُورَةُ في كتاب الله تَعالىَ ستَّةٌ: اَلنِّصْفُ، وَالرُّبْعُ، وَالـثُّمُنُ، وَالثُّلُثـانِ، وَالثُّلُثُ، وَالسُّدُسُ. فَالنِّصْفُ فَرْضُ خَمْسَةَ: اَلْبنْت، وَبِنْت الْإِبْنِ، وَالْأُخْت مِـنَ الْأَبِ وَالْأُمِّ، وَالْأُخت مِنَ الْأَب، وَالـزَّوْجِ إِنْ لَـمْ يَكُـنْ مَعَـهُ وَلَـدٌ وَلاَ وَلَـدُ ابْـنٍ. وَالرُّبْعُ فَرْضُ اثْنَيْنِ: اَلزَّوْجِ مَعَ الْوَلَدِ أَوْوَلَدِ الابْنِ، وَهُوَ فَرْضُ الزَّوْجَةِ وَالزَّوْجاتِ مَـعَ عَدَمِ الْوَلَدِ أَوْوَلَدِ الابْنِ.

---

﴿(وَالْفُرُوضُ الْمَذْكُورَةُ): ئەو بەشە میراتانەی دیارکراون بۆ میراتگرەکان ﴾

(فِـي كِتابِ اللهِ تَعـالىَ) له قـورئانی پیرۆزدا، له سـورەتی (النساء)، (سِتَّةٌ) شـەش بەشـن:

(اَلنِّصْفُ) نیوەیی $\frac{١}{٢}$، (وَالرُّبْعُ) چوارێك $\frac{١}{٤}$، (وَالثُّمُنُ) هەشتێك $\frac{١}{٨}$، (وَالثُّلُثانِ) دوو سێیەك $\frac{٢}{٣}$،

(وَالـثُّلُـثُ) سـێیـەك $\frac{١}{٣}$، (وَالسُّدُسُ) شـەشێك $\frac{١}{٦}$.

(فَالنِّصْفُ) بەشی‌یەکەم: کە نیوەیە (فَرْضُ خَمْسَةٍ) بەشی پێنج جۆرە میراتگرانە: یەکەم: (اَلْبِنْتِ) بەشی کیژی‌مردووەکەیە، بەو مەرجەی بە تەنها بێ، واتە: نە خوشك‌و نە برای‌خۆی لەگەڵدا نەبێ. دووەم: (وَبِنْتِ الإِبْنِ) بەشی کیژەکوڕی مردووەکەیە، بەو مەرجەی بـە تـەنها بێ، واتە: نە کیژی‌مردووەکەو نە خوشك‌و نە برای خۆی لەگەڵدا نەبێ.

سـێیەم: (وَالأُخْتِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ) بەشی خوشکی‌مردووەکەیە، کە لـەدایك‌وباوکی بـێ، بـەو مەرجەی نە کیژی‌مردووەکەو نە هی کوڕی‌مردووەکەو نـە خوشـك‌و نـە بـرای خـۆی لەگەڵدا نەبێ. چوارەم: (وَالأُخْتِ مِنَ الأَبِ) بەشی خوشکی‌مردووەکەیە، کە تەنها لەباوکی بـێ، بـەو مەرجانەی گوتمان و هەم خوشکی لەدایك‌و باوکی‌مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ.

پێنجـەم: (وَالزَّوْجِ) بەشی مێردی ئافرەتەمردووەکەیە (إِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ وَلَدٌ) بـەو مەرجـەی نە کیژو نە کـوڕی ئافرەتەمردووەکـەو، هـەم (وَلاوَلَـدُابْنٍ) هـی کـوڕی ئافرەتەمردووەکـەی لەگەڵدا نەبێ، جا لە خۆی بێ، یان لە مێردێکی‌تر.

(وَالرُّبْـعُ) بەشـی‌دووەم: کـە چـوارێکە (فَـرْضُ اثْنَـيْنِ) بەشـی دوو جـۆرە میراتگرانـە: یەکەم: (اَلزَّوْجِ) بەشی مێردی‌ئافرەتە مردووەکەیە (مَعَ الْوَلَدِ) ئەگەر مێردەکە: کیـژ، یـان کوڕی ئافرەتەکەی لەگەڵدا بێ، جا لە خۆی بێ، یان لە مێردێکی‌تر (أَوْ وَلَدِالإِبْنِ) یان کیژو کوڕی کوڕی‌ئافرەتەمردووەکەی لەگەڵدا بێ.

دووەم: (وَهُوَ) هەروەها چوارێك (فَـرْضُ الزَّوْجَـةِ) بەشـی ژنێکی‌مردووەکەیـە (وَالزَّوْجـاتِ) هەروەها بەشی گشت ژنەکانی‌مردووەکەیە، بە یەکەوە بۆخۆیان بەشی ئەکـەن (مَـعَ عَـدَمِ الْوَلَـدِ) بـەو مەرجـەی مێردەکـەی: کیـژ، یـان کوڕی‌خـۆی نـەبێ (أَوْ وَلَـدِالإِبْنِ) هـەروەها کیژی‌کوڕ، یان کوڕی‌کوڕیشی نەبێ.

وَالثُّمُنُ: فَرْضُ الزَّوْجَةِ وَالزَّوْجات مَعَ الْوَلَد أَوْوَلَدالابْنِ. وَالثُّلُثان فَرْضُ أَرْبَعَة: اَلْبِنْتَيْنِ، وَبِنْتَيْ الابْنِ، وَالأُخْتَيْنِ مِنَ الأَب وَالأُمِّ، وَالأُخْتَيْنِ مِنَ الأَب. وَالثُّلُثُ فَرْضُ اثْنَيْنِ: اَلأُمِّ إذا لَمْ تُحْجَبْ، وَهُوَ للإثْنَيْنِ فَصاعداً مِنَ الإخْوَةِ وَالأَخَوات مِنْ وَلَدالأُمِّ. وَالسُّدُسُ فَرْضُ سَبْعَة: اَلأُمِّ مَعَ الْوَلَد أَوْ وَلَدالابْنِ أَواثْنَيْنِ فَصاعِداً مِنَ الإخْوَةِ وَالأَخَوات، وَهُوَ لِلْجَدَّة عِنْدَ عَدَمِ الأُمِّ،

---

(وَالثُّمُنُ) بەشی‌سێ‌یەم: کە هەشتێکە (فَرْضُ الزَّوْجَةِ) بەشی ژنێکی‌مردووەکەیە (وَالزَّوْجاتِ) وە بەشی گشت ژنەکانی‌تریەتی، بە یەکەوە بەشی ئەکەن (مَعَ الْوَلَدِ) ئەگەر مێردەکە کوڕ، یان کیژی هەبێ، جا لەو ژنە بێ، یان لە ژنێکی‌تر (أَوْ وَلَدِ الإِبْنِ) یان کیژی‌کوڕ، یان کوڕی‌کوڕی هەبێ.

(وَالثُّلُثانِ) بەشی‌چوارەم: کە دووسێیەکە (فَرْضُ أَرْبَعَةٍ) بەشی چوار جۆرە میراتگرانە: یەکەم: (اَلْبِنْتَيْنِ) بەشی دوو کیژە، یان زیاتر لە دووان، بەو مەرجەی برای خۆیان لەگەڵدا نەبێ. دووەم: (وَبِنْتَيْ‌الإِبْنِ) بەشی دوو کیژەکوڕ، یان زیاتر لە دوو کیژەکوڕە، بەو مەرجەی کیژی مردووەکەیان لەگەڵدا نەبێ‌و برای خۆیان لەگەڵدا نەبێ.

سێ‌یەم: (وَالأُخْتَيْنِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ) بەشی دوو خوشك، یان زیاتر لە دووانە کە لە دایك‌و باوکی بن، بەو مەرجەی: کیژی مردووەکەو کیژی‌کوڕی‌مردووەکەو برای‌خۆیان لەگەڵدا نەبێ.

چوارەم: (وَالأُخْتَيْنِ مِنَ الأَبِ) بەشی دوو خوشك، یان زیاتر لە دووانە کە تەنها لە باوکی بن، بەو مەرجەی گوتمان‌و، هەروەها خوشکی لە دایك‌و باوکیش لەگەڵیاندا نەبێ.

(وَالثُّلُثُ) بەشی پێنجەم: کە سێیەکە (فَرْضُ اثْنَيْنِ) بەشی دوو جۆرە میراتگرانە: یەکەم: (اَلأُمِّ) بەشی‌دایکی‌مردووەکەیە (إذا لَمْ تُحْجَبْ) بەو مەرجەی بەشی کەم نەکرێتەوە، واتە: نە کیژو نە کوڕی مردووەکەو نە هی‌کوڕی‌مردووەکەو، نە دووان و نە زیاتر لە دووان خوشك‌و برای مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ.

دووەم: (وَهُوَ) هەروەها سێیەك (لِلإِثْنَيْنِ) بەشی دووانە (فَصاعِداً) هەروەها بەشی زیاتر لە دووانە (مِنَ الإِخْوَةِ وَالأَخَواتِ) لە خوشك‌و برایەکانی مردووەکە (مِنْ وَلَدِ الأُمِّ) کە تەنها لە دایکی بن، وە جیاوازی نێر و مێ نیە.

(وَالسُّدُسُ) بەشی‌شەشەم: کە شەشێکە (فَرْضُ سَبْعَةٍ) بەشی حەفت جۆرە میراتگرانە: یەکەم: (الأُمِّ) بەشی‌دایکی‌مردووەکەیە (مَعَ الْوَلَدِ) ئەگەر مردووەکە: کیژ، یان کوڕی خۆی هەبێ (أَوْ وَلَدِالإِبْنِ) یان کیژی‌کوڕ، یان کوڕی کوڕی هەبێ (أَوْ إِثْنَيْنِ فَصاعِداً) یان دوو، یان زیاتر (مِنَ الإِخْوَةِ وَالأَخَواتِ) لە خوشك، یان لە برایەکانی مردووەکە هەبێ، جا لە دایك‌و باوکی بن، یان تەنها لە باوکی، یان تەنها لە دایکی بن.

دووەم: (وَهُوَ) شەشێك (لِلْجَدَّةِ) بەشی داپیرەی مردووەکەیە (عِنْدَ عَدَمِ الأُمِّ) لەو کاتەی دایکی

وَلِبِنْتِ ٱلاِبْنِ مَعَ بِنْتِ الصُّلْبِ، وَهُوَ لِلأُخْتِ مِنَ ٱلأَبِ مَعَ ٱلأُخْتِ مِنَ ٱلأَبِ وَٱلأُمِّ، وَهُوَ فَرْضُ ٱلأَبِ مَعَ ٱلْوَلَدِ أَوْوَلَدِٱلاِبْنِ، وَفَرْضُ الْجَدِّ عِنْدَ عَدَمِ ٱلأَبِ، وَهُوَ فَرْضُ الْواحِدِ مِنْ وَلَدِٱلأُمِّ. وَتَسْقُطُ الْجَدَّاتُ بِٱلأُمِّ، وَٱلأَجْدادُ بِٱلأَبِ، وَيَسْقُطُ وَلَدُٱلأُمِّ مَعَ أَرْبَعَةٍ: ٱلْوَلَدِ، وَوَلَدِٱلاِبْنِ، وَٱلأَبِ، وَالْجَدِّ. وَيَسْقُطُ ٱلأَخُ لِلأَبِ وَٱلأُمِّ مَعَ ثَلاثَةٍ: ٱلاِبْنِ، وَابْنِ ٱلاِبْـــنِ، وَٱلأَبِ، وَيَسْقُطُ وَلَدُٱلأَبِ بِهَؤُلاَءِ الثَّلاثَةِ، وَبِٱلأَخِ لِلأَبِ وَٱلأُمِّ.

---

مردووەکە نەمابێ، جیاوازی نیە داپیرەکە: دایکیدایکی بێ، یان دایکیباوکی بێ، جا ئەگەر هەردوو داپیرەکان کۆ بونەوە، تەنها یەك شەشێکیان ئەدرێتێو بۆ خۆیان بەشی ئەکەن.

سێیەم: (وَلِبِنْتِ الإِبْنِ) هەروەها شەشێك بەشی یەك کیژە کوڕە، یان زیاتر لە یەك (مَعَ بِنْتِ الصُّلْبِ) ئەگەر کیژی مردووەکە هەبێ.

چوارەم: (وَهُوَ لِلأُخْتِ مِنَ الأَبِ) هەروەها شەشێك بەشی یەك خوشکە، یان زیاتر لە یەك خوشك کە تەنها لەباوکی بێ (مَعَ الأُخْتِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ) ئەگەر خوشکی لەدایكو باوکی هەبێ.

پێنجەم: (وَهُوَ فَرْضُ الأَبِ) هەروەها شەشێك بەشی باوکیمردووەکەیە (مَعَ الْوَلَدِ) ئەگەر مردووەکە کیژ، یان کوڕیخۆی هەبێ (أَوْ وَلَدِ الإِبْنِ) یان کیژیکوڕ، یان کوڕیکوڕی هەبێ.

شەشەم: (وَفَرْضُ الْجَدِّ) هەروەها شەشێك بەشی باپیرەیمردووەکەیە (عِنْدَ عَدَمِ الأَبِ) ئەگەر مردووەکە باوکیخۆی نەمابێو، کیژ، یان کوڕی هەبێ.

﴿ئاگـــاداری﴾: مەبەســت بــە بــاپیرە: تــەنها باوکیبــاوکو بــە ســەرەوەترە.

حەفتەم: (وَهُوَ فَرْضُ الْواحِدِ) شەشێك بەشی یەك کەسە (مِنْ وَلَدِ الأُمِّ) لە خوشك، یان برای دایکی.

(وَتَسْـقُطُ الْجَـدَّاتُ) داپیرەکانیمردووەکـە بێبـەش ئـەبن لـە مـیرات (بِـالأُمِّ) بـە دایکـی مردووەکە، جا داپیرەکە دایکیدایك بێ، یان دایکیباوك بێ، بەڵام دایکیباوك بە بـاوکیش هەر بێبەش ئـەبێ. (وَالأَجْـدادُ) باپیرەکانیمردووەکـە بێبـەش ئـەبن (بِالأَبِ) بـە بـاوکی مردووەکە، چونکە نزیکترە.

(وَيَسْقُطُ وَلَدُالأُمِّ) هەروەها بێبەش ئەبێ خوشكو برای تەنها لەدایکی (مَعَ أَرْبَعَةٍ) بە چـوار جـۆرە کـەس: (اَلْوَلَـدِ) بـە کیـژو کـوڕی مردووەکـەو (وَوَلَـدِالإِبْنِ) بـە کیـژو کـوڕی کـوڕی مردووەکەو (وَالأَبِ) بە باوکیمردووەکەو (وَالْجَدِّ) بە باپیرەی مردووەکە.

(وَيَسْقُطُ الأَخُ لِلأَبِ وَالأُمِّ) برای لەدایکیوباوکی بێبەش ئـەبێ (مَـعَ ثَلاثَـةٍ) بـە سـێ جـۆرە کەس: (اَلإِبْنِ) بە کوڕی مردووەکەو (وَإِبـنِ الإِبْـنِ) بـە کـوڕی کوڕیمردووەکـەو (وَالأَبِ) بـە باوکی مردووەکە. (وَيَسْقُطُ وَلَدُ الأَبِ) برای لە بـاوکی بێبـەش ئـەبێ (بِهَـؤُلاءِ الثَّلاثَـةِ) بـەو سێ کەسانە: بە کوڕو بە کوڕیکوڕو بە باوك (وَبِـالأَخِ لِـلأَبِ وَالأُمِّ) وە بـە بـرای لـە دایـكو باوکی، چونکە بەهێزترە.

وَأَرْبَعَـــةٌ يُعَصِّــبُونَ أَخَــواتِهِمْ: اَلابْـــنُ، وَابْـــنُ الابْـــنِ، وَالأَخُ مِـــنَ الأَبِ وَالأُمِّ، وَالأَخُ مِـــنَ الأَبِ. وَأَرْبَعَـــةٌ يَرِثُـــونَ دُونَ أَخَـــواتِهِمْ: وَهُـــمُ الأَعْمَـــامُ، وَبَنُوالأَعْمامِ، وَبَنُوالأَخِ، وَعَصَباتُ الْمَوْلَىالْمُعْتِقِ.

---

﴿ئاگــاداری﴾: خوشــك وەكــو بــرای خــۆی وایــە: لــەو بێبەشــبوونەی باســمــان كــرد.
ئینجا بزانە: كوڕەبرای لەدایكو باوكی بێبەش ئەبێ: بە باوكو بە باپیرەو بـە كـوڕو بـە كوڕیكوڕو بە برای لە دایكیو باوكیو بە برای لە بـاوكی، هـەروەها كـوڕەبرای لـە بـاوكی بێبەش ئەبێ: بەم شەشانەو بە كوڕەبرای لە دایكو باوكی.
هەروەها مامی لە دایكو باوكی بێبـەش ئـەبێ: بـەم حەفتانـەو بـە كـوڕەبرای لـە بـاوكی، هەروەها مامی لە باوكی بێبەش ئەبێ: بەم هەشتانەو بە مامی لە دایكو باوكی.
هەروەها كوڕەمامی لە دایكو بـاوكی بێبـەش ئـەبێ: بـەم نۆیانـەو بـە مـامی لـە بـاوكی، هەروەها كوڕەمامی لە باوكی بێبەش ئەبێ: بەم دەیانەو بە كوڕەمامی لە دایكو باوكی.
(وَأَرْبَعَةٌ) چوار میراتگری نێرینـە هەنـە (يُعَصِّبُونَ أَخَـواتِهِمْ) خوشـكەكانیخۆیان ئەكەنـە عەسەبە، واتە: ئەگـەر ئـەوان هـەبن خوشـكەكانیان بەشـی دیاركراویـان نـادرێتـێ، بـەڵكو لەگەڵ برایەكانیان بە یەكەوە میراتیان ئەدرێتێ: هەر برایەك دوو ئەوەندەی خوشـكەكەی ئەبا، جاری واش هەیە خوشكەكان لەگەڵ برایـەكانیان بێبـەش ئـەبن، جـاری واش هەیـە بەشیان كەم ئەبێتەوە:
یەكەم: (اَلإِبْنُ) كوڕیمردووەكەیە، واتە: خوشكەكانیخۆی ئەكاتە عەسـەبەو بـەخۆی دوو ئەوەندەی خوشكەكەی ئەبا.
دووەم: (وَإِبْـنُ الإِبْـنِ) كوڕیكـوڕە، ئـەویش كیــژە كوڕەكــان ئەكاتــە عەســەبە.
سێیەم: (وَالأَخُ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ) برای لە دایكو باوكییە.
چوارەم: (وَالأَخُ مِـنَ الأَبِ) بـرای لـە باوكیـیە. ئەوانـەش خوشـكەكانی خۆیـان ئەكەنـە عەسەبەو دوو ئەوەندەی خوشكەكانیان ئەبەن.
(وَأَرْبَعَةٌ) چوار جۆرە میراتگریتر هەنە (يَرِثُـونَ) بـەخۆیان مـیرات ئـەگرن (دُونَ أَخَـواتِهِمْ) بەڵام خوشكەكانیان میرات ناگرن (وَهُمْ) ئەو چوارانە:
یەكـەم: (الأَعْمـامُ) مامەكانیمردووەكـە، بـەخۆیان میراتگرن، بـەڵام خوشـكەكانیان–كـە پووری مردووەكەنە– میرات ناگرن.
دووەم: (وَبَنُــو الأَعْمــامِ) كــوڕە مامــەكان، واتــە: كیــژی مــــام مــــیرات نــــاگرێ.
سێیەم: (وَبَنُوالأَخْوَةِ) كوڕە برایەكان، واتە: كیژی برا میرات ناگرێ.
چوارەم: (وَعَصَباتُ الْمَوْلَىالْمُعْتِقِ) عەسەبەكانی گـەورەی ئازادكـەر، واتـە: خوشـكەكانی ئەوان میرات ناگرن.

(فَصْــلٌ) وَتَجُــوزُ الْوَصِــيَّةُ بِــالْمَعْلُومِ وَالْمَجْهُــولِ وَالْمَوْجُــودِ وَالْمَعْــدُومِ، وَهِيَ مِنَ الثُّلُثِ، فَإِنْ زادَ وُقِفَ عَلَى إجازَةِ الْوَرَثَةِ،

﴿ فَصْلٌ: لە باسی وەسیێت ﴾

واتـــــە: خێرکردنێـــــك كــــە لــــە دوای مــــردن جێبــــەجێ بكــــرێ.

جا بزانە: خێرکردن لە ژیاندا خێری زیاترە لەو خێرەی کە ئەیخاتە دوای مردن، بەڵام ئەگەر لە ژیانیا نەیکرد، با وەسیێت بکا: لە دوای مردن بۆی بکرێ ﴿عَنْ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَ النَّبيُّ ﷺ: ما حَقُّ امْرِىءٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُرِيدُ أَنْ يُوصِيَ فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَــيْنِ إلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باش نیە بۆ مرۆڤی موسوڵمان شتێکی هەبێو بیەوێ لە دوایمردن بیکاتە خێر: دوو شەوی بە سەردا بڕوا، بەڵکو وا باشە وەسیێتەکەی بنووسێ لە لایخۆی.

(وَتَجُوزُ الْوَصِيَّةُ) وەسیێتکردن دروستە (بِالْمَعْلُومِ) بە شتی زانـدراو، وەك بڵێ: لە دوای مردنم ئەم مەڕەم بۆ بکەنە خێر (وَالْمَجْهُولِ) هەروەها دروستە بە شتی نەزانـدراو، وەك بڵێ: لە دوای مردنم مەڕێکم بۆ بکەنە خێر (وَالْمَوْجُودِ) هەروەها دروستە بە شتی هەبووی، وەك بڵێ: ئەم خانووەی ئێستام (وَالْمَعْدُومِ) هەروەها بە شتی هێشتا نەبووبێ، وەك بڵێ: ئەو خانووەی لەمەودوا دروستی ئەكەم، لە دوای مردنم بیکەنە خێر.

(وَهِيَ) وەسیێت (مِنَ الثُّلُثِ) لە سێیەکی ماڵیمردووەکە جێبەجێ ئەکرێ، واتە: ئەو ماڵەی لە ڕۆژی مردنی هەیەتی (فَإِنْ زادَ) جا ئەگەر ئەو وەسیێتەی دایناوە، لە سێیەکی ماڵەکە زیاتر بوو (وُقِفَ) زێدەیەکە ڕائەگیرێ (عَلَى إجازَةِ الْوَرَثَةِ) لە سەر ڕێگەدانی گشت میراتگرەکان، واتە: ئەگەر ڕازی بون، گشتی جێبەجێ ئەکرێ، ئەگەر ڕازی نەبون، تەنها تا سێیەکیماڵەکە جێبەجێ ئەکرێو لە سێیەك زیاتر ئەگەڕێتەوە بۆ میراتگرەکانی، جا ئەگەر هەندێکیان ڕازی بونو ئەوانیتر ڕازی نەبون، ئەوە تەنها بەشی ڕازیبووەکان وەسیێتەو، هیئەوانیتر میراتەو تەنها بۆ خۆیانە.

﴿عَنْ سَعد بن أَبِيوَقّاص ﷺ: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ التَّصَدُّقِ بِثُلُثَيْ مَالِهِ؟ فَلَمْ يُجِــزْهُ، وَبِشَطْرِهِ؟ فَلَمْ يُجِزْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ عَنِ الثُّلُثِ؟ فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إنَّــكَ إنْ تَذَرْ وَرَثَتَكَ أَغْنِياءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ﴾ رواەالشیخان، (سَعد)- خوا لێی ڕازی بێ- لە نەخۆشیدا گوتیە پێغەمبەر ﷺ: ئایا دوو بەشی ماڵم بکەمە خێر؟ فەرمووی: نا. گوتی: نیوەی ماڵم؟ فەرمووی: نا. گوتی: ئەدی سێیەکی ماڵم؟ فەرمووی: سێیەك باشەو زۆریشە، تۆ ئەگەر میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی، باشترە لەوەی هەژار بنو دەرۆزە بکەن.

وَلاَ تَجُوزُ الْوَصِيَّةُ لِوارِثٍ إِلاَّ أَنْ يُجِيزَهَا بَاقِي الْوَرَثَةِ، وَتَصِحُّ الْوَصِيَّةُ: مِنْ كُلِّ بالِغٍ، عاقِلٍ، لِكُلِّ مُتَمَلِّكٍ، وَفِي سَبِيلِ اللهِ تَعالَى.
وَتَصِحُّ الْوَصِيَّةُ إِلَى مَنْ اجْتَمَعَتْ فِيهِ خَمْسُ خِصالٍ: اَلإِسْلاَمُ، وَالْبُلُوغُ، وَالْعَقْلُ، وَالْحُرِّيَّةُ، وَالأَمَانَةُ.

---

(وَلاَ تَجُوزُ الْوَصِيَّةُ لِوارِثٍ) دروست نیەو نابێ وەسیێت بۆ میراتگر (إِلاَّ أَنْ يُجِيزَها بَاقِي الْوَرَثَةِ) مەگەر میراتگرەکانیتر ڕازی بن ﴿عَنْ أَبِي أُمامَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ وَصِيَّةَ لِوارِثٍ إِلاَّ أَنْ يَشاءَ الْوَرَثَةُ﴾ رواه الدارقطني، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دروست نیە وەسیێت بۆ میراتگر، مەگەر میراتگرەکانیتر ڕازی بن.
(وَتَصِحُّ الْوَصِيَّةُ) وەسیێتکردن دروستە (مِنْ كُلِّ بالِغٍ) لە لایەن هەر کەسێکەوە کە بلۆغی بوبێ (عاقِلٍ) عەقڵی هەبێ، بەڵام مەرج نیە وەسیێتکەرەکە موسوڵمان بێ.
(لِكُلِّ مُتَمَلِّكٍ) وەسیێت دروستە بۆ هەر شتێك کە بگونجێ ببێتە خاوەن ماڵ، کەوابوو: وەسیێت دروست نیە: بۆ ئاژەڵو بۆ مردوو و بۆ شتێ کە هێشتا نەبوبێ.
وە هەروەها پێویستە وەسیێت بۆکراوەکە: دیارکراوبێ، کەوابوو: دروست نیە بڵێ: بۆ یەکێك لەم دووانە.
(وَفِي سَبِيلِ اللهِ تَعالَى) هەروەها وەسیێت دروستە بۆ ڕێگای خوا: وەکو دروستکردنی مزگەوتو چاککردنی ڕێگەو، بەرژەوەندی هەژاران. بەڵام ئاگادار بە: وەسیێت دروست نیە بۆ لایەنێکی وەها کە گوناهی تێدابێ.

## ﴿ باسی سەروەسیێت ﴾

سەروەسیێت ئەو کەسەیە: کە وەسیێتکەر وەسیێتی لە لا ئەکا بۆ ئەوەی کاروباری دوای مردنی بۆ جێبەجێ بکا: وەکو قەرزدانەوەو جێبەجێکردنی وەسیێتو ئاگاداری ماڵو منداڵەکانی، جا دایکی منداڵەکان بۆ پەروەردەی منداڵەکان لە هەموو کەس لەپێشترە ئەگەر مەرجەکانی لێبێتەجێ.
(وَتَصِحُّ الْوَصِيَّةُ) وەسیێتکردن دروستە (إِلَى مَنْ) لە لای ئەو کەسەی (اجْتَمَعَتْ فِيهِ) کە تێیدا کۆ بێتەوە (خَمْسُ خِصالٍ) پێنج ڕەوشت:
یەکەم: (الإِسْلاَمُ) ئیسلام بێ. دووەم: (وَالْبُلُوغُ) بلۆغی بوبێ. سێیەم: (وَالْعَقْلُ) عەقڵی هەبێ. چوارەم: (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازاد بێ. پێنجەم: (وَالأَمانَةُ) ئەمین بێ.
هەروەها پێویستە سەری لە کاروباری ژیان دەربچێو دادپەروەر بێو دوژمنی منداڵەکان نەبێ.
﴿پاشکۆ﴾: پەشیمانبوونەوە لە وەسیێت کردنو لە سەروەسیێت دانان دروستە.

* * *

## (كِتابُ النِّكَاحِ وَمَا يَتَعَلَّقُ بِهِ مِنَ الْأَحْكَامِ وَالْقَضَايَا)

اَلنِّكَاحُ مُسْتَحَبٌّ لِمَنْ يَحْتَاجُ إِلَيْهِ، وَيَجُوزُ لِلْحُرِّ أَنْ يَجْمَعَ بَيْنَ أَرْبَعِ حَرائِرَ، وَلِلْعَبْدِ بَيْنَ اثْنَتَيْنِ، وَلاَ يَنْكِحُ الْحُرُّ أَمَةً إِلاَّ بِشَرْطَيْنِ: عَدَمُ صَداقِ الْحُرَّةِ، وَخَوْفُ الْعَنَتِ.

---

**﴿ كِتابُ النِّكَاحِ: ئەم پەرتووكە باسی ژن مارەكردن ئەكا ﴾**

**(وَما يَتَعَلَّقُ بِهِ) وە باسی ئەو شتانە ئەكا: كە پەیوەندییان بە مارەكردنەوە هەیە: (مِنَ الأَحْكامِ) لە بڕیارەكانیشەرعو (وَالْقَضايا) لە ڕووداوەكانیتری مارەكردن.**

(اَلنِّكاحُ) ژن هێنانو شوو كردن (مُسْتَحَبٌّ) سوننەتە (لِمَنْ) بۆ پیاو و ئافرەتێكی وەها: كە (يَحْتاجُ إِلَيْهِ) پێویستی بە جیماع هەبێ، واتە: دڵیان بۆ بچێ، پیاوەكە توانای ژن هێنانی هەبێو، ئافرەتەكە پێویستی بە بەخێوكردن هەبێ، یان مەترسی لە داوێن پیسان هەبێ ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ مَسْعُودٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قالَ: يَا مَعْشَرَ الشَّبابِ مَنِ اسْتَطاعَ مِنْكُمُ الْباءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هۆ كۆمەڵی لاوەكان هەر كەسێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە، با ژن بهێنێ، چونكە ژن هێنان باشتر چاو و داوێنتان لە حەرام ئەپارێزێ.

ئینجا بزانە: سوننەتە پیاو ئافرەتێكی ئایین پەروەر بێنێ، ئافرەتیش شوو بە پیاوێكی ئایین پەروەر بكا، هەروەها سوننەتە ئافرەتەكە: كچ بێو لە نەتەوەیەكی باش بێو مارەییەكەی سووك بێو خزمێكی زۆر نزیك نەبێو لەو جۆرە ئافرەتانە بێ: كە بە زۆری زاو زێ ئەكەن.

(وَيَجُوزُ لِلْحُرِّ) دروستە بۆ پیاوی ئازاد: (أَنْ يَجْمَعَ) كۆ بكاتەوە لە ژێر مارەو تەڵاقی خۆیدا (بَيْنَ أَرْبَعِ حَرائِرَ) چوار ئافرەتی ئازاد، واتە: دروستە لە یەك كاتا پیاو چوار ژنی بەیەكەوە هەبن، خوای گەورە فەموویەتی: ﴿فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً﴾ ئەو ئافرەتانەی لێتان حەڵاڵن بە دڵی خۆتان لە خۆتانیان مارە بكەن، جا یەك بێ، دوو بن، سێ بن، چوار بن، بەڵام ئەگەر ترستان هەبوو كە بە دادپەروەری لە نێوانیاندا نەجولێنەوە، تەنها یەك ئافرەت مارە بكەن.

(وَلِلْعَبْدِ) هەروەها دروستە بۆ كۆیلە (بَيْنَ اثْنَتَيْنِ) كە دوو ئافرەتی هەبن لە یەك كاتا، چونكە كۆیلە بە نیوەیئازاد داندراوەو سەحابەش -خوا لێیان ڕازی بێ- لە سەر ئەوە یەكدەنگن.

(وَلاَ يَنْكِحُ الْحُرُّ أَمَةً) دروست نیە پیاوی ئازاد ئافرەتی كۆیلە، واتە: (جاریة) لە خۆی مارە بكا (إِلاَّ بِشَرْطَيْنِ) تەنها بە دوو مەرج دروستە:

یەكەم: (عَدَمُ صَداقِ الْحُرَّةِ) توانای نەبێ مارەیی ئافرەتێكی ئازاد بدا.

دووەم: (وَخَوْفُ الْعَنَتِ) مەترسی هەبێ كە تووشی زینا ببێ، وە هەروەها ئەبی كۆیلەكە موسوڵمان بێو، نابێ هیچ ئافرەتی ئازادی لە ژێر مارەییدا بێ.

وَنَظَرُ الرَّجُلِ إِلَى الْمَرْأَةِ عَلَى سَبْعَةِ أَضْرُبٍ، أَحَدُهَا: نَظَرُهُ إِلَى أَجْنَبِيَّةٍ لِغَيْرِ حاجَةٍ فَغَيْرُجائِزٍ. وَالثَّانِي: نَظَرُهُ إِلَى زَوْجَتِهِ أَوْ أَمَتِهِ فَيَجُوزُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى مَاعَدَا الْفَرْجَ مِنْهُمَا.

---

﴿ئاگاداری﴾: ئەو مەرجانە بۆ ئەوە بوو: کە(جاریـة)ی کەسێکیتر لـە خـۆی مـارە بکـا، بەڵام (جاریة)ی خۆی ئەو مەرجانەی ناوێ‌و بە بێمارەکردن دروستە جیماعی لەگەڵ بکا.

## ﴿ باسی تەماشاکردنی ئافرەت‌و پیاو ﴾

(وَنَظَرُ الرَّجُلِ) تەماشاکردنی پیاوی بلۆغ بوو (إِلَى الْمَرْأَةِ) بۆ ئافرەت (عَلَى سَبْعَةِ أَضْرُبٍ) حەفت بەشە (أَحَدُهَا) یەکەم: (نَظَرُهُ) تەماشـاکردنی پیـاوە (إِلَـى أَجْنَبِيَّـةٍ) بـۆ ئـافرەتی بێگانە (لِغَيْرِ حاجَةٍ) بە بێپێویستی (فَغَيْرُ جائِزٍ) ئەو تەماشاکردنە دروست نیە، هەرچەند دەماریشی هەڵنەستێ، یـان ئافرەتەکـە پـیرو ناشـیرین بـێ، خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبـەرﷺ بـە پیـاوانی خاوەن باوەڕ بڵێ: با چاوی خۆیان بنوقێنن‌و تەماشای ئافرەتی بێگانـە نەکـەن‌و داوێنـی خۆیان بپارێزن‌و لە حەرام بە کاری نەهێنن.

﴿ئاگـاداری﴾: حەرامـە ئـافرەت تەماشـای پیـاوی بێگانـە بکـا، هـەروەها واجبـە گشـت ئەندامەکانی خۆی داپۆشێ ئەگەر بزانێ پیاوی بێگانە تەماشای ئەکا، واتە: ئـەو زانایانـەی فەرموویانــە: (واجـب نیـە ئـافرەت ڕووخسـاری‌خۆی داپۆشـێ بـەڵکو سـوننەتە). مەبەستیان ئەوەیە: بەو مەرجەی دڵنیابێ کە پیاوی بێگانە تەماشـای ناکـا، چـونکە خـوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُـرُوجَهُنَّ﴾ ئـەی پێغەمبەرﷺ بە ئافرەتانی خاوەن باوەڕ بڵێ: با چاوی خۆیـان بنـوقێنن‌و تەماشـای پیـاوی بێگانە نەکەن، داوێنی خۆیان بپارێزن‌و لە حەرام بە کاری نەهێنن.

هەر لە دوای ئەو ئایەتەش خوای‌گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ...﴾ پێیان بڵێ: با جوانی‌خۆیان بۆ هیچ کەسێك ئاشکرا نەکـەن جگـە لـە مێـردی خۆیان‌و...تا کۆتایی مەحرەمەکانی خۆیان.

ئەمەش شتێکی ئاشکرایە: کە ڕووخسار جوانترین ئەندامی ئافرەتە، کـەوابوو: ئـەبێ ئـەو جوانی‌یە لە بێگانە بشارێتەوە ﴿عَنْ أَسْماءَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كُنَّا نُغَطِّي وُجُوهَنَا مِنَ الرِّجَـالِ﴾ رواه الحاكم على شرط الشيخين، (أسماء) ئەفەرموێ: ئێمە ڕووخساری خۆمان لـە پیـاوی بێگانە دائەپۆشی، واتە: لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ.

(وَالثَّانِي) دووەم: (نَظَرُهُ إِلَى زَوْجَتِهِ) تەماشاکردنی پیاوە بۆ ژنی خۆی (أَوْ أَمَتِهِ) یان بـۆ (جارية)ی خۆی (فَيَجُوزُ أَنْ يَنْظُرَ) دروستە تەماشای هەموو لەشیان بکا (إِلَى مَاعَدَا الْفَرْجَ مِنْهُمَا) جگـە لـە ئەندامی میزکـردن نـەبێ، واتـە: تەماشـاکردنی ئەنـدامی میزکـردن هـی ئافرەتی خۆی مەکروهەو حەرام نیە.

وَالثَّالِثُ: نَظَرُهُ إِلَىَ ذَوات مَحارِمه أَوْ أَمَته الْمُزَوَّجَة فَيَجُوزُ فِيمَاعَدا مـا بَـيْنَ السُّـرَّة وَالرُّكْبَـةِ. وَالرَّابِـعُ: اَلنَّظَـرُ لأَجْـلِ النِّكَـاحِ فَيَجُـوزُ إِلىَالْوَجْـهِ وَالْكَفَّـيْنِ. وَالْخـامِسُ: اَلنَّظَـرُ لِلْمُـداواة فَيَجُـوزُ إِلىَالْمَواضِـعِ الَّتِـي يَحْتـاجُ إِلَيْهَـا. وَالسَّادِسُ: اَلنَّظَرُ لِلشَّهادَة أَوْ لِلْمُعامَلَة فَيَجُوزُ النَّظَرُ إِلَىَ الْوَجْه خَاصَّةً.

---

(وَالثَّالِثُ) سىٰيەم: (نَظَرُهُ) تەماشاكردنى پياوە (إِلَى ذَواتِ مَحارِمِه) بۆ ئـەو ئافرەتانـەى مەحرەمى خۆيەتى: وەكو دايكو خوشكو كيژو پوور (أَوْ أَمَتِهِ الْمُزَوَّجَةِ) هـەروەها بۆ (جارية)ى خۆى كە لە كەسێكىترى مارە كردوە (فَيَجُوزُ) دروستە بنـوارێ (فِيما عَدا ما بَيْنَ السُّرَّةِ وَالرُّكْبَةِ) بۆ هەموو ئەندامیان جگە لە نێوان ئەژنۆ و ناوكيان نەبێ، بەلام ئەگەر دەمارى هەڵئەستا، حەرامە تەماشاى دەستو ڕووخساريشيان بكا.

(وَالرَّابِعُ) چوارەم: (اَلنَّظَرُ) تەماشاكردنى ئافرەتە (لأَجْلِ النِّكاحِ) بۆ ئەوەى لە خۆى مـارە بكا (فَيَجُـوزُ) دروستە تەماشاى بكـا، بـەڵكو سـوننەتە (إِلَـى الْوَجْـهِ وَالْكَفَّيْنِ) تەماشـاى ڕووخسـارو لەپـە دەسـتەكانى بكـا، چـونكە جـوانى لـە ڕووخسـارى دەرئەكـەوێو نـەرمو نۆلَيش لە دەستەكانى دەر ئەكـەوێ ﴿عَنِ الْمُغِيرَةِ﴾: أَنَّهُ خَطَبَ امْرَأَةً فَقالَ النَّبِـيُّ ﷺ: أُنْظُرْ إِلَيْها فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمـا﴾ رواهالترمـذي، (مُغـيرة) ژنێكـى داخـواز كـرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: تەماشاى بكە، چونكە ئەو تەماشـاكردنە ئەبێتـە هـۆى گونجـانو بەردەوامبوونى خۆشەويستى لە نێوانتاندا.

ئينجا بزانە: دروستە زياتر لە جارێكو دوو جار تەماشاى بكا بـە نيـازى مـارەكردن، جـا ئەگەر نەگونجا بەخۆى تەماشاى بكا، با دايكىخۆى، يان خوشكىخۆى، يان مەحرەمێكى ئافرەتەكە بنێرێ تاكو لە جياتىى تەماشاى بكاو پىٰى بڵێ چۆنە.

(وَالْخامِسُ) پێنجەم: (اَلنَّظَـرُ لِلْمُـداواةِ) تەماشـاكردنى ئافرەتـە بـۆ دەرمـانكردن (فَيَجُـوزُ) دروستە بۆ پياو و ئافرەت (إِلَى الْمَواضِعِ الَّتى) تەماشاى ئەو شوێنانەىيەكترى بكـەن كـە (يَحْتاجُ إِلَيْها) پێويستيان بە دەرمانكردن هەيە، بەو مەرجەى بۆ ئەو جۆرە دەرمانكردنـە ئافرەت دەست نەكەوێو لە كاتى دەرمانكردن مەحرەمێك، يان ئـافرەتێكىتر لـەوێ بـێ، بەلام تا موسوڵمان هەبێ، نابێ لە لاىكافر خۆى دەرمان بكا.

(وَالسَّادِسُ) شەشـەم: (اَلنَّظَرُ) تەماشاكردنە (لِلشَّهادَةِ) بۆ شاهيدى لە سەردانو بۆ كردنـە شاهيد (أَوْ لِلْمُعامَلَةِ) يان بۆ كڕينو فرۆشتنو ئاڵوگۆڕييـەكانىتر (فَيَجُـوزُ النَّظَـرُ) دروستە تەماشاى يەكترى بكـەن (إِلَـى الْوَجْـهِ خاصَّةً) تـەنها تەماشـاى ڕووخسـار بكـەن، چـونكە ئادەميزاد بە ڕووخسار ئەناسرێتەوە.

وَالسَّابِعُ: اَلنَّظَرُ إِلى الأَمَةِ عِنْدَ ابْتِياعِهَا فَيَجُوزُ إِلىَ الْمَوَاضِعِ الَّتِي يَحْتَاجُ إِلَى تَقْلِيبِهَـا.
(فَصْلٌ) وَلاَ يَصِحُّ عَقْدُ النِّكَاحِ إِلاَّ بِوَلِيٍّ وَشاهِدَيْ عَدْلٍ،

---

(وَالسَّابِعُ) حەفتـەم: (اَلنَّظَرُ إِلَى الأَمَةِ) تەماشاكردنى(جارية)يە، واتە: كۆيلە (عِنْدَ إِبْتِياعِهـا) كاتى كڕينى (فَيَجُوزُ) دروستە (إِلَى الْمَواضِعِ الَّتِي) تەماشاى ئەو شوێنانەى بكا كە (يَحْتاجُ إِلَى تَقْلِيبِها) پێويستيان بە هەڵگێڕو وەرگێڕ هەيە، جگە لە ئەژنۆ و ناوك.

﴿پاشكۆ﴾ بزانـە: تەماشـاكردنى ڕووخسـار لـە كـاتى فێركردنىخوێنـدن، يـان فێركردنـى كاركردن دروستە، بەو مەرجەى ئەو جۆرە فێركردنـە پێويسـت بـێو لـە پـەناى پـەردەوە نەگونجێو هيچ مەحرەمىخۆى نەبێ فێرى بكا.

ئينجا بزانـە: حەرامە ئافرەتى موسوڵمان ڕێگا بـدا ئـافرەتى كـافر تەماشـاى بكـا، هـەروەها حەرامە ئافرەتو پياوى بێگانە دەست لـە هـەر ئەنـدامێكى يـەكترى بـدەنو حەرامـە دەسـت بخەنە دەستى يەكتر، هەروەها حەرامە دوو ئافرەت، يان دوو پياو لەگەڵ يـەكترى بخـەون بـە ڕووتى، يان بە جلەوە ئەگەر دەمارِيان لێك هەڵسێ، هەروەها حەرامە پياو تەماشاى عـەورەتى پياو بكا، ئافرەت تەماشاى عەورەتى ئافرەت بكا، كە لە باسى نوێژ باسمان كرد.

هەروەها كە منداڵەكان تەمەنيان بووە دە ساڵ، واجبە: نێر و مێ لێك جيـا بكرێنـەوە لـە خەوتن، جا بابو كيژ بن، يان دايكو كوڕ بن، يان خوشكو بـرا بـن، هـەر وەك لـە (باسـى پەروەردەىمنداڵ)دا بە بەڵگەوە ڕابرا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە بـاسى ڕوكنەكـانى ژن مارە كردن ﴾

بزانە: ژن مارەكردن لە پێنج ڕوكن پێك دێ: يەكەم: مێرد. دووەم: ژن. سـێيەم: (وَلِـى)، واتە: سەرپەرشتكارى ژن. چوارەم: دوو شاهيد. پێنجەم: گفتوگۆى مارەبڕين.

ئينجا بزانە: مەرجە –بۆ دروستبوونى مارەكردن– بزانـدرێ: ئـەو ژنـە لـەو پيـاوە حەڵاڵـەو ئەبى دبارى بكرێ ژنەكە كامەيەو پياوەكە كامەيە، نابێ هيچيان لە ژێر ئيحرامـدا بـنو نابـێ مارەبڕينەكە بە زۆرەملـێ بێو نابێ ئافرەتەكە لە ژێر مارەو (عِدَّة)ى كەسێكىتردا بێ.

## ﴿ باسى وەلى و شاهيد ﴾

(وَلاَ يَصِحُّ) دروست نيـە (عَقْدُ النِّكـاحِ) مـارەبڕين (إِلاَّ بِـوَلِيٍّ) تـەنها بـە مـارەبڕينى (وَلِـى) –واتە: بە سەرپەرشتكارى ئافرەتەكە– نەبێو (وَشاهِدَيْ عَدْلٍ) تەنها بە ئامادەبوونى دوو شاهيدى دادپەروەر نـەبێ ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: عَنِ النَّبِـيِّ ﷺ: لاَ نِكَـاحَ إِلاَّ بِـوَلِيٍّ وَشاهِدَىْ عَدْلٍ﴾ رواهأحمد وابن حبان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: هيچ مارەبڕينێك دروست نيە تـەنها بە (وَلِى)و دوو شاهيدى دادپەروەر نەبێ.

﴿ئـاگادارى﴾: لە مەزهەبى ئيمـامى(حنفـى)دا: ئەگـەر ئـافرەت بلـوغى بـوو و عـاقڵ بـوو، سەرپەخۆيەو بۆى دروستە: هەر بەخۆى –لە لاى دوو شاهيد– خۆى لە پياوێك مـارە بكـا،

وَيَفْتَقِرُ الْوَلِيُّ وَالشَّاهدان إِلَىَ سِتَّةِ شَرائطَ: اَلإِسْلاَمُ، وَالْبُلُوغُ، وَالْعَقْلُ، وَالْحُرِيَّةُ، وَالذُّكُورَةُ، وَالْعَدَالَةُ. إِلاَّ أَنَّهُ لاَ يَفْتَقِرُ نِكَاحُ الذِّمِّيَّةِ إِلَىَ إِسْلاَمِ الْوَلِيِّ، وَلاَ نِكاحُ الأَمَةِ إِلَىَ عَدالَةِ السَّيِّدِ.

---

هـەم بـۆی دروسـتـه یـەکێکیتر بکاتـە وەکیـل: تـاکو لـە پیاوێـك مـارەی بکـا، وە لەو دوو مەسەلەیەدا جیاوازی کچو بێوەژن نیە.

(وَيَفْتَقِرُ الْوَلِيُّ) پێویستی هەیە (وَلی)ی ژنەکـە (وَالشَّاهِدانِ) وە هـەردوو شـاهیدەکان (إِلى سِتَّةِ شَرائِطَ) شەش مەرجیان لێبێنە جێ:

یەکەم: (الإِسْلاَمُ) موسوڵمان بن، واتە: کافر نابێتە شاهیدو، نابێ ژنیش لە یـەکێکیتر مـارە بکا. دووەم: (وَالْبُلُوغُ) بلۆغیان بوبێ. سـێیەم: (وَالْعَقْلُ) عـاقڵ بـن، واتـە: منـداڵو شـێت نابنە شاهیدو ناتوانن ژنیش مارە بکەن: نە لـە خۆیـانو نـە لـە کەسـێکیتر، هـەروەها ئـەو کەسەی لە بەر پیری هۆشی تێك چووە، نابێ ژن مارە ببڕێ. چوارەم: (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازاد بـن، واتە: کۆیلە نابێتە شاهیدو نابێتە (وَلی)ی ژنەکـە. پێنجەم: (وَالذُّكُورَةُ) نێرینـە بـن، واتـە: ئافرەت نابێتە شاهیدی مارەبڕینو ناشتوانێ مارەی ژن ببڕێ.

شەشـەم: (وَالْعَدالَةُ) دادپەروەر بن، واتە: گوناهیگەورەیان نـەبێو سـوور نـەبن لـە سـەر گوناهی بچووكو خوو و ڕەووشتی ناڵەباریان نەبێ، کەوابوو: (فاسق) نابێتە شاهیدو نابێ مارەی ژنیش ببڕێ.

(إِلاَّ أَنَّهُ) بەڵام ئەو جیاوازییە هەیە (لاَ يَفْتَقِرُ نِكاحُ الذِّمِّيَّةِ) پێویست نیـە بـۆ مـارەبڕینی ئافرەتی کافری ژێر پەیمان (إِلَى إِسْلاَمِ الْوَلِيِّ) کە (وَلی)یەکـەی موسـوڵمان بـێ (وَلاَ نِكـاحُ الأَمَةِ) هەروەها پێویست نیە بۆ مارەبڕینی (جارية)، واتـە: کۆیلـە (إِلَى عَدالَـةِ السَّيِّدِ) کـە گەورەکەی دادپەروەر بێ.

﴿ئاگاداری﴾: لە مەزهەبیئیمامی(حنفی)دا دروستە: بە دوو شاهیدی فاسقو بـە (وَلـی)ی فاسق ئافرەت مارە ببڕێ، وە زۆر لە زانایانی مەزهەبی(شافعي)ش ئەو (فتوا)یەیان داوە، کەوابوو: بۆ ئەم سـەردەمە چارەمان نیە ئـەبی بـە فـەرموودەی ئەوانـە ڕەفتـار بکـەین، چـونکە دادپـەروەر ئـەمڕۆ کـەم دەسـت ئەکـەوێ، جـا پێویسـتە: ژنو مێـردو (وَلـی)و شاهیدەکان-گشتیان-لەو فەرموودەیە ئاگادار بکرێنو بڵێن: ئێمە بـەم (فتـوا)یـە ڕازیـن: کـە (دروستـە ژن مـارە بکـرێ بـە شـاهیدی فاسـق و بـە وەلی فاسـق). بـۆ ئـەوەی مارەبڕینەکە دروست ببێ.

﴿ئاگاداریەکیتر﴾: مەرجە: ئەبی شاهیدەکان گوێیان لە گفتوگۆی مارەبڕین ببێو نابێ کوێر بنو ئەبی ژنو مێردەکە بناسن، جا ئەوەش بزانـە: دروسـتە کـوڕی ژنو مێردەکـە، یـان بـاپیرەی ژنو مێردەکـە، یـان مامیهـەردووکیان، یـان برایـان، یـان دوژمنیـان، یـان باوکیمێردێکی بالغبوو- ئەوانە- گشتیان دروستە ببنە شاهیدی مارەبڕین.

## ﴿ باسی گفتوگۆی ماره بڕین ﴾

پێویسـته لـه دانیشـتگای ماره‌بڕینـدا چـوار کـه‌س ئامـاده بـن: دووانیان شاهید بن‌و گوێ له گفتوگۆ بگرن. وه یه‌کێکیان (وَلی)ی ئافره‌ته‌که بێ-یان وه‌کیلی (وَلی)یه‌که بێ- بۆ ئه‌وه‌ی گفتوگۆیه‌که بکا. وه یه‌کێکیان مێرده‌که-یان وه‌کیلی مێرده‌که-بێ‌و وه‌ڵامی گفتوگۆیه‌که بداته‌وه.

ئینجا بزانه: سوننه‌ته یه‌کێك له‌و چوارانه، یان که‌سێکی‌تر-پێش ماره بڕین- ئه‌م ووتاره بخوێنێته‌وه: ﴿إنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِهِ مِن شُرُورِ أَنْفُسِنا مَـنْ يَهْدِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَهادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَـهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، (يَاأَيُّهَاالنَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِى خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوااللهَ الَّذِى تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا)، (يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوااتَّقُوااللهَ حَقَّ تُقَاتِـهِ وَلاَ تَمُـوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْـتُمْ مُسْلِمُونَ)، (يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوااتَّقُوااللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِـرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًاعَظِيمًا)﴾ رواه أصحاب السنن.

هه‌روه‌ها بزانـه: پێویسته بۆ ماره‌بڕین: یه‌کێك له‌م دوو ووشانه بگوترێ-که لـه قورئـانی پیرۆزدا بـه کـار هـاتون-کـه ووشـه‌ی (تَـزْوِيج)ه واتـه: له‌گـه‌ڵ جـووتکردن، یـان ووشـه‌ی (إنْكاح)، واته: کردنه ژن ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إتَّقُـوااللهَ فِي النِّسَـاءِ فَـإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمانِ اللهِ وَاسْـتَحْلَلْتُمْ فُـروُجَهُنَّ بِكَلِمَـةِاللهِ﴾ رواه‌مسلم، پێغه‌مبه‌رﷺ فـه‌رمووی: لـه خـوا بترسـن له‌گـه‌ڵ ژنـه‌کانتان بـاش بـن، چـونکه بـه ئه‌مینداریـه‌تی خـوا ئه‌وانتان وه‌رگرتون‌و به ووشه‌ی خوای‌گه‌وره داوێنی ئه‌وانتان حه‌ڵاڵ کردوه.

ئینجا بزانـه: گۆڕینی ئـه‌و دوو ووشـه‌یه بـۆ هـه‌موو زمـانێکی‌تر دروسـته، بۆ وێنـه: کـاك نه‌وزادی باوکی کیژه‌که بڵێ: (کاك ئازاد، ئه‌وا خانزادی کیژم کرده ژنـی تـۆ و له‌گه‌ڵ تـۆم جووت کرد به ده میسقالی زێڕ مارەیی). ئینجا کـاك ئـازاد وه‌ڵام بداتـه‌وه‌و بڵـێ: (قبـوڵم کرد خانزادی کیژت به ژن بۆ خۆم‌و به جووت له‌گه‌ڵ خۆم به‌و ماره‌ییه‌ی گوتمان).

وه ئه‌گه‌ر وه‌کیل ماره‌ی ئه‌بڕی، با وه‌کیله‌که بڵێ: (ئـه‌وا خـانزادی کیـژی کـاك نـه‌وزادم به وه‌کیلایه‌تی‌وی کرده ژنی تۆ و له‌گه‌ڵ تۆم جووت کرد به ئه‌وه‌نده ماره‌ییه). ئینجـا مێرده‌که‌ش له وه‌ڵامدا بڵێ: (قبوڵم کرد خانزادی کیژی کاك نه‌وزاد بـه جـووت له‌گـه‌ڵ خۆم به ژن بۆ خۆم...).

یان بڵێته وه‌کیلی‌مێرده‌که: (ئه‌وا خانزادی کیـژم دایـه کـاك ئـازاد بـه ژنایـه‌تی‌و له‌گـه‌ڵ ئه‌ویم جووت کرد...). ئینجا وه‌کیلی‌کاك ئازاد لـه وه‌ڵامـدا بڵـێ: (قبـوڵم کـرد خـانزادی

(فَصْلٌ) وَأَوْلَى الْوُلاَةَ اَلأَبُ، ثُمَّ الْجَدُّ أَبُ اْلأَبِ، ثُمَّ اْلأَخُ للأَبِ وَاْلأُمِّ، ثُمَّ اْلأَخُ لِلأَبِ، ثُمَّ ابْنُ اْلأَخِ للأَبِ وَاْلأُمِّ، ثُمَّ إِبْنُ اْلأَخِ للأَبِ، ثُمَّ الْعَمُّ، ثُمَّ ابْنُهُ عَلَى هَذاالتَّرْتِيبِ،

---

کیژی تۆ به ژن بۆ کاك ئازاد و بـه جـووت لەگـەڵ کاك ئـازاد بـه وەکیلایـەتیوی بـه ئەومندە مارەییە).

﴿پاشکۆ﴾: له دوای مارەبڕین سوننەته پیرۆزبایی له ژنو مێردەکه بکرێو دوعـای باشـیان بۆ بکرێو بڵێ: ﴿بَارَكَ اللهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُما فِي خَيْرٍ﴾ رواه الترمذي، خوا له یەکتریتان پیرۆز بکاو به خۆشیو شادی لەگەڵ یەکتریتان کۆ بکاتەوە.

ئینجا که ژنەکەی گواستەوەو چوونه ژووری زاواو بووك، سوننەته زاوا مووی پێشه سەری بووکەکه بگرێو بڵێ: خـوا لـه یـەکتریمان پـیرۆز بکـاو بـه خۆشـی لەگـەڵ یـەکتریمان کـۆ بکاتەوە. ئینجا بڵێ: ﴿أَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَها وَخَيْرَ ما جَبَلْتَها عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِـنْ شَرِّها وَشَرِّ ما جَبَلْتَها عَلَيْهِ﴾ رواەابوداود.

ئینجـا هـەموو جارێـك کـه ویسـتیان جیمـاع بکـەن، یـا نـەختێك مـاچو دەسـتبازی بکـەنو هەردووکیان پێش جیمـاعکردن بڵێن: ﴿بِسْمِ اللهِ أَللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطانَ ما رَزَقْتَنَا﴾ رواەالشیخان. جا ئەگەر پیاوەکه پێشدا ڕەحەت بوو و ئاوی هات، یا هەڵنەستێ تـا ئافرەتەکەش ڕەحەت ئەبێ.

﴿ئاگاداری﴾: خۆ ڕەحەتکردنی ژنو مێرد به دەستی یەکتری، یان به هەر ئەندامێکیتری یەکتری دروستە، بـەڵام خـۆ ڕەحـەتکردن بـه دەسـتی خـۆی، یـان کەسـێکیتر، یـان بـه ئەندامێکیتری لەش دروست نیە، خـوای گـەورە فـەرموویـەتی: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُـرُوجِهِمْ حَافِظُونَ إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ﴾ ئەو کەسانەی دامێنی خۆیان ئـەپارێزن جگـه لـه ڕابـواردنی لەگەڵ ژنەکانی خۆیان...ئەوانه له بەهەشتدا ڕێزدارن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ﴾ رواەالشیخان، هـەر کەسێك توانای ژن هێنانی نەبو، با بەڕۆژوو بێ. واته: ئەگەر خۆ ڕەحەتکردن بـەم جـۆرە دروست بووایه، پێغەمبەرﷺ ڕێگای ئەداو فەرمانی بەڕۆژووبوونی نەئەدا.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی له پێشترین(وَلِی) بۆ مارە بڕین ﴾

(وَأَوْلَى الْوُلاَةَ) لەپێشترین (وَلِی) بۆ مارەبڕین (اَلأَبُ) باوکی ژنەکەیه (ثُمَّ الْجَدُّ أَبُوالأَبِ) ئینجا ئەگەر باوکی نەبو، باوکی باوك (ثُمَّ الأَخُ لِلأَبِ وَالأُمِّ) ئینجا برای ژنەکه له دایكو بـاوکی (ثُـمَّ الأَخُ لِلأَبِ) ئینجا برای ژنەکه تەنها له باوکی (ثُمَّ إِبْنُ الأَخِ لِـلأَبِ وَالأُمِّ) ئینجـا کـوڕەبرای لـه دایكو باوکی (ثُمَّ إِبْنُ الأَخِ لِلأَبِ) ئینجا کوڕەبرای له باوکی (ثُمَّ الْعَمُّ) ئینجـا مـامی لـه دایـكو باوکی، ئینجا مامی له باوکی (ثُمَّ ابْنُهُ) ئینجا کوڕەمام (عَلَىهَذاالتَّرْتِيبِ) له سـەر ئـەو ڕیـزە، واته: کوڕه مامی له دایكو باوکی لەپێشتره له کوڕه مامی تەنها له باوکی.

فَــإذا عُـــدِمَت الْعَصَـــباتُ فَـــالْمَوْلَى الْمُعْتِقُ، ثُـــمَّ عَصَـــباتُهُ، ثُـــمَّ الْحـــاكِمُ. وَلاَيَجُوزُ أَنْ يُصَرِّحَ بِخِطْبَةِ مُعْتَدَّةٍ، وَيَجُوزُ أَنْ يُعَرِّضَ لَها، وَيَنْكِحَها بَعْدَ الْقضاء عدَّتِها.

(فَإذا عُدِمَتِ الْعَصَباتُ) هەر کاتێك ئەو خزمانەش نەبون (فَـالْمَوْلَى الْمُعْتِقُ) ئـەو گەورەيـەی لە کاتی خۆی ئافرەتەکەی ئازاد کردوە، مارەی ئەبڕێ (ثُمَّ عَصَباتُهُ) ئينجا ئەگەر ئەويش نەبوو، خزمەکانی وی (ثُمَّ الْحاكِمُ) ئينجا ئەگەر خزمی نەبون، (قازی) مارەی ئەبڕێ.

﴿ئاگــاداری﴾: شـيربايی وەرگـرتن حەرامـە، واتـە: (وَلـی)یژنەکـە بڵـێ: کيژەکـەم، يـان خوشکەکەمت لێ‌مارە ناکەم تا ئەوەندەم نەدەيێ. هەرچەند بەو نيـازەش وەری‌بگرێ کە بۆ خۆی، يان بۆ کەسێکی‌تری بە ژن بداتەوە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: قالَ اللهُ تَعالَى: ثَلاثَةٌ أَنا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ باعَ حُرّاً فَأَكَـلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ إِسْتَأْجَرَ أَجِيراً فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِهِ أَجْرَهُ﴾ رواه‌البخـاری، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە لە حەديسی(قُدْسی)دا فەرموويەتی: سێ جـۆرە کـەس هەنـە مـن بەخۆم لە سەريان داواکارم لە ڕۆژی قيامەتدا: يەکەم: ئەو کەسەی لـە سـەر دەسـتی مـن پەيمانێك بدا، ئينجا خيانەتکاری بکا. دووەم: ئەو کەسەی ئادەميزادێکی‌ئـازاد بفرۆشـێ‌و پارەی وەربگرێ. سێ‌يەم: ئـەو کەسـەی کرێکارێـك بـە کرێ بگـرێ‌و ئيشـەکەی پێ‌بکـاو کرێيەکەی نەداتێ.

**ئينجا بزانە:** ئەگەر دوو (وَلـی)، يـان زيـاتر کـۆ بونـەوە: وەکـو دوو بـرا، يـان دوو مـام، سوننەتە کامەيان زاناترەو تەمـەنی زۆرتـرە ئـەو مـارەی بـبڕێ، بـەڵام ئەگـەر ئافرەتەکـە يـەکێکيانی ئيـزن داو لـە پيـاوێکی هاوچەشـنی‌خۆی مـارە کـرد، ئـەوە دروسـتەو نابـێ ئەوانی‌تر ناڕەزايی دەربڕن.

## ﴿ باسی خوازبێنی ﴾

(وَلاَ يَجُوزُ) دروسـت نيـە (أَنْ يُصَـرِّحَ) مەبەسـتی خـۆی ئاشـکرا بکـا (بِخِطْبَـةٍ مُعْتَـدَّةٍ) بـۆ داخوازی ئافرەتێکی وەها: کە هێشتا لە ژێر(عِدَّة)دا بێ، جا مێـردی مردبـێ، يـان تـەڵاقی دابێ، بەڵام (وَيَجُوزُ) دروستە (أَنْ يُعَرِّضَ لَها) بە پێچەو پەنا داخـوازی بکـا، وەك بڵـێ: تـۆ ئافرەتێکی جوانی، تۆ بـێ‌مێرد نامێنيتـەوە (وَيَنْكِحَهـا) ئينجـا مـارەی بکـا (بَعْدَ إِنْقِضـاءِ عِدَّتِها) پاش کۆتايی هاتنی(عِدَّة)کانی.

﴿ئاگــاداری﴾: حەرامـە داخـوازی‌کردنی ئـافرەتێکی مـارەبڕاو، جـا گوازترابێتـەوە بـۆ مێردەکەی، يـان نـا ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَيْسَ مِنّا مَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَـى زَوْجِها﴾ رواه ابوداود، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو کەسە لە ئوممەتی ئێمە نيە کە دڵـی ژنێك تێك بدا لە سەر مێردەکەی‌خۆی.

وَالنِّساءُ عَلَى ضَرْبَيْنِ: ثَيِّبات وَأَبْكار، فَالْبِكْرُ: يَجُوزُ لِلأَبِ وَالْجَدِّ إِجْبارُها عَلَى النِّكاحِ، وَالثَّيِّبُ: لاَ يَجُوزُ تَزْوِيجُها إِلاَّ بَعْدَ بُلُوغِها وَإِذْنِها.

---

هەروەها: حەرامە داخوازی بە سەر داخوازی کەسێکی‌تردا بکا ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لاَيَخْطُبِ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْرُكَ الْخاطِبُ قَبْلَهُ أَوْ يَـأْذَنَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ پیاوی موسوڵمان داخوازی بە سەر داخوازی برای‌خۆیدا بکا، تا ئەوە واز نەهێنێ، یان ئیزنی ئەدا.

هەروەها ئەگەر کەسێك پرسو ڕای پێکرا دەربارەی پیاوێك، یان ئافرەتێك: ئایا بۆ ژن و مێردایەتی چۆنە؟ واجبە کەموکوڕیەکانی ئەو پیاوە، یان ئەو ئافرەتە بە ڕاستی بڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿اَلْمُسْتَشارُ مُؤْتَمَنٌ﴾ رواه اصحاب السنن، پرس پێکراو بە ئەمین داندراوە، کەوابوو: نابێ خیانەت بکا.

## ﴿ باسی مارەبڕینی کچ و بێوەژن ﴾

(وَالنِّســـاءُ) ئافرەتـــان دەربـــارەی مـــارەبڕین (عَلَى ضَـــرْبَيْنِ) دوو جـــۆرن: یەکەمیان: (ثَيِّباتٍ) بێوەژنن، واتە: جارێك جیماعی لەگەڵ کرابێ، جا بە حەڵاڵی، یان بە حەرامی. دووەمیان: (وَأَبْكارٌ) کچن، واتە: لە ژیانیا جیماعی لەگەڵ نەکرابێ.

(فَالْبِكْرُ) جا ئافرەتی کچ (يَجُوزُ) دروستە (لِلأَبِ وَالْجَدِّ) بۆ باوك و باپیرەی (إِجْبارُهـا عَلَى النِّكاحِ) بە بێ‌ئیزن مارەی ببڕن، جا بلۆغی بوبێ، یان نا ﴿عَنْ عائِشَــةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهـا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَزَوَّجَها وَهِيَ بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ وَدَخَلَ بِها وَهِيَ بِنْــتُ تِسْــعٍ﴾ رواه الشيخان، (عائِشَة) -خوا لێی ڕازی بێ- فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ لە خۆی مارە کردم تەمەنم شەش ساڵان بوو، کە گواستمیەوە تەمەنم نۆ ساڵان بوو.

ئینجا بزانە: بەم چوار مەرجانە دروستە باوك و باپیرە بە بێ‌ئیزن کیژەکە مارە ببڕن: یەکەم: مێردەکە هاوچەشنی ئافرەتەکە بێ. دووەم: لە کاتی مارەبڕین ئەبێ مێردەکە بە ئەندازەی مارەیی‌هاوێنەی ئەو ئافرەتە ماڵی هەبێ. سێیەم: نابێ دوژمنایەتی لە نێوان ئافرەتەکەو پیاوەکەدا هەبێ. چوارەم: نابێ دوژمنایەتی بە ئاشکرا لە نێوان ئافرەتەکەو باوك و باپیرەدا هەبێ. بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە ئیزن بداو بە بێ ئەو مەرجانە ڕازی بێ، ئەوە دروستە مارە بکرێ.

﴿ئاگاداری﴾: جگە لە باوك و باپیرە هیچ (وەلی)یەکی‌تر ناتوانێ ئافرەت بە بێ‌ئیزن مارە ببڕێ.

(وَالثَّيِّبُ) ئافرەتی بێوەژن (لاَ يَجُوزُ) دروست نیە (تَزْوِيجُها) هیچ کەسێك مارەی ببڕێ (إِلاَّ بَعْدَ بُلُوغِها) تا بلۆغی ئەبێ، ئەگەر منداڵ بێ (وَإِذْنِها) وە تا بە زوبانی‌خۆی ئەڵێ: ئیزنە مارەم بکەن ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لاَتُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ وَلاَالْبِكْـرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ وَإِذْنُها سُــكُوتُهَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دروست نیە

(فَصْلٌ) وَالْمُحَرَّماتُ بِالنَّصِّ أَرْبَعَ عَشَرَةَ، سَبْعٌ بِالنَّسَبِ: وَهُنَّ الأُمُّ وَإِنْ عَلَتْ، وَالْبِنْتُ وَإِنْ سَفَلَتْ، وَالأُخْتُ، وَالْخالَةُ،

---

بێوەژن مارە ببڕێ تا داوای فەرمانی لێبکرێ، واتە: تا ئەڵێ مارەم بکە، هەروەها کچ نابێ مارە ببڕێ تا داوای ئیزنی لێبکرێ، وە بێدەنگبوونی کچ ئیزندانە. واتە: ئەگەر پرسیان پێکردو بێدەنگ بوو، نیشانەی ئەوەیە کە ڕازییە مارە بکرێ.

﴿ئاگاداری﴾: تەنها بۆ باوکو باپیرە دروستە ژنێك، یان زیاتر لە کوڕی خۆیان -کە بلۆغی نەبوبێ- مارە ببڕن، بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا-خوا لێی ڕازی بێ- بۆ هەموو (وَلی)یەکان دروستە ژن لە منداڵ مارەبکەن و هەم ئافرەتی منداڵ لە یەکێکیتر مارە بکەن، بەو مەرجەی هاوچەشنی خۆی بێ و مارەییەکەی لە هاوێنەکانی خۆی کەمتر نەبێ، ئەگینا: مارەبڕینەکە دروست نیە.

## ﴿ باسی هاوچەشنی ﴾

مەبەست بە هاوچەشنی ئەوەیە: مێردەکە لە پێنج سیفەتدا وەکو ژنەکە بێ، یەکەم: لەو بێکەموکوڕیانەی ئەبنە هۆی پەشیمانبوونەوە. دووەم: ئازاد بێ. سێیەم: ڕەسەنایەتی باوکو باپیر. چوارەم: ئایین پەروەری. پێنجەم: کاروپیشە.

ئینجا بزانە: ئەو هاوچەشنییە مافی ئافرەتەکەو مافی (وَلی)یەکەیەتی، کەوابوو: ئەگەر باوك، یان باپیرە کچێکیان لە پیاوێك مارە کرد کە لە یەکێك لەو سیفەتانەدا هاوچەشنی نەبو: وەك کچێکی منداڵ لە پیاوێکی بالغی گوناهبار مارە بکەن، ئەوە دروست نیە، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکەو (وَلی)یەکەی وازیان لەو مافە هێناو هەردووکیان بەم مارەبڕینە ڕازی بون، ئەوە دروستە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو ئافرەتانەی حەرامن پیاو لە خۆیان مارە بکا ﴾

(وَالْمُحَرَّماتُ) ئەو ئافرەتانەی کە حەرامن پیاو لە خۆیان مارە بکا (بِالنَّصِّ) بە فەرموودەی خوای گەورە (أَرْبَعَ عَشَرَةَ) چواردە ئافرەتن: (سَبْعٌ) حەفتیان لەوانە (بِالنَّسَبِ) بە هۆی خزمایەتی‌نەژاد حەرامن (وَهُنَّ) ئەو حەفتانە ئەمانەن:

یەکەم: (الأُمُّ) دایکی‌خۆیەتی (وَإِنْ عَلَتْ) هەرچەند بەرەو سەرەوەش بێ: وەکو دایکی دایکو دایکی باوك.

دووەم: (وَالْبِنْتُ) کیژی خۆیەتی (وَإِنْ سَفَلَتْ) هەر چەند بەرەو خواریش بێ: وەکو کیژی‌کوڕو کیژی‌کیژ... هتد.

سێیەم: (وَالأُخْتُ) خوشکی خۆیەتی: جا لە دایکو باوکی بێ، یان تەنها لە باوکی بێ، یان تەنها لە دایکی بێ.

چوارەم: (وَالْخالَةُ) ئەو پوورەیە کە خوشکی‌دایکیەتی، یان خوشکی‌داپیریەتی: جا لەدایکو باوکی بێ، یان لەدایکی، یان لە باوکی.

وَالْعَمَّةُ، وَبِنْتُ الْأَخِ، وَبِنْتُ الْأُخْتِ. وَإِثْنَتَانِ بِالرَّضَاعِ: الْأُمُّ الْمُرْضِعَةُ، وَالْأُخْتُ مِنَ الرَّضَاعِ. وَأَرْبَعٌ بِالْمُصَاهَرَةِ: أُمُّ الزَّوْجَةِ، وَالرَّبِيبَةُ إِذَا دُخِلَ بِالْأُمِّ، وَزَوْجَةُ الْأَبِ،

---

پێنجەم: (وَالْعَمَّةُ) ئەو پوورەیە کە خوشکی باوکیخۆیەتی، یان خوشکی باپیرەی: جا لە باوکو دایکی بێ، یان لە دایکی، یان لە باوکی.
شەشەم: (وَبِنْتُ الأَخِ) کیژیبرای خۆی، بەو شێوەی گوتمان.
حەفتەم: (وَبِنْتُ الأُخْتِ) کیژیخوشکیخۆی بەو شێوەی گوتمان. خوای گەورە فەرموویەتی ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ﴾ راڤەی ئایەتەکە دیارە.
(وَإِثْنَتَانِ بِالرَّضَاعِ) دوو ئافرەتیتریش حەرامن بە هۆی شیرخواردن: (وَهُمَا الأُمُّ الْمُرْضِعَةُ) یەکێکیان: دایکیشیرییە، واتە: ئەو ئافرەتەی شیری داوییێ (وَالأُخْتُ مِنَ الرَّضَاعِ) دووەمیان: خوشکیشیرییە، واتە: ئەو ئافرەتەی لە دایکی وێ شیرت خواردوە، یان ئەو لە دایکیتۆ شیری خواردوە، یان هەردووکتان لە ئافرەتێك شیرتان خواردبێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ﴾ واتە: دایکی شیریو خوشکی شیریتان لێحەرامن.
(وَأَرْبَعٌ) چوار ئافرەتیتریش حەرامن (بِالْمُصَاهَرَةِ) بە هۆی زاواو خەزورایەتی (وَهُنَّ) ئەوانە:
یەکێکیان: (أُمُّ الزَّوْجَةِ) دایکیژنیخۆیەتی، هەرچەند بەرەو سەرەوەش بێ: وەك دایکی دایکی ژنەکەی، یان دایکیباوکیژنەکەی، جا بزانە: بە تەنها مارەبڕین دایکو داپیرەی ژنەکەی لێحەرام ئەبن، واتە: هەر چەند جیماعیشی لەگەڵ ژنەکەی نەکردبێ.
دووەمیان: (وَالرَّبِيبَةُ) کیژیژنیخۆیەتی، هەر چەند بەرەوخواریش بێ: وەك کیژیکیژی ژنەکەی، یان کیژیکوڕی ژنەکەی، وە جیاوازی نیە ئەو کیژو کوڕانەی ژنەکە: لە مێردێکیتری پێش خۆی، یان دوای خۆی بن (إِذَا دُخِلَ بِالأُمِّ) بەو مەرجە کیژەکەی لێحەرام ئەبێ: ئەگەر جیماعی لەگەڵ دایکیکیژەکە کردبێ، واتە: بە تەنها مارەبڕین کیژەکە حەرام نابێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَائِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾ دایکەکانیژنەکانتان لێحەرامن، هەروەها کیژەکانیژنەکانیشتان لێ حەرامن، ئەو جۆرە ژنانەی جیماعتان لەگەڵ کردون.
سێیەمیان: (وَزَوْجَةُ الأَبِ) ژنیباوکیخۆیەتی، هەر چەند بەرەو سەرەوەش بێ: وەکو ژنی باوکیباوکی، یان ژنیباوکیدایکی، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَ تَنكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم﴾ ئەو ئافرەتانە مارە مەکەن کە باوکتان مارەیان کردون.
جا بزانە: باوکو باپیرە جیماعیان لەگەڵ ژنەکانیان کردبێ، یان نا، هەر حەرامن.

وَزَوْجَةُ الْإِبْنِ. وَواحِدَةٌ مِنْ جِهَةِ الْجَمْعِ: وَهِيَ أُخْتُ الزَّوْجَةِ. وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِها، وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخالَتِها، وَيَحْرُمُ مِنَ الرَّضاعِ ما يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ.

---

چوارەمیان: (وَزَوْجَةُ الإِبْنِ) ژنیکوڕی خۆیەتی هەرچەند بەرەوخوارەوەش بێ: وەکو ژنی کوڕیکوڕ، یان ژنی کوڕیکیژ، جا هەرچەند کوڕەکە جیماعیشی لەگەڵ ژنەکەی نەکردبێ، هەر حەرامە، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ﴾ ژنی ئەو کوڕانەی لە پشتی خۆتانن لێتان حەرامن.

﴿ئاگاداری﴾: ئەوانەی باسمان کردن بە یەکجاری حەرامنو تەماشاکردنیان دروستەو دەستنوێژیشیان لێناشکێ.

جا بزانە: هەر کەسێك بە هەڵە جیماعی لەگەڵ ئافرەتێك کرد، واتە: وایتێگەیشتبو ژنی خۆیەتیو نەیزانی بێگانەیە، ئەو ئافرەتەش لە باوکو لە کوڕی پیاوەکە حەرام ئەبێ بە یەکجاری، دایکو کیژی ئافرەتەکەش لە پیاوەکە حەرام ئەبن بە یەکجاری، بەڵام نابنە مەحرەم، واتە: تەماشاکردنیان حەرامەو دەستنوێژیان لێئەشکێ.

(وَواحِدَةٌ) ئافرەتێکیتریش حەرامە (مِنْ جِهَةِ الْجَمْعِ) بە هۆی کۆکردنەوە لەگەڵ یەکێکی دیکەدا (وَهِيَ أُخْتُ الزَّوْجَةِ) ئەمەش خوشکیژنیخۆیەتی، واتە: تا ژنەکەی لە ژێر مارەییدا بێ، نابێ خوشکەکەی مارە بکا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ حەرامە دوو خوشك لە ژێر یەك مارەییدا کۆ بکەنەوە.

(وَلاَ يُجْمَعُ) هەروەها حەرامە کۆ بکرێتەوە (بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِها) لە ژێر مارەی پیاوێکدا: ئافرەتێکو خوشکی باوکیئافرەتەکە (وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخالَتِها) هەروەها حەرامە بە یەکەوە کۆ بکرێتەوە لە ژێر مارەی پیاوێکدا: ئافرەتێکو خوشکیدایکیئافرەتەکە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِها وَلا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخالَتِها﴾ رواەالشیخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دروست نیە لە ژێر مارەی پیاوێکدا ئافرەتو پووری ئافرەتەکە کۆ بکرێنەوە: جا خوشکی باوکی بێ، یان خوشکی دایکی بێ.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کاتێك ژنەکەی مرد، یان تەڵاقیدا، دروستە خوشکی ژنەکەی، یان پووری ژنەکەی لە خۆی مارە بکا، کەواتە: خوشکی ژنو پووری ژن تەماشاکردنیان حەرامەو دەستنوێژیان لێئەشکێ.

(وَيَحْرُمُ مِنَ الرَّضاعِ) حەرامە بە هۆی شیرخواردن (ما يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ) ئەو جۆرە ئافرەتانەی لە خزمایەتی حەرام بون ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: يَحْرُمُ مِنَ الرَّضاعَةِ ما يَحْرُمُ مِنَ الْوِلادَةِ﴾ رواەالشیخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر ئافرەتێك بە هۆی خزمایەتی حەرامە، بە هۆی شیریش حەرامە. (لە باسی شیردان بە درێژی باسی ئەکەین) إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

وَتُرَدُّ الْمَرْأَةُ بِخَمْسَةِ عُيُوبٍ: بِالْجُنُونِ، وَالْجُذَامِ، وَالْبَرَصِ، وَالرَّتَقِ، وَالْقَرْنِ. وَيُرَدُّ الرَّجُلُ بِخَمْسَةِ عُيُوبٍ: بِالْجُنُونِ، وَالْجُذَامِ، وَالْبَرَصِ، وَالْجَبِّ، وَالْعُنَّةِ. (فَصْلٌ) وَيُسْتَحَبُّ تَسْمِيَةُ الْمَهْرِ فِي النِّكَاحِ، فَإِنْ لَمْ يُسَمَّ صَحَّ الْعَقْدُ،

---

(وَتُرَدُّ الْمَرْأَةُ) دروسته مێرد مارەبڕینەکەی هەڵبوەشێنێتەوە (بِخَمْسَةِ عُيُوبٍ) بە پێنج جۆرە کەموکوڕی لە ژنەکەیدا: (بِالْجُنُونِ) بە هۆی شێتیو (وَالْجُذَامِ) بە هۆی گرووییو (وَالْبَرَصِ) بە هۆی بەڵەکیو (وَالرَّتَقِ) بە هۆی گیرانی شوێنی‌جیماع بە زێدەگۆشت و (وَالْقَرْنِ) بە هۆی گیرانیی بە ئێسقان.

(وَيُرَدُّ الرَّجُلُ) هەروەها دروستە ژنەکەش مارەبڕینەکەی هەڵبوەشێنێتەوە (بِخَمْسَةِ عُيُوبٍ) بە هۆی پێنج جۆرە کەموکوڕی لە مێردەکەیدا: (بِالْجُنُونِ وَالْجُذَامِ وَالْبَرَصِ) بە هۆی شێتیو گرووییو بەڵەکیو (وَالْجَبِّ) بە هۆی لێبونەوەی ئەندامی‌جیماعکردن و (وَالْعُنَّةِ) بە هۆی نەمێردی، واتە: جیماع پێنەکران بە ماوەی ساڵێك.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی مارەیی دانان بۆ ئافرەت ﴾

(وَيُسْتَحَبُّ) سوننەتە (تَسْمِيَةُ الْمَهْرِ) ناوهێنانی مارەیی (فِي النِّكَاحِ) لە گفتوگۆی مارەبڕیندا، واتە: سوننەتە لە گفتوگۆی مارەبڕیندا دیاری بکرێ: مارەیی ئەو ژنە چەندەو چۆنە؟ وەك بڵێ: (ئەوا فاتیمەی کچم کردە ژنی تۆ مارەیی لە سەر تۆ هەزار دینار بێ). ئینجا مێردەکەش بەو جۆرە قبوڵ بکا.

(فَإِنْ لَمْ يُسَمَّ) جا ئەگەر لە گفتوگۆی مارەبڕیندا ناوی مارەییان نەهێنا (صَحَّ الْعَقْدُ) مارەبڕینەکە دروستەو لێکتری حەڵاڵ ئەبن، جا بە تەنها ئەو مارەبڕینە مارەیی هاووێنە ئەکەوێتە سەر مێردەکە، هەر چەند جیماعیشی لەگەڵ نەکردبێ ﴿عَنْ ابنِ مَسْعُودٍ ﷺ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَها صَدَاقاً، وَلَمْ يَدْخُلْ بِها حَتَّى ماتَ؟ فَقالَ ابْنُ مَسْعُود: لَها مِثْلُ صَداقِ نِسائِها لا وَكْسَ وَلا شَطَطَ وَعَلَيْها الْعِدَّةُ وَلَهَا الْمِيراثُ. فَقالَ مَعْقِلٌ الأَشْجَعِيُّ ﷺ: قَضى رَسُولَ اللهِ مِثْلَ ماقَضَيْتَ﴾ رواه‌اصحاب السنن، پرسیار لە (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) کرا ﷺ دەربارەی پیاوێك: ژنێکی لە خۆی مارە کردو هیچ مارەیی بۆ دانەنابو و جیماعیشی لەگەڵ نەکردبو تا مرد؟ لە وەڵاما فەرمووی: ئەبی بە وێنەی مارەیی ئافرەتەکانی خزمی خۆی مارەیی بۆ دابندرێو لە (عِدَّة)ش دابنیشێو میراتیشی بدرێتێ. جا یەکێك لە سەحابەکان هەڵساو فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ بەم جۆرەی‌تۆ بڕیاری داوە.

﴿ئاگاداری ﴾: (مَهْرُالمِثْلِ)، واتە: مارەیی هاووێنە، ئەو جۆرە مارەیی‌یە: کە داندراوە بۆ ئەو ئافرەتانەی وەکو ئەو ژنەنە لە بنەچەکەدا: وەکو خوشكو کیژەبراو کیژەمامو خوشکی‌باوك.

وَوَجَبَ الْمَهْرُ بِثَلاَثَةِ أَشْياءَ: أَنْ يَفْرِضَهُ الزَّوْجُ عَلَى نَفْسِهِ، أَوْيَفْرِضَهُ الْحَاكِمُ، أَوْ يَدْخُلَ بِهَا فَيَجِبُ مَهْرُالْمِثْلِ. وَلَيْسَ لأَقَلِّ الصَّداقِ وَلاَ لأَكْثَرِه حَدٌّ، وَيَجُوزُ أَنْ يَتَزَوَّجَها عَلَى مَنْفَعَةٍمَعْلُومَةٍ.

---

جا بزانه: ئەوەی گوترا، دەربارەی ئافرەتێك بوو كە بە (وەلی)یەكەی خۆی نەگوتبێ: بە بێمارەیی لە فلانم مارە بكە. كەواتە: ئەگەر بڵێ: بە بێمارەیی مارەم بكە. ئەوە بە تەنها مارەبڕین هیچ مارەیی واجب نابێ، بەڵام (وَوَجَبَ الْمَهْرُ) مارەیی بۆ ئەو جۆرە ژنە واجب ئەبێ (بِثَلاَثَةِ أَشْياءَ) بە یەكێك لەو سێ شتانە:

یەكەم: (أَنْ يَفْرِضَهُ الزَّوجُ عَلَىنَفْسِهِ) مێردەكە بە خۆی مارەییەكە لە سەرخۆی واجب بكا، واتە: پێش جیماعكردن بڵێ: ئەوەندە زێڕە، یان ئەوەندە دینارە مارەییت بێ. ژنەكەش پێی ڕازی بێ. دووهەم: (أَوْ يَفْرِضَهُ الْحاكِمُ) یان (قازی) مارەییەكە دیاری بكا، ئەگەر ئافرەتەكە شكایەتی كرد. سێیەم: (أَوْ يَدْخُلَ بِها) یان مێردەكە جیماعی لەگەڵ بكا (فَيَجِبُ مَهْرُالْمِثْلِ) ئینجا بەو جیماعكردنە (مَهْرُالْمِثْلِ) واتە: مارەیی هاوێنە لە سەر مێردەكە واجب ئەبێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر پێش ئەو سێیانە ژنەكە، یان مێردەكە مرد، ئەوە مارەیی هاوێنە ئەكەوێتە سەر مێردەكە، (بەڵگە: حەدیسەكەی‌پرابردووە).

جا بزانە: ئەگەر ئافرەتێك بە هەڵە جیماعی لەگەڵ كرا، واتە: وایتێگەیشت ئەو پیاوە مێردی خۆیەتی، یان خەوتبو، ئەبێ پیاوەكە مارەیی هاوێنە بداتە ئافرەتەكە، بەڵام ئەگەر ئافرەتەكە ئەیزانی ئەو پیاوە مێردی خۆی نیە، ئەوە بۆی ئەبێتە زینا، كەواتە: مارەیی نادرێتێ.

(وَلَيْسَ لأَقَلِّ الصَّداقِ) دیاری نەكراوە: نە بۆ كەمترینیمارەییو (وَلاَ لأَكْثَرِهِ) نە بۆ زۆرترینی مارەیی (حَدٌّ) هیچ سنوورێك، واتە: هەر شتێك كڕینو فرۆشتنی دروست بێ، دروستە بكرێتە مارەیی، جا كەم بێ، یان زۆر بێ ﴿عَنْ سَهل بن سَعْدٍ﷛: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قالَ لِرَجُلٍ أَرادَ النِّكاحَ: أُنْظُرْ وَلَوْ خاتَماً مِنْ حَدِيدٍ﴾ الحديث رواه‌الشيخان، پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێكی فەرموو-كە ئەیویست ژن مارە بكا-: برۆ هەوڵی شتێك بدە بۆ مارەییژنەكە، هەرچەند ئەنگوستیلەیەكی ئاسنیش بێ.

﴿وَعَنْ عائِشَةَرَضِيَ‌الله عنها: كانَ صَداقُ أَزْواجِ النَّبِيِّ ﷺ خَمْسُمِأَةِ دِرْهَمٍ﴾ رواه‌مسلم، (عائشە) فەرموویەتی: مارەیی ژنەكانی پێغەمبەر ﷺ پێنجسەد دیرهەم بوو، واتە: سێسەدو پەنجا میسقالی زیو. بەڵام بە هەر جۆرێ بێ، مارەیی كەم باشترە.

(وَيَجُوزُ) دروستە (أَنْ يَتَزَوَّجَها) ژنەكە مارە بكا (عَلَى مَنْفَعَةٍ مَعْلُومَةٍ) لە سەر سوودێكی زانراو، وەك بڵێ: مارەییت فێركردنی قورئانی پیرۆز بێ، یان سورەتێك لە قورئان ﴿عَنْ سَهل بن سَعْدٍ﷛: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قالَ لِرَجُلٍ: ماذا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟ قالَ سُورَةُ كَذا

وَيَسْقُطُ بِالطَّلَاقِ قَبْلَ الدُّخُولِ نِصْفُ الْمَهْرِ.

وَسُورةُ كَذا فَقالَ: زَوَّجْتُكَها بِما مَعَكَ مِنَ الْقُرآنِ﴾ رواه‌الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ به‌ پیاوێكی فه‌رموو: چه‌ند له‌ قورئان ئه‌زانی؟ گوتی: ئه‌م دوو سوره‌ته‌: (الْبَقَرَةَ وَآلِ عِمْرانَ)، جا فه‌رمووی: وا ئه‌م ئافره‌ته‌م كرده‌ ژنی تۆ ماره‌یی‌ی فێركردنی ئه‌و دوو سوره‌ته‌ بێ.

(وَيَسْقُطُ) لائه‌چێ له‌ سه‌ر مێرده‌كه‌ (بِالطَّلَاقِ) به‌ هۆی ته‌لاقدانی ژنه‌كه‌ی (قَبْلَ الدُّخُولِ) پێش ئه‌وه‌ی جیماعی له‌گه‌ڵ بكا (نِصْفُ الْمَهْرِ) نیوه‌ی ماره‌یی، خوای گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَافَرَضْتُمْ﴾ ئه‌گه‌ر ته‌لاقتان دان پێش ئه‌وه‌ی جیماعیان له‌گه‌ڵ بكه‌ن‌و ماره‌ییشتان بۆ دانابون، نیوه‌ی ماره‌ییان بده‌نێ. كه‌واته‌: ماره‌یی‌ته‌واو: یان به‌ جیماعكردن، یان به‌ مردنی یه‌كێك له‌ ژن‌و مێرده‌كه‌ واجب ئه‌بێ، هه‌رچه‌ند جیماعیشی له‌گه‌ڵ نه‌كرابێ.

﴿ئاگـاداری﴾: دروسته‌ ژن و مێرد له‌ نێوان خۆیاندا پێك بێن: كه‌ له‌ جیاتی‌ماره‌یی شتێكی‌تری بداتێ، هه‌روه‌ها دروسته‌ ژنه‌كه‌ گه‌رده‌نی مێرده‌كه‌ی ئازاد بكا له‌ گشت ماره‌یی، یان هه‌ر له‌ به‌شێكی، به‌و مه‌رجه‌ی ماره‌ییه‌كه‌ زه‌كاتی تێدا واجب نه‌بوبێ، چونكه‌ له‌ ئه‌ندازه‌ی زه‌كات—كه‌ مافی هه‌ژارانه‌—گه‌رده‌نی ئازاد نابێ.

جا بزانه‌: ئه‌گه‌ر مێرده‌كه‌ مرد و ماره‌یی ژنه‌كه‌ی نه‌دابو، ئه‌بی پێش وه‌سێت‌و به‌شكردنی میرات، ماره‌یی ژنه‌كه‌ بدرێ.

## ﴿ باسی (مُتْعَة)ی ته‌لاق ﴾

(مُتْعَة) ئه‌وه‌یه‌: كه‌ مێرد ژنه‌كه‌ی ته‌لاق دا به‌خشیشێكی بداتێ له‌ به‌ر ئه‌و دڵته‌نگیه‌ی به‌ سه‌ری هێناوه‌، خوای گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿وَلِلْمُطَلَّقاتِ مَتاعٌ بِالْمَعْرُوفِ﴾ ئه‌و ئافره‌تانه‌ی ته‌لاقدراون، واجبه‌: به‌خشیشی ته‌لاقیان بدرێتێ به‌گوێره‌ی توانای مێرده‌كه‌و لێوه‌شانه‌وه‌ی ئافره‌ته‌كه‌.

جا بزانه‌: سوننه‌ته‌ به‌خشیشی ته‌لاق له‌ ئه‌ندازه‌ی سی دیرهه‌م، واته‌: بیست‌و یه‌ك میسقالی زیو كه‌متر نه‌بێ. هه‌روه‌ها بزانه‌: ئه‌و ئافره‌ته‌ی پێش جیماعكردن ته‌لاق دراوه‌و ماره‌یی بۆ دیاركراوه‌، به‌خشیشی نادرێتێ.

﴿پاشـكۆ﴾: ئه‌گه‌ر ژنه‌كه‌و مێرده‌كه‌ بووه‌ كێشه‌یان: ئایا ماره‌ییه‌كه‌ چه‌نده‌و چی‌یه‌؟ شاهیدیش نه‌بو، ئه‌بی هه‌ردووكیان سوێند بخۆن، ئینجا ماره‌یی هاوێنه‌ بۆ ژنه‌كه‌ دائه‌نرێ.

هه‌روه‌ها بزانه‌: ئه‌گه‌ر مێرد خشڵی زێڕو زیوی كڕی‌و ژنه‌كه‌ی خۆی پێ ڕازانده‌وه‌، به‌مه‌ نابێته‌ ملكی ژنه‌كه‌و هه‌ر هی مێرده‌كه‌یه‌، جا ئه‌گه‌ر ژنه‌كه‌ داوای ئه‌كرد، ئه‌بی دوو شاهید بێنێ، یان شاهیدێك بێنێ‌و سوێندیش بخوا: كه‌ مێرده‌كه‌ ئه‌و خشڵه‌ی داوه‌تێ به‌ ملكایه‌تی. بكه‌ڕێوه‌ بۆ باسی (به‌خشین).

فتح القريب:١٥

(فَصْلٌ) وَالْوَلِيمَةُ عَلَى الْعُرْسِ مُسْتَحَبَّةٌ، وَالإِجابَةُ إِلَيْها واجِبَةٌ إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ.
(فَصْلٌ) وَالتَّسْوِيَةُ فِي الْقَسْمِ بَيْنَ الزَّوْجاتِ واجِبَةٌ،

﴿ فَصْلٌ: لەباسی (وَلِيمَة) زیافەتی بووك گواستنەوە ﴾

(وَالْوَلِيمَةُ) دروستکردنی خواردەمەنی (عَلَى الْعُرْسِ) بۆ بووك گواستنەوە (مُسْتَحَبَّةٌ) سوننەتێکی گەورەیە.

ئینجا بزانە: کاتی ئەو زیافەتە لە مارەبڕینەوە دەست پێدەکا، بەڵام باشتر ئەوەیە: لە پاش بووك گواستنەوە دروست بکرێو خەڵك بانگ بکرێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ لِعَبْدِالرَّحْمَنِ بنِ عَوْفٍ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشاةٍ﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەر ﷺ بە (عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف)ی فەرموو: زیافەتی بووك بکە، هەرچەند بە یەك مەڕیش بێ.

ئینجا بزانە: سوننەتەکە پێك دێ بە هەر خواردنێکی بیداتە خەڵك ﴿عَنْ صَفِيَّةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَوْلَمَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى بَعْضِ نِسائِهِ بِمُدَّيْنِ مِنْ شَعِيرٍ﴾ رواه‌البخاری، پێغەمبەر ﷺ بە دوو مستە جۆ –جارێك– زیافەتی بووکی کرد.

(وَالإِجابَةُ إِلَيْها واجِبَةٌ) چوونە سەر زیافەت واجبە: ئەگەر بانگ کرا ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك بانگ کراو نەچوو بۆ سەر زیافەت، ئەوە گوناهبار ئەبێ بەرامبەر خواو پێغەمبەر ﷺ. (إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ) مەگەر عوزرێکی بە دەستەوە بێ: وەك نەخۆش بێ، یان بترسێ، یان بێدینیەك بکرێ، ئەوە واجب نیە بچێتە سەر زیافەت.

ئینجا بزانە: هەر بووك گواستنەوەیەك تایبەت بێ بە دەوڵەمەندەکان، یان ژنو پیاو تێکەڵ بن، یان زوڕنا لێبدرێ، یان مەی بخورێتەوە، یان نوێژنەکەر ئامادە بن، ئەوە واجب نیە بچێتە ئەو زیافەتە، هەروەها بزانە: ئەگەر کەسێك بانگ نەکرێ بۆ سەر زیافەت، حەرامە لەخۆیەوە بچێ.

﴿پاشکۆ﴾: دروستە بڵاوکردنی شیرنایی‌و پارە بۆ هەموو جۆرە خۆشی‌یەکی وەك ژن هێنان، هەروەها سوننەتە زیافەتکردن: بۆ قورئان ختمکردنو بۆ گەڕانەوەی لە سەفەرو بۆ خانوودروستکردنو بۆ کوڕ سوننەتکردنو بۆ منداڵبوون. هەروەك لە باسی هۆزەباتەدا ڕوونی ئەکەینەوە، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی نۆبەتکردنی مێرد لە نێوان ژنەکانیدا ﴾

(وَالتَّسْوِيَةُ) یەکسانی (فِي الْقَسْمِ) لە مانەوەی شەوێدا (بَيْنَ الزَّوْجاتِ واجِبَةٌ) لە نێوان ژنەکانی خۆیدا واجبە، جا دوو ژنی هەبن، یان سێ، یان چوار ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ كانَتْ لَهُ إِمْرَأَتانِ فَمالَ إِلَى إِحْداهُما دُونَ الأُخْرَى جاءَ يَوْمَ الْقِيامَةِ

وَلاَ يَدْخُلُ عَلَى غَيْرِ الْمَقْسُومِ لَهَا لِغَيْرِ حاجَة، وَإِذا أرادَ السَّفَرَ أَقْرَعَ بَيْنَهُنَّ وَخَرَجَ بِالَّتِي تَخْرُجُ لَهَاالْقُرْعَةُ، وَإِذا تَزَوَّجَ جَدِيدَةً خَصَّها بِسَبْعِ لَيالٍ

---

وَشِقُّهُ مائِلٌ﴾ رواه‌اصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك دوو ژنی هەبن، جا تەنها بۆ لای یەکێکیان ئەچوو و بۆ لای ئەوی‌تریان نەئەچوو، لە ڕۆژی قیامەت بە تەنیشتی خواربوو دێتە دادگای خودا.

ئینجا بزانە: لای کەمی نۆبەتکردن یەك شەوەو لای زۆری سێ شەوە، کەواتە: لە سێ شەو زیاتر دروست نیە لە لای هیچیان بمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر ژنەکانی ڕازی بن، دروستە.

(وَلاَ يَدْخُلُ) دروست نیە بچێ (عَلَى غَيْرِ الْمَقْسُومِ لَهَا) بۆ ماڵی ئەو ژنەی نۆبەتی نیە (لِغَيْرِ حاجَةٍ) تەنها ئەگەر چوونەکەی پێویست بێ، دروستە بچێ بەو مەرجەی زۆر نەمێنێتەوە: وەك سەردانی نەخۆش، یان دانانی شتێك، یان بەخێرهێنانی میوان، جا ئەگەر بە بێ‌پێویستی چوو و زۆر مایەوە، ئەبی بۆ ئەوی‌تریان قەزا بکاتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ژن مافی نۆبەتی هەیە هەرچەند نەخۆشیش بێ، یان پیر بێ، یان لە حەیزدا بێ، یان کەڵکی جیماعی نەبێ، بەڵام یەکسانی لە نێوان ژنەکانی‌دا: لە جیماع‌و لە خۆشەویستی‌دا واجب نیە.

ئینجا بزانە: حەرامە دوو هەوێ لە یەك خانوودا نیشتەجێ بکا، بەڵام ئەگەر ڕازی بن دروستە، هەروەها دروستە هەوێیەك نۆبەتی خۆی بداتە هەوێیەکەی‌تر ئەگەر مێردەکەی ڕازی بێ ﴿عَنْ عائِشَةَ: أَنَّ سَوْدَةَ وَهَبَتْ يَوْمَها لِعائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهما﴾ رواه‌الشیخان، (سَوْدَة) نۆبەتی خۆی دابوە (عائِشَة).

(وَإِذا أرادَ السَّفَرَ) هەر کاتێك مێردەکە ویستی بە سەفەر بچێ‌و ژنێکی لەگەڵ خۆیا ببا (أَقْرَعَ بَيْنَهُنَّ) ئەبی پشکەیان بۆ بکا (وَخَرَجَ بِالَّتِي) جا ئەو ژنە لەگەڵ خۆیا ببا کە (تَخْرُجُ لَها الْقُرْعَةُ) پشکەی بۆ دەرچووە، واتە: ناوی ژنەکانی ئەنووسێ‌و ئەیخاتە ناو شتێك‌و ئەیتەکێنێ، ئینجا ناوێك دەرئێنێ‌و خاوەنی ئەو ناوە لەگەڵ خۆیا ئەبا ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذا أرادَ سَفَراً أَقْرَعَ بَيْنَ نِسائِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُها خَرَجَ بِها مَعَهُ﴾ رواه‌الشیخان، پێغەمبەرﷺ کاتێ ئەچووە سەفەر، پشکەی لە نێوان ژنەکانی‌دا ئەکرد، جا کامەیان ناوی دەرچوبا، لەگەڵ خۆیا ئەیبردە سەفەرەکە.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کەسێك ماڵی‌خۆی بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی‌تر، ئەبی ژنەکانیشی لەگەڵ خۆیا ببا، یان ئەبی تەڵاقیان بدا، مەگەر ژنەکان بەم وازهێنانە ڕازی بن، لەو بابەتەدا جیاوازی نیە: لە نێوان ئەو مێردەی یەك ژنی هەیە، یان زیاتر.

(وَإِذا تَزَوَّجَ جَدِيدَةً) هەر کاتێك مێردەکە ژنێکی نوێی بە سەر ژنە کۆنەکەی‌دا هێنا (خَصَّها بِسَبْعِ لَيالٍ) ئەبی بە تایبەت حەفت شەو-بە بێ‌نۆبەت- لە لای بمێنێتەوە

إنْ كانَتْ بِكْراً، وَبِثَلاثٍ إنْ كانَتْ ثَيِّباً، وَإذا خافَ نُشُوزَ الْمَرْأَة وَعَظَها، فَإنْ أَبَتْ إلاَّ النُّشُوزَ هَجَرَها، فَإنْ أَقامَتْ عَلَيْه هَجَرَها وَضَرَبَها، وَيَسْقُطُ بِالنُّشُوزِ قَسْمُها وَنَفقَتُها.

---

(إنْ كانَتْ بِكْراً) ئەگەر ژنە نوێیەکە کچ بێ (وَبِثَلاثٍ) وە ئەبی سێ شەو لە لای بمێنێتەوە (إنْ كانَتْ ثَيِّباً) ئەگەر ژنە نوێیەکە بێوەژن بێ ﴿عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لِلْبِكْرِ سَبْعٌ وَلِلثَّيِّبِ ثَلاَثٌ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مافی کچ حەفت شەوەو مافی بێوەژن سێ شەوە.

﴿ باسی (ناشِزَة)بوون، واته: لاملی‌كردنی ژن ﴾

(وَإذا خافَ نُشُوزَ الْمَرْأَةِ) هەر کاتێك مێردەکە ترسا: کە ژنەکەی لاملی بکاو لە فەرمانی دەربچێ: وەکو ڕووگرژ بێ‌و پشت لە مێردەکەی بکا (وَعَظَها) با ئامۆژگاری بکاو پێی بڵێ: لە خوا بترسە، مێرد مافی زۆرە لە سەر ژن.

(فَإنْ أَبَتْ) جا ئەگەر ئامۆژگاریی وەرنەگرت (إلاَّ النُّشُوزَ) هەر دەستی بە لاملی کرد (هَجَرَها) مێردەکە جێگەی‌خەوتنی لێ جیا ئەکاتەوە (فَإنْ أَقامَتْ عَلَيْهِ) جا ئەگەر هەر لە سەر لاملیەکەی مایەوە (هَجَرَها وَضَرَبَها) جێگەی خەوتنی جیا ئەکاتەوەو، هەم لێی‌ئەدا، بەڵام نابێ بە جۆرێکی وەها لێی‌بدا: ئەندامێکی بشکێ، یان خوێنی لێبێ.

خوای‌گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾ ئەو ئافرەتانەی لە لاملییان ئەترسن، ئەمبێیان بکەن‌و جێگەی نووستنیان لەگەڵ جیا بکەنەوەو لێیان بدەن، جا ئەگەر گوێڕایەڵی ئێوە بون، هیچ ڕێگایەکی‌تر داوا مەکەن.

ئینجا ئەگەر ژنەکە هەر لاملیی کردو ناکۆکی کەوتە نێوانیان، ئەبی دادگای چارەسەرکردن دابنرێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللهُ بَيْنَهُمَا﴾ ئەگەر ترسان ناکۆکی بکەوێتە نێوان ژن‌و مێرد، ئێوە پیاوێکی‌خزمی مێردەکەو پیاوێکی‌خزمی ژنەکە بنێرن بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، واتە: با هەوڵی ئاشتکردنەوەیان بدەن، جا ئەگەر نەگونجا، با لێکیان جیا بکەنەوە بە ڕەزامەندی هەردووکیان، بەو شێوەیەی لە (خولع)دا باسی ئەکەین، إنْ شاءَاللهُ تَعالَى.

(وَيَسْقُطُ) ژنەکە لە دەستی ئەچێ (بِالنُّشُوزِ) بە هۆی لاملی‌کردن (قَسْمُها) نۆبەتی شەومانەوەو (وَنَفَقَتُها) وە خواردەمەنی‌و جلوبەرگ، واتە: مێردەکە بۆی دروستە خواردن‌و جل‌و بەرگو خانوو نەداتە ئەو ژنەی لاملی دەکا، تا واز ئەهێنێ.

ئینجا بزانە: هەر ژنێك بە بێ‌ئیزنی مێردەکەی بڕواتە دەرەوە، یان نەیەڵێ مێردەکەی جیماعی لەگەڵ بکا، یان ماچی بکا، یان لەگەڵی نەخەوێ، یان پشتی تێبکا، ئەوە بە لاملی

(فَصْلٌ) وَالْخُلْعُ جَائِزٌ عَلَى عِوَضٍ مَعْلُومٍ، وَتَمْلِكُ بِهِ الْمَرْأَةُ نَفْسَها، وَلاَ رَجْعَةَ لَهُ عَلَيْهَا إلاَّ بِنكَاحٍ جَدِيد،

دانەندرێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذا دَعَا الرَّجُلُ إمْرَأَتَهُ إلَى فِراشِه فَأَبَتْ لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکاتێك مێرد داوای لە ژنەکەی خۆی کرد بچێتە لای، ژنەکەش نەچو، تا بەیانی مەلائیکە لەعنەتی لێ ئەکەن.

## ﴿ باسی مافی ژن لە سەر مێرد ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ ژنەکان مافیان لە سەر مێردەکانیان هەیە وەك ئەو مافەی مێردەکان لە سەر ژنەکانیان هەیە بەگوێرەی یاسای شەرع، بەڵام پیاوەکان پلەیەکیان زیاتر ماف لە سەر ئافرەتان هەیە. جا ئەگەر مێردەکە ستەمی لە ژنەکەی ئەکرد بەخێوی نەئەکرد، یان وازی لێ هێنابو، یان جنێوی پێ ئەدا، یان بە ناهەق لێی ئەدا، ئەبێ (قازی) تەمبێی بکا، بەڵام ئەگەر هەردووکیان تاوانبار بون، ئەبێ دادگای چارەسەرکردن دروست بکرێ وەکو گوتمان.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (خُلْع) ﴾

واتە: کڕینەوەی تەڵاق لە مێردەکە، وەك ژنەکە بڵێتە مێردەکەی: ئەو شتەت ئەدەمێ تەڵاقم بدە. ئەویش تەڵاقی بداو شتەکە وەربگرێ.

(وَالْخُلْعُ) خولع–واتە: کڕینەوەی تەڵاق–(جَائِزٌ) دروستە (عَلَى عِوَضٍ مَعْلُومٍ) بە وەرگرتنی شتێکی زاندراو، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ ئەگەر ترسان لەوەی ژن و مێرد سنووری خوا نەپارێزن لەگەڵ یەکتری، هیچ گوناهیان ناگاتێ کە ژنەکە تەڵاقی خۆی بکڕێتەوە.

(وَتَمْلِكُ بِهِ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا) بەم تەڵاق کڕینە ژنەکە ئەبێتە خاوەنی خۆی، واتە: هەر کاتێك (عِدَّة)ی تەواو بوو، ئەتوانێ شوو بە پیاوێکی تر بکا (وَلاَ رَجْعَةَ لَهُ عَلَيْها) مێردەکەی خۆی ناتوانێ بیگەڕێنێتەوە ژێر مارەی خۆی (إلاَّ بِنكَاحٍ جَدِيدٍ) تەنها بە مارەبڕینێکی نوێ نەبێ، واتە: وەك جاری یەکەم بە (وَلِي)و (دوو شاهید) مارەی ببڕێ و مارەییەکی تری بۆ دابنێ، وە بەو مەرجەش ژنەکەش ڕازی بێ.

﴿ئاگاداری﴾: دروستە ژنەکە بە مارەیی خۆی تەڵاقەکە بکڕێتەوە، جا بۆ ئەوەی تەڵاقەکە بکەوێ و گەردەنی مێردەکەش ئازاد بێ، پێویستە هەردوو لایان تەواو بزانن مارەییەکە چی یەو چەندە، وە زەکاتیشی تێدا واجب نەبوبێ، وە هەر لەو دانیشتنەشدا گەردەنی مێردەکەی ئازاد بکا، واتە: مێردەکە بڵێ: (وا تەڵاقم دای بە گەردەن ئازادکردنم لە مارەییەکەت). ژنەکەش بڵێ: (وا گەردنم ئازاد کردی لە ئەوەندە مارەییەکەم)

وَيَجُوزُ الْخُلْــعُ فِــي الطُّهْــرِ وَفِــي الْحَــيْضِ، وَلاَ يَلْحَــقُ الْمُخْتَلِعَــةَ الطَّــلاَقُ.
(فَــصْــلٌ):

﴿عَنْ ابن عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لاِمْرَأَة ثابت بن قَــيْسٍ: أَتَــرُدِّينَ عَلَيْــهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. فَقَالَ ﷺ لِثَابِتٍ: إقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَــةً﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ فەرموویە ژنی (سابیت): ئەگەر (سابیت) تەڵاقت بدا، ئەو باغەی بە مارەیی لێت وەرگرتـوە ئەیدەیـەوە؟ گوتی: بەڵێ. جا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ئـەی (سابیت) باغەکەی لێوەربگرەو تەڵاقێکی بدە.

(وَيَجُــوزُ الْخُلْــعُ) خولـع=تـەلاق کرینـەوە دروسـتە (فِـي الطُّهْـرِ) لـە کـاتی خـاوێنیدا (وَفِـي الْحَـيْضِ) وە لـە کـاتی حـەیزدا (وَلاَ يَلْحَـقُ الْمُخْتَلِعَـةَ) ناگاتـە ئـەو ژنـەی تـەلاقی کڕاوەتەوە (اَلطَّلاَقُ) هیچ جۆرە تـەلاقێك، واتـە: ئـەو ژنـەی لـە بەرانبـەر وەرگـتنی شتێك تەلاق دراوە-جگە لەو تەلاقە- هیچ تـەلاقێکیتری ناکـەوێ، چونکە بـەو تەلاقـە بووەتـە بێگانە، هەرچەندە (عِدَّة)شی تەواو نەبوبێ.

﴿پاشـکۆ﴾: دروسـتە کەسـێکیتر-بـە بـێئیزنی ژنەکـە- تەلاقەکـەی لـە مێردەکـەی بکڕێتەوە، جا ژنەکە هەر سەربەخۆ ئەبێ، ئەو کەسەش هیچ دەستەڵاتی بـە سـەردا نیـەو ناشتوانێ پارەکەی لێوەربگرێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر ژنەکـە کردبویـە وەکیلـی خـۆی، بەمـە -تەنها- مافی پارە وەرگرتنەوەی هەیە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ژن تەڵاقدان ﴾

واتە: پچڕاندنی پەیوەندی ژن‌و مێردایەتی، جا بەم تەڵاقدانـە ژنەکـەی لـێ حـەرام ئـەبێ‌و ئەبێتە بێگانە.

ئینجا بزانـە: تەلاقدان مەکروهـە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللهِ اَلطَّلاَقُ﴾ رواەالحاكم، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لـەو حەلالانـەی کـە خـوا زیـاتر ڕقی لێیە، ژن تەڵاقدانە.

بەڵام جاری وا هەیـە ژن تەڵاقـدان خێـرە: وەك ئـەو کەسـەی مـاڵی ژنەکـەی پـێ جێبـەجێ نەکرێ، یان ژنەکەی بێناموس بێ، یان بەدخوو بـێ ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍرَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ إِمْرَأَتِي لاَتَرُدُّ يَدَ لاَمِسٍ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: غَرِّبْهَا. قَالَ: أَخَــافُ أَنْ تَتْبَعَهَا نَفْسِي. قَالَ: فَاسْتَمْتِعْ بِهَا﴾ رواەالنسـائی، پیاوێك هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ گـوتی: ژنەکەم دەستیهیچ کەسێك ناگێڕێتـەوە؟ پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: تـەلاقی بـدە. پیاوەکـە گوتی: دەترسم دڵم بۆی بچێ. پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: کـەوابوو: لەگـەڵی ڕابـوێرە. واتـە: بیهێڵەوە؟ نەوەك لە دوای تەلاقدانی-بە هۆی دڵبۆچوونەکەی- زینای لەگەڵ بکا.

وَالطَّلَاقُ ضَرْبَانِ: صَرِيحٌ وَكِنَايَةٌ، فَالصَّرِيحُ ثَلَاثَةُ أَلْفَاظٍ: اَلطَّلَاقُ، وَالْفِرَاقُ، وَالسَّرَاحُ، وَلَا يَفْتَقِرُ صَرِيحُ الطَّلَاقِ إِلَى النِّيَّةِ. وَالْكِنَايَةُ: كُلُّ لَفْظٍ احْتَمَلَ الطَّلَاقَ وَغَيْرَهُ، وَيَفْتَقِرُ إِلَى النِّيَّةِ.

(وَالطَّلَاقُ) گفتوگۆی تەلاقدان (ضَرْبَانِ) دوو جۆرە (صَرِيحٌ) یەکەم: گوتەی ئاشکرایە. (وَكِنَايَةٌ) دووەم: گوتەی نائاشکرایە. (فَالصَّرِيحُ) گوتەی ئاشکرا (ثَلَاثَةُ أَلْفَاظٍ) سێ وشەنە، یەکەم: (اَلطَّلَاقُ) وشەی تەلاقە، وەك بڵێ: وا تەلاقم دای، یان وا ژنی‌خۆم تەلاق دا، یان تەلاقم کەوتبێ. دووەم: (وَالْفِرَاقُ) وشەی جیابوونەوەیە، وەك بڵێ: وا جیام کردیەوە. سێیەم: (والسَّرَاحُ) وشەی بەرەڵلاکردنە، وەك بڵێ: وا بەرەڵلام کردی.

جا بزانە: ئەو سێ وشەیە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ تەلاقدان بە کار هاتوون‌و تەنها بۆ عەرەبزمانەکان ئاشکرانە، بەلام بۆ گەلانی‌تر-وەك گەلی کورد- تەنها وشەی تەلاق ئاشکرایەو دووەکانی‌تر نائاشکرانە.

(وَلَا يَفْتَقِرُ) پێویستی نیە (صَرِيحُ الطَّلَاقِ) وشەی‌ئاشکرای تەلاق (إِلَى النِّيَّةِ) بە نیازی ناو دڵ، واتە: کە بە زوبان بڵێ: وا تەلاقم دای، ئەوە تەلاقی ئەکەوێ.

هەروەها ئەگەر بە گاڵتەش تەلاقی بدا، تەلاقی ئەکەوێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ثَلَاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: اَلطَّلَاقُ، والنِّكَاحُ، والرَّجْعَــةُ﴾ رواه‌الترمذي والحاكم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سێ شت هەنە ڕاستییان هەر ڕاستی‌یە، گاڵتە پی‌کردنیشیان هەر ڕاستی‌یە: ژن مارەکردن‌و ژن تەلاقدان‌و تەلاق چاککردنەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر کەسێك بڵێ: (بە تەلاقم ئەو ئیشە ناکەم). ئەوە گوناهەو نابێتە سوێند، واتە: ئیشەکەش بکا تەلاقی ناکەوێ.

(وَالْكِنَايَةُ) گوتەی نائاشکرای تەلاق (كُلُّ لَفْظٍ) گشت وشەیەکە (احْتَمَلَ الطَّلَاقَ) کە بۆ تەلاقدان بە کار دێ‌و (وَغَيْرَهُ) بۆ شتی‌تریش بە کار دێ (وَيَفْتَقِرُ) گوتەی نائاشکرای تەلاق پێویستی هەیە (إِلَى النِّيَّةِ) بە نیازی ناو دڵ، کەواتە: ئەگەر کەسێك بڵێ:

(حەلاڵی‌خوام لێ‌حەرام بێ، یان بڵێ: تۆم لێ‌حەرام بێ وەك دایکم. یان وا تۆم لە خۆم حەرام کرد. یان بڵێ: وا بەرەڵلام کردی. یان بڵێ: لێم جیا ببەوە. وازم لێ‌بێنە. خوا حافیزت بێ. بۆ خۆت شوو بکە. تۆ بێ‌مێردی. تۆ وەك دایك‌و خوشکی منی. وەك سەگو بەراز تۆم لێ حەرام بێ).

ئەوە ئەگەر بەم وشانە نیازی ناو دڵی تەلاقدان بێ، تەلاقی ئەکەوێ، ئەگەر نا: تەلاقی ناکەوێ، بەلام ئەگەر یەکێك بڵێتە ژنەکەی خۆی: تۆ لە من حەرام بی، یان بڵێ: وا تۆم لە خۆم حەرام کرد، وە نیازی تەلاقدان نەبو، ئەوە واجبە کەففارەتی سوێند بدا، هەروەك لە (ظهار)دا باسی ئەکەین، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

وَالنِّساءُ فيه ضَرْبَان: ضَرْبٌ فِي طَلاَقِهِـنَّ سُـنَّةٌ وبِدْعَـةٌ، وَهُــنَّ ذَوَاتُ الْحَـيْضِ، فَالسُّنَّةُ: أَنْ يُوقِعَ الطَّلاقَ فِي طُهْرٍ غَيْرِ مُجامِعٍ فِيه، وَالْبِدْعَةُ أَنْ يُوقِـعَ الطَّـلاقَ فِـي الْحَيْضِ أَوْ فِي طُهْرٍ جَامَعَهَا فِيه. وَضَرْبٌ لَيْسَ فِي طَلاقِهِنَّ سُنَّةٌ وَلاَ بِدْعَةٌ، وَهُنَّ أَرْبَعٌ:

﴿ باسی تەلاقی (سنّي)و (بِدْعي) ﴾

(وَالنِّسـاءُ) ئافرەتـان (فِيـه) لـە تەلاقدانـدا (ضَـرْبان) دوو بەشـن: (ضَرْبٌ) بەشێکیان (فِي طَلاقِهِنَّ) تەلاقدانیان (سُنَّةٌ) پێی ئەگوترێ سوننی، واتـە: گوناه نیە (وَبِدْعَةٌ) یان پێی ئەگوترێ بیدعی، واتە: گوناهە (وَهُنَّ) ئەو جۆرە ئافرەتانـە (ذَوَاتُ الْحَيْضِ) ئەوانەن کە حەیز ئەبینن‌و جیماعیان لەگەڵ کراوە:

(فَالسُّنَّةُ) ئینجا تەلاقی سوننی، واتـە: ئـەو تەلاقـەی دروسـتە (أَنْ يُوقِعَ الطَّلاقَ) ئەوەیە تەلاقی بدا (فِي طُهْرٍ) لە کاتی پاکبوونەوەی لە حەیز (غَيْرِ مُجامِعٍ فِيهِ) وە جیماعی لەگەڵ نەکردبێ لە ماوەی ئەو پاکبوونەوەیەدا، خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ هەر کاتێك ژنتان تەلاق دان، لەو کاتە تەلاقیان بدەن: کە دەست بە (عِدَّة) ئەکەن. واتە: لە کاتی پاکبوونەوەیان لە حەیز، تەلاقیان بدەن.

(وَالْبِدْعَـةُ) تـەلاقی بیـدعی، واتـە: ئـەو تەلاقدانـەی گوناهـە، دوو جـۆرە: یەکەم: (أَنْ يُوقِـعَ الطَّلاقَ) ئەوەیە تـەلاقی بدا (فِي الْحَيْضِ) لـەو کاتـەی ئافرەتەکـە لـە حەیزدایە، چونکە (عِدَّة)ی درێژ ئەبێتەوە.

دووەم: (أَوْ فِي طُهْرٍ) ئەوەیە تەلاقی بدا، لەو پاکبوونەوەیەدا کە (جَامَعَهَا فِيهِ) جیماعی لەگەڵ کردبێ، نەوەك ئاوس بێ‌و پەشیمان ببێتـەوە. ئـەو دوو جۆرە تەلاقدانـە گوناهـە، بەلام تەلاقەکە ئەکـەوێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَـائِضٌ، فَقَـالَ النَّبِيُّ ﷺ لِعُمَرَ: مُرْهُ فَلْيُراجِعْها ثُمَّ لِيُمْسِكْها حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَـاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ، وإِنْ شاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّساءُ﴾ رواه الشيخان، (عبدالله)ی کوڕی ئیمامی(عمر)-خوا لێیان ڕازی بێ-ژنی خۆی تەلاق دا لەو کاتەی لـە حەیزدا بوو، ئینجا پێغەمبەرﷺ بە ئیمامی(عمر)ی فەرموو: پێی بڵێ: بـا تەلاقەکـەی چـاك بکاتەوە-واتە: ژنەکەی بگەڕێنێتەوە ژێر نیکـاحی‌خۆی- ئینجـا ڕایبگرێ تـا لـە حـەیز پـاك ئەبێتەوە، ئینجا جارێکی‌تریش ئەکەوێتەوە حەیزو دیسان پاك ئەبێتەوە، جا ئەگـەر ویسـتی با هەر لە لای بمێنێتەوە، یان ئەگەر ویستی بـا تـەلاقی بـدا پـێش ئـەوەی جیمـاعی لەگـەڵ بکاتەوە، ئەوە ئەو شێوەیەیە کە خوا فەرمانی داوە ژنی تێدا تەلاق بدرێن.

(وَضَرْبٌ) بەشە ئافرەتێکی‌تر هەیە (لَيْسَ فِي طَلاقِهِنَّ سُنَّةٌ) تەلاقـدانیان سـوننی نیـەو (وَلا بِدْعَةٌ) بیدعیش نیە (وَهُنَّ أَرْبَعٌ) ئەو بەشە چوار جۆرە ئافرەتن:

اَلصَّغِيرةُ، وَالآيِسَةُ، وَالْحامِلُ، وَالْمُخْتَلِعَةُ الَّتِي لَمْ يَدْخُلْ بِها.
(فَصْلٌ) وَيَمْلِكُ الْحُرُّ ثَلاثَ تَطْلِيقات، وَالْعَبْدُ تَطْلِيقَتَيْنِ،

---

یەکەم: (اَلصَّغِيرةُ) ئافرەتی بچووکە، واتە: هێشتا حەیزی نەدیتبێ.
دووەم: (وَالآيِسَةُ) ئافرەتی پیرە، واتە: حەیزی نەمابێ. چونکە ئەو دووانە (عِدَّة)یان بە سێ مانگ تەواو ئەبێ.
سێیەم: (وَالْحامِلُ) ئافرەتی ئاوسە، چونکە (عِدَّة)ی بە منداڵبوون تەواو ئەبێ.
چوارەم: (وَالْمُخْتَلِعَةُ الَّتِي) ئەو ئافرەتەیە کە خولعی لەگەڵ کراوەو (لَمْ يَدْخُلْ بِها) جیماعیشی لەگەڵ نەکراوە، چونکە (عِدَّة)ی لە سەر نیە، کەوابوو: تەڵاقدانی ئەو ئافرەتەش کە هێشتا جیماعی لەگەڵ نەکردوە، نە سوننی‌یەو نە بیدعی‌یە؟ چونکە (عِدَّة)ی لە سەر نیە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی ژمارەی تەڵاق‌و، ئەوانەی تەڵاقیان ناکەوێ ﴾

(وَيَمْلِكُ الْحُرُّ) پیاوی ئازاد ئەبێتە خاوەنی(ثَلاثَ تَطْلِيقات) سێ تەڵاق: لە هەر ژنێك لە ژنەکانی ﴿عَنْ أَنَسٍ وَأَبِي رُزَيْنٍ رضي الله عنهما: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ قَوْلِهِ تَعالَى: (اَلطَّلاَقُ مَرَّتانِ). فَأَيْنَ الثَّالِثَةُ؟ قالَ: (إِمْساكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)﴾ رواه‌أحمد وأبوداود، پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکرا، خوا ئەفەرموێ: (ئەو تەڵاقەی کە مێرد ئەتوانێ ژنەکەی بگەڕێنێتەوە، دوو جارە). ئایا سێیەمەکە کوا؟ لە وەڵامدا فەرمووی: (یان بە یاسای شەرع ژنەکەت ڕابگرە، یان بە چاکی بەرەڵلای بکە). (وَالْعَبْدُ تَطْلِيقَتَيْنِ) وە کۆیلە خاوەنی دوو تەڵاقە.

ئینجا بزانە: ئەو سێ تەڵاقە: یەکە یەکە ئەکەوێ‌و بە کۆمەڵیش ئەکەوێ، واتە: ئەگەر بڵێ: هەرسێك تەڵاقم بکەوێ، یان بڵێ: بە هەرسێك تەڵاق تەڵاقم دای، ئەوە هەرسێك تەڵاقی ئەکەوێ، وە هەر چوار مەزهەب لە سەر ئەوە یەکدەنگن ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: كانَ الطَّلاَقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ طَلاَقُ الثَّلاَثِ واحِدَةً، فَقالَ عُمَرُ: إِنَّ النَّاسَ قَدِ اسْتَعْجَلُوا فِي أَمْرٍ كانَ لَهُمْ فِيهِ أَناةٌ، فَلَوْأَمْضَيْناهُ عَلَيْهِمْ، فَأَمْضاهُ عَلَيْهِمْ﴾ رواه‌مسلم، (ابن عباس) ئەفەرموێ: ئەو سێ تەڵاقەی ئێستا بە یەکەوە تەڵاق ئەدرێ، لە سەردەمی پێغەمبەرﷺو ئیمامی(أبوبكر)و دوو ساڵیش لە سەردەمی ئیمامی(عمر)دا یەکە یەکە تەڵاق ئەدرا، جا ئیمامی(عمر) فەرمووی: ئەو خەڵکە پەلە ئەکەن لە شتێکی وەها کە ماوەی تێدا هەبوو، ئینجا ئیمامی(عمر) بڕیاریدا: ئەگەر کەسێك بە کۆمەڵ هەر سێك تەڵاقەکەی فڕێ بدا، هەرسێك تەڵاقی ئەکەوێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر بڵێ: تەڵاقم دای، یان تەڵاقم بکەوێ، وە نیازی دوو، یان سێی لە دڵدا نەبێ، ئەوە تەنها یەك تەڵاقی ئەکەوێو ئەتوانێ (رِجْعَة) بکا، وەك باسی ئەکەین.

**وَيَصِحُ ٱلإِسْتِثْنَاءُ فِي الطَّلَاقِ إِذا وَصَلَهُ بِهِ، وَيَصِحُ تَعْلِيقُهُ بِالصِّفَةِ وَالشَّرْطِ، وَلا يَقَعُ الطَّلاقُ قَبْلَ النِّكاحِ. وَأَرْبَعَةٌ لايَقَعُ طَلاَقُهُمْ: اَلصَّبِيُّ، وَالْمَجْنُونُ، وَالنَّائِمُ، وَالْمُكْرَهُ.**

---

(وَيَصِحُ الاسْتِثْنَاءُ) دروسته جیاکردنەوه (فِي الطَّلاقِ) له تەلاقدان، وەك بڵێ: هەر سێك تەلاقم کەوتبێ جگه له دوو تەلاق، یان بڵێ: وا هەر چوار ژنی خۆم تەلاق دان جگه له ئامینەو فاتیمه (إذا وَصَلَهُ بِهِ) بەو مەرجەی جیاکردنەوەکه به ووشەی تەلاقدانەوه بنوسێنێ.

(وَيَصِحُ) دروسته (تَعْلِيقُهُ) تەلاق ببەسترێ (بِالصِّفَةِ) بە هاتنی کاتێك، وەك بڵێ له مانگی ڕەمەزاندا تەلاقت بکەوێ (وَالشَّرْطِ) هەروەها دروسته تەلاق ببەسترێ به مەرجێك، وەك بڵێ: ئەگەر بچیته دەرەوه تەلاقت بکەوێ، یان بڵێ: هەر کاتێ چویته ماڵی باوکت تەلاقت بکەوێ.

هەروەها دروسته تەلاق بکرێته سوێند بۆ کردنیکارێك، یان بۆ نەکردنیکارێك، وەك بڵێ: تەلاقم بکەوێ ئەچمه دەرەوه، یان بڵێ: تەلاقم بکەوێ چای ناخۆمەوه. جا هەر کاتێك مەرجەکه، یان سوێندەکه جێبەجێ نەکرا تەلاقی ئەکەوێ.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کاتێك سوێندی بە هەرسێك تەلاق خوارد، یان هەرسێك تەلاقی به مەرجێك بەستەوه، وەك بڵێ: هەرسێك تەلاقم بکەوێ ناچمه ماڵی برایەکەم. یان بڵێ: ئەگەر ئەم شتەت پێ بفرۆشم هەسێك تەلاقم بکەوێ. ئینجا پەشیمان بۆوە، چارەی ئەمەیه: (خولع) لەگەڵ ژنیخۆی بکا، واته: ژنەکەی تەلاقێکی به پاره لێبکڕێ، ئینجا دووباره مارەی بکاتەوه—وەك یەکەمجار— ئینجا ئەگەر له دوای (خولع)کردن بچێته ماڵی برایەکەی، یان شتەکەی پێ بفرۆشێ، سێ تەلاقی ناکەون، چونکه به نوێیی مارەی کردۆتەوه.

بەڵام ئەوەش بزانه: چەند تەلاقی ماوه، هەر بەوەندە تەلاقه ژنەکەی بۆ ئەگەڕێتەوه، واته: وەکو جاری یەکەم نابێتەوه خاوەنی سێ تەلاق.

(وَلا يَقَعُ الطَّلاَقُ) تەلاق ناکەوێ (قَبْلَ النِّكَاحِ) پێش ژن مارەکردن، واته: ئەگەر بڵێ: هەر کاتێك ژنم هێنا تەلاقم بکەوێ. یان بڵێ: ئەگەر ئەو ژنەم مارە کرد تەلاقم لێی بکەوێ. —چونکه ئەو ژنه بێگانەیه— تەلاقی ناکەوێ ﴿عَنْ عَمْرِو بن شُعَيْب عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لاَطَلاَقَ إِلاَّ فِيمَاتَمْلِكُ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هیچ تەلاقێك ناکەوێ جگه لەو تەلاقەی ملکی خۆته.

﴿ئاگاداری﴾: هەر ئەو حەدیسەش بەڵگەیه: که باوكو باپیرەو هیچ کەسێکیتر بۆی نیه به بێئیزن: ژنیکوڕ، یان ژنیکەسێکیتر تەلاق بدەن، چونکه ملکی خۆیان نیه، بەڵام به وەکیلایەتی دروسته ژنیکەسێکیتر، یان هی کوڕی خۆیان تەلاق بدەن.

(وَأَرْبَعَةٌ) چوار جۆره کەس هەنه (لاَ يَقَعُ طَلاَقُهُمْ) تەلاقیان ناکەوێ: یەکەم: (اَلصَّبِيُّ) منداڵ. دووەم: (وَالْمَجْنُونُ) شێت. سێیەم: (وَالنَّائِمُ) خەوتوو. واته: ئەو سێیانه ژنیش تەلاق بدەن تەلاقیان ناکەوێ ﴿عَنْ عائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ:

(فَصْلٌ) وَإذا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ واحدَةً أَوْ إثْنَتَيْنِ فَلَهُ مُراجَعَتُها مالَمْ تَنقَضِ عِدَّتُها، فَإِنْ انْقَضَتْ عِدَّتُها حَلَّ لَهُ نِكاحُها بِعَقْدٍ جَديد،

---

رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ﴾ رواه أحمد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سێ کەس هەنە هیچ گفتوگۆیەکیان لە سەر نانووسرێ، یەکەم: پیاوی خەوتوو تا هەشیار ئەبێتەوە. دووەم: منداڵ تا بلۆغی ئەبێ. سێیەم: شێت تا چاك ئەبێتەوە.

چوارەم: (وَالْمُكْرَهُ) زۆرلێکراو، وەك پێی بڵێ: ئەگەر ژنەکەت تەلاق نەدەی، ئێستا دەتکوژم ﴿عَنْ عائِشَةَرَضِيَاللهُ عَنها: عَنِ النَّبِيِّﷺ: لاَ طَلاَقَ فِي إِغْلاَقٍ﴾ رواه ابوداود، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تەلاقی بە زۆرلێکردن ناکەوێ.

جا بزانە: بەو مەرجە تەلاقی ناکەوێ: ئەگەر زۆردارەکە توانای هەبێ هەر ئەودەم هەڕەشەکەیخۆی بگەیەنێتە جێو زۆرلێکراوەکەش توانای خۆ ڕزگارکردنی نەبێ. دیسان بزانە: هەڕەشە لێکردن: بە لێدانو بەندکردنو کوشتنیکەسێکیترو زینا لەگەڵکردن، گشتی بە زۆرلێکردن دائەنرێن.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (رَجْعَة) تەلاق چاککردنەوە ﴾

واتە: گەڕاندنەوەی ژنی تەلاقدراو بۆ ژێر مارەی خۆی (وَإذا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ) هەر کاتێك پیاو ژنی خۆی تەلاق دا (واحِدَةً) بە یەك تەلاق (أَوْ إِثْنَتَيْنِ) یان بە دوو تەلاق، ئەو ئافرەتە پێی ئەگوترێ: (رِجْعِيَّة)، کەوابوو: (فَلَهُ مُراجَعَتُها) بۆی دروستە بیگەڕێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی–هەرچەند ژنەکەش ڕازی نەبێ– بەم چوار مەرجانە:

(مالَمْ تَنْقَضِ عِدَّتُها) یەکەم: (عِدَّة)ی تەواو نەبوبێ. دووەم: سێبەسێ تەلاقی نەدابێ. سێیەم: بە پارە تەلاقی نەدابێ. چوارەم: جیماعی لەگەڵ کردبێ.

﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَاللهُ عَنهُما:... أَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَها واحِدَةً أَوْ إِثْنَتَيْنِ؟ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِﷺ أَمَرَنِي أَنْ أُراجِعَهَا﴾ رواه مسلم، پیاوێك پرسیاری لە (ابن عمر) کرد: دەربارەی تەلاق؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر بە یەك تەلاق، یان بە دوو تەلاق، تەلاقت داوە؟ بیگەڕێنەوە ژێر مارەی خۆت، پێغەمبەرﷺ ئەوها فەرمانی بە من کرد.

جا بزانە: گفتوگۆی (رَجْعَة) گەڕاندنەوە ئەمەیە: (وا ژنیخۆم گەڕاندەوە ژێر مارەی خۆم). یان بڵێ: (وا دووبارە کردمەوە ژنیخۆم). هەروەها بزانە: سوننەتە لە لای دوو شاهید ئەو گفتوگۆیە بڵێ.

(فَإِنْ انْقَضَتْ عِدَّتُها) جا ئەگەر لە دوای تەلاقدان (عِدَّة)ی تەواو بوو (حَلَّ لَهُ) بۆی حەڵاڵە (نِكاحُها) مارەی بکاتەوە (بِعَقْدٍ جَدِيدٍ) بە مارەبڕینێکی نوێ: بە ئیزنی ژنەکەو بە (وَلِي)و دوو شاهیدو بە مارەییەکیتر.

وَتَكُونُ مَعَهُ عَلَى مَابَقِيَ مِنَ الطَّلاقِ، فَإِنْ طَلَّقَهَا ثَلاثاً لَمْ تَحِلَّ لَهُ إِلاَّ بَعْدَ وُجُودِ خَمْسَةِ شَرائِطَ: انْقِضاءُ عِدَّتِها مِنْهُ، وَتَزْوِيجُهَا بِغَيْرِهِ، وَدُخُولُهُ بِهَا وإِصابَتُها، وَبَيْنُونَتُها مِنْهُ، وَانْقِضاءُ عِدَّتِها مِنْهُ.

---

جا بزانه: ئەوەیان پێی ئەگوترێ: جیابووەوەی بچووك- (اَلْبائِنُ الصُّغْرَى)، كەوابوو: (وَتَكُونُ مَعَهُ) ئەو ئافرەتەی كە ئەگەڕێندرێتەوە، یان مارە ئەكرێتەوە، دێتەوە لای مێردەكەی (عَلَى مابَقِيَ مِنَ الطَّلاقِ) بەو ژمارەیەی كە ماویەتی لە تەلاقەكانی: ئەگەر تەلاقێكی مابێ، تەنها هەر بەو تەلاقە لە لای ئەمێنێتەوە، ئەگەر دوو تەلاقی مابن، تەنها بە دوو تەلاق لە لای ئەمێنێتەوە، چونكە ئیمامی(عمر)ﷺ وەها (فتوا)ی داوەو (صحابة)ش ڕەخنەیان نەبوە، (البیهقی) گێڕاویەتیەوە.

**﴿ مارە بە جاش ﴾**

(فَإِنْ طَلَّقَها ثَلاثاً) جا ئەگەر سێبەسێ ژنەكەی تەلاق دابێ: بە پارە، یان بە خۆڕایی، بە یەك ووشە، یان بە سێ ووشە، ئەوە پێی ئەگوترێ: (اَلْبائِنُ الْكُبْرَى)-جیابووەوەی گەورە. كەوابوو: (لَمْ تَحِلَّ لَهُ) ئەو ژنەی لێ حەڵاڵ نابێتەوە-چونكە هەرسێك تەلاقی كەوتون- (إِلاَّ بَعْدَ وُجُودِ خَمْسَةِ شَرائِطَ) بەڵام لە دوای هاتنە جێی پێنج مەرج لێی حەڵاڵ ئەبێتەوە:

یەكەم: (انْقِضاءُ عِدَّتِها مِنْهُ) (عِدَّة)ی لەو مێردە بە سەر بچێ.

دووەم: (وَتَزْوِيجُها بِغَيْرِهِ) مێردێكیتر بكا.

سێیەم: (وَدُخُولُهُ بِها) مێردیدووەم بیگوازێتەوەو (وإِصابَتُها) جیماعیشی لەگەڵ بكا.

چوارەم: (وَبَيْنُونَتُها مِنْهُ) مێردیدووەمیش ئەبێ تەلاقی بدا.

پێنجەم: (وَانْقِضاءُ عِدَّتِها مِنْهُ) (عِدَّة)ی لە مێردیدووەمیش بە سەر بچێ، ئینجا مێردییەكەم مارەی بكاتەوە.

جا بزانە: ئەو جۆرە تەلاق چاككردنەوەیە لە كوردەواریدا پێی ئەڵێن (مارە بە جاش). خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾ هەر كاتێك مێرد سێبەسێ ژنەكەی خۆی تەلاق دا، لێی حەڵاڵ نابێتەوە تا مێردێكیتر ئەكا.

﴿وَعَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: طَلَّقَ رَجُلٌ إِمْرَأَتَهُ ثَلاثاً فَتَزَوَّجَها رَجُلٌ، ثُمَّ طَلَّقَها قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِها، فَأَرادَ زَوْجُها الأَوَّلُ أَنْ يَتَزَوَّجَها، فَسَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقالَ: لاَ، حَتَّى يَذُوقَ الآخَرُ مِنْ عُسَيْلَتِها﴾ رواه‌الشیخان، پیاوێك سێبەسێ ژنی خۆی تەلاق دا، جا یەكێكیتر مارەی كرد، جا ئەویش تەلاقی داو هێشتا جیماعی لەگەڵ نەكردبو، جا مێردەكەی یەكەمی ویستی دیسان لەخۆی مارە بكاتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لێت حەڵاڵ نیە مارەی بكەیەوە تا مێردەكەیدووەمیش هەنگوینۆكەی لێ تام ئەكا. واتە: تا جیماعی بە تەواوی لەگەڵ ئەكا.

(فَصْلٌ) وَإِذا حَلَفَ أَنْ لاَ يَطَأَ زَوْجَتَهُ مُطْلَقاً أَوْ مُدَّةً تَزِيدُ عَلَى أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَهُوَ مُـــولٍ، وَيُؤَجَّلُ لَهُ إِنْ سَأَلَتْ ذَلِكَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، ثُمَّ يُخَيَّرُ بَيْنَ الْفَيْئَةِ وَالتَّكْفِيرِ، وَالطَّلاَقِ،

---

(**ڕوونکردنەوە**): ئافرەتی‌تەڵاقدراو سێ جۆرە، یەکەم: (رِجْعِيَّة)، واتە: گەڕاندرایەوە، کە ئەو ئافرەتەیە: جیماعی لەگەڵ کرابێ، ئینجا بە بێ‌پارە، بە تەڵاقێك، یان بە دوو تـەڵاق، تەڵاق درابێ، هەر لە(عِدَّة)شدا بێ. جا ئـەو جـۆرە تەڵاقـدراوە: تەڵاقی‌تریشـی ئەکـەوێ‌و لەگەڵ مێردەکەشی میرات لە یەکتری ئەگرن.

دووەم: (اَلْبائِنُ الصُّغْرَى)، واتە: جیابووەوەی بچووك، ئـەو ئافرەتەیـە: هێشـتا جیمـاعی لەگەڵ نەکرابێ‌و بە تەڵاقێك، یان بە دوو، تەڵاق درابێ، یـان بـە پـارە تـەڵاقێك، یـان دوو، تەڵاق درابێ، یان (رِجْعِيَّة) بـێ‌و (عِـدَّة)ی بـە سەرچـوبێ. ئەمـەیان تـەڵاقی‌تری ناکـەوێ‌و لەگەڵ مێردەکەی میرات لە یەکتری ناگرن، بەڵام بە مارەبڕینێکی نوێ حەڵاڵ ئەبێتەوە.

سێیەم: (اَلْبائِنُ الْكُبْرَى)، واتە: جیابووەوەی گەورە، ئەوەیە: سێ‌بەسێ تـەڵاق درابـێ: بـە پارە، یان بێ‌پارە. ئەمەیان بە (مارە بەجاش) نـەبێ حـەڵاڵ نابێتـەوەو لەگـەڵ مێردەکـەی میرات لە یەکتری ناگرن.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (إيلاء) ﴾

واتە: سوێندخواردنی مێرد: کە جیماع لەگەڵ ژنەکەی خۆی نەکا. (وَإِذا حَلَفَ) هەر کاتێـك مێرد سوێندی خوارد: (أَنْ لاَ يَطَأَ زَوْجَتَهُ) کە جیماع لەگەڵ ژنەکەی خۆی نەکا (مُطْلَقاً) بە بێ‌ماوەدانـان، وەك بڵـێ: والله جیماعـت لەگـەڵ ناکـەم. (أَوْ مُـدَّةً) یـان سـوێندی خـوراد: ماوەیەکی‌وەها جیماعی لەگەڵ نەکا: کە (تَزِيدُ عَلَى أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ) ئەو ماوەیە زیاتر بـوو لـە چوار مانگ، وەك بڵێ: والله تـا پێـنج مـانگی‌تر جیماعـت لەگـەڵ ناکـەم. (فَهُوَ مُولٍ) ئـەو مێردە سوێندی دائەمەزرێ (وَيُؤَجَّلُ لَهُ) هـەروەها مـاوەی بـۆ دائەنـدرێ (إِنْ سَـأَلَتْ ذَلِـكَ) ئەگەر ئافرەتەکە داوا بکا (أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ) تا چوار مانگ، هەروەها ئەگەر ژنەکەش داوا نەکا تا ماوەی چوار مانگ ئەڕوا هیچ دەنگی لەگەڵ ناکرێ، جا ئەگـەر لـەو ماوەیـەدا جیمـاعی لەگەڵ ژنەکەی کرد، ئەوە کەففارەت ئەداو سوێندەکەی کۆتایی دێ.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای ئـەو چـوار مانگە ئەگـەر جیمـاعی نـەکرد (يُخَيَّرُ) مێردەکـە ئەکرێتـە سەرپشك: (بَيْنَ الْفَيْئَةِ) یان ئەبێ جیمـاع بکـاو (وَالتَّكْفِيرِ) کـەففارەتی سـوێندەکەش بـدا (وَالطَّلاَقِ) یان ئەبێ ژنەکەی تەڵاق بدا بۆ ئەوەی ستەمەکە لە سەر ژنەکـە لابچـێ، خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَــإِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەوانـەی سـوێند ئـەخۆن: جیمـاع لەگەڵ ژنەکانی خۆیان نەکەن، بۆیان هەیە تا مـاوەی چـوار مـانگ چـاوەڕوان بکـەن، جـا ئەگەر گەڕانەوە بۆ ژن‌و مێردایەتی–واتە: جیمـاعی کـردو کـەففارەتی دا– خـوای گـەورە

فَــــــإِنْ امتَنَــــــعَ طَلَّــــــقَ عَلَيْــــــهِ الْحَــــــاكِمُ.
(فَصْلٌ) وَالظِّهارُ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِزَوْجَتِه: أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي.

---

لێیـان خـۆش ئـەبێو ڕەحمیـان پێـئەکا، وە ئەگـەر ویسـتیان تـەلاق بـدەن بـا بیکـەن، خوا بیسەرەو زانایە بە کردەوەیان.

(فَإِنْ امْتَنَعَ) جا ئەگەر مێردەکە خۆی گێر کرد: تـەلاقی نـەداو جیماعیشـی نـەکرد (طَلَّقَ عَلَيْهِ الْحاكِمُ) ئەو کاتە (قازی) لە دژی وی ژنەکەی تەلاق ئەدا بە یەك تەلاق، واتە: ئـەڵێ: وا تەلاقێکی ئەم ژنەم دا لە جیاتی مێردەکەی.

﴿پاشکۆ﴾: ئەگەر گوتیە ژنەکەی: هەر سێك تـەلاقم بکـەوێ جیماعـت لەگـەڵ ناکـەم، یـان گوتی: ئەگەر جیماعت لەگەڵ بکەم هەرسێك تەلاقم بکەوێ. ئەوە سوێندەکەی دائەمـەزرێو لە دوای چوار مانگ ژنەکە داوای لێ ئەکا: یان تەلاقی بدا، یان جیماعی لەگەڵ بکاو بە پـەلـە لێی دەربێنـێ، چـونکە بـەم جیماعـە تـەلاقی ئەکـەوێ، بـەڵام باشـتر ئەوەیـە: خولـع بکـاو تەلاقەکەی چاك بکاتەوە، بەو شێوەیەی باسمان کرد لە باسی(خولع)دا.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو ئافرەتانەی لە دادگا-بە یاسایدەستکرد-خۆیان تەلاق ئەدەن، ئەوانە تەلاقیان ناکەوێو هەر ژنـی مێـردی خۆیـانن، هەرچـەند (قـازی)ش تەلاقنامـەیان بـداتێ، چونکە بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (ظِهار) ﴾

(وَالظِّهارُ) زیهار ئەمەیە: (أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِزَوْجَتِهِ) پیـاو بڵێتـە ژنەکـەیخۆی: (أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي) تۆ بە لای منەوە وەکو پشتیدایکمی، یان بڵـێ: تـۆ لەگـەڵ مـن وەکـو پشـتی خوشکمی، یان بڵێ: دامێنی تۆ بە لای منـەوە وەکـو دامـێنی دایکم، یـان خوشـکم وایـە. ئەوانە گوتەی ئاشکرای زیهار بونو پێویستییان بە نیازی ناو دڵ نیە.

ئینجا بزانـە: ئەگەر مێرد بڵێتە ژنەکەی: تۆ وەکو دایکمی، یان وەکو کیـژی مـنی. ئـەوە ئەگەر مەبەستی زیهار نەبو، نابێتە زیهار، جا مەبەستی ڕێزلێنان بـێ، یـان نـا، وە ئەگـەر مەبەسـتی زیهـار بـێ، ئەبێتـە زیهـار، وە ئەگـەر مەبەسـتی یـەك تـەلاق بـێ، تـەلاقێکی ئەکەوێ...هتد.

بەڵام ئەگەر بڵێ: تۆ وەك دایکو خوشکم لە من حەرام بی، یـان بڵـێ: وا تـۆم لـە خـۆم حـەرام کرد، یان بڵێ: دامێنی تـۆم لێحـەرام بـێ. ئـەوە ئەگـەر مەبەسـتی زیهار بـێ، ئەبێتـە زیهار، ئەگەر مەبەستی یەك تەلاق بێ، تەلاقێکی ئەکەوێ...هتد، وە ئەگەر مەبەستی-بەم ووشـانە-تەنها حەرامکردنی ژنەکەی بێ، لێی حـەرام نـابێ، بـەڵام ئـەبی کـەففارەتی سـوێند بـدا، بـەو جۆرەی لە پەرتووکی سوێندخواردندا ڕوونی ئەکەینەوە ﴿عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَـالَ: إِذا حَرَّمَ الرَّجُلُ عَلَيْهِ إِمْرَأَتَهُ فَهِيَ يَمِينٌ يُكَفِّرُهَا، وقالَ: لَقَدْ كانَ لَكُمْ فِـي رَسُـولِ اللهِ ﷺ

فَإذا قالَ لَهـا ذَلِـكَ وَلَـمْ يُتْبِعْـهُ بِـالطَّلاَقِ صـارَ عائـداً وَلَزِمَتْـهُ الْكَفّـارَةُ، وَالْكَفّارَةُ: عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ سَـليمَةٍ مِـنَ الْعُيُـوبِ الْمُضِـرَّةِ بِالْعَمَـلِ وَالْكَسْـبِ، فَإنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيامُ شَهْرَيْنِ مُتَابِعَيْنِ، فَـإنْ لَـمْ يَسْـتَطِعْ فَإطْعَـامُ سِـتِّينَ مِسْـكِيناً كُلُّ مِسْكِينٍ مُدٌّ، وَلاَ يَحِلُّ لِلْمُظَاهِرِ وَطْؤُها حَتَّى يُكَفِّرَ.

---

أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ رواه‌الشيخان، (ابن عباس) فه‌رمووی: هه‌ر كاتێك پیاو ژنه‌كه‌ی‌خۆی له سه‌ر خۆی حه‌رام كرد، ئه‌و حه‌رامكردنه به سوێند دائه‌ندرێو واجبه: كه‌ففاره‌تی بۆ بدا، ئه‌وه شوێنكه‌وتنێكی جوانی پێغه‌مبه‌ره‌ﷺ بۆ ئێوه. بروانه سوره‌تی(التحريم).

(فَإذا قالَ لَها ذَلِكَ) جا هه‌ر كاتێك مێرده‌كه گوته‌یه‌كی(ظهار)ی به ژنه‌كه‌ی خۆی گوت (وَلَمْ يُتْبِعْهُ بِالطَّلاَقِ) وه یه‌كسه‌ر له‌و كاته‌ش ته‌لاقی نه‌دا (صارَ عائِداً) به‌م ته‌لاق نه‌دانه ئه‌بێته گه‌ڕاوه، واته: ده‌رئه‌كه‌وێ ژنه‌كه‌ی ئه‌وێته‌وه، كه‌وابوو: (وَلَزِمَتْهُ الْكَفّارَةُ) كه‌ففاره‌تی زیهاری ئه‌كه‌وێته سه‌ر:

به كورتی: (هه‌ركه‌سێك ووشه‌یه‌كی(ظهار) بڵێته ژنه‌كه‌ی خۆیو یه‌كسه‌ر له دوای ته‌واوبوونی ووشه‌كه‌ی (ظهار) ژنه‌كه‌ی ته‌لاق نه‌دا، وا ده‌رئه‌كه‌وێ: به ژنه‌كه‌ی خۆی ڕازی‌یه‌و قسه‌یه‌كی ناشیرنی كردوه، كه‌وابوو: كه‌ففاره‌تی زیهاری ئه‌كه‌وێته سه‌ر، به‌ڵام ئه‌گه‌ر یه‌كسه‌ر به دوای ووشه‌ی(ظهار)دا ته‌لاقی بدا، كه‌ففاره‌تی ناكه‌وێته سه‌ر).

(وَالْكَفّارَةُ) كه‌ففاره‌تی زیهار ئه‌مه‌یه: (عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ) كۆیله‌یه‌كی موسوڵمان ئازاد بكا (سَليمَةٍ مِنَ الْعُيُوبِ) هیچ كه‌موكورییه‌كی وای تێدا نه‌بێ (الْمُضِرَّةِ بِالْعَمَلِ وَالْكَسْبِ) كه زیان به ئیش‌وكار بگه‌یه‌نێ.

(فَإنْ لَمْ يَجِدْ) جا ئه‌گه‌ر كۆیله‌ی ده‌ست نه‌كه‌وت (فَصِيامُ شَهْرَيْنِ مُتَتابِعَيْنِ) ئه‌بێ دوو مانگ به سه‌ر یه‌كدا به‌ڕۆژوو ببێو نابێ یه‌ك ڕۆژ نێوانیان بخاتێ، واته: ئه‌گه‌ر ڕۆژێك به‌ڕۆژوو نه‌بو، ئه‌وه‌ی‌ڕابردووی گشتی تێك ئه‌چێو ئه‌بی سه‌رله‌نوێ ده‌ست پێ‌بكاته‌وه.

(فَإنْ لَمْ يَسْتَطِعْ) جا ئه‌گه‌ر توانای نه‌بو دوو مانگ به‌ڕۆژوو بێ: له به‌ر پیری، یان له به‌ر نه‌خۆشی‌یه‌كی به‌رده‌وام (فَإطْعامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً) ئه‌بی خۆراك بداته شه‌ست هه‌ژار (كُلُّ مِسْكِينٍ مُدٌّ) هه‌ر هه‌ژارێك یه‌ك مسته دانه‌وێڵه، واته: (٦٠٥) غرام.

(وَلاَ يَحِلُّ) دروست نیه (لِلْمُظاهِرِ) بۆ ئه‌و مێرده‌ی زیهاری كردوه (وَطْؤُها) جیماع له‌گه‌ڵ ژنه‌كه‌ی بكا (حَتَّى يُكَفِّرَ) تا كه‌ففاره‌ت ئه‌دا، هه‌رچه‌ند تواناشی نه‌بێ كه‌ففاره‌ت بدا، چونكه خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾ ئه‌و كه‌سانه‌ی زیهار له ژنی خۆیان ئه‌كه‌نو ژنه‌كه‌شیان ئه‌وێته‌وه، ئه‌بی كۆیله‌یه‌ك ئازاد بكه‌ن

(فَصْلٌ) وَإِذَا رَمَى الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ بِالزِّنَا فَعَلَيْهِ حَدُّ الْقَذْفِ إِلاَّ أَنْ يُقِيمَ الْبَيِّنَةَ أَوْ يُلاَعِنَ، فَيَقُولَ عِنْدَ الْحَاكِمِ فِي الْجَامِعِ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي جَمَاعَةٍ مِنَ النَّاسِ: أَشْهَدُ بِاللهِ إِنَّنِي لَمِنَ الصَّادِقِينَ فِيمَا رَمَيْتُ بِهِ زَوْجَتِي -فُلاَنَةَ- مِنَ الزِّنَا، وَإِنَّ هَذَا الْوَلَدَ مِنَ الزِّنَا وَلَيْسَ مِنِّي. أَرْبَعَ مَرَّاتٍ،

---

پێش جیماعکردن، بەم فەرمانە ئێوە تەمبێ ئەکرێن‌و خوا کردەوەتان ئەزانێ، جا ئەگەر کۆیلەیان دەست نەکەوت، ئەبێ دوو مانگ بە سەر یەکدا بەڕۆژوو بن، جا ئەگەر توانایان نەبو، ئەبێ خواردن بدەنە شەست هەژار.

﴿پاشکۆ﴾: زیهار بۆ ماوەیەکی دیارکراو دروستە، وەك بڵێ: تا ماوەی مانگێك تۆ وەکو پشتی دایکمی. ئینجا ئەگەر لە ماوەی ئەو مانگەدا جیماعی کرد، کەففارەتی ئەکەوێتە سەر، ئەگەر تا مانگەکە تەواو بوو هیچی نەکرد، ئەوە هیچی ناکەوێتە سەر، وە لەدوای مانگێك ژنەکەی لێ حەڵاڵ ئەبێتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ژن بە مێردەکەی بڵێ: تۆ وەکو باوکو برای منی. ئەوە گوناهی ئەگاتێ، بەڵام لێی حەرام نابێ‌و کەففارەتیشی لە سەر نیە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (لعان) ﴾

واتە: لەعنەتکردنی مێرد بە هۆی زیناکردنی ژنەکەی، بەو شێوەیەی باسی ئەکەین. (وَإِذَا رَمَى الرَّجُلُ) هەر کاتێك مێرد جنێو بداتە (زَوْجَتَهُ) ژنی خۆی‌و ئابڕووی ببا (بِالزِّنَا) پێی بڵێ: زینات کردوە (فَعَلَيْهِ حَدُّ الْقَذْفِ) ئەو مێردە -هەشتا شوڕکەدار- دارکاری ئابڕووبردنی ئەکەوێتە سەر بەو مەرجەی ژنەکە لە ژیانیا هیچ جارێك زینای نەکردبێ، کەواتە: ئەبێ هەشتا داری لێبدرێ:

(إِلاَّ أَنْ يُقِيمَ الْبَيِّنَةَ) مەگەر مێردەکە چوار شاهید بێنێ: کە ژنەکە جارێك زینای کردوە، یان ژنەکە دان بنێ: بەوەی کە زینای کردوە (أَوْ يُلاَعِنَ) یان مێردەکە لەعنەت بکا بۆ ئەوەی دارکاریەی لە سەر لابچێ:

(فَيَقُولَ) مێردەکە لە لەعنەتکردنیدا ئەڵێ (عِنْدَ الْحَاكِمِ) لە لای(قازی)، واتە: ئەبێ (قازی) ئەو گفتوگۆیەیان پێ بڵێ‌و نابێ لەخۆیانەوە بیڵێن (فِي الْجَامِعِ) سوننەتە ژن‌و مێردەکە ببردرێنە ناو مزگەوت (عَلَى الْمِنْبَرِ) لە سەر مینبەر رابگیرێن (فِي جَمَاعَةٍ مِنَ النَّاسِ) کۆمەڵێك خەڵك لەوێ ئامادە بن، ئینجا لە پێشدا (قازی) فەرمان ئەدا مێردەکە بڵێ: (أَشْهَدُ بِاللهِ إِنَّنِي لَمِنَ الصَّادِقِينَ فِيمَا رَمَيْتُ بِهِ زَوْجَتِي فُلاَنَةَ مِنَ الزِّنَا) شایەدی ئەدەم سوێندم بە خوا: من ڕاست ئەکەم کە بە فلانە ژنی خۆم گوت: زینات کردوە.

ئینجا ئەگەر ژنەکەی لە زینا منداڵی بوبێ، یان ئاوس بوبێ، واجبە بڵێ: (وَإِنَّ هَذَا الْوَلَدَ مِنَ الزِّنَا وَلَيْسَ مِنِّي) وە ئەو منداڵەی ئێستا هەیەتی، یان لە ناو زگیدایە، منداڵی من نیەو هی زینایە. (أَرْبَعَ مَرَّاتٍ) ئەبێ چوار جار ئەو شاهیدیە بڵێ.

وَيَقُولَ فِي الْمَرَّةِ الْخَامِسَةِ بَعْدَ أَنْ يَعِظَهُ الْحاكِمُ: وَعَلَيَّ لَعْنَةُ اللهِ إِنْ كُنْتُ مِنَ الْكاذِبِينَ. وَيَتَعَلَّقُ بِلِعانِهِ خَمْسَةُ أَحْكَامٍ: سُقُوطُ الْحَدِّ عَنْهُ، وَوُجُوبُ الْحَدِّ عَلَيْها، وَزَوالُ الْفِراشِ، وَنَفْيُ الْوَلَدِ، وَالتَّحْرِيمُ عَلَى الأَبَدِ. وَيَسْقُطُ الْحَدُّ عَنْها بِأَنْ تَلْتَعِنَ فَتَقُولَ: أَشْهَدُ بِاللهِ

---

(وَيَقُولَ فِي الْمَرَّةِ الْخامِسَةِ) هەروەها پێنجەمین جار ئەڵێ (بَعْدَ أَنْ يَعِظَهُ الْحاكِمُ) پاش ئەوەی (قازی) بە سزادانی قیامەت ئەیترسێنێو پێی ئەڵێ: لە خوا بترسە، درۆ مەکە، سزای دۆزەخ توندو تیژترە لە هی دونیا. جا ئەگەر مێردەکە دڵنیا بوو کە ڕاست ئەکا، با بڵێ: (وَعَلَيَّ لَعْنَةُ اللهِ إِنْ كُنْتُ مِنَ الْكاذِبِينَ) لەعنەتی خوام لێبدا ئەگەر درۆ بکەمو بوختانم بە ژنەکەم کردبێ.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ ئەو پیاوانەی ئابڕووی ژنەکانیان ئەبەنو پێیان ئەڵێن زینات کردووە، جگە لە خۆیان هیچ شاهیدیان نەبو، با پیاوەکە چوار جار بەخۆی شایەدی بدا: کە ڕاست ئەکا، جاری پێنجەمیش بڵێ: لەعنەتی خوام لێبدا ئەگەر درۆ بکەم.

(وَيَتَعَلَّقُ) ئەبەسترێ (بِلِعانِهِ) بە لەعنەتکردنی مێردەکە (خَمْسَةُ أَحْكامٍ) پێنج بڕیار، واتە: کە مێردەکە شایەدیەکەی تەواو بوو، پێنج بڕیاری شەرعی دەرئەچن:

یەکەم: (سُقُوطُ الْحَدِّ عَنْهُ) دارکاری جنێوەکەی لە سەر لائەچێ.

دووەم: (وَوُجُوبُ الْحَدِّ عَلَيْها) دارکاری، یان بەردبارانی زینا ئەکەوێتە سەر ژنەکە.

سێیەم: (وَزَوالُ الْفِراشِ) مارەی ژنەکە لە مێردەکەی هەڵئەوەشێتەوە.

چوارەم: (وَنَفْيُ الْوَلَدِ) منداڵەکەش نابێتە هی مێردەکە، ئەگەر گوتبی: هی من نیە.

پێنجەم: (وَالتَّحْرِيمُ عَلَى الأَبَدِ) ژنەکەش بە یەکجاری لە مێردەکە حەرام ئەبێ، ئەگەر مێردێکیتریش بکا هەر لێی حەڵاڵ نابێتەوە ﴿عَنْ عُمَرَ وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: مَضَتِ السُّنَّةُ أَنْ يُفَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ وَلاَ يَجْتَمِعانِ أَبَداً﴾ رواه ابوداود والبيهقی، شەریعەتی پێغەمبەرﷺ وای بڕیار داوە: ژنو مێردی لەعنەتچی لێك جیا بکرێنەوەو تا ماون بە یەکەوە کۆ نەبنەوە. ﴿وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە دوای لەعنەتکردن، ژنو مێردەکەی لێك جیاکردنەوەو منداڵەکەشی دایە ژنەکە.

(وَيَسْقُطُ الْحَدُّ عَنْها) دارکاریو بەردبارانی زینا لە سەر ژنەکە لا ئەچێ (بِأَنْ تَلْتَعِنَ) بەوەی ئەویش لەعنەت بکا، واتە: لە دوای کۆتایی لەعنەتی مێردەکە، (قازی) بە ژنەکە ئەڵێ: وەرە تۆش لەعنەت بکە (فَتَقُولَ) ئینجا ژنەکە ئەڵێ: (أَشْهَدُ بِاللهِ

إنَّ–فُلاَناً– هَذا لَمِنَ الْكاذِبِينَ فِيمَارَمانِي بِه مِنَ الزِّنا. أَرْبَعَ مَرَّات، وَتَقُولَ فِي الْمَــرَّةِ الْخامِسَةِ بَعْدَ أَنْ يَعِظَها الْحَــاكِمُ: وَعَلَــيَّ غَضَــبُ الله إِنْ كَــانَ مِــنَ الصَّــادِقِينَ. (فَــصْــلٌ):

---

إِنَّ فلاناً هَذا لَمِنَ الْكاذِبِينَ فِيما رَمانِي بِهِ مِنَ الزِّنا) شایەدی ئەدەم سوێندم بە خـوا: ئـەو مێردەی من–كە فلانە– درۆ ئەكا لەو جنێوەی كە بە منی گوتـوە: زینـات كـردوە. (أَرْبَـعَ مَرَّاتٍ) چوار جار ئەو شایەدیە ئەدا.
(وَتَقُولَ فِي الْمَرَّةِ الْخامِسَةِ) ئینجا جاری پێنجەم ژنەكە ئەڵێ (بَعْدَ أَنْ يَعِظَهاالْحاكِمُ) پاش ئەوەی (قازی) بە سزای دۆزەخ ئەیترسێنێ وەكو گوتمـان (وَعَلَيَّ غَضَبُ اللهِ إِنْ كانَ مِنَ الصَّادِقِينَ) غـەزەبی خـوا بمگـرێ ئەگـەر مێردەكـەم ڕاسـت بكـا لـەو ئابڕووبردنـەی مـن. خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَيَدْرَؤُ عَنْهَاالْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّــهُ لَمِــنَ الْكَــاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ سزای زینا لـە سـەر ژنەكـە لائـەدرێ بەوەی چوار جار شایەدی بدا: كـە مێردەكـەی درۆ ئـەكاو جـاری پێنجـەم بڵـێ: خـوا غـەزەبم لێبگرێ ئەگەر مێردەكەم ڕاست بكا.
﴿ئاگاداری﴾: ئەگـەر مێردەكـە نـاوی ئـەو پیـاوەی هێنـابو: كـە زینـای لەگـەڵ ژنەكـەی كردوە، ئەبی لە هەر چوار شایەدیەكاندا نـاوی پیاوەكـەش بڵێتـەوە بـۆ ئـەوەی داركـاری ئابڕووبردنی ئەویشـی لـە سـەر لابچـێ، ئینجا بزانـە: ڕستەكانی لەعنـەتكردن، بـە هـەر زمانێك بگوترێن دروستە، هەروەها بزانە: داركاری ئابڕووبردنی ئافرەتو پیاوی بێگانە لە پەرتووكی تاوانەكاندا بەدرێژی باس ئەكەین، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.
﴿پاشكۆ﴾: پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿أَيُّما إِمْرَأَةٍ أَدْخَلَتْ عَلَى قَوْمٍ مَنْ لَــيْسَ مِــنْهُمْ فَلَيْسَتْ مِنَ اللهِ فِي شَيْءٍ وَلَنْ يُدْخِلَها اللهُ جَنَّتَهُ، وَأَيُّما رَجُلٍ جَحَدَ وَلَدَهُ وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْــهِ إِحْتَجَبَ اللهُ عَنْهُ وَفَضَحَهُ عَلَىرُؤُوسِ الأَوَّلِينَ والآخَــرِينَ﴾ رواه ابـن حبـان وغـيره، هـەر ئافرەتێك منداڵێك بكاتە هی پیاوێكو منداڵەكەش هی ئەو نەبێ، ئەو ئافرەتە–لە بەر ئەوەی گوناهێكیگەورەی كردوە– لە لای خوا هیچ ڕێزی لێناندرێو خوا نایباتە بەهەشـت، وە هـەر پیاوێك بە منداڵی خۆی بڵێ: هی من نیە، بشزانێ منداڵەكە هی خۆیـەتی، خـوای گـەورە لـە ڕۆژی قیامەت خۆی لێدائەپۆشێو ڕوو ڕەشی ئەكا لە بەردەم هەموو خەڵك.

﴿ فَصْلٌ: لە بـاسی (عِدَّة) ﴾

( **پێناسە** ): (عِدَّة) ئەوەیە: ئافرەتی مێرد مردوو، یان تەڵاقدراو، ماوەیەك چاوەڕوان بكـا، واتە: تا كۆتایی ئەو ماوەیە نابێ شوو بكا.
خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَلاَتَعْزِمُوا عُقْدَةَالنِّكَاحِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ مـارەی ئافرەت مەبڕن تا ئەو ماوەیەی خوا لە سەر ئافرەتەكەی نووسیوە كۆتایی دێ.

وَالْمُعْتَدَّةُ عَلَى ضَرْبَيْنِ: مُتَوَفًّى عَنْهَا، وَغَيْرُ مُتَوَفًّى عَنْهَا، فَالْمُتَوَفَّى عَنْها: إنْ كانَتْ حاملاً فَعِدَّتُها بِوَضْعِ الْحَمْلِ، وَإِنْ كانَتْ حائلاً فَعِدَّتُها أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ. وَغَيْرُ الْمُتَوَفَّى عَنْها: إنْ كانَتْ حَاملاً فَعِدَّتُهَا بِوَضْعِ الْحَمْلِ، وَإِنْ كانَتْ حائِلاً وَهِيَ مِنْ ذَوات الْحَيْضِ فَعِدَّتُها ثَلاَثَةُ قُرُوء وَهِيَ الأَطْهارُ،

---

(وَالْمُعْتَدَّةُ) ئەو ئافرەتانەی (عِدَّة)یان لە سەر واجبە (عَلَى ضَرْبَيْنِ) دوو بەشن: یەکەم: (مُتَوَفًّى عَنْهَا) ئەوەیە: کە مێردەکەی مردوە.
دووەم: (وَغَيْرُ مُتَوَفًّى عَنْها) ئەوەیە: کە مێردی نەمردوە:
١- (فَالْمُتَوَفَّى عَنْها) جا ئەو ئافرەتەی مێردی مردوە: (إنْ كانَتْ حاملاً) ئەگەر لە مێردەکەی خۆی ئاوس بوو (فَعِدَّتُها) ئەوە (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ (بِوَضْعِ الْحَمْلِ) بە دانانی باری ناو زگی، جیاوازی نیە: منداڵێکی زیندوو بێ، یان مردوو بێ، وێنەی تەواو بوبێ، یان پارچە گۆشتێك بێو وێنەی نهێنیی کرابێ، جا لە دامێنی بێتە دەرەوە، یان زگی هەڵبدڕنو بیهێننە دەرەوە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأُولاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ ئافرەتانی ئاوس (عِدَّة)یان تەواو ئەبێ بە دانانی باری ناو زگیان.
(وَإِنْ كانَتْ حائِلاً) وە ئەگەر ئەو ئافرەتەی مێردی مردوە، ئاوس نەبو لە مێردەکەی خۆی (فَعِدَّتُها) ئەوە (عِدَّة) تەواوبوونی (أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ) بە چوار مانگو دە ڕۆژە، جیاوازی نیە: جیماعی لەگەڵ کردبێ، یان نا، گەورە بێ، یان منداڵ بێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ ئەو پیاوانەی لە ئێوە ئەمرنو ژنیان لە پاش بەجێ ئەمێنێ، ئەبی ژنەکانیان چوار مانگو دە ڕۆژ چاوەڕوان بکەن.
٢- (وَغَيْرُالْمُتَوَفَّى عَنْها) ئەو ئافرەتەی مێردی نەمردوە، بەڵام تەلاق دراوە، یان مارەبڕینی هەڵوەشاوەتەوە (إِنْ كانَتْ حاملاً) ئەگەر لە مێردەکەی خۆی ئاوس بوبێ (فَعِدَّتُها) ئەوە (عِدَّة)ی تەواو ئەبی (بِوَضْعِ الْحَمْلِ) بە دانانی منداڵی ناو زگی بەو شێوەی باسمان کرد.
(وَإِنْ كانَتْ حائِلاً) وە ئەگەر ئافرەتەکە لە مێردەکەی خۆی ئاوس نەبو (وَهِيَ مِنْ ذَوات الْحَيْضِ) وە لەو جۆرە ئافرەتانەش بوو کە حەیز ئەبینن (فَعِدَّتُها) تەواوبوونی(عِدَّة)کەی (ثَلاثَةُ قُرُوء) بە دیتنی سێ قورئە (وَهِيَ) ئەو سێ قورئە (الأَطْهارُ) پاکبوونەوەی نێوان دوو حەیزە، واتە: هەر کاتێك سێ پاکبوونەوەی تەواو کردن، (عِدَّة)کەی تەواو ئەبێ.
کەوابوو: ئەگەر ئافرەتێك لە کاتی پاکبوونەوەدا تەلاق درا، ئەو پاکیەی بە یەکێك لەو سێیانە بۆ ئەژمێردرێو کە جاری سێیەم لە دوای ئەو پاکیە حەیزی بینی، (عِدَّة)کەی تەواو ئەبێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ﴾ ئەو ئافرەتانەی تەلاق دراون، با چاوەڕوان بکەن تا سێ پاکبوونەوە تەواو ئەکەن.

وَإِنْ كانَتْ صَغِيرَةً أَوْ آيِسَةً فَعِدَّتُها ثَلاَثَةُأَشْهُرٍ. وَالْمُطَلَّقَةُ قَبْلَ الدُّخُولِ بِها لاَعِدَّةَ عَلَيْهَا،

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ئافرەتێك حەیزی نەما: لە بەر نەخۆشی، یان لە بەر شیردانی منداڵ، ئەبی هەر چاوەڕوان بکا، تا حەیز ئەبینێ، یان تا ئەگاتە تەمەنی لە حەیز وەستان، ئینجا سێ مانگ (عِدَّة) ئەباتە سەر، بەلاَم: ئەگەر هۆی وەستانی حەیز نەزاندرا، ئەوە لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعي)و لە مەزهەبی ئیمام(مالك)و ئیمام(أحمد) ئەفەرموێ: با نۆ مانگ چاوەڕوان بکا، ئینجا ئەگەر حەیزی نەدیت، با سێ مانگیتریش بە ناوی (عِدَّة) دابنیشێ، بەم ساڵە (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ.

(وَإِنْ كانَتْ صَغِيرَةً) ئەگەر ئافرەتی تەلاقدراو منداڵ بوو حەیزی نەبینیبو (أَوْ آيِسَةً) یان لەبەر پیری لە حەیز وەستابو (فَعِدَّتُها) تەواوبوونی (عِدَّة)ی (ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ) بە سێ مانگی تەواوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنْ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاَثَةُأَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ﴾ ئەو ئافرەتانەی لە حەیز وەستاون، (عِدَّة)ی ئەوان سێ مانگە، هەروەها ئەوانەی حەیزیان نەبینیوە، هی ئەوانیش سێ مانگە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو ئافرەتەی بە هەڵە جیماعی لەگەڵ کراوە، واتە: پیاوەکە وایتێگەیشتبو ژنیخۆیەتی، ئەویش واجبە (عِدَّة) ببینێ: وەکو ژنی تەلاقدراو، وە ئەو منداڵەی لەو جیماعە دروست ئەبێ، ڕێزی هەیەو هی ئەو پیاوەیە کە جیماعی بە هەڵەی کردوە، واتە: هی مێردی ژنەکە نیە، هەروەها حەرامە مێردی خۆی ڕابواردنو جیماعی لەگەڵ بکا تا (عِدَّة)ی ئەو پیاوە—بەهەڵەداچووە— تەواو ئەبێ.

(وَالْمُطَلَّقَةُ) ئەو ئافرەتەی تەلاق دراوە، یان مارەی هەڵوەشاوەتەوە (قَبْلَ الدُّخُولِ بِها) پێش ئەوەی مێردەکەی خۆی جیماعی لەگەڵ بکا (لاَ عِدَّةَ عَلَيْها) هیچ (عِدَّة)ی لە سەر نیە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾ هەر کاتێ ئافرەتانی موسوڵمانتان مارە کردو پێش جیماع لەگەڵکردنیان تەلاقتان دان، هیچ (عِدَّة)تان لە سەر ئەوان نیە.

کەوابو: ئەگەر تەنها یەك جار جیماعی لەگەڵ کردبێ، (عِدَّة)ی ئەکەوێتە سەر، هەرچەند پێش تەلاقدانیش زۆر لە یەکتری دوور بوبنو چەند ساڵێکیش جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، چونکە (عِدَّة) لایەنی خواپەرستیشی تێدایە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو ئافرەتەی بە (زینا) جیماعی لەگەڵ کراوە، هیچ (عِدَّة)ی لە سەر نیە، چونکە (زینا) ڕێزی بۆ دانەندراوە، جا—لەبەر ئەوە—ئەگەر لە (زینا) ئاوس بوو، دروستە هەر بە ئاوسی شوو بکا: بە زیناکارەکە، یان بە پیاوێکیتر، وە ئەو منداڵەی لە (زینا) دروست ئەبێ، (بیژی)یە، واتە: تەنها هی ژنەکەیەو نابێتە هی مێردی ژنەکەو ناشبێتە هی پیاوە زیناکارەکە، هەرچەند لەمەودوا ژنەکەش مارە بکا، کەوابو: ئەگەر (مَنِی)، واتە:

وَعِدَّةُ الْأَمَةِ بِالْحَمْلِ كَعِدَّةِ الْحُرَّةِ، وَبِالأَقْرَاء أَنْ تَعْتَدَّ بِقُرْأَيْنِ، وَبِالشُّهُورِ عَنِ الْوَفَاةِ أَنْ تَعْتَدَّ بِشَهْرَيْنِ وَخَمْسِ لَيَالٍ، وَعَنِ الطَّلَاقِ أَنْ تَعْتَدَّ بِشَهْرٍ وَنِصْفٍ، فَإِنْ اعْتَدَتْ بِشَهْرَيْنِ كَانَ أَوْلَى.

---

تۆوی پیاوێکیان هێناو بە لولکەیەك، یان بە هەر هۆیەکیتر خستیانە ناو منداڵدانەی ژنەکە، ئەمەش وەك منداڵی (بیژی) ئەژمێردرێ‌و نابێتە هی خاوەن تۆیەکەو ناشبێتە هی مێردی ژنەکە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلْوَلَدُ لِلْفِراشِ وَلِلْعاهِرِ اَلْحَجَرُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منداڵ هی مێردی ئەو ژنەیە کە بە حەڵاڵی سەرجێی کردوە، بۆ بێ‌ناموسیش سەرشۆڕی دانراوە.

(وَعِدَّةُ الأمَةِ) هەر وەها (عِدَّة)ی ئافرەتی کۆیلە، ئەگەر ئاوس بوو (بِالْحَمْلِ) بە دانانی منداڵەکەی ناو زگیەتی (كَعِدَّةِ الْحُرَّةِ) وەکو (عِدَّة)ی ئافرەتی ئازاد، کە باسمان کرد (وَبِالأَقْراءِ) وە ئەگەر ئاوس نەبو و حەیزیشی ئەبینی (أَنْ تَعْتَدَّ) ئەوە (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ (بِقُرْأَيْنِ) بە تەواوبوونی دوو پاکبوونەوە لە حەیز (وَبِالشُّهُورِ) ئەگەر (عِدَّة)ی بە مانگ بوو، چونکە حەیزی نەئەبینی (عَنِ الْوَفاةِ) ئەگەر (عِدَّة)ی مێرد مردنی بوو (أَنْ تَعْتَدَّ) (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ (بِشَهْرَيْنِ وَخَمْسِ لَيالٍ) بە دوو مانگو پێنج شەو (وَعَنِ الطَّلاقِ) ئەگەر (عِدَّة)ی تەڵاقدان بوو (أَنْ تَعْتَدَّ) (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ (بِشَهْرٍ وَنِصْفٍ) بە مانگو نیوێك (فَإِنْ اعْتَدَّتْ) بەڵام ئەگەر (عِدَّة) ببینێ (بِشَهْرَيْنِ) بە ماوەی دوو مانگ (كانَ أَوْلَى) ئەوە باشترە.

﴿ پاشکۆ: لەبارەی ئەو ژنەی مێردی ون بووە ﴾

ئەگەر ئافرەت مێردی ون بوو و هیچ هەواڵێکی نەبو، دروست نیە شوو بکا تا دوو شاهید شاهیدی ئەدەن کە مردوە، یان بە شێوەیەکیتر دڵنیا ئەبێ کە نەماوە.

بەڵام لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعي)و مەزهەبی ئیمام(مالك)و ئیمام(أحمد)-خوا لێیان رازی بێ- فەرموویانە: ئەو ئافرەتە ئەچێتەی لای (قازی)، ئینجا (قازی) ماوەی چوار ساڵی بۆ دائەنێ کە چاوەڕوان بکا، ئینجا لە دوای ئەو چوار ساڵە (عِدَّة)ی مردن چوار مانگو دە ڕۆژ ئەبینێ، ئینجا بۆی دروستە شوو بکاتەوە. ﴿عَنْ عُمَرَ ﷺ: فِي إِمْرَأَةِ الْمَفْقُودِ: تَتَرَبَّصُ أَرْبَعَ سِنِينَ ثُمَّ تَعْتَدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً﴾ أخرجه مالك والشافعي، واتە: ئەو جۆرەی کۆتمان لە ئیمامی (عمر) گێڕاویەتیانەوە.

ئینجا ئەگەر لە دوای شووکردن مێردەکۆنەکەی دەرکەوتەوە، ئەوە هەر ئەبێتەوە ژنی مێردە کۆنەکە، چونکە بۆمان دەرکەوت: مارەبڕینەکەی لە دووەمەکە نەهاتوە، جیماعەکەش بە جیماعی بە هەڵە دائەنرێ.

جا ئەگەر لەو جیماعە منداڵێك دروست بوو، ئەوە هی مێردە نوێیەکەیە، کەوابوو: نابێ مێردە کۆنەکە جیماعی لەگەڵ بکا تا (عِدَّة)ی مێردی نوێ تەواو ئەبێ.

(فَصْلٌ) وَيَجِبُ لِلْمُعْتَدَّةِ الرَّجْعِيَّةِ اَلسُّكْنَى وَالنَّفَقَةُ، وَيَجِبُ لِلْبائِنِ اَلسُّكْنَى دُونَ النَّفَقَةِ إلاَّ أَنْ تَكُونَ حامِلاً، وَيَجِبُ عَلَى الْمُتَوَفَّى عَنْها زَوْجُها: اَلإِحْدادُ وَهُوَ اَلإِمْتِناعُ مِنَ الزِّينَةِ وَالطِّيبِ،

﴿ فَصْلٌ: له باسی مافی ئەو ئافرەتەی له (عِدَّة)دایه ﴾

(وَيَجِبُ) واجبه (لِلْمُعْتَدَّةِ الرَّجْعِيَّةِ) بۆ ئەو ئافرەتەی له (عِدَّة)ی ڕیجعی‌دایه، واته: به بێ‌پاره تەلاق درابێ، به یەك تەلاق، یان به دوو تەلاق، جا ئاوس بێ، یان نا: (اَلسُّكْنَى) ئەبی مێردەكەی مافی نیشتەجێ‌كردنی بداتێ، واته: یان خانووی بداتێ، یان كرێی بداتێ تا (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ (وَالنَّفَقَةُ) وه ئەبی مافی بەخێوكردنیشی بداتێ تا (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ.

(وَيَجِبُ لِلْبائِنِ) هەروەها واجبه بۆ ئەو ئافرەتەی له (عِدَّة)ی (بائِن)دایه، واته: جیابوونەوه، له بەر ئەوەی سێ‌بەسێ تەلاقی داوه، یان به پاره تەلاقی داوه (اَلسُّكْنَى) ئەبی مێردەكەی مافی نیشتەجێ‌كردنی بداتێ تا (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ، وه دروستیش نیه به یەكەوه له یەك خانوودا بن، خوای گەوره فەرموویەتی: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ﴾ ئافرەتانی تەلاقدراو نیشتەجێ بكەن لەو شوێنەی پێش تەلاقدان تێیدا دانیشتبون بەگوێرەی توانای خۆتان.

(دُونَ النَّفَقَةِ) بەلام ئەركی بەخێوكردنی له سەر مێردی تەلاقدەر نیه (إلاَّ أَنْ تَكُونَ حامِلاً) مەگەر ژنەكە له مێردەتەلاقدەرەكەی ئاوس بێ، خوای گەوره فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ كُنَّ أُولاَتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ ئەگەر ئافرەتانی تەلاقدراو منداڵیان له زگدا بوو، بەخێویان بكەن تا منداڵەكەیان دائەنێن.

﴿ئاگاداری﴾: ئافرەتی مێرد مردوو تا (عِدَّة)ی تەواو ئەبێ تەنها مافی نیشتەجێ‌كردنی هەیەو ئەركی بەخێوكردنی نادرێتێ، هەرچەند ئاوسیش بێ ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ مَرْفُوعاً: لاَنَفَقَةَ لِلْحامِلِ الْمُتَوَفَّى عَنْها زَوْجُها﴾ أخرجه البيهقي والدارقطني، ئافرەتی ئاوسی مێردمردوو ئەركی بەخێوكردنی نادرێتێ.

(وَيَجِبُ) واجبه (عَلَى الْمُتَوَفَّى عَنْها زَوْجُها) له سەر ئافرەتی مێردمردوو (اَلإِحْدادُ) تازیەداری بكا تا (عِدَّة)ی تەواو ئەبی (وَهُوَ) تازیەداری ئەمەیه: (اَلإِمْتِناعُ مِنَ الزِّينَةِ) خۆی نەڕازێنێتەوەو جلی جوان‌و خشڵی زێڕو زیو نەكاتە بەر (وَالطِّيبِ) وه خۆی بۆنخۆش نەكا ﴿عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لاَتُحِدُّ إِمْرَأَةٌ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ إلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً وَلاَ تَلْبَسُ ثَوْباً مَصْبُوغاً وَلاَ تَكْتَحِلُ وَلاَ تَمَسُّ طِيباً﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ ئافرەت بۆ هیچ مردووێك له سێ ڕۆژان زیاتر تازیەداری بكا، تەنها بۆ مێردەكەی خۆی چوار مانگو ده ڕۆژ تازیەداری ئەكا: جلی ڕەنگاو ڕەنگ ناكاتە بەرو كل ناكاتە چاوی‌و خۆی بۆنخۆش ناكا.

وَعَلَى الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا وَالْمَبْتُوتَةِ: مُلاَزَمَةُ الْبَيْتِ إِلاَّ لِحَاجَةٍ.
(فَصْلٌ) وَمَنِ اسْتَحْدَثَ مِلْكَ أَمَةٍ حَرُمَ عَلَيْهِ الإِسْتِمْتَاعُ بِهَا حَتَّى يَسْتَبْرِأَهَا: إِنْ كَانَتْ مِنْ ذَوَاتِ الْحَيْضِ بِحَيْضَةٍ، وَإِنْ كَانَتْ مِنْ ذَوَاتِ الشُّهُورِ بِشَهْرٍ فَقَطْ، وَإِنْ كَانَتْ مِنْ ذَوَاتِ الْحَمْلِ بِالْوَضْعِ،

---

(وَعَلَى الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا) واجبە لە سەر ئافرەتی مێردمردوو (وَالْمَبْتُوتَةِ) هەروەها واجبە لە سەر ئەو ئافرەتەی بە یەکجاری تەلاق دراوە (مُلاَزَمَةُ الْبَيْتِ) بەردەوام هەر لە ماڵەوە بن، واتە: دروست نیە–تا (عدّة)یان تەواو ئەبێ– لە ماڵ بچنە دەرەوە: نە بۆ ماڵی باوكو خزم، نە بۆ حەج کردن، نە بۆ بازاڕو شوێنەکانیتر.

(إِلاَّ لِحَاجَةٍ) مەگەر چوونەدەرەوەیان پێویست بێ بۆ کڕینی خواردەمەنی، یان مەترسی دزو بێناموس هەبێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لاَتُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَيَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ﴾ ئافرەتانی تەلاقدراو لە ماڵەوە دەر مەکەن تا (عدّة)یان تەواو ئەبێ، نابێ بەخۆیشیان لە ماڵەوە دەربچن مەگەر ئیشێکی بێناموسانە بکەن.

﴿وَعَنْ فُرَيْعَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ زَوْجَهَا قُتِلَ، فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ: أَنْ تَمْكُثَ فِي بَيْتِهَا حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ رواه اصحاب السنن، (فريعة) فەرموویەتی: مێردم کوژراو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم: هەر لە ماڵی خۆم بمێنمەوە تا (عدّة)م تەواو ئەبێ.

﴿ئاگاداری﴾: هەر ئافرەتێك (ناشزة)، واتە: لامل بێ، ئینجا مێردی بمرێ، یان تەلاقی بدا، ئەو مافانەی باسمان کردن هیچی نادرێتێ.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی (إِسْتِبْراء) دڵنیایی ﴾**

واتە: چاوەڕوانکردنی تێپەڕبوونی ماوەیەك بە سەر ئافرەتی کۆیلەدا بۆ دڵنیابوون کە منداڵی تێدا نیە (وَمَنِ اسْتَحْدَثَ) هەر کەسێك وەدەستی هێنا (مِلْكَ أَمَةٍ) ئافرەتێکی کۆیلە، واتە: (جارية)کی دەست کەوت، جا بە هۆی کڕین، یان بەخشین، یان لە تالانی کافران، یان بە میرات، یان بە هۆیەکیتر (حَرُمَ عَلَيْهِ) حەرامە لە سەر ئەو پیاوە (الإِسْتِمْتَاعُ بِهَا) دەستبازی لەگەڵ ئەو ئافرەتە بکا: وەك ماچکردنو جیماع کردنو ئەو جۆرە شتانە (حَتَّى يَسْتَبْرِأَهَا) تا ماوەی دڵنیایی پێ تەواو ئەکا، وە جیاوازی کچو بێوەژن نیە:

(إِنْ كَانَتْ مِنْ ذَوَاتِ الْحَيْضِ) ئەگەر ئەم (جارية)یە لەوانە بوو حەیزی ئەبینی (بِحَيْضَةٍ) بە تێپەڕبوونی حەیزێکی تەواو ماوەی دڵنیایی تەواو ئەبێ (وَإِنْ كَانَتْ مِنْ ذَوَاتِ الشُّهُورِ) ئەگەر (جارية)کە حەیزی نەئەبینی لە بەر پیری، یان منداڵ بوو (بِشَهْرٍ فَقَطْ) بە تێپەڕبوونی یەك مانگی تەواو ماوەی دڵنیایی تەواو ئەبێ (وَإِنْ كَانَتْ مِنْ ذَوَاتِ الْحَمْلِ) ئەگەر (جارية)کە ئاوس بوو (بِالْوَضْعِ) بە دانانی منداڵی ناو زگی ماوەی دڵنیایی تەواو

وَإذا مـــاتَ سَـــيِّدُ أُمِّ الْوَلَـــد اسْـــتَبْرَأتْ نَفْسَـــها كَالأَمَـــة.
(فَصْلٌ) وَإذَا أرْضَعَت الْمَـــرأةُ بلَبَنِهـــا وَلَـــداً صـــارَ الرَّضِـــيعُ وَلَـــدَهَا بشَـــرْطَيْنِ:
أحَـــدُهُماَ: أنْ يَكونَ لَهُ دُونَ الْحَوْلَيْنِ. وَالثّانِي: أنْ تُرضِعَهُ خَمْسَ رَضَعات مُتَفرّقَات.

---

ئەبێ ﴿عَنْ أبِي سَعيدﷺ: قالَ النَّبِيُّﷺ فِي سَبايا أوْطاس: لاَ تُوطَأُ حامِلٌ حَتَّى تَضَـعَ، وَلاَ غَيْرُ ذاتِ حَمْلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَـةً﴾ أخرجه ابوداود، پێغەمبەرﷺ دەربارەی کۆیلەکانی ئەوتاس-کە لە جەنگی (حنین) لە کافرەکان بەدیل گیرابون- فەرمووی: جیماع لەگەڵ (جاریة)ی ئاوس مەکەن تا منداڵی ئەبێو جیماعیش لەگەڵ ئەوانیتر مەکەن-کە ئاوس نینە- تا حەیزێکی تەواو ئەبینن (وَإذا ماتَ) هەر کاتێك مرد (سَيِّدُ أُمِّ الْوَلَد) گەورەی ئەو (جارية)ی دایکی منداڵە، واتە: ئەو (جارية)ی کە لە گەورەی خۆی منداڵێکی بووە، جا منداڵەکە مابێ، یان نا، هەر کاتێك گەورەکەی مرد (إسْتَبْرَأتْ نَفْسَها) واجبە بۆ خۆی ماوەی دڵنیایی تەواو بکا (كَالأَمَةِ) وەکو ئەو(جارية)ی باسمان کرد، ئینجا کە ماوەی دڵنیایی تەواو بوو، ئەتوانێ شوو بکا. واتە: (عِدَّة)ی مێرد مردنی لە سەر نیە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (رضاع) شیرخواردنی منداڵ ﴾

بزانە: مەبەست بەم شیرخواردنە شیری ئادەمیزادە، نەك شیری گیاو ئاژەڵ. (وَإذَا أرْضَعَت الْمَرأةُ بِلَبَنِها) هەر کاتێك ئافرەتێك شیری خۆی دەرخواردی (وَلَداً) منداڵێك دا (صارَ الرَّضِيعُ) ئەو منداڵە شیرخۆرە ئەبێتە (وَلَدَها) منداڵەشیری ئافرەتەکە، ئافرەتەکەش ئەبێتە دایکەشیری منداڵەکە (بِشَرطَيْنِ) بە دوو مەرج:

(أحَدُهُماَ) یەکەمیان: (أنْ يَكونَ لَهُ دُونَ الْحَوْلَيْنِ) ئەبی تەمەنی منداڵەکە لە دوو ساڵان کەمتر بێ ﴿عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: عَنِ النَّبِيِّﷺ: لاَيُحَرِّمُ مِنَ الرَّضـاعِ إلاَّ مـا فَتَـقَ الأمْعاءَ وَكانَ قَبْلَ الْفِطامِ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هیچ شیرخواردنێك حەرامی ناگەیەنێ جگە لەو شیرەی ئەگاتە ناو ڕیخۆڵەکانو بەهێزیان ئەکا، وە پێش تەولوبوونی دوو ساڵیش بێ.

(وَالثّانِي) دووەمیان: (أنْ تُرْضِعَهُ خَمْسَ رَضَعاتٍ) ئەبی پێنج جار شیری بداتێ، بەلام مەرج نیە بە تێری بێ، ئینجا بزانە: جیاوازی نیە منداڵەکە: ئەو پێنج جارە لە مەمکی ژنەکە شیر بمژێ، یان لێی بدۆشرێ ئینجا بخرێتە ناو دەمی منداڵەکە.

(مُتَفَرِّقاتٍ) ئەبی ئەو پێنج جارەش لە یەك جیاجیا بن، کەواتە: ئەگەر منداڵەکە لە خۆشیان دەمی لە مەمکەکەی هەڵئەگرتو دووبارە ئەیگرتەوە، یان لەو مەمکە گواستیەوە بۆ مەمکەکەیتر، بۆ ئەوەی تێر ببێ، ئەوە هەر بە یەك جار ئەژمێردرێ.

﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهـا: كانَ فِيما أُنْزِلَ مِنَ الْقُرآنِ (عَشْرُ رَضَعاتٍ مَعْلُوماتٍ يُحَرِّمْنَ). ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُوماتٍ. فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِﷺ وَهُوَ فِيما يُتْلَى مِنَ الْقُرآنِ﴾ رواه مسلم،

وَيَصيرُ زَوْجُها أَباً لَهُ، وَيَحْرُمُ عَلَى الْمُرْضَعِ اَلتَّزويجُ إِلَيْهـا وَإِلَىٰ كُـلِّ مَـنْ ناسَـبَهَا، وَيَحْرُمُ عَلَيْهَا اَلتَّزويجُ إِلَى الْمُرْضَعِ وَوَلَدِه، دونَ مَنْ كانَ في دَرَجَتِه أَوْ أَعْلَى طَبَقَةً مِنْهُ.

---

حەزرەتی(عائشة)-خوا لێی رازی بێ- فەرموویەتی: یەکەمجار ئایەتێك لە قورئانـدابو: کـە (دە جـار شیرخواردن حـەرامی ئەکەیـەن). دوایی ئـەوە ڕەش بـۆوە بـە ئایـەتێکی‌تر: کـە (پێـنج جـار شیرخواردن حـەرامی ئەکەیـەن). ئینجا پێغەمبـەرﷺ وەفـاتی کـرد، ئـەوە لەگـەڵ قورئانـدا ئەخوێندرایەوە. (مەبەستی ئەمەیە: بڕیاری پێنجەکە بەردەوامەو خوێندنەوەی لاچووە).

(وَيَصِـيرُ زَوْجُهـا) هـەروەها مێـردی ئافرەتەشـیردەرەکە ئەبێتـە (أَباً لَـهُ) بـاوکی منداڵـە شیرخۆرەکە، کەوابوو: کوڕو کیژی ئافرەتەشیردەرەکەو هی مێردەکەشی ئەبنـە خوشـكو برای شیرخۆرەکە، هیچ جیاوازی گەورەترو بچووکترەکان نیە.

هەروەها خوشكو برای ئافرەتەکەو هی مێردەکەشی ئەبنە پورو خاڵو مـامی شـیرخۆرەکە، هەروەها دایكو باوکی ئافرەتەکەو هی مێردەکەشی ئەبنـە داپـیرەو باپیرەی شـیرخۆرەکە، هەم ژنەکانی‌تری مێردەکەش گشتی ئەبنە زڕدایکی شیرخۆرەکە.

(وَيَحْرُمُ عَلَى الْمُرْضَعِ) حەرامە لە سەر شیرخۆرەکە (اَلتَّزْويجُ إِلَيْها) دایکەشـیرییەکەی خـۆی لەخۆی مارە بکا (وَإِلَى كُلِّ مَنْ ناسَبَها) وە ئەو ئافرەتانەشی لێحەرامن کە پەیوەنـدییان بـە دایکەشیرییەکەوە، یان بە مێردەکەیەوە هەیە، جا بە هۆی خزمایەتی، یان بە هۆی شیر.

(وَيَحْـرُمُ عَلَيْهـا) حەرامـە لـە سـەر ئافرەتەشـیردەرەکە (اَلتَّـزْويجُ إِلَـى الْمُرْضَـعِ) شـوو بـە شیرخۆرەکە بکا (وَوَلَدِهِ) هەروەها حەرامە شوو بە کوڕەکانی شیرخۆرەکەش بکا، هـەروەها حەرامە: شوو بە مێردی شیرخۆرەکەش بکا.

ئینجـا بزانـە: حەرامــە مێــردی ئافرەتــە شــیردەرەکەش: شــیرخۆرەکەو کیــژەکانی شیرخۆرەکەو ژنی شیرخۆرەکە لە خۆی مارە بکا، چونکە ئەبنە کیژو نەوەو ژنی‌کوڕی.

(دونَ مَنْ كانَ في دَرَجَتِهِ) بەڵام ئەوانـەی لـە پلـەی شـیرخۆرەکەن: وەکـو خوشـكو بـرای شیرخۆرەکە، ئەوان حەرام نابن، جیاوازی نیە ئەو خوشكو برایانە: لە خۆی بچـوکتر بـن، یان گەورەتر بن (أَوْ أَعْلَى طَبَقَةً مِنْهُ) هەروەها ئەوانەی لە پلەی سەرەوەترن: وەك دایكو باوكو مامو خاڵو پووری شیرخۆرەکە، ئەوانیش حەرام نابن.

**﴿ئاگاداری﴾**: هەر کاتێك ئافرەتێك شـیری بداتـە کوڕێكو کچێك: کـە لـە کوڕەکـە مـارە کراوە، شیرەکەش حەرامی ئەکەیاند، ئەو مارەبڕینە هەڵئەوەشـێتەوەو بـە یـەکجاری لێـك حەرام ئەبن، هەروەها ئەگەر دایکت شیری دایە ژنێکی تۆ-کە تەمەنی لە دوو ساڵ کـەمتر بوو-ئەوە یەکسەر ئەبێتـە خوشـکت، یـان ئەگـەر ژنـە گەورەکـەت شـیری دایـە ئـەو ژنـە منداڵەیـەت، بەمـە مـارەبڕینی هـەردووکیان هەڵئەوەشـێتەوە، چـونکە بچووکەکە ئەبێتـە کیژت، گەورەکەش ئەبێتە دایکی ژنت.

(فَصْلٌ) وَنَفَقَةُ الْعَمُودَيْنِ منَ الْأَهْلِ واجبَةٌ للْوالـدينِ وَالْمَوْلُـودينَ، فَأَمَّـا الْوالـدُونَ فَتجبُ نَفَقَتُهُمْ بِشَرْطَيْنِ: الْفَقْرِ وَالزَّمانَة، أَوالْفَقْرِ وَالْجُنُون، وَأَمَّا الْمَوْلُـودُونَ فَتجـبُ نَفَقَتُهُمْ بِثَلاثَة شَرائطَ: الْفَقْرِ وَالصِّغَرِ، أَوالْفَقْرِ وَالزَّمانَة، أَوالْفَقْرِ وَالْجُنُون،

---

﴿پاشكۆ﴾: شیرخواردنی منداڵ ئاشكرا ئەبێ: بە شاهیدیی دوو پیاو، یان بە شاهیدیی پیاوێكو دوو ئافرەت، یان بە شاهیدیی چوار ئافرەت، وە دروستە ئافرەتە شیردەرەكەش یەكێك بێ لەو شاهیدانە بەو مەرجەی داوای كرێیشیرەكە نەكا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەخێوكردنی خزمو، ژنو، ئاژەڵ ﴾

(وَنَفَقَةُ الْعَمُودَيْنِ) بەخێوكردنی هەردوو تیرە، واتە: تیرەی سەرەوەو خوارەوە (مِنَ الأَهْلِ) لە خزمەكان (واجِبَةٌ) واجبە: (لِلْوالِدِينَ) بەخێوكردنی دایكانو باوكان لە سەر تیرەی خوارەوە واجبەو (وَالْمَوْلُودِينَ) هی تیرەی خوارەوەش لە سەر دایكانو باوكان واجبە:

(فَأَمَّا الْوالِدُونَ) ئینجا دایكو باوكو داپیرەو باپیرە (فَتَجِبُ) واجبە لە سەر كوڕو كیژو نەوەیەكانیشیان (نَفَقَتُهُمْ) بەخێویان بكەن: جا كافر بن، یان موسوڵمان بن (بِشَرْطَيْنِ) بە دوو مەرج:

یەكەم: (الْفَقْرِ) ئەوەیە دایكو باوك هەژار بن (وَالزَّمانَةِ) وە پەككەوتووش بن، واتە: نەتوانن كار بكەنو خۆیان بژێنن. دووەم: (أَوالْفَقْرِ) یان هەژار بنو (وَالْجُنُونِ) شێتیش بن.

بەڵام فەرموودەی بەهێزی مەزهەبی(شافعي) ئەمەیە: ئەگەر دایكو باوك تەنها هەژار بون، واجبە كوڕو كیژەكانیان بەخێویان بكەن، چونكە زۆر سفڵەییو بێئەمەكییە دایكو باوك داوای كاركردنیان لێبكرێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلاَ تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾ ئەگەر دایكتو باوكت داوای كافربوونیان لێكردی، بە قسەیان مەكەو لە دونیادا بە چاكەكردن لەگەڵیان بژێ.

واتە: هەرچەند كافریش بن.

(وَأَماالْمَوْلُودُونَ) هەروەها كوڕو كیژ هەرچەند بەرەوخواریش بن (فَتَجِبُ) واجبە لە سەر دایكو باوك هەرچەندە بەرەوسەرەوەش بن (نَفَقَتُهُمْ) بەخێویان بكەن (بِثَلاثَةِ شَرائِطَ) بە سێ مەرج:

یەكەم: (الْفَقْرِ وَالصِّغَرِ) ئەگەر هەژار بنو منداڵیش بن، كەوابوو: تا كوڕ بلۆغی ئەبێو كیژ شوو ئەكا، بەخێوكردنیان هەر واجبە. دووەم: (أَوالْفَقْرِ وَالْجُنُونِ) یان ئەگەر هەژار بنو شێتیش بن. سێیەم: (أَوالْفَقْرِ وَالزَّمانَةِ) یان ئەگەر هەژار بنو پەككەوتووش بن.

كەوابوو: ئەگەر منداڵو شێتو پەككەوتووماڵیان هەبوو، ئەبی لە ماڵی خۆیان بەخێو بكرێن، هەروەها ئەگەر منداڵ بلۆغی بوو و كاری دەست نەكەوتو هەژاریش بوو، واجبە بەخێو بكرێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەگەر

وَنَفَقَةُ الرَّقِيقِ وَالْبَهَائِمِ واجِبَةٌ، وَلاَ يُكَلَّفُونَ مِنَ الْعَمَلِ مَا لاَ يُطِيقُونَ. وَنَفَقَةُ الزَّوْجَةِ الْمُمَكِّنَةِ مِنْ نَفْسِها واجِبَةٌ،

---

ئافرەتان شیریان دایە منداڵەکانتان، ئێوەش کرێیان بدەنێ. واتە: چونکە ئەرکی بەخێوکردنی منداڵتان لە سەر خۆتانە.

﴿ئاگاداری﴾: هەتا باوکو باپیرە توانای بەخێوکردنی منداڵیان هەبێ، لە سەر دایك واجب نابێ، بەڵام کوڕو کیژ ئەبی بە هاوبەشی باوکو دایکو باپیرەو داپیرە بەخێو بکەن: بەگوێرەی میرات وەرگرتن، جا هەتا کوڕو کیژو نەوەکان توانای بەخێوکردنی باوکیان هەبێ، لە سەر باوکیو باپیرەی واجب نابێ، وە هەتا کوڕو کیژ توانایان هەبێ، لە سەر نەوەکان واجب نابێ.

ئینجا بزانە: مەبەست لە بەخێوکردنی ئەو دوو تیرەیە ئەمەیە: بەخێوکەرەکە بە تێری خواردنو پێخۆر بداو جلو بەرگو شوێنی خەوتنو دانیشتن دابین بکاو کرێی پزیشکو دەرمان بدا.

﴿ئاگاداری﴾: جگە لەو دوو تیرەی باسمان کردن، بەخێوکردنی هیچ خزمێکیتر واجب نیە. بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: بەخێوکردنی هەموو خزمێکیمەحرەم واجبە.

(وَنَفَقَةُ الرَّقِيقِ) بەخێوکردنی کۆیلە بەو شێوەی باسمان کرد (وَالْبَهَائِمِ) وە بەخێوکردنی ئاژەڵ (واجِبَةٌ) واجبە لە سەر خاوەن کۆیلەو خاوەن ئاژەڵ، واتە: ئەگەر خاوەنەکانیان بەخێویان نەکا، (قازی) فەرمانیان ئەداتێ: کە ئاژەڵەکەو کۆیلەکە: یان بفرۆشێ، یان کۆیلەکە ئازاد بکاو، ئاژەڵەکەش سەر ببڕێ ئەگەر گۆشتی بخورێ.

(وَلاَ يُكَلَّفُونَ) دروست نیە بخرێتە سەر شانی کۆیلەو ئاژەڵ (مِنَ الْعَمَلِ مـا) کارێکی وا (لاَ يُطِيقُونَ) کە توانایان نیە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ﵁: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لِلْمَمْلُوكِ طَعامُهُ وَكِسْوَتُهُ وَلاَ يُكَلَّفُ مِنَ الْعَمَلِ إِلاَّ ما يُطِيقُ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کۆیلە ئەبی خواردنو بەرگی بدرێتێو تەنها ئەو کارەی پێ بکرێ، کە توانای هەیە.

### ﴿ باسی بەخێو کردنی ژن ﴾

(وَنَفَقَةُ الزَّوْجَةِ) بەخێوکردنی ئەو ژنەی (الْمُمَكِّنَةِ مِنْ نَفْسِها) کە بە تەواوی خۆی ئەخاتە ژێر دەستەڵاتی مێردەکەی (واجِبَةٌ) واجبە لە سەر مێردەکەی، واتە: هەر کاتێك ئافرەتەکە بە مێردی خۆی گوت: من ئامادەم خۆم ئەدەمە بەردەستی تۆ. ئەو ئافرەتە بەخێوکردنی ئەکەوێتە سەر مێردەکەی، هەرچەند مێردەکەش منداڵ بێ، یان شێت بێ، یان توانای جیماعکردنی نەبێ ﴿عَنْ جابِرٍ﵁: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ أخرجه مسلم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ژنەکانتان مافی خواردنو بەرگکردنیان لە سەر ئێوەیە.

وَهِيَ مُقَدَّرَةٌ: فَإِنْ كانَ الزَّوْجُ مُوسراً فَمُدَّان مِنْ غالب قُوتها، وَيَجِبُ مِنَ الأُدْمِ وَالْكِسْوَةِ ما جَرَتْ بِه الْعادَةُ، وَإِنْ كانَ مُعْسراً فَمُدٌّ مِنْ غالب قُوت الْبَلَد، وَمَا يَأْتَدمُ بِه الْمُعْسِرُونَ وَيَكْسُونَهُ. وَإِنْ كانَ مُتَوَسِّطاً فَمُدٌّ وَنِصْفٌ، وَمِنَ الأُدْمِ وَالْكِسْوَةِ الْوَسَطُ،

---

﴿ئاگاداری﴾: ئەو ئافرەتەی بچوکەو خۆی لە بەر جیماع ناگرێ دروست نیە بدرێتە دەست مێردەکەی. ئینجا بزانە: بۆ واجببوونی بەخێوکردنی ژن مەرجە سەرپەرشتکاری منداڵو شێت: ژنەکەیان بۆ وەربگرێ، بەڵام ئەگەر منداڵەکە نزیکی بلۆغبوونی کردبو، هەر بەخۆی ئەتوانێ ژنەکەی وەربگرێ.

(وَهِيَ) بەخێوکردنی ژن (مُقَدَّرَةٌ) ئەندازەی بۆ داندراوە: (فَإِنْ كانَ الزَّوْجُ مُوسِراً) ئەگەر مێردەکە دەوڵەمەند بوو (فَمُدَّانِ) ئەبی هەموو ڕۆژێك دوو مست خواردنی بداتێ (مِنْ غالِبِ قُوتِها) لەو جۆرەی کە بە زۆری لەو شوێنە ئەیخۆن.

(وَيَجِبُ) هەروەها واجبە لە سەر مێردەکە (مِنَ الأُدْمِ) پێخۆریشی بداتێ: وەکو ڕۆن و خوێو گۆشتو شیرو خورماو ئەو جۆرە شتانە، بەگوێرەی ڕەووشتی ئەو شوێنەو دەستەڵاتی مێردەکە (وَالْكِسْوَةِ) هەروەها جلو بەرگ واجبە لە سەر مێردەکە (ما جَرَتْ بِهِ الْعادَةُ) بەگوێرەی ئەو جۆرە بەرگەی خەڵکی ئەو شوێنە بە کاری ئەهێنن و بەگوێرەی دەستەڵاتی مێردەکە.

(وَإِنْ كانَ مُعْسِراً) وە ئەگەر مێردەکە لاتو هەژار بوو (فَمُدٌّ) یەك مست خواردنی لە سەرە (مِنْ غالِبِ قُوتِ الْبَلَدِ) لەو جۆرە خواردنەی خەڵکی ئەو شوێنە بە زۆری ئەیخۆن (وَما يَأْتَدِمُ بِهِ الْمُعْسِرُونَ) هەروەها ئەو جۆرە پێخۆرەی لە سەرە: کە لاتو هەژارەکان ئەیکەنە پێخۆر (وَيَكْسُونَهُ) ئەو جۆرە بەرگەی لە سەرە: کە هەژارەکان ئەیکەنە بەرگ، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ﴾ ئەو کەسەی زۆری هەیە با بەگوێرەی هەبوونی خۆی ئەرکی بەخێوکردن بدا، بەڵام ئەو کەسەی کەمی هەیە، خوا چەندی داوەتێ با بەو ئەندازەیە ئەرکی بەخێوکردن بدا.

(وَإِنْ كانَ مُتَوَسِّطاً) ئەگەر مێردەکە ناوەنجی بوو: نە هەژار بوو، نە دەوڵەمەند (فَمُدٌّ وَنِصْفٌ) مستو نیوێك خواردنی لە سەرە (وَمِنَ الأُدْمِ) وە لە پێخۆر (وَالْكِسْوَةِ) وە لە جلو بەرگ (الْوَسَطُ) ناوەنجیی لە سەرە.

﴿ئاگاداری﴾: مێرد لە سەری واجبە ژنەکەی لە شوێنێك نیشتەجێ بکا: کە لە ژنەکە بوەشێتەوە، واجبە: کەلوپەلی خەوتنو چێشت لێنانو پاکو خاوێنیو ئاوهێنانی بۆ دابین بکا، بەڵام کرێی دەرمانو پزیشك لە سەر مێردەکە واجب نیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ژنەکە لەگەڵ مێردەکەی بە یەکەوە خواردنیان ئەخوارد –وەك ڕەوشتی ئێستا وەهایە– ئەوە ئەبێتە بەخێوکردنو ئەو یاسایەی باسمان کرد ڕەفتاری پێناکرێ.

وَإِنْ كانَتْ مِمَّنْ يُخْدَمُ مِثْلُها فَعَلَيْهِ إِخْدامُها.
وَإِنْ أَعْسَرَ بِنَفَقَتِها فَلَها فَسْخُ النِّكاحِ، وَكَذَلِكَ إِنْ أَعْسَرَ بِالصَّداقِ قَبْلَ الدُّخُولِ.

---

(وَإِنْ كانَتْ مِمَّنْ) ئەگەر ژنەکە لەو جۆرە ئافرەتانە بوو: کە (يُخْدَمُ مِثْلُها) هاوویّنەکانی وێ خزمەت ئەکران، لە بەر ئەوەی لە گەورە ماڵە ناودارەکان بوو (فَعَلَيْهِ) واجبە لە سەر مێردەکەی (إِخْدامُها) ئافرەتێکی خزمەتکاری بۆ بگرێو هەرچەند مێردەکەش هەژار بێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ واتە: بە باشی هاوسەرێتی لەگەڵ ژنەکانتان بکەن

﴿ باسی نەتوانینی بەخێوکردنی ژن ﴾

(وَإِنْ أَعْسَرَ بِنَفَقَتِها) ئەگەر مێرد هیچی نەبو ژنەکەی پێ بەخێو بکاو جلو بەرگی بۆ بکڕێ، ئەوە تێبینی ئەکرێ: ئەگەر ئافرەتەکە خۆی ڕاگرتو بە جۆرێك خۆی پێ بەخێو کرا، ئەوە گشتی لە سەر مێردەکەی ئەبێتە قەرز.
بەڵام ئەگەر خۆی پێڕانەگیرا، ئەوە (فَلَها) بۆی دروستە (فَسْخُ النِّكاحِ) مارەبڕین هەڵبوەشێنێتەوە لە لای (قازی) ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الرَّجُلِ الَّذِي لاَ يَجِدُ ما يُنْفِقُ عَلَى زَوْجَتِهِ، قَالَ: يُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا﴾ أخرجه الدارقطني والبيهقي، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی هیچی نیە ژنەکەی پێ بەخێو بکا، فەرموویەتی: لێك جیا ئەکرێنەوە.
﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر مێرد ماڵی هەبوو ژنەکەی بەخێو بکا، بەڵام بە ڕقەکاری بەخێوی نەئەکرد، ئەوە ژنەکەی ناتوانێ مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە، کەوابوو: ئەو بەخێوکردنە لە سەر مێردەکە ئەبێتە قەرزو، (قازی) لێی ئەستێنێ، بەڵام زۆر لە زانایانی ئایینی ئەو فەرموودەیان هەڵبژاردوە: ئەگەر مێردەکەی ون بوو و نەئەتوانرا ئەرکی بەخێوکردنی لێوەربگیرێ، ژنەکەی ئەتوانێ مارەبڕین هەڵبوەشێنێتەوە لە لای (قازی).
(وَكَذَلِكَ) هەروەها ژنەکە بۆی دروستە مارەبڕین هەڵبوەشێنێتەوە (إِنْ أَعْسَرَ بِالصَّداقِ) ئەگەر مێردەکەی توانای مارەییدانی نەبێ (قَبْلَ الدُّخُولِ) پێش ئەوەی جیماعی لەگەڵ بکا، واتە: ئەگەر ژنەکە ڕێگای داو جیماعی لەگەڵ کرد، ئەوکاتە بۆی دروست نیە مارە بڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوە.
﴿ئاگاداری﴾: ژنەکە بۆی دروستە خۆی تەسلیمی مێردەکەی نەکا تا مارەیی ئەداتێ، بەو مەرجەی قەرز نەبێ، جا ئەگەر بووە کێشەیان، ئەبێ مێردەکە مارەییەکە لە لای پیاوێکی دادپەروەر دابنێ، ئینجا ژنەکەش خۆی تەسلیمی مێردەکە بکاو دادپەروەرەکەش مارەییەکە بداتە ژنەکە.

(فَصْلٌ) وَإذا فَارَقَ الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ وَلَهُ منْها وَلَدٌ فَهِيَ أَحَقُّ بحَضَانَته إلَىَ سَبْعِ سِنِينَ، ثُمَّ يُخَيَّرُ بَيْنَ أَبَوَيْه فَأَيُّهُمَا اخْتَارَ سُلِّمَ إلَيْه،

## ﴿ فَصْلٌ: له باسى (حَضانَة) ﴾

واته: پاراستنو پەروەردەكردنی مندالٚ: بەو جۆرەی كە بیشۆریٚو جلو بەرگی بشۆریٚو بیخاتە بێشكەو بیخەوێنیٚو لە هەموو زیانێك بیپارێزیٚ.

(وَإذا فَارَقَ الرَّجُلُ) هەر كاتێك مێرد جیا بۆوە (زَوْجَتَهُ) لە ژنی خۆی: بە هۆی مردن، یان بە هۆی تەلاقدان، یان بە هۆی هەلٚوەشاندنەوەی مارەبڕین (وَلَهُ منْها وَلَدٌ) ئەو مێردە لەو ژنە منداڵێكی هەبوو (فَهِيَ) ژنەكەی (أَحَقُّ) زیاتر مافی هەیە (بحَضَانَته) كە منداڵەكەی بدرێتە دەستو پەروەردەی بكا (إلَى سَبْعِ سِنِينَ) تا تەمەنی منداڵەكە ئەبێتە حەفت ساڵان، واتە: تا چاكەو خراپە لێك جیا ئەكاتەوە، چونكە دایك دلٚسۆزترە بۆ منداڵەكەی ﴿عَنْ عَبْد الله بن عَمرورَضِيَ اللهُ عَنهُما: قالَت امْرَأَةٌ: يا رَسُولَ اللهﷺ إنّ إبْني هَذا طَلَّقَنِي أَبُوهُ فَأرادَ أَنْ يَنْزِعَهُ منِّي، فَقالَ لَها رَسُولُ اللهﷺ: أَنْت أَحَقُّ بِه مالَمْ تَنْكَحي﴾ رواه أحمد، ئافرەتێك گوتی: باوكی ئەم منداڵەم منی تەلاق داوەو ئەیەویٚ منداڵەكەم لیٚوەربگرێتەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ بۆ وەرگرتنی مافت زیاترەو لەپێشتری تا مێردێكیتر ناكەی.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر دایك نەبو، ئەو كاتە دایكیدایكو بە سەرەوەتر مافیان زیاترە، ئینجا باوكی منداڵەكە، ئینجا دایكیباوكو بە سەرەوەتر، ئینجا باوكیباوكو بە سەرەوەتر، ئینجا دایكی باوكیباوك، ئینجا خوشكی منداڵەكە، ئینجا خوشكیدایكی، ئینجا كیژی خوشك، ئینجا كیژیبرای، ئینجا خوشكیباوكی.

(ثُمَّ) ئینجا كە منداڵەكە چاكەو خراپەی لێك جیّا كردەوە (يُخَيَّرُ) ئەكرێتە سەرپشك (بَيْنَ أَبَوَيْه) لە نێوان دایكو باوكی (فَأَيُّهُما اخْتارَ) هەر كامیانی هەڵبژارد (سُلِّمَ إلَيْه) ئەدرێتە دەستی ﴿عَنْ أَبيهُرَيْرَةَ﵁: أَنّ النَّبيَّﷺ قالَ لِغُلامٍ: ياغُلامُ هَذا أَبُوكَ وَهَذه أُمُّكَ فَخُذْ بِيَد أَيِّهِما شئْتَ. فَأَخَذَ بِيَد أُمِّه فَانْطَلَقَتْ بِه﴾ رواەاصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ منداڵێكی كردە سەرپشكو پیٚی فەرموو: ئەمە باوكتەو ئەمەش دایكتە لەگەڵ كامیان پێت خۆشە دەستی بگرە. منداڵەكەش دەستی دایكی گرتو دایكەكەش لەگەڵ خۆیا بردی.

﴿ئاگاداری﴾: دایكی منداڵەكە كریٚی پەروەردەكردنو بەخێوكردنی منداڵەكە لەو كەسە وەردەگریٚ: كە ئەركی بەخێوكردنی منداڵەكەی لە سەرە.

جا بزانە: واجبە دایك فرچك بداتە منداڵەكەی، ئینجا ئەگەر ویستی بەخۆی شیری بداتیٚ، ئەوە باشەو لە هەموو كەسێك لەپێشترەو ئەتوانیٚ كریٚی شیردانیشوەربگریٚ، جا ئەگەر دایكەكە شیری هەبوو و نەیدا منداڵەكەی، ئەوە مافی پەروەردەكردنیشی نامێنیٚ، بەلاٚم ئەگەر هەر شیری تیٚدا نەبو، مافی هەر ئەمێنیٚو لە لایەكیتر شیری ئەدرێتیٚ.

وَشَرائطُ الْحَضانَة سَبْعَةٌ: اَلْعَقْلُ، وَالْحُرِّيَّةُ، وَالدِّينُ، وَالْعِفَّةُ، وَالْأَمانَةُ، وَالْإِقَامَةُ، وَالْخُلُوُّ مِنْ زَوْجٍ. فَإِنْ اخْتَلَّ شَرْطٌ مِنْها سَقَطَتْ.

(كِتابُ الْجِنايَات)

---

ئینجا بزانە: دروستە دایكو باوكی منداڵەكە قسەیان بكەنە یەكو پێش تەواوبوونی دوو ساڵ منداڵەكە لە شیر ببچڕن، بەو مەرجەی زیان بە منداڵەكە نەگا، ئەگەر نا: ئەبی دوو ساڵی بۆ تەواو بكرێن.

(وَشَرائِطُ الْحَضانَة) مەرجەكانی ئەو كەسەی منداڵی ئەدرێتە دەست بۆ پەروەردەكردن (سَبْعٌ) حەفت مەرجن: (اَلْعَقْلُ) یەكەم: عەقڵی هەبێ، واتە: شێت مافی پەروەردەكردنی منداڵی نیە. (وَالْحُرِّيَّةُ) دووەم: ئازاد بێ، كۆیلە مافی نیە. (وَالدِّينُ) سێیەم: موسوڵمان بێ، واتە: كافر نابێ موسوڵمان پەروەردە بكا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللّٰهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ خوای گەورە هیچ رێگەی نەداوەتە كافرەكان كە سەرپەرشتی موسوڵمانان بكەن بە هیچ شێوەیەك.

(وَالْعِفَّةُ) چوارەم: داوێنپاك بێ. (وَالْأَمانَةُ) پێنجەم: دەست پاكو رەووشت پاك بێ، واتە: مرۆڤی خائینو بەدرەوشت نابێ منداڵ پەروەردە بكا. (وَالْإِقامَةُ) شەشەم: نیشتەجێ بێ لەو شوێنەی منداڵەكەی لێیە. (وَالْخُلُوُّ مِنْ زَوْجٍ) حەفتەم: ئەو ئافرەتەی منداڵ پەروەردە ئەكا بێ مێرد بێ. بەڵام: ئەگەر مێرد بە مامی منداڵەكە، یان بە كوڕە مامی بكا، مافی هەر ئەمێنێ (فَإِنْ اخْتَلَّ شَرْطٌ مِنْها) جا ئەگەر لەو حەفتانە مەرجێك ناتەواو بوو (سَقَطَتْ) مافی پەروەردەكردنی نامێنێ.

﴿پاشكۆ﴾: خزمە نێرینەكان مافی پەروەردەكردنیان هەیە بەگوێرەی ئەو ریزەی لە میراتدا باسمان كرد، بەڵام ئەگەر لە ریزی ئەو نێرینەیە ئافرەتێك هەبوو، ئەو كاتە ئافرەتەكە لەپێشترە.

* * *

﴿ كِتابُ الْجِنايات: ئەم پەرتووكە باسی تاوانەكان ئەكا ﴾

بە هۆی لەناوبردنی گیانی ئادەمیزادێك، یان یەكێك لە ئەندامەكانی لەشی، یان بریندار كردنی.

ئینجا بزانە: كوشتنی بە ناهەق –لە دوای كافربوون– لە گشت گوناهێكی تر گەورەترە، جا مەبەست بە كوشتنی بە ناهەق ئەو جۆرە كوشتنەیە: كە یاسای ئیسلام رێگای نەدا، كەوابوو: كوشتنی كافری پەیمان لەگەڵكراو –وەكو كوشتنی موسوڵمان– لە گوناهە گەورەكانە، بەڵام كوشتنی موسوڵمان گوناهی گەورەترە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ

اَلْقَتْلُ عَلَى ثَلاَثَــةِ أَضْــرُبٍ: عَمْــدٌ مَحْــضٌ، وَخَطَــأٌ مَحْــضٌ، وَعَمْــدُ خَطَــإٍ، فَالْعَمْدُ الْمَحْضُ: هُوَ أَنْ يَعْمِدَ إِلَىضَرْبِهِ بِمَا يَقْتُلُ غَالِباً وَيَقْصِدَ قَتْلَهُ بِــذَلِكَ، فَيَجِــبُ الْقَوَدُ عَلَيْهِ، فَإِنْ عَفَــا عَنْــهُ وَجَبَــتْ دِيَــةٌ مُغَلَّظَــةٌ حالَــةٌ فِــي مَــالِ الْقَاتِــلِ. وَالْخَطأُ الْمَحْضُ: أَنْ يَرْمِيَ إِلَى شَيْءٍ فَيُصِيبَ رَجُلاً فَيَقْتُلَهُ،

---

النَّبِيُّ ﷺ: إجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقات. قالُوا: وَما هُنَّ؟ قالَ اَلشِّرْكُ باللهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْــلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إلاَّ بالْحَقِّ وَأَكْلُ الرِّبا وَأَكْلُ مالِ الْيَتِيمِ وَالتَّوَلِّي يَــوْمَ الزَّحْــفِ وَقَذْفُ الْمُحْصَنات الْغافِلاتِ الْمُؤْمِنات﴾ رواه‌الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: خۆتـان له‌و حه‌فت گوناهانـه بپـارێزن کـه لـه‌ناوتان ئه‌بـه‌ن، یه‌که‌م: کـافربوون. دووه‌م: سـیحر. سێیه‌م: کوشتنی به ناهـه‌ق. چـواره‌م: ڕیبـا خـواردن. پێنجه‌م: مـاڵی خـواردنی یـه‌تیم. شه‌شه‌م: هه‌ڵاتن له کاتی ڕووبه‌ڕوو بوونه‌وه‌ی دوژمنی ئـایینی. حه‌فتـه‌م: بوختـان کـردن به ئافره‌تانی داوێنپاك و ئیماندار.

(اَلْقَتْـلُ) کوشـتن (عَلَـى ثَلاَثَـةِ أَضْـرُبٍ) سـێ جـۆره (عَمْـدٌ مَحْـضٌ) یه‌کـه‌م: کوشـتنی بـه قه‌سدی‌یه. (وَخَطَأٌ مَحْضٌ) دووه‌م: کوشتنی به هه‌ڵه‌یه. (وَعَمْدُ خَطَإٍ) سـێیه‌م: کوشـتنی به هه‌ڵه‌ی وێنه‌ی به قه‌سدی‌یه:

١-(فَالْعَمْدُالْمَحْضُ) کوشتنی به قه‌سدی (هُوَ) ئه‌مه‌یه: (أَنْ يَعْمِدَ إِلَىضَرْبِهِ) بـه قه‌سـدی لـه ئاده‌میزاده‌که بدا (بِمَا) به شتێکی وه‌ها (يَقْتُلُ غالِباً) که به زۆری گیانله‌به‌ر بکوژێ: وه‌کو تفه‌نگو خه‌نجه‌رو به‌ردی گه‌وره‌و ژه‌هر ده‌رخوارددان‌و خنکاندن‌و ئه‌و جۆره شتانه (وَيَقْصِدَ قَتْلَهُ) وه مه‌به‌ستیشی کوشتنی‌وی بێ (بِذَلِكَ) به‌و لێدانه (فَيَجِبُ) جـا بـه‌م جـۆره کوشـتنه واجب ئـه‌بێ (اَلْقَوَدُ) کوشـتنه‌وه‌ی لـه تۆڵـه (عَلَيْـهِ) لـه سـه‌ر مرۆڤکوژه‌کـه، واتـه: ئـه‌وه‌ی کوشتنه‌که‌ی کردوه، خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِــي الْقَتْلَــى﴾ نووسراوه له سه‌ر ئێوه: کوشتنی له تۆڵه‌ی کوژراوه‌کان.

ئینجـا بزانـه: نابـێ ئـافره‌تی ئـاوس بکـوژرێ لـه تۆڵـه، تـا منداڵه‌کـه‌ی دائـه‌نێ. (فَإِنْ عَفَا عَنْهُ) جا ئه‌گه‌ر خاوه‌ن مافی تۆڵه‌وه‌رگر له تاوانباره‌که خـۆش بـوو (وَجَبَتْ دِيَةٌ) واجب ئه‌بێ له‌جیاتی‌کوشتنه‌وه: خوێندانێکی (مُغَلَّظَةٌ) ئه‌ستوور (حالَّةٌ) ده‌ست به‌جێ (فِي مالِ الْقاتِلِ) له ماڵی مرۆڤکوژه‌که، خوای گه‌وره فه‌رموویـه‌تی: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيــهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِــالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْــهِ بِإِحْسَــانٍ﴾ هـه‌ر که‌سێك لێی بـوردراو واز لـه کوشـتنه‌وه‌ی هێنـدرا، بـا خـاوه‌ن مافه‌کـه بـه ئه‌نـدازه‌ی شـه‌رع خوێنه‌کـه وه‌ربگـرێ‌و خوێنده‌ره‌که‌ش به زووترین کات خوێنه‌که بدا.

٢-(وَالْخَطأُ الْمَحْضُ) کوشتنی به هه‌ڵـه ئه‌مه‌یـه: (أَنْ يَرْمِيَ إِلَى شَيْءٍ) شـتێك بهـاوێ بـۆ لای شتێکی‌تر (فَيُصِيبَ رَجُلاً) ئینجا به ئاده‌میزاێکی‌تر بکه‌وێ، که مه‌به‌ستی نه‌بوه (فَيَقْتُلَـهُ) جـا

فَلاَ قَوَدَ عَلَيْه، بَلْ تَجبُ دِيَـةٌ مُخَفَّفَـةٌ عَلَىالْعاقِلَـةِ مُؤَجَّلَـةٌ فـي ثَـلاَث سـنينَ. وَعَمْدُ الْخَطَإِ أَنْ يَقصدَ ضَرْبَهُ بِمَـا لاَيَقْتُـلُ غَالِبـاً فَيَمُـوتُ، فَـلاَ قَـوَدَ عَلَيْـه، بَلْ تَجبُ دِيَةٌ مُغَلَّظَةٌ عَلَى الْعاقِلَةِ مُؤَجَّلَةٌ في ثَلاَث سنينَ.

---

بەو شتە ئادەمیزادەکە بکوژێ، بۆ وێنە: ئەگەر تفەنگێك بهاوێ بەرەو ئاژەڵێك، جا بە ئادەمیزادێك بکەوێ، یان بیەوێ ئاژاد بکوژێو گوللەکە بە ئەوزاد کەوتو کوشتی، یان بە سواری ئۆتۆمۆبیل ئەڕۆیشتو یەکێکی کوشت کە نەیئەدی، ئەوە گشتی کوشتنی بە هەڵەیە.

کەوابوو: (فَلاَ قَوَدَ عَلَيْهِ) کوشتنی لە تۆڵەی لە سەر نیە، واتە: ئەو کەسەی یەکێکیتر بە هەڵە ئەکوژێ دروست نیە لە تۆڵەی بکوژرێتەوە (بَلْ تَجِبُ دِيَةٌ مُخَفَّفَةٌ) بەڵکو خوێنێکی سووك واجب ئەبێ (عَلَىالْعاقِلَةِ) خوێنەکەش لە سەر خزمەکانی مرۆڤکوژەکەیە، لە سەر خۆی نیە (مُؤَجَّلَةٌ) خوێندانەکەش ماوەی بۆ داندراوە (فـي ثَـلاَث سـنينَ) بە ماوەی سێ ساڵان بیدەن، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَـةٍ مُؤْمِنَـةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَىأَهْلِهِ﴾ هەر کەسێك موسوڵمانێك بە هەڵە بکوژێ، ئەبێ کۆیلەیەکی موسوڵمان ئازاد بکاو خوێنیش بدرێتە خزمەکانی کوژراوەکە. واتە: دروست نیە لە تۆڵەی بکوژرێ.

٣-(وَعَمْـدُالْخَطَإِ) کوشتنی بە هەڵەی وێنەی بە قەسدی ئەمەیە: (أَنْ يَقْصِـدَ ضَـرْبَهُ) مەبەستی لێدانی ئادەمیزادەکە بێ (بِما لاَ يَقْتُلُ غالِباً) بە شتێکیوەها کە بە زۆری وابێ ئادەمیزادی پێنەکوژرێ: وەك لێدانی بە گۆچانو بەردی بچووکو شاپ لێدانو ئەو جۆرە شتانە (فَيَمُـوتُ) ئینجا -بەو لێدانە- ئادەمیزادەکە بمرێ (فَـلاَ قَـوَدَ عَلَيْـهِ) ئەمەش کوشتنەوەی لە تۆڵەی لە سەر نیە، واتە: دروست نیە لە تۆڵەی ئەو کوشتنە بیکوژن (بَـلْ تَجِبُ دِيَةٌ مُغَلَّظَـةٌ) بەڵکو لەو کوشتنەش خوێنێکی ئەستوور واجب ئەبێ (عَلَىالْعاقِلَـةِ) خوێنەکەش لە سەر خزمەکانی مرۆڤکوژەکەیە، لە سەر خۆی نیە (مُؤَجَّلَـةٌ) ماوەی بۆ داندراوە (فِي ثَلاَثِ سِنِينَ) کە بە سێ ساڵان بیدەن ﴿عَنْ عَمْرو بن شُعَيْب عَنْ أَبِيه عَنْ جَدِّهِﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: عَقْلُ شِبْهِ الْعَمْدِ مُغَلَّظٌ مِثْلُ عَقْلِ الْعَمْدِ، وَلاَ يُقْتَـلُ صـاحِبُهُ﴾ رواهأحمد وابوداود، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوێنی کوشتنیوێنەی بەقەسدی وەکو خوێنیکوشتنی بەقەسدی ئەستوورە، بەڵام نابێ مرۆڤکوژەکە بکوژرێ لە تۆڵە.

کەوابوو: تەنها ئەو کەسەی بەقەسدی یەکێك ئەکوژێ، دروستە لە تۆڵە بیکوژنەوە، لە دوو جۆرەکەیتر دروست نیە بیکوژنەوە، بەڵکو خوێنی کوژراوەکە وەرئەگیرێ.

﴿پاشکۆ﴾: بریندارکردنی ئادەمیزادو لێکردنەوەی یەکێك لە ئەندامەکانی -وەکو کوشتن- ئەو سێ جۆرەی هەنە: بە قەسدی، بە هەڵە، وێنەی بە قەسدی. وە تۆڵەوەرگرتنەوە تەنها لە جۆری بە قەسدیدا دروستە، لە دوو بەشەکەیتر خوێن ئەدرێ.

وَشَرائطُ وُجُوب الْقصاصِ أَرْبَعَةٌ: أَنْ يَكُونَ الْقاتِلُ بالغاً، عاقلاً، وَأَنْ لاَيَكُونَ والداً لِلْمَقْتُولِ، وَأَنْ لاَ يَكُونَ الْمَقْتُولُ أَنْقَصَ مِنَ الْقاتِلِ بِكُفْرٍ أَوْرِقٍّ.

---

ئینجا بزانه: مەبەست بە خزمەکانی مرۆڤکوژەکە خزمینێرینەی میراتگرە-جگە لە باوكو باپیرەو كوڕو نەوە-بەو مەرجەی ئەو خزمە هەژار نەبێو مندالٚ نەبێو شێت نەبێ، جا ئەگەر خزمی نەبو، یان نەیانتوانی خوێنەکە بە تەواوی بدەن، ئەبی (بیتُ المال) خوێنەکە بدا، جا ئەگەر نەبو، ئەبی مرۆڤکوژەکە بەخۆی هەموو خوێنەکە بدا.

﴿ باسی مەرجەکانی کوشتنی لە تۆڵە ﴾

(وَشَرائطُ وَجُوب الْقِصاصِ) مەرجەکانی واجببوونی کوشتنی لە تۆڵە (أَرْبَعَةٌ) چوارن:

یەکەم: (أَنْ يَكُونَ الْقاتِلُ بالغاً) مرۆڤکوژەکە بلۆغی بوبێ.

دووەم: (عاقلاً) عەقلّی هەبێ، واتە: مندالٚو شێت ئەگەر کەسێکیان بە قەسدی کوشت دروست نیە لە تۆڵە بکوژرێنەوە، بەڵکو ئەبی خوێنی کوشتن لە ماڵی ئەوان بدرێ ﴿عَنْ عائشةَرَضِيَ اللهُ عَنها: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّىيَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّىيَكْبُرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ﴾ رواهأحمد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سێ کەس نووسینیتاوانیان لە سەر نیە: خەوتوو، مندالٚ، شێت.

سێیەم: (وَأَلاَّ يَكُونَ وَالِداً لِلْمَقْتُولِ) نابێ مرۆڤکوژەکە دایكو باوكی کوژراوەکە بێ ﴿عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَيُقَادُ الْوالِدُ بِالْوَلَدِ﴾ رواهالبیهقی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باوكو باپیرەو دایكو داپیرە لە تۆڵەی كوڕو کیژی خۆیان ناکوژرێن.

کەوابوو: ئەگەر دایك، یان باوك مندالّی خۆیان بکوژن، خوێنیان ئەکەوێتە سەر بۆ میراتگرەکانی کوژراوەکە، بەڵام ئەگەر كوڕو کیژ دایکی خۆیان، یان باوکی خۆیان بکوژن، یان خزمێك خزمێکیتر بکوژێ، ئەوانە-گشتیان-دروستە لە تۆڵەییەکتری بکوژرێن.

چوارەم: (وَأَلاَّ يَكُونَ الْمَقْتُولُ) نابێ کوژراوەکە (أَنْقَصَ مِنَ الْقاتِلِ) کەمتر بێ لە پلەی مرۆڤکوژەکە (بِكُفْرٍ) بە هۆی کافری (أَوْرِقٍّ) یان بە هۆی کۆیلەیی، کەواتە: ئەگەر موسوڵمانێك کافرێکی پەیمان لەگەڵکراو بکوژێ، یان کۆیلەیەك بکوژێ، دروست نیە لە تۆڵە بیکوژن، چونکە مرۆڤکوژەکەو کوژراوەکە یەکسان نینە.

هەروەها مەرجە ئەبی کوژراوەکە رێزی هەبێ لە ئیسلامداو خوێنی بە فیڕۆ نەدرابێ، کەوابوو: ئەگەر کەسێك رێگرێك، یان موسوڵمانێکی کافربوو، یان زیناکەرێکیوەها: کە ژنی هێنابێ، یان زۆردارێکیهێرشکەر بکوژێ، ئەوە نە تۆڵەی لە سەرەو نە خوێنی لە سەرە ﴿عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكافِرٍ﴾ رواهالبخاری، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ موسوڵمان لە تۆڵەی کافر بکوژرێ.

وَتُقْتَلُ الْجَماعَةُ بِالْواحد، وَكُلُّ شَخصَيْنِ جَرَى الْقصاصُ بَيْنَهُما فِي النَّفْسِ يَجْرِى بَيْنَهُما فِي الأَطْراف، وَشَرائِطُ وُجُوب الْقِصاصِ فِي الأَطْراف-بَعْدَ الشَّرائط الْمَذْكُورَة-إِثْنان:

﴿ئاگاداری﴾: پیاو و ئافرەت هەردووکیان لە کوشتندا یەکسانن، واتە: لە تۆڵەی یەکتری ئەکوژرێن ﴿عَنْ عَمْرو بنْ حَزْمٍ﴾: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ الرَّجُلَ يُقْتَلُ بِالْمَرْأَةِ﴾ أخرجه ابوداود وَغيرهُ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پیاو لە تۆڵەی ئافرەت ئەکوژرێ.

(وَتُقْتَلُ الْجَماعَةُ بِالْواحِدِ) کۆمەڵێك لە تۆڵەی یەك کەس ئەکوژرێن، کە بە تێکڕایی کوشتویانە، وەك بە یەکەوە لێی بدەن تا دەمرێ، یان بە یەکەوە لە بڵندایی فڕێی بدەنە خوارەوە، یان بیخەنە ناو ئاگر، یان ناو دەریا، یان شاهیدیی بە درۆ لە سەر بدەن و بە هۆی شاهیدیەکە بکوژرێ ﴿عَنْ ابن الْمُسَيَّب: أَنَّ عُمَرَ﴾ قَتَلَ خَمْسَةً أَوْ سَبْعَةً بِرَجُلٍ قَتَلُوهُ غِيلَةً﴾ رواه الإمام مالك، ئیمامی(عمر)-خوا لێی ڕازی بێ-پێنج، یان حەفت کەسی لە تۆڵەی پیاوێك کوشتن، کە بە فێڵ کوشتبویان.

ئینجا بزانە: ئەگەر یەکێك هەڕەشە لە یەکێکیتر بکاو لێیبداو بڵێ: ئەگەر فلان نەکوژی، من-ئێستا-تۆ ئەکوژم. ئەویش لە ترسان کوشتی، ئەوە ئەبی هەردووکیان-واتە: زۆردارەکەو زۆرلێکراوەکە- لە تۆڵەیکوژراوەکە بکوژرێن.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر یەکێك کۆمەڵێك بکوژێ، ئەوە لە تۆڵەی یەکێکیان ئەکوژرێو، خوێنی ئەوانیتریشی لێوەرئەگیرێ.

ئینجا بزانە: تاوانکارەکە بە کام شێوەو بە کام ئامێر کوشتنەکەی کردوە، ئەبی هەر بەو شێوەیەو بەو ئامێرە بکوژرێتەوە.

بەڵام ئەگەر ئەو جۆرەی ئەو کوشتنی پێکردوە، لە شەرعدا حەرام بوو: وەکو زینا، ئەوە ئەبی بە شمشێر بکوژرێ.

## ﴿ باسی تۆڵەی ئەندامەکان ﴾

(وَكُلُّ شَخْصَيْنِ) هەر دوو کەسێك (جَرَى الْقِصاصُ بَيْنَهُما) کە تۆڵە لە نێوانیاندا هەبێ (فِي النَّفْسِ) لە کوشتندا (يَجْرِى بَيْنَهُما) تۆڵە لە نێوانیاندا هەیە (فِي الأَطْرافِ) لە لابردنی ئەندامێکی یەکتر، واتە: هەر کەسێك دروست بێ: لە تۆڵەی کوشتنی یەکێکیتر بکوژرێ، دروستیشە: لە تۆڵەی لابردنی یەکێك لە ئەندامەکان هەمان ئەندامی لێبکرێتەوە.

(وَشَرائِطُ وَجُوبِ الْقِصاصِ) مەرجەکانیواجببوونی تۆڵەوەرگرتن (فِيالأَطْرافِ) لە ئەندامەکانی لەشدا (بَعْدَ الشَّرائِطِ الْمَذْكُورَةِ) لە دوای ئەو چوار مەرجانەی باسمان کردن، کە گوتمان: بالغ بێو عاقڵ بێو نابێ دایكو باوکی کوژراوەکە بێو نابێ کوژراوەکە پلەی نزمتر بێ. (إِثْنانِ) دوو مەرجیتریش پێویستن:

اَلإِشْتِراكُ فِي الْإِسْمِ الْخاصِّ: اَلْيَمينُ بِالْيَمينِ، وَالْيُسْرَى بِالْيُسْرَى، وَأَنْ لاَيَكُونَ بِأَحَدِ الطَّرَفَيْنِ شَلَلٌ. وَكُلُّ عُضْوٍ أُخِذَ مِنْ مِفْصَلٍ فَفِيهِ الْقِصاصُ، وَلاَ قِصاصَ فِي الْجُرُوحِ إِلاَّ فِي الْمُوَضِّحَةِ.

يەكەم: (اَلْإِشْتِراكُ فِيالإِسْمِ الْخاصِّ) هەردوو ئەندامەكانی تاوانكارەكەو ستەم لێكراوەكە وەكو یەك بن لە ناوی تایبەتی‌دا، بەم جۆرە: (اَلْيَمينُ بِالْيَمينِ) ئەندامەكانی ڕاستە لە تۆڵەی ئەندامەكانی ڕاستە لێئەكرێتەوە (وَالْيُسْرَى بِالْيُسْرَى) چەپەش لە تۆڵەی چەپە لێئەكرێتەوە، واتە: دەستی ڕاستە لە تۆڵەی دەستی ڕاستە، گوێی ڕاستە لە تۆڵەی گوێی ڕاستە...هتد.
دووەم: (وَأَنْ لاَ يَكُونَ بِأَحَدِ الطَّرَفَيْنِ شَلَلٌ) نابێ یەكێك لەو ئەندامانە ووشك‌و بێكار بوبێ، كەوابوو: دروست نیە دەستێكی ساغ لە تۆڵەی دەستێكی شەلەپەتەی بێكار لێبكرێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە دروستە، بەو مەرجەی مەترسی مردنی‌تاوانكارەكە نەبێ.
(وَكُلُّ عُضْوٍ) هەر ئەندامێك (أُخِذَ مِنْ مِفْصَلٍ) لە جومگەدا لێكرابێتەوە (فَفِيهِ الْقِصاصُ) تۆڵەی هەیەو ئەبێ ئەندامی تاوانكارەش لەو جومگەیەدا لێبكرێتەوە، جا ئەگەر لە هەنیشكدا لێی كردبێوە، ئەوە لە هەنیشكدا لێی ئەكرێتەوە، ئەگەر لە گوزینك، یان لە ئەژنۆوە بوو، ئەوە لە گوزینگ، یان لە ئەژنۆدا لێی ئەكرێتەوە.
جا بزانە: ئەگەر ئەو مرۆڤەی بریندار كرابو، یان ئەندامێكی لێكرابێوە، پاش ماوەیەك بە هۆی ئەو برینە مرد، ئەوە دروستە تاوانكارەكە لە تۆڵەی بكوژرێ، بەڵام ئەگەر ئەندامێكی تاوانكارەكەیان لە تۆڵەی یەكێكی‌تر لێكردەوەو مرد، ئەوە خوێنی بە فیڕۆ ئەڕوا.
(وَلاَ قِصاصَ فِيالْجُرُوحِ) تۆڵەوەرگرتنەوە دروست نیە لە برینداركردن و ئێسقان شكاندن (إِلاَّ فِي الْمُوَضِّحَةِ) تەنها لەو برینەدا دروستە كە ئێسقانی لە ناو گۆشتدا بەدەر خستبێ، جا لە هەر شوێنێكی لەش بێ، دروستە بەو ئەندازەیە بریندار بكرێتەوە، بەڵام شكاندنی ئێسقان تۆڵەی نیە، بەڵكو (قازی) خوێنێكی بۆ دائەنێ.
﴿پاشكۆ﴾: مافی‌كوشتنی لە تۆلە: بۆ گشت میراتگرەكانە، واتە: ئەو خزمەی میراتگر نیە، هیچ مافی نیە، كەوابوو: ئەگەر لە ناو ئەو میراتگرانەدا منداڵ، یان شێت هەبوو، یان یەكێكیان ئامادەنەبو، دروست نیە ئێستا تاوانكارەكە بكوژرێ، بەڵكو بەند ئەكرێ تا منداڵەكە بلۆغی ئەبێ‌و شێت چاك ئەبێتەوەو ئەوی‌تریش ئامادە ئەبێ‌و رایان وەرئەگیرێ: جا ئەگەر بڕیاری كوشتنیان دا، ئەوە یەكێكیان لەجیاتی گشتیان ئەیكوژێ، یان‌وەكیلێك ئەگرن، بەڵام ئەگەر یەكێك لەو میراتگرانە لێی ببورێ، واجبە میراتگرەكانی‌تریش لێی ببورن، واتە: دروست نیە بكوژرێ.
ئینجا بزانە: كوشتنی لە تۆڵە ئەبێ بە ئیزنی گەورەی ئەو شوێنە بێ، بەڵام ئەگەر گەورە لەو شوێنەدا نەبو، یان تۆڵەی بۆ وەرنەئەگرت، ئەو كاتە دروستە: بە نهێنی بیكوژێ لە تۆڵەی كوژراوەكەی خۆی.

(فَصْلٌ) وَالدِّيَةُ عَلَى ضَرْبَيْنِ: مُغَلَّظَةٌ وَمُخَفَّفَةٌ، فَالْمُغَلَّظَةُ مِأَةٌ مِنَ الْإِبِلِ: ثَلَاثُونَ حِقَّةً، وَثَلَاثُونَ جَذَعَةً، وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا. وَالْمُخَفَّفَةُ مِأَةٌ مِنَ الْإِبِلِ: عِشْرُونَ حِقَّةً، وَعِشْرُونَ جَذَعَةً، وَعِشْرُونَ بِنْتَ لَبُونٍ، وَعِشْرُونَ ابْنَ لَبُونٍ، وَعِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ. فَإِنْ عُدِمَتِ الْإِبِلُ انْتَقَلَ إِلَى قِيمَتِهَا، وَقِيلَ: يُنْتَقَلُ إِلَى أَلْفِ دِينَارٍ

---

﴿ فَصْلٌ: له باسی (دِيَة) خوێنی مرۆڤی کوژراو و ئەندامی لەناوبراو ﴾

( **پێشەکی** ): ئاشکرایە تەنها لە کوشتنی بەقەسدیدا دروست بوو مرۆڤکوژەکە لە تۆڵە بکوژرێ، بەڵام سوننەتە میراتگرەکانی‌کوژراوەکە لێی ببوورن‌و نەیکوژن‌و خوێنی لێوەربگرن، جا ئەگەر خوێنیشی لێوەرنەگرن، زیاتر خێریان ئەگاتێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ﴾ هەر کەسێك ببورێ‌و پێك بێ، پاداشتی‌وی لە سەر خوایە.

ئینجا بزانە: خوێنی کوژراوەکە-ئەگەر وەرگیرا-ئەبێ لە نێوان میراتگرەکانی‌دا بەش بکرێ: بەگوێرەی میرات، واتە: خزمەکانی‌تر-کە میراتگر نین- هیچ مافیان نیە.

(وَالدِّيَةُ) ئەو خوێنەی بە هۆی کوشتن واجب ئەبێ (عَلَى ضَرْبَيْنِ) دوو جۆرە (مُغَلَّظَةٌ) یەکەم: خوێنی ئەستوورە. (وَمُخَفَّفَةٌ) دووەم: خوێنی سووکە:

١-(فَالْمُغَلَّظَةُ) خوێنی ئەستوور (مِأَةٌ مِنَ الْإِبِلِ) سەد ووشتری سێ بەشە: (ثَلَاثُونَ حِقَّةً) سی ووشتری مێی سێ ساڵەیە (وَثَلَاثُونَ جَذَعَةً) سی ووشتری مێی چوار ساڵەیە (وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً) چل ووشتری ئاوسە، واتە: (فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا) بێچووەکەی خۆی لە زگی‌دا بێ، ئەوە خوێنی کوشتنی بەقەسدیەو لە سەر مرۆڤکوژەکەیە، جا بزانە: خوێنی کوشتنی وێنەی بەقەسدیش هەر ئەوەیە، بەڵام لە سەر خزمەکانی مرۆڤکوژەکەیە.

٢-(وَالْمُخَفَّفَةُ) خوێنی سووك (مِأَةٌ مِنَ الْإِبِلِ) سەد ووشتری پێنج بەشە: (عِشْرُونَ حِقَّةً) بیست ووشتری مێی سێ ساڵەیە (وَعِشْرُونَ جَذَعَةً) بیست ووشتری مێی چوار ساڵەیە (وَعِشْرُونَ بِنْتَ لَبُونٍ) بیست ووشتری مێی دوو ساڵەیە (وَعِشْرُونَ إِبْنَ لَبُونٍ) بیست ووشتری نێرینەی دوو ساڵەیە (وَعِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ) بیست ووشتری مێی یەك ساڵەیە، ئەوە خوێنی کوشتنی بە هەڵەیەو لە سەر خزمەکانی مرۆڤکوژەکەیە ﴿عَنْ ابْنِ حَزْمٍ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ فِي النَّفْسِ الدِّيَةَ مِأَةً مِنَ الْإِبِلِ﴾ رواه‌النسائی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوێنی پیاوێك سەد ووشترە.

(فَإِنْ عُدِمَتِ الْإِبِلُ) جا ئەگەر ووشتری دەست نەکەوتن (انْتَقَلَ إِلَى قِيمَتِهَا) نرخی سەد ووشترەکە وەرئەگیرێ، ئەوە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافعی)یە (وَقِيلَ) وە لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعی)دا گوتراوە: (يُنْتَقَلُ إِلَى أَلْفِ دِينَارٍ) ئەچێتە سەر هەزار میسقالی زێڕ

أَوْ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفَ دِرْهَمٍ، وَإِنْ غُلِّظَتْ زِيدَ عَلَيْهَا الثُّلُثُ، وَتُغَلَّظُ دِيَةُ الْخَطَإِ فِي ثَلاَثَةِ مَوَاضِعَ: إِذَا قَتَلَ فِي الْحَرَمِ، أَوْ قَتَلَ فِي الأَشْهُرِ الْحُرُمِ، أَوْ قَتَلَ ذَارَحِمٍ مَحْرَمٍ. وَدِيَةُ الْمَرْأَةِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ دِيَةِ الرَّجُلِ، وَدِيَةُ الْيَهُودِيِّ وَالنَّصْرَانِيِّ ثُلُثُ دِيَةِ الْمُسْلِمِ، وَدِيَةُ الْمَجُوسِيِّ ثُلُثَا عُشْرِ دِيَةِ الْمُسْلِمِ.

---

﴿عَنْ ابْنِ حَزْمٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: وَعَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَلْفُ دِينَارٍ﴾ رواه النسائي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خاوەن زێڕ واجبە هەزار میسقال بدا لە خوێنی یەك پیاو.

(أَوْ إِثْنَيْ عَشَرَأَلْفَ دِرْهَمٍ) یان ئەچێتە سەر دوانزە هەزار دیرهەمی زیو ﴿عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلاً قُتِلَ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ دِيَتَهُ إِثْنَيْ عَشَرَأَلْفَ دِرْهَمٍ﴾ رواه اصحاب السنن، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاوێك کوژرا، پێغەمبەر ﷺ دوانزە هەزار دیرهەمی زیوی خوێن بۆ دانا.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو سێ جۆرە خوێنە بە شەرع دیار کراونو ئەبی یەکێکیان بدرێ، بەلام دروستە: خزمی‌کوژراوەکە لەگەڵ تاوانکارەکە پێك بێنو شتێکی‌تری لەجیاتی لێوەربگرنو گەردەنی ئازاد بکەن، هەرچەند شتەکە لە ئەندازەی‌خوێن کەمتریش بێ.

(وَإِنْ غُلِّظَتْ) ئەگەر خوێن ئەستوور بکرێ (زِيدَ عَلَيْهَاالثُّلُثُ) سێیەکی لە سەر زیاد ئەکرێ، بەلام ئەو فەرموودەیە بێ‌هێزە، فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: ئەگەر زێڕو زیو لە خوێنی کوشتن بدرێ ئەستوور ناکرێ، واتە: هیچی لە سەر زیاد ناکرێ.

(وَتُغَلَّظُ دِيَةُ الْخَطَإِ) خوێنی‌کوشتنی بە هەڵە ئەستوور ئەکرێ، واتە:وەکو خوێنی بە قەسدی ئەکرێتە سێ بەش (فِي ثَلاَثَةِ مَوَاضِعَ) لە سێ شوێناندا:

یەکەم: (إِذَا قَتَلَ فِي الْحَرَمِ) ئەگەر لە حەرەمی(مَكَّة)ی پیرۆزدا کوشتنەکەی کردبێ.

دووەم: (أَوْ قَتَلَ فِي الأَشْهُرِالْحُرُمِ) یان لە یەکێك لە مانگە حەرامەکاندا کوشتنی کردبێ: کە (ذوالْقَعدة، ذوالْحِجَّة، مُحَرَّم، رَجَب)ن. سێیەم: (أَوْ قَتَلَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ) یان خزمێکی مەحرەمی‌خۆی بکوژێ:وەك باوكو دایكو براو خوشك.

(وَدِيَةُ الْمَرْأَةِ) خوێنی ئافرەتی‌کوژراو (عَلَى النِّصْفِ مِنْ دِيَةِالرَّجُلِ) نیوەی خوێنی پیاوە، هەروەها خوێنی‌ئەندامەکانیشی نیوەی خوێنی ئەندامەکانی پیاوە ﴿عَنْ معاذ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: دِيَةُالْمَرْأَةِ عَلَىالنِّصْفِ مِنْ دِيَةِالرَّجُلِ﴾ رواه‌البيهقي.

(وَدِيَةُ الْيَهُودِيِّ) خوێنی ئافرەتو پیاوی جولەکە (وَالنَّصْرَانِيِّ) وە خوێنی ئافرەتو پیاوی گاور- دیان (ثُلُثُ دِيَةِ الْمُسْلِمِ) سێیەکی‌خوێنی ئافرەتو پیاوی موسوڵمانە (وَدِيَةُ الْمَجُوسِيِّ) خوێنی ئاگرپەرستو بت پەرست (ثُلُثَا عُشْرِ دِيَةِ الْمُسْلِمِ) دوو سێیەکی‌دەیەکی خوێنی موسوڵمانە ﴿عَنْ ابْنِ الْمُسَيِّبِ: أَنَّ عُمَرَ ﷺ قَضَى فِي دِيَةِ الْيَهُودِيِّ وَالنَّصْرَانِيِّ: بِأَرْبَعَةِ

وَتُكْمَلُ دِيَةُ النَّفْسِ: فِي قَطْعِ الْيَدَيْنِ، وَالرِّجْلَيْنِ، وَالأَنْفِ، وَالأُذُنَيْنِ وَالْعَيْنَيْنِ، وَالْجُفُونِ الأَرْبَعَةِ، وَاللِّسَانِ، وَالشَّفَتَيْنِ، وَذَهَابِ الْكَلاَمِ، وَذَهَابِ الْبَصَرِ، وَذَهَابِ السَّمْعِ، وَذَهَابِ الشَّمِّ،

---

آلأف، وَفِي دِيَةِ الْمَجُوسِيِّ: بِثَمانمأَةٍ﴾ اخرجه الشافعي، ئیمامی(عمر-خوای لێ ڕازی بێ-خوێنی جولەکەو دیانانی چوار هەزار دیرهەمی داناوە، هی ئاگر پەرستیش: هەشت سەد دیرهەم.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو کافرانەی باسمان کردن، بەو مەرجە کوشتنیان حەرامەو خوێنیان ئەدرێ، کە لە لای موسوڵمانێك دڵنیا کرابن، یان پەیمانی پاراستنیان پێدرابێ.

## ﴿ باسی خوێنی ئەندامەکانی لەش ﴾

(وَتُكْمَلُ دِيَةُ النَّفْسِ) خوێنی گیانێك بە تەواوی ئەدرێ (فِي قَطْعِ الْيَدَيْنِ) لە لێکردنەوەی هەردوو دەست (وَالرِّجْلَيْنِ) هەروەها خوێنێکی تەواو ئەدرێ لە لێکردنەوەی هەردوو قاچ، کەواتە: ئەگەر هەردوو دەستو هەردوو قاچی لێکردنەوە، ئەبی دوو خوێنی دوو کەسی کوژراوی بداتێ، هەروەها: ئەگەر هەردوو دەستەکانی لە کار خستن، ئەبی خوێنێکی تەواوی بداتێ، هەرچەند لێیشی نەکردبێتەوە، هەروەها ئەگەر قاچەکانی لێنەکردنەوە، بەلام لە ڕۆیشتنی خست، هەر ئەبی خوێنێکی تەواوی بداتێ ﴿عَنْ ابنْ حَزمٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِي الْيَدِ نِصْفُ الْعَقْلِ وَفِي الرِّجْلِ نِصْفُ الْعَقْلِ﴾ رواه ابوداود، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوێنی یەك دەست: نیوەی خوێنی خاوەنیەتی، خوێنی یەك قاچ: نیوەی خوێنی خاوەنیەتی. جا بزانە: خوێنی یەك پەنجە: دەیەکی خوێنی خاوەنەکەیەتی.

(وَالأَنْفِ) هەروەها خوێنی گیانێکی تەواو ئەدرێ لە لێکردنەوەی لووت (وَالأُذُنَيْنِ) هەروەها لە لێکردنەوەی هەردوو گوێ: خوێنێکی تەواو ئەدرێو، لە یەك گوێ: نیوەخوێن ئەدرێ (وَالْعَيْنَيْنِ) هەروەها ئەبی خوێنێکی تەواو بدرێ لە لابردنی هەردوو چاو، کەواتە: لە یەك چاو: نیوەخوێن واجبە (وَالْجُفُونِ الأَرْبَعَةِ) هەروەها خوێنێکی تەواو ئەدرێ لە لێکردنەوەی هەر چوار پێڵوی چاوەکانی.

(وَاللِّسَانِ) وە لە لێکردنەوەی زوبان: خوێنێکی تەواو ئەدرێ (وَالشَّفَتَيْنِ) لە لێکردنەوەی هەردوو لێو: خوێنێکی تەواو ئەدرێ ﴿عَنْ ابنْ حزمٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِي اللِّسَانِ اَلدِّيَةُ وَفِي الشَّفَتَيْنِ اَلدِّيَةُ﴾ رواه النسائي وغيره.

(وَذَهَابِ الْكَلاَمِ) وە لە نەهێشتنی گفتوگۆ: خوێنێکی تەواو ئەدرێ، هەرچەند زوبانیشی لێنەکاتەوە (وَذَهَابِ الْبَصَرِ) وە لە کوێرکردنی هەردوو چاو: خوێنێکی تەواو ئەدرێ، هەرچەند چاوەکانیشی دەرنەهێنێ، بەلام ئەگەر دەریشیان بێنێ، هەر یەك خوێن واجب ئەبێ (وَذَهَابِ السَّمْعِ) وە لە کەڕکردن-واتە: لابردنی گوێلێبوون-خوێنێکی تەواو ئەدرێ، هەرچەند گوێیەکانیشی لێنەکاتەوە (وَذَهَابِ الشَّمِّ) وە لە لابردنی بۆنکردن: خوێنێکی تەواو ئەدرێ.

وَذَهاب الْعَقْلِ، وَالذَّكَرِ، وَالأُنْثَيَيْنِ. وَفِي الْمُوَضِّحَةِ وَالسِّنِّ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ، وَفِي كُلِّ عُضْوٍ لاَمَنْفَعَةَ فِيهِ حُكُومَةٌ، وَدِيَةُ الْعَبْدِ قِيمَتُهُ، وَدِيَةُ الْجَنِينِ الْحُرِّ غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ،

---

(وَذَهابِ الْعَقْلِ) وه لـه لابردنـی عـهقلّ: خـوێنێكی تـهواو ئـهدرێ، بـهلاّم ئهگـهر لـه پـاش خـوێن وهرگـرتن شـێتیهكهی چـاك بـۆوه، ئـهبی خوێنهكـه بگهڕێنێتـهوه بـۆ تاوانبارهكـه ﴿عَنْ زَيْدِ بن أَسْلَمَ قالَ: مَضَتِ السُّنَّةُ أَنَّ فِي الْعَقْلِ إِذا ذَهَبَ، اَلدِّيَةَ﴾ رواه‌البیهقـی، لـه پێغهمبهرهوه ﷺ وا هاتوه: خوێنی شێتكردن: سهد ووشتره.

(وَالـذَّكَرِ) هــهروهها لــه لێكردنــهوهی ئهنـدامیمیزكردنی پیـاو: خـوێنێكی تـهواو ئـهدرێ (وَالأُنْثَيَيْنِ) وه له لێكردنهوهی ههردوو گون: خوێنێكی تهواو ئـهدرێ، جیـاوازی نیـه ئـهو ئهندامو گونه: هی منداڵ بێ، یان هی پیر بێ، خاوهنهكهی جیماعی پـێ بكـرێ، یـان نـا، له بنهوه لێیان بكاتهوه، یان سهریئهندامهكه ببڕێو هێلكهیگونهكان دهربێنێ ﴿عَنْ ابْنِ حَزْمٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِي الذَّكَرِ اَلدِّيَةُ وَفِي الْبَيْضَتَيْنِ اَلدِّيَةُ﴾ رواه‌النسائی وَغیره.

(وَفِي الْمُوَضِّحَةِ) خوێنی ئهو برینهی گهیشتۆته سهر ئێسقان‌و ئێسقانهكهی بهدهر كهوتوه (وَالسِّنِّ) وه خوێنی یهك ددان، جا له بنـهوه دهری بێنـێ، یـان لـه سـهر پـدوو بیشـكێنێ (خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ) ههر یهكهیان پێنج ووشتره، واته: بیستیهكی خوێنی گیانی خاوهنهكهی ﴿عَنْ ابْنِ حَزْمٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِي السِّنِّ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ وَفِي الْمُوَضِّحَةِ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ﴾ رواه‌النسائی.

﴿ئاگاداری﴾: پێغهمبهر ﷺ فهرموویـهتی: ﴿وَفِي الْجائِفَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ﴾ رواه‌النسـائی، لـهو برینهی لهشی مرۆڤ كون ئهكاو ئهگاته ناو بۆشـایی لـهش: سـێیهكی خـوێنی خاوهنهكـهی واجب ئهبێ.

ئینجا بزانه: ههر كهسێك كچێنیئافرهتێك لابیا، ئهبی تۆڵهی بداتێ، وه ئهگـهر بـه هـۆی زینـاكردن لای ببـاو ئافرهتهكـهش ڕازی نـهبو، ئـهبی-جگـه لـه تۆڵـهی كچێنی-مـارهیی هاووێنهیشی بداتێ.

(وَفِي كُلِّ عُضْوٍ) وه تۆڵهی ههر ئهندامێك (لاَ مَنْفَعَةَ فِيـهِ) كه كـهلكی كـاركردنی نـهمابێ: وهكو دهستی ووشكبوو و ددانی زێدهو پهنجهی زێده (حُكُومَةٌ) خوێنێكیوهها ههیـه كـه له لای (قازی) دیاری ئهكرێ (وَدِيَةُ الْعَبْدِ) خوێنی كۆیلهی كوژراو (قِيمَتُهُ) نرخی خۆیهتی، جا زۆر بێ، یان كهم بێ.

## ﴿ باسی تۆڵهی (جَنین) كۆرپهی ناو زگ ﴾

(وَدِيَةُ الْجَنِينِ الْحُرِّ) خوێنی كۆرپهی ناو زگ: كه ئازاد بـێو بـه هـۆی دهسـت درێژیكردنـه سهر دایكهكهی به مردوویی لێی بێته دهرهوه، جیاوازی نێرو مێ نیه، جیـاوازی كۆرپـهی تهواو و پارچه گۆشتێكیوێنهكراو نیـه (غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ أَمَـةٌ) خوێنهكـهی: یـان كۆیلهیـهكی

وَدِيَـــــةُ الْجَـــــنِينِ الرَّقِيـــــقِ عُشْـــــرُ قِيمَـــــةِ أُمِّـــــهِ.
(فَصْلٌ) وَإِذَا اقْتَرَنَ بِدَعْوَى الدَّمِ لَوْثٌ يَقَعُ بِهِ فِي النَّفْسِ صِدْقُ الْمُدَّعِي حَلَفَ الْمُدَّعِي خَمْسِينَ يَمِيناً وَاسْتَحَقَّ الدِّيَةَ،

---

نێره، یان کۆیلەیەکی مێیە، جا ئەگەر نەبو، ئەبێ پێنج ووشتر بدرێن، یان نرخی پێنج ووشترەکان ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى فِي دِيَةِالْجَنِينِ بِعَبْدٍ أَوْ وَلِيدَةٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ حوكمی كردوە: كە خوێنی كۆرپەی ناو زگ كۆیلەیەك بێ.
ئینجا بزانە: خوێنی ئەو كۆرپەیە لە سەر خزمەكانی تاوانبارەكەیەو، بۆ میراتگرەكانی كۆرپەكەیە.(وَدِيَةُ الْجَنِينَ الرَّقِيقِ) خوێنی كۆرپەی ناو زگ كە كۆیلە بێ (عُشْرُ قِيمَةِ أُمِّهِ) دە یەكی نرخی دایكیەتی.
﴿ئاگاداری﴾: لەو تاوانەدا جیاوازی نیە: لە نێوان باوكیكۆرپەكەو دایكە ئاوسەكەو كەسێكیتر، هەروەها جیاوازی نیە ئەو بارفڕێدانە: بە هۆی دەرمانخواردن بێ، یان بە هۆی لێدان بێ، یان بە هۆیترساندن بێ، یان بە هۆی برسیكردن بێ.
بەڵام: ئیمامی (الزَّرْكَشِي) فەرموویەتی: ئەگەر دایكەكە تووشی مەترسی مردن بوو، دروستە دەرمانی بارهاویشتن بخواو تۆڵەی ناكەوێتە سەر.
هەروەها بزانە: دەرمانخواردن بۆ فڕێدانی كۆرپەی ناو زگ پێش ئەوەیرۆحی تێكرێ یا پێش ئەوەیوێنەی نهێنیی بكێشرێ، هەر حەرامە، بەڵام تۆڵەیواجب نیە.
هەروەها دەرمانخواردن بۆ ئەوەی بە یەكجاری منداڵی نەبێ، حەرامە، بەڵام ئەگەر هەر بۆ ماوەیەك بێ، دروستە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (قَسَامة): سوێندخواردنی كوشتن ﴾

واتـــــە: ســـــوێندخواردنی میراتگرەكـــــانی كوژراوەكـــــەو، ئاشـــــكراكردنی كوشـــــتن.
(وَإِذَا اقْتَرَنَ بِدَعْوَىالدَّمِ) هەر كاتێك هەبوو لەگەڵ داواكردنیكوشتنێك (لَوْثٌ) نیشانەیەك هەبوو، واتە: ئەگەر كەسێك بڵێ: فڵانكەس كوڕی منی كوشتووە، نیشانەیەكی وەهای هەبوو: كە (يَقَعُ بِهِ فِيالنَّفْسِ) بەو نیشانەیە ئەهاتە ناو دڵ (صِدْقُ الْمُدَّعِي) كە داواكارەكە ڕاست ئەكا: وەك كوژراوەكە لە بەر دەرگەی دوژمنەكانی لاشەی كەوتبێ، یان كۆمەڵێك پەرت ببنو لاشەی كوژراوێك بەجێ بهێڵن، یان خەڵك بڵێ: فڵانكەس كوشتویەتیو شاهیدیش نەبێ، یان هەر یەك شاهید هەبێ، ئەوانە گشتی نیشانەی ڕاستینە.
كەوابوو: (حَلَفَ الْمُدَّعِي) داواكارەكە سوێند ئەخوا لە سەر داوایەكەی خۆی (خَمْسِينَ يَمِيناً) پەنجا سوێند، لە سوێندەكاندا ئەڵێ: فڵانكەس كوشتوویەتی (وَاسْتَحَقَّ الدِّيَةَ) ئینجا كە میراتگر سوێندەكانی تەواو خواردن، تەنها مافی خوێن وەرگرتنی هەیە، خوێنەكەش لە سەر تاوانكارەكەیە ئەگەر كوشتنی بەقەسدی بێ، ئەگەر نا: لە سەر خزمەكانیەتی.

جا بزانە: ئەگەر کوژراوەکە لە یەك میراتگر زیاتری هەبوو، ئەو پەنجا سوێندە بە سەریاندا بەش ئەکرێ بەگوێرەی میرات، جا ئەگەر یەکێکیان بەشە سوێندەکەی خۆی نەخوارد، یان منداڵ بوو، یان لە ماڵەوە نەبوو، ئەوىتر پەنجا سوێندەکە ئەخولو-تەنها-بەشە خوێنەکەی خۆی بۆ خۆی وەرئەگرێ.

هەروەها بزانە: لە مەزهەبی ئیمام (مالك)دا: ئەگەر کوژراوەکە پێش مردنی بڵێ: فڵانکەس منی کوشت، ئەمەش ئەبێتە نیشانەی ڕاستی.

﴿ئاگاداری﴾: مافی کوشتنی لە تۆڵە ئاشکرا ئەبێ: یان بە شاهیدیی دوو پیاوی دادپەروەر، یان بە دان پێداهێنانیتاوانکارەکە، بەڵام مافیخوێن وەرگرتن بەم دووانە ئاشکرا ئەبێو هەم بە شاهیدیی پیاوێكو دوو ئافرەت، یان بە شاهیدیی پیاوێكو پەنجا سوێند ئاشکرا ئەبێ.

(وَإِنْ لَمْ يَكُنْ هُناكَ لَوْثٌ) ئەگەر هیچ نیشانەی ڕاستی نەبوو، بەڵام میراتگرەکان گوتیان: فڵانکەس کوشتویەتی (فَالْيَمِينُ) ئەم پەنجا سوێندە (عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ) لە سەر داوالێکراوەکەیە، واتە: پەنجا سوێند ئەخواو ئەڵێ: من نەمکوشتوە. ئینجا کە پەنجا سوێندی خوارد، ئەبێ وازی لێبێنن ﴿عَنْ سَهْلِ بن حَثْمَةَ ﷺ: أَنَّ عَبْدَاللهِ بن سَهْلٍ قُتِلَ فِي خَيْبَرَ، فَقالَ الْيَهُودُ: واللهِ ما قَتَلْناهُ. فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَقاربِه: يُقْسِمُ خَمْسُونَ مِنْكُمْ؟ قَالُوا: لاَ. قالَ: فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ بِأَيْمانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ؟ قالُوا: قَوْمٌ كُفَّارٌ. فَوَداهُ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ قِبَلِه﴾ رواه‌الشيخان، یەکێك لە سەحابەکان کە ناوی (عبدالله) بوو، لە (خیبر)دا کوژراو، جولەکەکان گوتیان: ئێمە نەمانکوشتوە. ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە خزمەکانی کوژراوەکەی فەرموو: ئایا پەنجا سوێند ئەخۆن بۆ ئەوەی خوێنی وەربگرن؟ گوتیان: سوێند ناخۆین. فەرمووی: ئایا جولەکەکان پەنجا سوێندتان بۆ بخۆن؟ گوتیان: ئەوان کافرن بە سوێندی ئەوان باوەڕ ناکەین. ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە لای خۆیەوە خوێنەکەی دا، بۆ ئەوەی کێشەکە ببڕێتەوەو خوێنی بە فیڕۆ نەچێ.

## ﴿ باسی (کَفّارَة)ی کوشتن ﴾

(وَعَلَى قاتِلِ النَّفْسِ)واجبە لە سەر ئەو کەسەی یەکێك ئەکوژێ (الْمُحَرَّمَةِ) کە ئەو کوشتنەش حەرام بێ (كَفّارَةٌ) ئەبێ کەففارەتیکوشتنەکە بدا، هەرچەند مرۆڤکوژەکە منداڵیش بێ، یان شێت بێ، جا کوشتنەکە بە هەڵە بێ، یان بە قەسدی بێ، هەروەها جیاوازی نیە: هەر بە خۆی خۆی بکوژێ، یان کەسێکیتر بکوژێ، جا کوژراوەکە: گەورە بێ، یان منداڵ بێ، پیاو بێ، یان ئافرەت بێ، شێت بێ، یان عاقڵ بێ، نەخۆش بێ، یان ساغ بێ، ئازاد بێ، یان کۆیلە بێ، موسوڵمان بێ، یان کافری پەیمان لەگەڵکراو بێ، یان کۆرپەی ناو زگ بێ.

عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ سَلِيمَةٍ مِنَ الْعُيُوبِ الْمُضِرَّةِ بِالْعَمَلِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيامُ شَهْرَيْنِ مُتَتابِعَيْنِ.

(وَهِيَ) کەففارەتی کوشتن ئەمەیە: (عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ) ئەبی کۆیلەیەکی موسوڵمان ئازاد بکا (سَلِيمَةٍ مِنَ الْعُيُوبِ الْمُضِرَّةِ بِالْعَمَلِ) هیچ کەموکورییەکی وەهای تێدا نەبێ: کە زیان بە ئیش‌و کار بگەیەنێ.

(فَإِنْ لَمْ يَجِدْ) جا ئەگەر کۆیلە نەبو (فَصِيامُ شَهْرَيْنِ) ئەبی دوو مانگ بەڕۆژوو ببێ بە نیەتی کەففارەتی‌کوشتن (مُتَتابِعَيْنِ) واجبە ئەو دوو مانگە بە سەر یەکدا بن، واتە: نابێ یەک ڕۆژ بکەوێتە نێوان، بەڵام: ئەگەر ئافرەت کەوتە حەیز، ئەوە نابێتە نێوان، کە پاک بۆوە لە سەر ڕۆژووەکان بەردەوام ئەبێ.

ئینجا بزانە: لە کەففارەتی کوشتندا نابێ خواردن بدرێتە هەژاران، بەڵام ئەگەر مرۆڤکوژەکە مرد و کەففارەتی نەدابو، ئەبی لەجیاتی هەر ڕۆژووەک یەک مستە دانەوێڵە لە میراتەکەی بدرێتە هەژاران، یان یەکێك لەجیاتیی بەڕۆژوو ببێ.

هەروەها بزانە: ئەگەر بە کۆمەڵێك یەکێك بکوژن، یان ببنە هۆی کوشتنی: وەکو شایەدی بە درۆی لە سەر بدەن، ئەوە هەر یەکەو کەففارەتێکی‌کوشتنی لە سەرە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللهِ وَكَانَ اللهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ هەر کەسێك موسوڵمانێك بکوژێ ئەبی کۆیلەیەکی موسوڵمان ئازاد بکاو خوێنیش بداتە خزمەکانی، مەگەر خێری پێ بکەن‌و خوێنی لێ‌وەرنەگرن، جا ئەگەر–ئەو موسوڵمانەکوژراوە–خزمەکانی کافر بون‌و جەنگیان لەگەڵ موسوڵمانان ئەکرد، ئەوە–تەنها–کەففارەت واجبە، بەڵام ئەگەر خزمەکانی کوژراوەکە کافری پەیمان لەگەڵکراو بون: جا کوژراوەکە کافر بێ، یان موسوڵمان بێ، ئەبی خوێنیشی بداو کەففارەتیش بدا، جا ئەگەر کۆیلەی دەست نەکەوت، ئەبی دوو مانگ بە سەر یەکدا بەڕۆژوو ببێ، ئەو تۆبەیە لە لای خواوەیە، خوا زاناو کارلەجێیە.

﴿پاشکۆ﴾: هەر کەسێك یەکێك بکوژێ، سێ مافی ئەکەوێتە سەر:

یەکەم: مافی خوا، ئەوە بە تۆبەکردن لە سەری لائەچێ، بەو مەرجەی خۆی بداتە دەست خزمەکانی‌کوژراوەکە ؟ بۆ ئەوەی بیکوژن، یان خوێنی لێوەربگرن، یان لێی ببورن.

دووەم: مافی خزمەکانی کوژراوەکە، ئەمەش لائەچێ کە بیکوژن، یان ببورن، یان خوێنی لێوەربگرن.

سێیەم: مافی کوژراوەکە، ئەوە لە سەری لاناچێ، بەڵام ئەگەر ئەو دوو مافەی‌تری لە دونیادا لە سەر خۆی لادا، ئەوە خوای گەورە لە قیامەت پێکیان ئەهێنێ‌و کوژراوەکە

لەجیاتی وی ڕازی ئەكاو لەویش خۆش ئەبێ، بەڵام ئەگەر ئەو مافەیڕابردووی لە سەر خۆی لانەدابو، ئەوە هەرسێك مافەكانی لە سەر ئەمێنێو-ئەگەر خوا حەز بكا-بە ئاگری دۆزەخ سزا ئەدرێ، وَاللهُ أَعْلَمْ.

*　　　*　　　*

﴿ كِتابُ الْحُدُودِ: ئەم پەڕتووكە باسی سنوری سزای تاوانەكان ئەكا ﴾

بزانە: خوای گەورە بۆ پاراستنی ئاینو، گیانو، نەژادو، ماڵو، هۆشو، ئابڕوو، چەند سزایەكی داناوە بەرانبەر كردنی چەند تاوانێك: وەكو كوشتن، زینا، بوختان، مەیخواردنەوە، دزیكردن، ڕێگرتن، زۆرداری، كافربوون، جەنگكردن لەگەڵ فەرمانڕەوای ئیسلام، نوێژنەكردن.

هەروەها بزانە: ئەگەر ئافرەتێكی ئاوس تاوانێكی لەو تاوانانە كرد، نابێ سزا بدرێ تا زگەكەی دائەنێ، هەرچەند لە زیناش ئاوس بوبێ.

جا هەر كەسێك لە دونیادا سزای تاوانەكەی لێوەربگیرێ، لە ڕۆژی قیامەت دووبارە لە سەر ئەو تاوانە سزا نادرێتەوە، بەو مەرجەی تاوانەكەی (كُفْر) نەبێ ﴿عَــنْ عُبَــادَةَ بــن الصَّامت ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ أَصابَ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَعُوقِبَ بِهِ فِي الدُّنْيا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصابَ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَسَتَرَهُ اللهُ عَلَيْهِ فَأَمْرُهُ إِلَى اللهِ إِنْ شاءَ عَفَا عَنْهُ وَإِنْ شاءَ عَذَّبَهُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك لەو گوناهانە گوناهێكی كردو لە دونیادا سزا درا، بەم سزادانە گوناهەكەی لە سەر لائەچێ، وە هەر كەسێك لەو گوناهانە گوناهێكی كرد بەڵام لێی ئاشكرا نەبو، ئەوە كارەكەی ئەكەوێتە لای خوا: ئەگەر حەز بكا لێی ئەبورێ، وەئەگەر حەز بكا سزای ئەدا.

واتە: با لە نێوان خۆیو خوایگەورەدا تۆبە بكاو ئاشكرای نەكا، بەو مەرجەی مافی خەڵك نەبێ، چونكە ئەگەر گوناهەكە مافی خەڵك بوو، ئەبی خاوەنەكەی ڕازی بكا، ئینجا خوایگەورە لێی ئەبورێ، هەروەك لە باسی (غَصْب)و (وَدِيعة)دا ڕوونمان كردەوە.

﴿ باسی سزای (زِنا) ﴾

زینا ئەمەیە: ئامێری مێزكردنی نێرینە بنێتە ناو كونی پێشەوە، یان پشتەوە بە حەرامی.

(وَالزَّانِي) ئەو ئافرەتو پیاوەی زینا ئەكەن (عَلَى ضَرْبَيْنِ) ئەكرێنە دوو بەش: (مُحْصَنٌ) یەكەمیان: (موحصەنە)، واتە: لە ژیانیا جیماعێكی حەڵاڵی كردبێ. (وَغَيْرُ مُحْصَنٍ) دووەمیان: (نا موحصەنە)، واتە: لە ژیانیا جیماعێكی حەڵاڵی نەكردبێ:

فَالْمُحْصَنُ حَدُّهُ اَلرَّجْمُ، وَغَيْرُ الْمُحْصَنِ حَدُّهُ مِأَةُ جَلْدَةٍ وَتَغْرِيبُ عامٍ إِلَىٰ مَسافَةِ الْقَصْرِ، وَشَرائِطُ الْإِحْصانِ أَرْبَعَةٌ: اَلْبُلُوغُ، وَالْعَقْلُ، وَالْحُرِّيَّةُ، وَوُجُودُ الْوَطْإِ فِي نِكاحٍ صَحِيحٍ. وَالْعَبْدُ وَالْأَمَةُ حَدُّهُما نِصْفُ حَدِّ الْحُرِّ،

---

(فَالْمُحْصَنُ) ئەو زینا کەرەی (موحصەنە): (حَدُّهُ) سزای زیناکردنەکەی (اَلرَّجْمُ) بەردبارانکردنە تا ئەمرێ، جا ئافرەت بێ، یان پیاو ﴿عَنْ عُمَرَ‌ؓ قالَ: رَجَمَ رَسُولُ اللهِ‌ﷺ وَرَجَمْنا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى أَنْ يَقُولَ قائِلٌ: ما نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتابِ اللهِ، فَيَضِلَّ بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهااللهُ، وَإِنَّ الرَّجْمَ حَقٌّ فِي كِتابِ اللهِ تَعالَى عَلَى مَنْ زَنَى إِذا أُحْصِنَ مِنَ الرِّجالِ وَالنِّساءِ﴾ رواەالشیخان، ئیمامی (عمر) فەرمووی: پێغەمبەرﷺ زیناکەری بەردباران کرد، ئێمەش لە دوای وی بەردبارانمان کرد، جا ئەترسم یەکێك بڵێ: بەردبارانکردن لە قورئاندا نیەو بە هۆی نەکردنی گومڕا ببێ، لە کاتێکا بەردبارانکردن ڕاستەو خوا نووسیویەتی لە سەر ئەو ژنو پیاوەی زینا ئەکەن، بەو مەرجەی (موحصەن) بن.

ئینجا بزانە: بەردەکانی بەردبارانکردن، سوننەتە پڕ بە لەپە دەست بن. (وَغَيْرُ الْمُحْصَنِ) زینا کەری (ناموحصەن): (حَدُّهُ) سزای زینایەکەی (مِأَةُ جَلْدَةٍ) دارکاریکردنە بە لێدانی سەد شوڕکەدار (وَتَغْرِيبُ عامٍ) وەئەبی ماوەی ساڵێکیش دەریەدەر بکرێ (إِلَى مَسافَةِ الْقَصْرِ) بۆ شوێنێکی وەها: کە کورتکردنەوەی نوێژی لێ دروست بێ، واتە: هەشتا کیلۆمەتر دوور بێ، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿اَلزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِأَةَجَلْدَةٍ﴾ ئافرەتی زیناکەرو پیاوی زیناکەر هەر یەکەیان سەد شوڕکەداریان لێدەن.

(وَشَرائِطُ الْإِحْصانِ) مەرجەکانی زیناکەری(موحصەن): جا پیاو بێ، یان ئافرەت (أَرْبَعَةٌ) چوارن (اَلْبُلُوغُ) یەکەم: بلۆغی بوبێ. (وَالْعَقْلُ) دووەم: عاقڵ بێ. (وَالْحُرِّيَّةُ) سێیەم: ئازاد بێ. (وَوُجُودُالْوَطْإِ) چوارەم: جارێك جیماعی کردبێ (فِي نِكاحٍ صَحِيحٍ) لە مارەبڕینێکی دروستدا، واتە: ئەگەر پیاوەکە، یان ئافرەتەکە جارێك جیماعیان کردبو، بەڵام بە ژنو مێردایەتیەکیدروستبوو نەبو، یان ژنو مێردایەتی دروست بوو، بەڵام جیماعیان نەکردبو، یان منداڵ بون، یان شێت بون، یان کۆیلە بون، ئەوانە بە (موحصەن) دانانرێن، واتە: بەردباران ناکرێن.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کەسێك بە زۆرلێکردن زینای پێبکەن، ئەوە سزای زیناکردنی لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر بە سەرخۆشی زینا بکا، سزای زینای لە سەرە، جا بەردباران بێ، یان دارکاری بێ (وَالْعَبْدُ) کۆیلەی نێر (وَالْأَمَةُ) وە کۆیلەی مێ ئەگەر زینایان کرد (حَدُّهُما) سزای زینا کردنیان (نِصْفُ حَدِّ الْحُرِّ) نیوەی پیاو و ئافرەتی ئازادە، واتە: پەنجا دارە،

وَحُكْمُ اللّواطِ وإتْيان الْبهائِمِ كَحُكْمِ الزِّنا، وَمَنْ وَطِـيءَ فِيمَـادُونَ الْفَـرْجِ عُـزِّرَ، وَلاَ يَبْلُغُ بالتَّعْزِيزِ أَدْنَى الْحُدُود.

---

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ ئەگەر (جاریە)کانتـان زینایـان کرد، بـە نیـوەی ئافرەتـانی ئـازاد سزایان لـە سەرە. کەواتە: کۆیلە بە هیچ جۆرێك بەردباران ناکرێ.

(وَحُكْمُ اللّواطِ) سزای نێربازی، واتە: قوندانو قونگان (وَإتْيانِ الْبَهائِمِ) وە سزای زیناکردن لەگەڵ ئاژەڵ (كَحُكْمِ الزِّنا) وەکو سزای زینا وایە، واتـە: ئەگـەر قونگیەکـە (موحصـەن) بوو، بەرد باران ئـەکرێ، ئەگـەر نـا: سـەد داری لێئـەدرێ، بـەڵام قوندەرەکـە بـە هـەموو جۆرێك هەر سەد داری لێئەدرێ.

## ﴿ باسی (تَعْزِير): تەمبێکردن ﴾

(وَمَنْ وَطِيءَ) هەر کەسێك بە حەرامی دەستبازی بکـا (فِيمـا دُونَ الْفَرْجِ) کە نەبێتـە زینـا کردن: وەکو ماچکردنو مەمك گرتنو دەست لە ملان کردنو ئەو جۆرە کردەوانـە (عُـزِّرَ) واجبە تەمبێ بکرێ، هەروەها ئەگەر لە کونی پشتـەوەدا، یـان لـە کـاتی حـەیزو نیفاسـدا جیماع لەگەڵ ژنیخۆی بکا، ئەبی تەمبێ بکرێ.

﴿ئاگاداری﴾: مەبەست لە (تَعْزِير)، واتە: تەمبێکردن، ئەوەیـە: تاوانبارەکـە لێی بـدرێو شاپی تێهەڵبدرێو سەری بتاشرێو ڕووی ڕەش بکرێو بەند بکرێ.

ئینجا بزانـە: هەر تاوانێك لە شەرعدا سزای دیـار نـەکرابێ، ئـەو تەمبێکردنـە سـزایەتی.

(وَلاَ يَبْلُغُ بِالتَّعْزِيرِ) نابێ (قازی) لـەو تەمبێکردنـە بگاتـە (أَدْنَـى الْحُدُودِ) کـەمترین سـزای گوناهەکان، واتە: ئەگەر بە دارکاری بیکا، نابێ بگاتە بیست شـوڕکەدار لـە کۆیلـەو، چـل شوڕکەدار لە ئازاد.

﴿پاشکۆ﴾: یەکـەم: هەر کەسێك ئافرەتێکی مەحرەم مارە بکاو زینای لەگەڵ بکا، سـزای وەکو سزای زینا وایە، بـەڵام لـە مەزهـەبی ئیمـامی(أحمد)-خوا لێی ڕازی بێ- ئـەبی بکـوژرێ ﴿عَنِ الْبَراءِ ﷺ: لَقِيتُ عَمِّي فَقُلْتُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِلَى رَجُـلٍ نَكَحَ إِمْرَأَةَ أَبِيهِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ وَآخُذَ مالَـهُ﴾ رواهاصحاب السنن، (بـەراء) -خوا لێی ڕازی بێ- فەرمووی: گەیشتمە مامی خۆم و پێم گوت: بۆ کوێ ئەچی؟ گوتی: پیاوێـك زرِدایکی خۆی مارە کردۆتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داومـێ: بچم بیکـوژمو ماڵەکەیشـی بە تاڵان بهێنم.

دووەم: تەنها ئەبی گەورەی موسوڵمانان، یـان جێگـری وی سـزای تاوانـەکان وەربگـرێو نابـێ ئـەو کەسـەی دەسـتەڵاتی نـەدراوەتێ سـزا وەربگـرێ، چـونکە فیتنـە ڕوو ئـەدلو سزایەکەش جێی خۆی ناگرێ.

(فَصْلٌ) وَإِذا قَذَفَ غَيْرَهُ بالزِّنا فَعَلَيْه حَدُّ الْقَذْف بثَمانيَة شَرائطَ: ثَلاثَةٌ فـي الْقــاذف: وَهُوَ أَنْ يَكُونَ بَالغاً، عاقلاً، وَأَنْ لايَكُونَ وَالداً للْمَقْذُوف. وَخَمْسَــةٌ فيالْمَقْــذُوف: وَهُوَ أَنْ يَكُونَ مُسْلماً، بالَغاً، عاقلاً، حُرّاً، عَفيفاً. وَيُحَدُّ الْحُرُّ ثَمانينَ، وَالْعَبْدُ أَرْبَعينَ،

---

سێیەم: زینا بە شاهیدیی چوار پیاوی دادپەروەر ئاشکرا ئەبێ، واتـە: ئەگـەر لـە چـوار پیـاو کـەمتر شـاهیدییان دا، ئـەبی گشـتیان دارکـاری بکـرێن، چـونکە ئەبێتـە بوختـان، هەروەها زینا ئاشکرا ئەبێ: کە زیناکارەکـە بـەخۆی شـاهیدی لـە سـەر خـۆی بـداو بڵـێ: زینام کردوە. بەڵام دروستە پەشیمان ببێتەوەو بڵێ درۆم کرد.

﴿ فَصْلٌ: لەباسی سزای (قَذْف) بوختان پێکردنی زینا ﴾

(وَإِذا قَذَفَ غَيْرَهُ) هەر کاتێك یەکێك بوختـانی بـە یـەکێکیتر کـرد (بِالزِّنـا) بـە زینـاکردن، واتە: پێی گوت: زینات کردوە. یان پێی بڵێ: نێرباز. یان پێی بڵێ: قوندەر. یان پـێی بڵێ: قەحپە. یان پێی بڵێ: پیاوێك تۆی گایە. یـان پـێی بڵـێ: گانـت داوە. یـان تـەنها پێی بڵێ: تۆ لە باوکی خۆت نی. وە مەبەستیشـی بـەو گوفتارانـە ئـابڕووبردن بـێ، نـەك شاهیدی (فَعَلَيْهِ حَدُّالْقَذْفِ) بەم بوختانە سزای بوختانی ئەکەوێتە سەر، وە هیچ جیـاوازی ئافرەت‌و پیاو نیە، خوای گـەورە فـەرموویـەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ ئەوانـەی بوختانیزینـا بـە داوێنپاکـان ئەکـەن، ئینجا چوار شاهید نائێنن، لە سزای ئەو بوختانە هەشتا داریان لێبدەن.

(بِثَمانِيَــةِ شَــرائِطِ) ئــەو ســزایە بــە هەشــت مــەرج ئەیکەوێتــە ســەر: (ثَلاثَةٌ مِنْها) سێ مەرج لەو هەشتانە (فِيالْقاذِفِ) ئەبی لە بوختانکەرەکەدا بێنـە جـێ (وَهُـوَ أَنْ يَكُونَ بَالِغاً) یەکەم: بلۆغی بوبێ. (عاقِلاً) دووەم: عاقڵ بێ. واتە: منداڵ‌و شـێت سـزای بوختانیان لە سەر نیە، چونکە بایەخ بە قسەی ئەوان نادرێ، کەواتە: تەمبێ ئەکرێن.

(وَأَلاّ يَكُونَ وَالِداً لِلْمَقْذُوفِ) سـێیەم: نابـێ بوختانکەرەکـە بـاوك‌و بـاپیرەو دایـك‌و داپـیرەی بوختان پێکراوەکە بێ، هەروەها نابێ زۆری لێکرابێ بۆ ئەوەی بوختان بکا.

(وَخَمْسَةٌ فِيالْمَقْذُوفِ) وە پێنج مەرجیتریش لە بوختان پێکراوەکەدا ئەبی بێنە جـێ (وَهُـوَ أَنْ يَكُونَ مُسْلِماً) یەکەم: بوختان پێکراوەکە موسوڵمان بێ. (بالِغاً) دووەم: بلۆغی بوبێ. (عاقِلاً) سێیەم: عاقڵ بێ. (حُرّاً) چوارەم: ئازاد بێ. (عَفِيفـاً) پێنجـەم: داوێنپـاك بـێ، واتـە: زینـای نەکردبێ. کەواتە: ئەگەر بوختان پێکراوەکە منداڵ بوو، یان شـێت بـوو، یـان کـافر بـوو، یـان کۆیلە بوو، یان جارێك زینای کردبوو، نابێ بوختانکەرەکەی دارکاری بکرێ.

(وَيُحَدُّ الْحُرُّ) بوختانکەری ئازاد سزا ئەدرێ (ثَمانِينَ) بە لێدانی هەشتا شـورکەدار (وَالْعَبْـدُ) وە بوختانکەری کۆیلە سزا ئەدرێ (أَرْبَعِينَ) بە لێـدانی چـل شـورکەدار، وە ئـەبی (قـازی) ئەو دارکارییە بکا، نەك بوختـان پێکراوەکە.

وَيَسْقُطُ حَدُّالْقَذْف بِثَلاَثَة أَشْياءَ: إِقامَة الْبَيِّنَة، أَوْ عَفْوالْمَقْذُوف، أوِاللِّعان فِي حَقِّ الزَّوْجَة.
(فَصْلٌ) وَمَنْ شَرِبَ خَمْراً أَوْ شَراباً مُسْكِراً يُحَدُّ أَرْبَعينَ،

---

(وَيَسْقُطُ حَدُّ الْقَذْفِ) سزاى بوختانكردن له سەر بوختانكەرەكە لا ئەچێ (بِثَلاَثَةِ أَشْياءَ) به سێ شت، يەكەم: (إِقامَةِ الْبَيِّنَةِ) به هێنانى چوار شاهيد: كه شاهيدى بدەن ئەو پياوە، يان ئەو ئافرەتەى ديتوە زيناى كردوە. دووەم: (أَوْ عَفْوِ الْمَقْذُوفِ) يان بوختان پێكراوەكە لێى ببورێ، يان ميراتگرەكەى له پاش مردنى وى لێى ببورێو بڵێ: نامەوێ سزا بدرێ. سىێيەم: (أَوِ اللِّعانِ فِي حَقِّ الزَّوْجَةِ) يان به هۆى لەعنەتكردن له دەربارەى بوختان پێكردنى ژنى خۆى، هەروەك باسمان كرد. هەروەها ئەگەر بوختان پێكراوەكه دان بنێو بڵێ: زينام كردوە، سزايەكه له سەر بوختانكەرەكەى لا ئەچێ.

﴿پاشكۆ﴾: ئەگەر هەر دوو كەسەكه بوختانيان به يەكترى كرد، ئەوە نابێتە تۆڵە وەرگرتنو به بەر سزادان ناكەوێ، واتە: ئەبى هەردووكيان داركارى بكرێن.

بەڵام ئەگەر يەكێك جنێو به يەكێكىتر بدا، ئەوىتر بۆى دروستە جنێوەكەى پێ بداتەوە، بەو مەرجەى له ئەندازەى جنێوەكه زياتر نەكاو جنێو به دايكو باوكى نەداتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسى سزاى شەرِا بخۆر ﴾

( پێشەكى ): مەبەست بەو شەرِابەى كه حەرامەو سزاى هەيه ئەوەيه: كه پێى سەرخۆش ببێ ﴿عَنْ عُمَرَ﴿ قالَ: نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ وَهِيَ مِنْ خَمْسَةٍ: مِنَ الْعِنَبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ. وَالْخَمْرُ مَا خامَرَ الْعَقْلَ﴾ رواه‌الشيخان، ئيمامى(عمر) فەرمووى: كاتێ شەرِاب حەرام كرا، لەو پێنج شتانه دروست ئەكرا: له ترێو خورماو هەنگوينو گەنمو جۆ، وە شەرِابى حەرام ئەوەيه سەرخۆش بكا.

ئينجا بزانه: جياوازى له نێوان كەمو زۆر نيه ﴿عَنْ جابِرٍ﴿: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ماأَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرامٌ﴾ رواه‌اصحاب السنن، پێغەمبەرﷺفەرموويەتى: هەر شەرِابێك زۆرەكەى سەرخۆش بكا، كەمەكەشى هەر حەرامە، هەرچەند سەر خۆشيشى نەكا.

كەوابوو: دروست نيه هيچ جۆرە شەرِابێك به قسەى هيچ كەسێك بۆ دەرمان بەكار بهێنرێ ﴿عَنْ طارق الْجعفي﴿: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْخَمْرِ يَصْنَعُها لِلدَّواءِ؟ فَقالَ: إِنَّها لَيْسَتْ بِدَواءٍ وَلَكِنَّها داءٌ﴾ رواه‌مسلم، (تاريقى جوعفى) پرسيارى له پێغەمبەرﷺ كرد رێگاى بدا: شەرِاب بۆ دەرمان به كار بهێنێ؟ پێغەمبەر يشﷺ رێگاى نەداو فەرمووى: شەرِاب دەرمان نيه، بەڵكو دەردە.

(وَمَنْ شَرِبَ خَمْراً) هەر موسوڵمانێك ئەو شەرِابه بخواتەوە كه له ترێ دروست كراوە (أَوْ شَراباً مُسْكِراً) يان هەر شەرِابێكىتر بخواتەوە: كه سەرخۆشى بكا، جا له هەر شتێكىتر دروست كرابێ (يُحَدُّ أَرْبَعِينَ) ئەبى سزا بدرێو چل شوركه دارى لێبدرێ.

وَيَجُوزُ أَنْ يَبْلُغَ بِهِ ثَمانِينَ عَلَى وَجْهِ التَّعْزِيزِ، وَيَجِبُ عَلَيْهِ الْحَدُّ بِأَحَدِ الأَمْرَيْنِ: بِالْبَيِّنَةِ، أَوِ الإِقْرارِ. وَلاَ يُحَدُّ بِالْقَيْءِ أَوِالإِسْتِنْكَاهِ.
(فَصْلٌ) وَتُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ بِسِتَّةِ شَرائِطَ: أَنْ يَكُونَ بالِغاً، عاقِلاً، وَأَنْ يَسْرِقَ نِصاباً قِيمَتُهُ رُبْعُ دِينارٍ،

---

(وَيَجُوزُ) بەلام بۆ کاربەدەست دروستە (أَنْ يَبْلُغَ بِهِ) سزای شەڕابخۆر بگەیێنێتە (ثَمانِينَ) هەشتا دار (عَلَى وَجْهِ التَّعْزِيزِ) بە ناوی تەمبێکردن، واتە: چلێك: سزایە، چلی‌تر: تەمبێکردنە ﴿عَنْ عَلِيٍّ ﷺ فِي شارِبِ الْخَمْرِ: جَلَدَ النَّبِيُّ ﷺ أَرْبَعِينَ، وَجَلَدَ أَبُوبَكْرٍ أَرْبَعِينَ، وَجَلَدَ عُمَرُ ثَمانِينَ، وَكُلٌّ سُنَّةٌ وَهَذا أَحَبُّ إِلَيَّ﴾ رواەمسلم، ئیمامی(علی) فەرمووی: پێغەمبەرﷺ چل داری لە شەڕابخۆر داوە، ئیمامی(أبوبكر)ش چل داری لێداوە، ئیمامی(عمر) هەشتا داری لێداوە، هەردووك هەر ڕێگای پێغەمبەرنﷺ، من هەشتایەکەم پێ‌خۆشترە.
(وَيَجِبُ عَلَيْهِ الْحَدُّ) شەڕابخۆر سزای ئەکەوێتە سەر (بِأَحَدِ أَمْرَيْنِ) بە یەکێك لەم دووانە: یەکەم: (بِالْبَيِّنَةِ) دوو پیاو شاهیدی بدەن بڵێن: شەڕابی خواردۆتەوە. دووەم: (أَوْ الإِقْرارِ) یان بە خۆی بڵێ: من شەڕابم خواردۆتەوە.
(وَلاَ يُحَدُّ) نابێ مرۆڤ دارکاری بکرێ (بِالْقَيْءِ) بە هۆی ڕشانەوە: کە شەڕابی لێبێتە دەرەوە (أَوْ الإِسْتِنْكاهِ) یان بە هۆی ئەوەی بۆنی شەڕابی لێبێ.
﴿ئاگاداری﴾: مندالۆ شێتو کافر و ئەو کەسەی بە زۆرلێکردن شەڕابیان دەرخوارد داوەو ئەو کەسەی نەیزانیوە شەڕابە، ئەوانە هیچیان سزایان لە سەر نیە.
﴿پاشکۆ﴾: ئەو کەسەی دارکاری ئەکرێ: جا لە بەر زیناکردن، یان بوختانکردن، یان شەڕابخواردنەوە، دروست نیە شوێنەکەدارەکانی لە دەمو چاو و شوێنە کوشندەکان بدرێن ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذاضَرَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَّقِ الْوَجْهَ﴾ رواەالشیخان، پێغەمبەرﷺفەرمووی: هەر کاتێ یەکێك داری سزای لە یەکێك دا، با ئاگادار بێ لە دەمو چاوی نەدا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی سزای دزیکردن ﴾

(وَتُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ) واجبە دەستی دز ببڕدرێ، واتە: لێبکرێتەوە، جا نێر بێ، یان مێ بێ، موسوڵمان بێ، یان کافر بێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾ پیاوی دز و ئافرەتی دز دەستیان لێبکەنەوە.
(بِسِتَّةِ شَرائِطَ) بە شەش مەرج: (أَنْ يَكُونَ بالِغاً) یەکەم: دزەکە بلۆغی بووبێ. (عاقِلاً) دووەم: عاقڵ بێ. (وَأَنْ يَسْرِقَ نِصاباً) سێیەم: ئەندازەیەکی وەها بدزێ (قِيمَتُهُ رُبْعُ دِينارٍ)

مِنْ حِـــرْز مثْلـــه، لاَمِلْـــكَ لَـــهُ فيـــه، وَلاَ شُـــبْهَةَ فـــي مـــال الْمَسْـــرُوق منـــهُ. وَتُقْطَعُ يَدُهُ الْيُمْنَى مِنْ مفصَلِ الْكُوعِ، فَإِنْ سَرَقَ ثانياً قُطعَتْ رِجْلُهُ الْيُسْرَى، فَإِنْ سَرَقَ ثالثاً قُطعَتْ يَدُهُ الْيُسْرَى، فَإِنْ سَرَقَ رابعاً قُطعَتْ رِجْلُهُ الْيُمنَى،

---

نرخەكەی بگاتە چوارێكە میسقالێكی زێڕ، یان زیاتر ﴿عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: عَنِ النَّبيِّ ﷺ: لاَ تُقْطَعُ يَدُالسَّارِقِ إِلاَّ فِي رُبْعِ دِينارٍ فَصاعِداً﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ دەستی دز ببڕدرێ تا ئەندازەی چوارێكە میسقالێك، یان زیاتر ئەدزێ.

(مِنْ حِرْزِ مثْله) چوارەم: دزیەكە لە شوێنی پاراستنی وێنەی‌خۆی بێ: وەك ئاژەڵ لە ناو تەویلە، یان لە لەوەڕگەدا بدزێ، جلو بەرگو قاپو پارە لە ناو ژووری‌خانوودا بدزێ، كەوابوو: ئەگەر ماڵەكە لە شوێنێكی وەها داندرابو كە شایانی پاراستنی ئەو جۆرە شتە نەبو: وەك ئاژەڵی بێ‌شوان لە بیاباندا، یان دانانی پارە لە دەرەوەی خانوو، ئەو دزە دەستی نابڕدرێو تەنها تەمبێ ئەكرێو ماڵەكەی لێوەرئەگیرێتەوە.

(لاَمِلْكَ لَهُ فيهِ) پێنجەم: هیچ بەشی دزەكە لەو ماڵە دزراوەدا نەبێ، كەوابوو: ئەگەر ماڵی خۆی لە یەكێكی‌تر بدزێتەوە، یان ئەو ماڵە بدزێ كە هاوبەشە لەگەڵ یەكێكی‌تر، بەمە دەستی نابڕدرێ. (وَلاَ شُبْهَةَ فِي مالِ الْمَسْرُوقِ مِنْهُ) شەشەم: هیچ گومانی مافی‌دزەكە لە ماڵی دزی‌لێكراوەكەدا نەبێ، كەوابوو: ئەگەر دایكو باوك دزی لە كوڕو كچی خۆیان بكەن، یان كوڕو كچ دزی لە دایكو باوكیان بكەن، دەستیان نابڕدرێ، چونكە مافی بەخێوكردنیان لە سەر یەكتری هەیە.

هەروەها ئەگەر یەكێك لە بەر برسیەتی‌و نەبوونی خواردەمەنی بدزێ، ئەویش نابێ دەستی ببڕدرێ، چونكە ماف بەخێوكردنی لە سەر دەوڵەمەندان هەیە.

(وَتُقْطَعُ يَدُهُ الْيُمْنَى) ئینجا ئەگەر دزیەكەی لە سەر ئاشكرابو، ئەبێ دەستی‌ڕاستەی ببڕدرێ (مِنْ مفصَلِ الْكُوعِ) لە جومگەی بازنەدەستەوە، ئینجا دەستە لێكراوەكەی بە ملیەوە هەڵئەواسرێ تا ماوەیەك (فَإِنْ سَرَقَ ثانياً) جا ئەگەر جاری دووەم دزی‌ی كرد (قُطعَتْ رِجْلُهُ الْيُسْرَى) ئەبێ قاچی‌چەپەی ببڕدرێ لە گوزینگەوە (فَإِنْ سَرَقَ ثالثاً) جا ئەگەر جاری سێیەم دزی‌ی كرد (قُطعَتْ يَدُهُ الْيُسْرَى) ئەبێ دەستی‌چەپەی ببڕدرێ (فَإِنْ سَرَقَ رابعاً) جا ئەگەر جاری چوارەم دزی‌ی كرد (قُطعَتْ رِجْلُهُ الْيُمْنَى) ئەبێ قاچی‌ڕاستەی ببڕدرێ ﴿عَنْ أَبي‌هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: قالَ النَّبيُّ ﷺ فِي السَّارِقِ: إِنْ سَرَقَ فَاقْطَعُوا يَدَهُ، ثُمَّ إِنْ سَرَقَ فَاقْطَعُوا رِجْلَهُ، ثُمَّ إِنْ سَرَقَ فَاقْطَعُوا يَدَهُ، ثُمَّ إِنْ سَرَقَ فَاقْطَعُوا رِجْلَهُ﴾ رواه الشافعي والدارقطني، واتەی ئاشكرایە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەبی شوێنی‌برینەكە بە ڕونی‌كوڵاو داغ بكرێ، بۆ ئەوەی خوێنەكەی بوەستێ‌و نەمرێ، كەوابوو: ئەركی ئەو ڕونەو ئەركی دەرمانكردن لە سەر دزەكەیە.

فَـــإنْ سَـــــرَقَ بَعْــــدَ ذَلِـــــكَ عُـــــزِّرَ، وَقِيـــــلَ يُقْتَـــــلُ صَـــبْراً.
(فَصْلٌ) وَقُطَّاعُ الطَّرِيقِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَقْسَامٍ: إنْ قَتَلُوا وَلَـمْ يَأْخُـذُوا الْمَـالَ قُتِلُـوا، فَإِنْ قَتَلُوا وَأَخَذُوا الْمَالَ قُتِلُوا وَصُلِّبُوا، وَإِنْ أَخَذُوا الْمَالَ وَلَمْ يَقْتُلُوا تُقْطَعُ أَيْدِيهِمْ

---

(فَإِنْ سَرَقَ بَعْدَ ذَلِكَ) جا ئەگەر لە دوای جاری‌چوارەم هەر دزیی کرد (عُزِّرَ) واجبە تـەمبێ بکرێ، واتە بەند ئەکرێ (وَقِيلَ يُقْتَلُ صَبْراً) وە لە فـەرموودەی بێ‌هێزدا: ئـەبی بکـوژرێ. بەلاّم لە بەر بێ‌هێزی، ئەم فەرموودەیە کاری پێ‌ناکرێ.

﴿پاشـکۆ﴾: مەرجـە بـۆ دەسـتبڕینی دز: یەکـەم: خـاوەن مـالّ دلوای مالّەدزراوەکـە بکـا. دووەم: ئـەبی دزیەکـە ئاشـکرا ببـێ: بـە شـاهیدیی دوو پیـاو، یـان بـە دانپێـداهێنانی دزەکە، جا ئەگەر دەستی ببڕدرێ، یان نا، هەر ئـەبی شـتەدزراوەکە بداتـەوە خاوەنەکـەی، بـەلاّم ئەگـەر تـەنها پیاوێـکو دوو ئـافرەت شـاهید بـون، یـان هـەر شـاهیدێك هـەبوو و خاوەنەکـەش سـوێندی خـوارد، یـان هـیچ شـاهید نـەبو و خاوەنەکـە بـە دزەکـەی گـوت: ئەبی سوێندم بۆ بخۆی، دزەکەش گوتی: تۆ سوێند بخۆ، ئینجا خاوەنەکە بە ئیزنی دزەکـە سوێندی خوارد، بەوانە تەنها مافی مالّ دانەوە ئەکەوێتـە سـەر دزەکـەو دەسـتی نـابڕدرێ. سێ‌یەم: ئەبی کاریەدەست دەستی دز ببڕێ، واتە: بە فەرمانیوی بێ.

﴿ فَصْلٌ: لەباسی سزای (قَاطِعُ الطَّرِيقِ) ڕێگر ﴾

( **پێناسـە** ): ڕێگـری ئەمەیە: موسـوڵمانێك، یـان زیـاتر هێـرش بکاتـە سـەر گیـان، یـان نامووس، یان مالّی خەلّکو بیخاتە مەترسی، جا لـە شـوێنێکی چـۆل، یـان لـە ئـاوەدانی، –بە چەکەوە، یان بە بێ‌چەك– هێرش بکەنە سەر خـەلّکو خەلّکەکـەش توانـای ئـەوانیان نەبێ، یان بچنە مالّێکو ڕێگا نەدەن دانیشتووەکانی‌مالّەکە هـاوار بکـەن، یـان لـە ڕێگـەدا مالّ لە ڕێبواران بستێنن، ئەوانە گشتیان ڕێگرن.

(وَقُطَّاعُ الطَّرِيقِ) ڕێگرەکان (عَلَى أَرْبَعَةِ أَقْسَامٍ) چـوار بەشـن، یەکـەم: (إِنْ قَتَلُـوا) ئەگـەر کەسێکیان کوشتبو (وَلَمْ يَأْخُذُوا الْمَالَ) هیچ مالّیشیان نەبردبو (قُتِلُوا) واجبە بکوژرێن.

دووەم: (فَـإِنْ قَتَلُـوا) ئەگـەر کەسـێکیان کوشـتبو (وَأَخَـذُوا الْمَـالَ) وە مالّیشـیان بردبـو (قُتِلُوا) واجبە بکوژرێن (وَصُلِّبُوا) وە لـە دوای‌کوشـتن ئـەبی لاشـەکەیان بـۆ مـاوەی سـێ ڕۆژان هەلّبواسرێ، لە شوێنێکی‌وەها: کە خەلّك بیانبینێ.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کەسێك لە کاتی بەرگری‌کردن ڕێگرێك بکوژێ، نەتۆلّەو نە کەففارەتی لە سەر نیە، جا بزانە: ئەبی–لە دوای کوشتن– ڕێگرەکان بشۆرێنو کفن بکرێن نوێـژیان لە سەر بکرێ، ئینجا هەلّئەواسرێن.

سێ‌یەم: (وَإِنْ أَخَذُوا الْمَالَ) ئەگەر مالّیان لە خەلّکی سـەند، نرخـی مالّەکـەش ئەگەیشـتە چـوارێکە میسـقالێکی‌زێڕ، بـەلاّم (وَلَـمْ يَقْتُلُوا) کەسـیان نەکوشـت، ئـەوە (تُقْطَـعُ أَيْـدِيهِمْ)

وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ، فَإِنْ أَخافُوا السَّبِيلَ وَلَمْ يَأْخُذُوا مالاً وَلَمْ يَقْتُلُوا حُبِسُوا وَعُزِّرُوا. وَمَنْ تابَ مِنْهُمْ قَبْلَ الْقُدْرَةِ عَلَيْهِ سَقَطَ عَنْهُ الْحُدُودُ وَأُخِذَ بِالْحُقُوقِ. (فَصْلٌ) وَمَنْ قُصِدَ بِأَذىً فِي نَفْسِهِ، أَوْ مالِهِ، أَوْ حَرِيمِهِ، فَقاتَلَ عَنْ ذَلِكَ

---

دەستیان ئەبڕدرێ (وَأَرْجُلُهُمْ) وە قاچیشیان ئەبڕدرێ (مِنْ خِلَافٍ) لە ڕاستەو چەپە، واتە: دەستی ڕاستەو قاچی چەپەیان بە یەکەوە ئەبڕدرێ.

﴿ئاگاداری﴾: لێرەشدا –وەکو ماڵیدزراو– مەرجە: ئەبێ خاوەن ماڵەکە داوای ماڵەکەی بکا: کە هی ئەوە، ئینجا سزایان لێوەرئەگیرێ.

چوارەم: (فَإِنْ أَخافُواالسَّبِيلَ) ئەگەر ڕێگەیان خستبوە مەترسی (وَلَمْ يَأْخُذُوا مالاً) وە ماڵیان لە هیچ کەسێك نەستاندبو (وَلَمْ يَقْتُلُوا) وە هیچ کەسێکیان نەکوشتبو (حُبِسُوا) ئەبێ بخرێنە بەندیخانە (وَعُزِّرُوا) وە ئەبێ تەمبێ بکرێن بە لێدان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُالَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِيالأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ سزای ئەو کەسانەی جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوا ئەکەنو هەوڵی وێرانکاری ئەدەن، هەر ئەوەیە: بکوژرێن، یان لە سێدارە بدرێن، یان دەستو قاچیان لە ڕاستەو چەپە ببڕدرێن، یان بخرێنە بەندیخانە، ئەو سزایە سەر شۆڕییە بۆ ئەوان لە دونیادا، وە لە ڕۆژی دواییدا سزایەکیگەورە ئەدرێن، ئەگەر خوا حەز بکا.

(وَمَنْ تابَ مِنْهُمْ) هەر کەسێك لە ڕێگرەکان تۆبە بکا (قَبْلَ الْقُدْرَةِ عَلَيْهِ) پێش ئەوەی بکەوێتە ژێر دەستەڵاتی موسوڵمانان (سَقَطَ عَنْهُ الْحُدُودُ) ئەو کوشتنو دەست بڕینەی مافی خوایە لە سەری لائەچێ (وَأُخِذَ بِالْحُقُوقِ) بەڵام مافی ئادەمیزادانی لێوەرئەگیرێتەوە: وەکو کوشتنی لە تۆڵەی ئەو کەسانەی کوشتونیو دانەوەی ئەو ماڵەی بردویەتی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلاَّالَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بەڵام ئەوانەی تۆبە ئەکەن پێش ئەوەی دەستەڵاتتان بکەوێتە سەریان، بزانن خوا لە مافی خۆی خۆش ئەبێو ڕەحم ئەکا.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (صائل) زۆرداری هێرشکەر ﴾

(وَمَنْ قُصِدَ) هەر کەسێك ڕووی تێکرا (بِأَذىً) بۆ ئەوەی زیانێکی پێبگەیەندرێ (فِي نَفْسِهِ) جا زیانەکە لە گیانو ئەندامەکانی بێ، واتە: زۆردارەکە هەوڵی کوشتنی بدا، یان هەوڵی لەناوبردنی ئەندامێکی لەشی بدا (أَوْ مالِهِ) یان هەوڵی بردن، یان تێکدانی ماڵی بدا (أَوْ حَرِيمِهِ) یان هەوڵی ناموس بردنی بدا (فَقاتَلَ عَنْ ذَلِكَ) جا زۆرلێکراوەکەش بەرگری لە گیانو

وَقَتلَ فَلاَ ضَمانَ عَلَيْه. وَعَلَى راكِب الدَّابَة ضَمانُ ما أَتْلَفَتْهُ دَابَّتُهُ.

نـاموس‌و مـاڵی کـردبو، زۆرداره‌کـه‌ش وازی نـه‌هێناو (وَقَتَـلَ) زۆرلێکراوه‌کـه زۆرداره‌کـه‌ی کوشت (فَـلاَ ضَـمانَ عَلَيْـه) ئـه‌وه: نـه تۆڵه‌ی‌کوشـتن‌و نـه خـوێن‌و نـه کـه‌ففاره‌ت، هیچـی ناکه‌وێتـه سـه‌ر، وه ئه‌گـه‌ر زۆرداره‌کـه ئـه‌وی کوشـت، بۆخـۆی بـه پله‌ی‌شـه‌هیدی ئـه‌گا ﴿عَنْ سَعيد بن زَيْدﷺ: قالَ النَّبيُّﷺ: مَنْ قُتلَ دُونَ دينه فَهُوَ شَهيدٌ وَمَنْ قُتلَ دُونَ دَمه فَهُوَ شَهيدٌ وَمَنْ قُتلَ دُونَ مَاله فَهُوَ شَهيدٌ وَمَنْ قُتلَ دُونَ أَهْله فَهُوَ شَهيدٌ﴾ رواه‌الترمذي، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: هه‌ر که‌سێك له به‌رگری‌کردن: له ئایینی‌و له گیانی‌و له مـاڵی‌و لـه ناموسی بکوژرێ، شه‌هیده.

ئینجا بزانه: به‌رگری‌کردن له ناموس واجبه، هیچ جیاوازی نیه ناموسه‌که: هی خۆی بێ، یان هی که‌سێکی‌تر بێ، جا کافر بێ، یان موسوڵمان بێ، یان ئاژه‌ڵ بـێ، چـونکه نـاموس به هیچ شێوه‌یه‌ك حه‌ڵاڵ نابێ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئافره‌تێکی بێ‌مێرد-بـه خۆشـی‌خۆی- بـه دو پیاوێك که‌وت‌و خۆی لێ ماره کرد، دروست نیه هیچیان بکوژرێن.

﴿ئاگاداری﴾ یه‌کـه‌م: ده‌بی زۆرداری هێرشکه‌ر به شێوه‌ی هه‌ره سـوکتر رابگـیرێ، واتـه: ئه‌گه‌ر به پاڕانه‌وه واز بێنێ، نابێ لێی بدا، ئه‌گه‌ر به لێدان واز بێنێ، نابێ بیکوژێ، بـه‌ڵام ئه‌گه‌ر ئه‌یزانی ئه‌م قۆناغانه هیچیان سودی نیه، دروسته یه‌کسه‌ر بیکوژێ.

دووه‌م: له‌و کاتـه‌ی پشـیله هێـرش دێنـێ‌و جوجه‌ڵـه‌و باڵنـده ئـه‌خوا، دروسـته بکـوژرێ.

(وَعَلَى راكِبِ الدَّابَّة) واجبه له سه‌ر ئه‌و که‌سه‌ی سواری ووڵاغێك بووه، یـان لێی ئـه‌خوڕێ، یان ڕای‌ئه‌کێشێ (ضَمانُ ماأَتْلَفَتْهُ دَابَّتُهُ) ده‌بی تۆڵه‌ی ئه‌و شته بدا که ووڵاغه‌که‌ی لـه‌ناوی بردوه، جا ووڵاغه‌که هی‌خۆی بێ، یان هی که‌سێکی‌تر بێ، واته: ئه‌گه‌ر ووڵاغه‌که یـه‌کێکی کوشت، یـان ئه‌نـدامێکی شـکاند، یـان شـتێکی لـه‌ناو بـرد، ئـه‌بی خزمـه‌کانی وی خـوێنی کوژراوه‌که بده‌ن‌و، به خۆیشی تۆڵه‌ی شته له‌ناوبراوه‌کان بدا.

﴿ئاگاداری﴾: ئه‌گه‌ر ئاژه‌ڵه‌که‌ی به توندی به‌ستبۆوه‌و خۆی به‌ره‌ڵڵا کرد، یان شوانێك لـه ترسی گورگ، یان له ده‌نگی هه‌ور ئاژه‌ڵه‌کانی لێ‌په‌رت بون‌و شتێکیان له‌ناو برد، تۆڵـه‌یان له سه‌ر نیه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر شوانه‌که خه‌وی لێکه‌وت، یان که‌مته‌رخه‌می کرد، ئه‌بی تۆڵه بـدا، هه‌رچه‌ند ئاژه‌ڵه‌کانیش هی‌خۆی نه‌بن.

هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر له ڕێگه‌یه‌کی ته‌سکدا ووڵاغه‌کـه‌ی به‌سـتبۆوه‌و شـتێکی لـه‌ناو بـرد، ئـه‌بی تۆڵه‌ی بدا.

ئینجا بزانـه: ئه‌گه‌ر شوفێری ئۆتۆمۆبیل به ئۆتۆمۆبیله‌که‌ی که‌سێك به هه‌ڵه بکوژێ، یان شتێك له‌ناو ببا، ئه‌وه خوێنی‌کوژراوه‌که له سه‌ر خزمه‌کانیه‌تی‌و تۆڵه‌ی شته‌که‌ش له سـه‌ر خۆیه‌تی، جا ئۆتۆمۆبیله‌که هی‌خۆی بێ، یان نا.

(فَصْلٌ) وَيُقاتَلُ أَهْلُ الْبَغْيِ بِثَلاثَةِ شَرائِطَ: أَنْ يَكُونُوا فِي مَنَعَةٍ، وَأَنْ يَخْرُجُوا عَنْ قَبْضَةِ الإِمامِ، وَأَنْ يَكُونَ لَهُمْ تَأْوِيلٌ سائِغٌ،

---

هەروەها بزانە: ئەگەر ئاژەڵەکە بە تەنها بوو و چووە ناو موڵکی کەسێکیترو شینابیەکەی خوارد، تۆڵە لە سەر خاوەنەکەیە، بەو مەرجەی خەڵکی ئەو شوێنە بە تێکڕایی ئاژەڵ بەرەڵڵا نەکەن، واتە: ئەگەر عادەتیان وەهابو، تۆڵە واجب نابێ.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی (بُغاة) لە فەرمان دەرچووەکان ﴾**

کە ئەو جۆرە موسوڵمانەن ملکەچی شەریعەتی ئیسلامن، بەڵام لە فەرمانی پێشەوای موسوڵمانان دەر ئەچنو لە دژی وی چەك هەڵئەگرن.

(وَيُقاتَلُ أَهْلُ الْبَغْيِ) واجبە ئەو کەسانە جەنگیان لەگەڵ بکرێ کە لە فەرمانی پێشەوای موسوڵمانان دەرئەچن (بِثَلاثَةِ شَرائِطَ) بە سێ مەرج:

یەکەم: (أَنْ يَكُونُوا فِي مَنَعَةٍ) هێزو توانای جەنگکردنیان هەبێ بە جۆرێکی وەها: کە نەکونجێ بە ئاسانی بگیرێن. دووەم: (وَأَنْ يَخْرُجُوا عَنْ قَبْضَةِ الإِمامِ) لە ژێر دەستەڵاتی پێشەوای موسوڵمانان دەریچنو لە شوێنێك کۆ ببنەوە. سێیەم: (وَأَنْ يَكُونَ لَهُمْ تَأْوِيلٌ سائِغٌ) بەڵگەیەکی گونجاویان هەبێ بۆ ڕاپەڕینەکەیان، واتە: بە قورئانو حەدیس پشتگیری بەڵگەکەیان بکەن.

ئینجا بزانە: نابێ یەکەمجار پێشەوا دەست بە جەنگ بکا تا پیاوێکی لێهاتوو ئەنێرێتە لایان: ئایا ڕەخنەیان چیە؟ جا ئەگەر باسی ستەمکارییان کرد، ئەبی پێشەوا واز لە ستەمەکەی بێنێ، یان ئەگەر باسی گۆڕانکاری ئایینیان کرد، ئەبی گۆڕانکارییەکە لاببا، جا ئەگەر هیچ بەڵگەی گونجاویان نەبو و هەر سوور بون لە سەر سەرپێچی کردن، ئەبی بانگەوازی جەنگیان لەگەڵ بکا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللهِ﴾ ئەگەر دوو کۆمەڵ لە موسوڵمانان بووە جەنگیان ئاشتیان بکەنەوە، جا ئەگەر یەکێکیان هەر سوور بوو لە سەر دەستدرێژی کردنو لە سنوور دەرچوو، ئێوە جەنگی لەگەڵ بکەن تا ئەگەڕێتەوە ژێر فەرمانی خوا.

﴿ئاگاداری﴾: یەکەم: هەر کۆمەڵێك بۆ ڕاو و ڕووت دەست بداتە چەك، ئەوانە ڕێگرن، هەروەك باسمان کردن.

دووەم: هەر کۆمەڵێك بۆ چەسپاندنی حوکمی ئیسلام دەست بداتە چەك، ئەمانەش جەنگاوەری ئیسلامن–نەك (بُغاة)–هەروەك لە پەرتووکی(جِهاد)دا باسی ئەکەین.

سێیەم: هەر کۆمەڵێك دەست بداتە چەکو لە ئایین هەڵگەڕێتەوەو بڵێن حوکمی ئیسلاممان ناوێ چونکە بە کەڵك نایێ، ئەمانەش کافرن، هەروەك لەمەودوا باسی ئەکەین.

وَلاَ يُقْتَلُ أَسِيرُهُمْ، وَلاَ يُغْنَمُ مَالُهُمْ، وَلاَ يُذَفَّفُ عَلَى جَرِيحِهِمْ.
(فَصْلٌ) وَمَنْ ارْتَدَّ عَنِ الإِسْلاَمِ اُسْتُتِيبَ ثَلاَثًا، فَإِنْ تابَ، وَإِلاَّ قُتِلَ،

---

(وَلاَ يُقْتَلُ أَسِيرُهُمْ) ئینجا ئەگەر بووە جەنگ لەگەڵ لە فەرماندەرچووەکان نابێ دیلەکانیان بکوژرێن (وَلاَيُغْنَمُ مالُهُمْ) وە نابێ ماڵیشیان بە تاڵان ببردرێ (وَلاَ يُذَفَّفُ عَلَىجَرِيحِهِمْ)وە نابێ بریندارەکانیان بکوژرێن، وە نابێ بە دوای هەڵاتووەکانیاندا بگەڕێن، کەوابوو: هەر کاتێك جەنگ کۆتایی هاتو مەترسی نەما، یان گەڕانەوە ژێر فەرمانی پێشەوا، ئەبێ ماڵو چەکو دیلەکانیان بدرێنەوە، (البيهقي) وەهای لە ئیمامی(علي) گێڕاوەتەوە.
﴿ئاگاداری﴾: ئەبێ کوژراوەکانی هەردوو لا بشۆرێنو نوێژیان لە سەر بکرێ.
ئینجا بزانە: ئەگەر هەڵگەڕاوەکان زەکاتیان لە خەڵکی وەرئەگرتو سزای گوناهەکانیان ئەداو بڕیارەکانی شەرعی ئیسلامیان ئەچەسپاند، ئەوانە گشتی بە دروستو ڕەوا دائەندرێو نابێ هەڵبوەشێندرێتەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (رِدَّة): وەرگەڕان لە ئایین ﴾

(مُرْتَدّ): کەسێکە لە ئیسلامەتییەوە بگەڕێتەوە بۆ کافربوون.
جا بزانە: هەر کەسێك باوەڕی بە یەکێك لە شەش ڕوکنەکانی ئیمان نەبێ، یان باوەڕی بە واجیبوونی یەکێك لە ڕوکنەکانی ئیسلام نەبێ، یان جنێو بە خوا، یان بە پێغەمبەر بداﷺ، یان حەرامێك حەڵاڵ بکا، یان حەڵاڵێك حەرام بکا، یان بە کردەوە، یان بە زوبان کوفرێك بکا: جا ئەو کوفرە بە ڕقەکاری بێ، یان بە گاڵتە بێ، یان هەر بە بیروباوەڕەوە بێ: وەکو گاڵتە بە خوا، یان بە پێغەمبەرێکی خوا، یان بە ئیسلام بکا، یان سوجدە بۆ بوونەوەرێك ببا، یان قورئان فڕێبدا، یان تفی لێبکا، یان بڵێ: کافر لە موسوڵمانان باشترن، یان بڵێ: بەرنامەی قورئان بە کەڵك نایێ، یان بڵێ: سەحابەی پێغەمبەرﷺ گشتی ڕێکرو جەردە بون، یان بە بیروباوەڕەوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەدا بێ کە دژ بە ئیسلامن، یان بڵێ: خۆزگە من کافر بویام. بەو جۆرە شتانە لە ئیسلام دەرئەچێو کافر ئەبێ.
(وَمَنِ ارْتَدَّ عَنِ الإِسْلاَمِ) هەر کەسێك لە ئیسلامەتییەوە بۆ کافربوون گەڕابێتەوە (اُسْتُتِيبَ) واجبە داوای تۆبەی لێبکرێو پێی بڵێن: لەو کوفرە پەشیمان ببەوەو شادە بێنەوە (ثَلاَثًا) تا ماوەی سێ ڕۆژان، بەڵام بە فەرموودەی ڕاستتر: هەر ئەو دەم داوای تۆبەی لێئەکرێ نەك سێ ڕۆژان:
(فَإِنْ تابَ) جا ئەگەر تۆبەی کردو موسوڵمان بۆوەو شادەی هێناوە، واتە: گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّاللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله). ئەوە وازی لێئەهێندرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هەر سوور بوو لە سەر کافربوونەکەی (قُتِلَ) واجبە هەر ئەودەم بکوژرێ، جا پیاو بێ، یان ئافرەت، بەو مەرجەی شێت نەبێو منداڵ نەبێو زۆری لێنەکرابێ تاکو کوفر بکا

وَلَمْ يُغَسَّلْ، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْه، وَلَمْ يُدْفَنْ فِي مَقابِرِ الْمُسْلِمِينَ.

---

﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: أَنَّ امْرأَةً إرْتَدَّتْ فَأَمَرَالنَّبِيُّ ﷺ: أَنْ يُعْرَضَ عَلَيْهاالأِسْلامُ فإنْ تابَــتْ وَإلاَّ قُتِلَــتْ﴾ رواه‌الدارقطني، ئافرەتێك لـه ئیسلام گـەڕاوەو بووە كـافر، جـا پێغەمبـەر ﷺ فەرمانیدا: كەپێی بڵێن: بێتەوە ناو ئیسلام، ئەگەر نەبۆوە موسوڵمان، با بكوژرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر (مُرْتَدّ) جەنگی لەگەڵ موسوڵمانان كرد، پێویست ناكا داوای تۆبـەی لێبكرێ.

﴿ئاگــاداری﴾ یەكـەم: كوشـتنی(مُرْتَـدّ)، واتـە: ئـەو كەسـەی لـە ئیسـلام بـۆ كـافربوون ئەگەڕێتـەوە، لـە ئەسـتۆی كاربەدەسـتانە، كـەوابوو: ئەگـەر یـەكێكی‌تر بـە بێ‌پرسـی كاربەدەست كوشتی، تەنها ئەبی تەمبێ بكرێ، واتە: هیچ تۆڵەو (كَفّارة)ی ناكەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر (مُرْتَدّ) جەنگی لەگەڵ موسوڵمان ئەكرد، ئەوە بۆ گشت موسوڵمانێك دروستە بیكوژێ بە هەر شێوەیەكی بگونجێ.

دووەم: چەند زانایەك ئەم فـەموودەیان هەڵبژاردوە: كـە ئـەبی ئـەو كەسـە بكوژرێ كـە جنێوی بە پێغەمبەر ﷺ دابێ، جا تۆبە بكا، یان نا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَنَّ امْــرَأَةً كانَتْ تَشْتُمُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَتَلَها رَجُلٌ أَعْمَى فَأَهْدَرَالنَّبِيُّ ﷺ دَمَهَا﴾ رواه‌ابوداود، ئافرەتێك جنێوی بە پێغەمبـەر ﷺ ئـەدا، ئینجا پیـاوێكی‌كوێر ئافرەتەكـەی كوشـت، پێغەمبـەر ﷺ تۆڵەی نەخستە سەر.

(وَلَمْ يُغَسَّلْ) ئەو كەسەی كافر بووە-كاتێ مرد، یـان كـوژرا- شـۆردنی نـاوێ (وَلَـمْ يُصَـلِّ عَلَيْهِ) وە حەرامەو نابێ نوێژی لـە سـەر بكرێ (وَلَـمْ يُـدْفَنْ فِـي مَقابِرِالْمُسْـلِمِينَ) وە نابێ لە گۆڕستانی موسوڵماناندا بنێژرێ، هەروەها ماڵەكەیشـی نابێتـە مـیرات، بـەڵكو ئەدرێتـە (بيت المال)ی موسوڵمانان.

﴿ئاگاداری﴾: هەر كەسێك كوفرێك بكا، هـەر ئـەو دەم مـارەی ژنەكـەی هەڵئەوەشـێتەوە ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەكردبێ، بەڵام ئەگەر جیمـاعی لەگـەڵ كردبـو، تـا (عِدَّة)ی تـەواو ئەبێ چاوەڕوان ئەكرێ: جا ئەگەر نەبۆوە موسوڵمان، مارەیەكەی هەڵئەوەشێتەوە.

﴿پاشكۆ﴾: ئەگەر كۆمەڵێك كافر بـون، واجبـە موسـوڵمانان جـەنگیان لەگـەڵ بكـەن، تـا سەركردایەتی‌و بنكەكانیان بنەبڕ ئەكرێن، هـەروەك ئیمـامی(أبـوبكر)و سـەحابە ﷺ وایـان كردوە، جا ئەگەر بە خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵ‌و ژنەكانیان كەوتنە دەست موسـوڵمانان، ئـەوە بەم شێوەیە ڕەفتار ئەكرێ:

یەكەم: چونكە پێغەمبەر ﷺ ئەفـەرموێ: ﴿مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَــاقْتُلُوهُ﴾ رواه‌البخـاری، هـەر كەسێك ئایینی خۆی گۆڕی، بیكوژن. بۆیێ ژن‌و پیاوەكانیـان دلوای ئیسـلامبوونەوەیان لێئـەكرێ، جـا هــەر كەسـێكیان نەبێتــەوە موسـوڵمان، ئـەبی بكـوژرێ، بـەڵام ئەگـەر

(فَصْلٌ) وَتارِكُ الصَّلاةِ عَلَى ضَرْبَيْنِ، أحَدُهُما: أنْ يَتْرُكَهـا غَيْـرَ مُعْتَقِـدٍ لِوُجُوبِهـا، فَحُكْمُهُ حُكْمُ الْمُرْتَدِّ. وَالثّاني: أنْ يَتْرُكَها كَسَـلاً مُعْتَقِـداً لِوُجُوبِهـا، فَيُسْـتَتابُ، فَإنْ تابَ وَصَلّى، وَإلاّ قُتِلَ حَدّاً.

---

موسـولّمانيان كوشـتبون، دروسـتە لـە تۆلّـە بكـوژرێن، هەرچـەند موسـولّمانيش ببنـەوە.
دووەم: منداڵەكانی‌ئەوان-كە بلۆغيان نەبوە-بە موسولّمان دائەندرێن، واتە: وەكو دايكو باوكەكانيان كافر نابن، كەوابوو: ئەبی بە ڕەووشتی ئیسلام پـەروەردە بكـرێنو، ناكرێنـە كۆيلەو گشتيان ئازادن.
سێيەم: مڵكو ماڵەكەيان ڕائەگيرێو چاوەڕوان ئەكرێ: هەر كەسێك موسولّمان ببێتەوە، مڵكو ماڵەكەو چەكەكەی خۆی ئەدرێتەوە، جا ئەگەر موسولّمان نەبۆوەو مرد، يان كوژرا، گشتی ئەدرێتە (بيت المال).
﴿ئاگاداری﴾: پێكهاتنو جـەنگ وەسـتاندن لەگـەڵ (مُرْتَـدّ): كافربووەكـان دروسـت نيـە، بەڵام لەگەڵ كافری‌بنەڕەتی دروستە، هەروەك لە كۆتايی(جهاد)دا باسی ئەكەين.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی سزای نوێژنەكەر و، زەكات نەدەر ﴾

(وَتارِكُ الصَّلاةِ) نوێژنەكەر (عَلَى ضَرْبَيْنِ) دوو جۆرە: (أَحَدُهُما) جۆری‌يەكەم: (أَنْ يَتْرُكَهـا) ئەو كەسەيە: كە نوێژ ناكا (غَيْرَمُعْتَقِدٍ لِوُجُوبِها) چونكە باوەڕی نيە كە نوێژ واجبە (فَحُكْمُـهُ) سزای ئەو نوێژنەكـەرە (حُكْمُ الْمُرْتَـدِّ) وەكـو سزای‌كەسێكی‌كافربووە، واتـە: داوای تۆبـەی لێئەكرێ، جا ئەگەر تۆبەی نـەكرد، واجبـە بكـوژرێو نابـێ بشـۆرێو نابـێ نوێـژی لـە سـەر بكرێو نابێ لە گۆڕستانی‌موسولّماناندا بنێژرێو ماڵەكەشی ئەدرێتە (بيت المال).
(وَالثّانِي) جۆری‌دووەم: (أَنْ يَتْرُكَها كَسَلاً) ئەو كەسەيە لە بەر تەمبەڵی نوێژ نەكا (مُعْتَقِداً لِوُجُوبِها) بەڵام باوەڕی هەبێ كە نوێژ واجبە (فَيُسْتَتابُ) سوننەتە داوای تۆبـەی لێبكرێ (فَإنْ تابَ وَصَلّى) جا ئەگەر تۆبەی كردو نوێژی كرد، وازی لێدێنين (وَإلاّ) بەڵام ئەگەر هەر سوور بوو لە سەر نوێژنەكردن (قُتِلَ حَدّاً) ئەكوژرێ، جا كوشـتنەكەی بـە نـاوی سـزادانە، نەك بە ناوی كـافربوون ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَ اللهُ عَنْهُما: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقاتِلَ النّـاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَإلَهَ إلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ وَيُقِيمُواالصَّلاَةَ وَيُؤْتُواالزَّكاةَ، فَإذا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمائَهُمْ وَأَمْوالَهُمْ إلاَّ بِحَقِّ الإسْلامِ وَحِسابُهُمْ عَلَى اللهِ تَعالَى﴾ رواه‌الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: فەرمانم پێكراوە: لەگەڵ خـەڵكی جـەنگ بكـەم تـا شادە ئەهێننو نوێژ ئەكەنو زەكات ئەدەن، جا كە ئەمانەيان كـردن، خـوێنو ماڵيـان لـە من ئەپارێزن تەنها بە مافێكی ئيسلام نەبێ، لێكۆڵينەوەی ناو دڵيشيان لە سەر خوايە لـە ڕۆژی قيامەت.

وَكَـــــانَ حُكْمُـــــــهُ حُكْـــــــمَ الْمُسْـــــــلِمِينَ.

## (كِــتابُ الْجِــهادِ)

(وكَـانَ حُكْمُـهُ) بڕيـارى شـەرع دەربـارەى ئـەو نوێژنەكـەرە (حُكْـمَ المُسْـلِمِينَ) وەكـو موسـوڵمانانە، واتـە: واجبـە بشـۆرێو كفن بكـرێو نوێـژى لـە سـەر بكـرێو دروسـتە لـە گۆڕستانى موسوڵمانان‌دا بنێژرێ وەكو تاوانبارەكانىتر.

﴿پاشكۆ﴾: ئەو حەديسە بەڵگەيە: ئەگەر كۆمەڵێك ڕێك بكەون لـە سـەر نـەكردنى واجبێكـى ئيسلام، واجبە: جەنگيان لەگەڵ بكرێ تا تۆبە ئەكەن:

بۆ وێنـە: ئەگەر كۆمەڵێك ڕێك بكەون لە سەر نوێژنەكردن، يان (جُمْعَة)نەكردن، يان زەكـات نەدان...هتد، ئەبێ جەنگيان لەگەڵ بكـرێ تـا تۆبـە ئەكـەن، هـەروەك ئيمـامى(أبـوبكر)ﷺ جـەنگى لەگـەڵ زەكاتنـەدەرەكان كـرد، ئينجـا بزانـە: ئـەو سـزايانەش ئـەبێ بـە فـەرمانى پێشەواى موسوڵمانان جێبەجێ بكرێن، يان جێگرێكى پێشەوا.

ديسان بزانە: هەر كەسێك تاوانو زيـانى زۆر بـێ، يـان زۆر بێناموسـى بكـا، يـان خـەڵك بخاتە مەترسى، واجبە بخرێتە بەنديخانە تا مردن.

هەروەها بزانە: هەر كاتێك هەواڵى تاوانێـك گەيشـتە لاى كاربەدەسـت، حەرامـە تكـاى بـۆ بكرێ، واتە: هەر كەسێك تكا بۆ تاوانبارێك بكا: تاكو سزا نـەدرێ، تـاوانێكى گـەورەى لـە سەر ئەنووسرێ ﴿عَنْ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ حالَتْ شَفاعَتُهُ دُونَ حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ فَقَدْ ضادَّ اللهَ في أَمْرِهِ﴾ رواه ابوداود، پێغەمبەرﷺ فەرمووى: هەر كەسێك هەوڵ بدا سزاىخودا لەسەر تاوانبارێك جێبەجێ نـەكرێ، بێگومـان ئـەو كەسـە دژايـەتى خـواى كردوە لە فەرمانەكەىدا.

* * *

## ﴿ كِتابُ الْجِهادِ: ئەم پەڕتووكە باسى (جِهاد) ئەكا ﴾

واتـە: خـەباتو تێكۆشـان بـە گيـانو بـە مـاڵو بـە زمـان بـۆ بەرزكردنـەوەى ئيسـلام: بـە چەسـپاندنى بڕيارەكـانى خـواو پێغەمبـەرﷺو نەهێشـتنى دەسـتەڵاتى (كُفْـر).

﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: جاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِـنَتِكُمْ﴾ رواه أحمد، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووى: لەگـەڵ كافرەكـان بجـەنگن بـە ماڵتـانو بـە گيانتـانو بـە زمانتان. كەوابوو: تێكۆشانى چەكدارانە-كە پێى ئەگوترێ: (غەزا)-بەشێكە لـە (جِهـاد)و لە دوو بەشەكەىتر خێرى زياترە، چونكە گيانى خۆى ئەفرۆشێتە خواى گەورە.

ئينجا بزانە: (جِهاد) بە چوار قۆناغ پێگەيشتوە:

يەكەم: بانگەوازى نهێنى بە بێجەنگكردن، ئەم قۆناغـە بـە هـاتنى سـوڕەتى ﴿يَاأَيُّهَـــا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ﴾ دەستى پێكردو تا ماوەى سێ ساڵى خاياند.

دووەم: بانگەوازیی ئاشکرا بە بێجەنگکردن، ئەم قۆناغە بە هاتنی ئایەتی ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ﴾ دەستی پێکردو تا کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ بەردەوام بوو.
ئینجا بزانە: ئەو دوو قۆناغانە، پێیان ئەگوترێ: (مَكّي).
سێیەم: بانگەوازیی ئاشکرا شان بەشانی جەنگکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان ئەکەن‌و دەستدرێژی ئەکەنە سەر ئیسلام، ئەم قۆناغە لە دوای کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ دەستی پێکرد: بە هاتنی ئایەتی ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾ لە ڕێگای خوا جەنگ لەگەڵ ئەو کەسانە بکەن کە جەنگتان لەگەڵ ئەکەن. ئەم قۆناغەش تا ڕزگارکردنی(مَكّة) بەردەوام بوو.
چوارەم: دوا قۆناغ، کە خوا فەرمانیدا: هەر کەسێك باوەڕی بە خوا نیەو هەر کەسێك ببێتە کۆسپ لە ڕێگای بانگەوازیی ئیسلام، ئەبێ جەنگی لەگەڵ بکرێ، ئەم قۆناغە لە دوای ڕزگارکردنی(مَكّة) دەستی پێکرد: بە هاتنی (آيَةُالسَّيْف)- ئایەتی شمشێر، کە خوا فەرمووی: ﴿وَقَاتِلُواالْمُشْرِكِينَ كَافَّةً﴾ جەنگ لەگەڵ کافرەکان بکەن بە گشتی. هەروەها فەرمووی: ﴿إِنْفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالاً وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾ ڕاپەڕن بە سوکی‌و بە گرانی، بە ماڵتان‌و بە گیانتان لە ڕێگای خوا (جِهاد) بکەن.
ئینجا لەم قۆناغەی چوارەمدا (جِهاد) جێگیر بوو، تا ڕۆژی قیامەت نابێ هیچ گۆڕانێکی بێتە سەر ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلْجِهادُ ماضٍ مُنْذُ بَعَثَنِي اللهُ إِلَى أَنْ يُقاتِلَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةِ اَلدَّجَّالَ لاَيُبْطِلُهُ جَوْرُ جائِرٍ وَلاَ عَدْلُ عادِلٍ﴾ رواهابوداود، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (جِهاد) هەر لە کاردایە لەو ڕۆژەوە کە خودا منی ناردوە بە پێغەمبەر، تا کۆتایی ئوممەتی من جەنگ لەگەڵ (دَجّال) ئەکا، ئەو (جِهاد)ە ستەمی هیچ ستەمکارێك‌و دادپەروەریی هیچ دادپەروەرێك هەڵیناوەشێنێتەوە.
ئینجا بزانە: واجیبوونی غەزا ئەکرێتە دوو بەش: یەکەم: (فَرْضُ الْكِفايَة)، لەو کاتەی کافرەکان لە وڵاتی خۆیان بن‌و دەستەڵاتیان بە سەر وڵاتی ئیسلامدا نەبێ، کەواتە: ساڵێ یەك جار واجبەو زیاتر سوننەتە: کە کۆمەڵێکی موسوڵمانان بەرەنگاری کافرەکان ببن‌و لەگەڵیان بجەنگێن، جا ئەگەر ئەو کۆمەڵە بەروەستی تەواوی پێکرا، ئەوە خێرەکە بۆ خۆیانەو گوناهەکەش لە سەر موسوڵمانانیتر لائەچێ، ئەگەر نا: واجبە هێزیان بۆ زیاد بکرێ.
دووەم: (فَرْضُ الْعَيْن)، واتە: لە سەر گشت کەسێك واجبە ڕاپەڕێ بۆ (جِهاد)کردن، ئەمەش لەو کاتەی کافرەکان بێنە ناو وڵاتی‌ئیسلام، یان کاربەدەستانی ئیسلام حوکم بە قورئان نەکەن؟ هەروەك ئیمامی (النواوي) ئەفەرموێ: قازی (عیاض) فەرموویەتی:

وَشَرائِطُ وُجُوبِ الْجِهادِ سَبْعُ خِصالٍ: اَلإِسْــلاَمُ، وَالْبُلُــوغُ، وَالْعَقْــلُ، وَالْحُرِّيَّــةُ، وَالذُّكُورِيَّةُ، وَالصِّحَّةُ، وَالطَّاقَةُ عَلَى الْقِتالِ.

---

(زانایانی ئایینی ئیسلام یەکدەنگن: کە نابێ کافر ببێتە گەورەی موسوڵمانان، وە ئەگەر گەورەی موسوڵمانان گەڕاوەو بووە کافر، یان نوێژی نەئەکردو فەرمانی بە نوێژکردن نەئەکرد، وە هەروەها ئەگەر گۆڕانکاری‌ی هێنا سەر شەریعەتی‌ئیسلام، یان (بِدْعَة)ی بڵاو ئەکردەوە، ئەوە لە فەرمانڕەوایی لائەچێ‌و واجبە موسوڵمانان لە دژی ڕاپەڕن‌و پێشەوایەکی دادپەروەر لە شوێنی‌ئەو دابنێن ئەگەر بگونجێ، ئەگەر نەگونجا، واجبە: موسوڵمان بۆ خۆی لەو شوێنە کۆچ بکا بۆ شوێنێکی‌باشتر). بڕوانە (شرح صحيح مسلم).

﴿قالَ النَّبِيُّ ﷺ: ما تَرَكَ قَوْمٌ اَلْجِهادَ إِلاَّ عَمَّهُمُ اللهُ بِعَذابٍ﴾ رواه‌الطبراني في‌الأوسط، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر گەلێك واز لە (جِهاد) بێنێ، خوای گەورە بە تێکڕایی سزایان ئەداو سەرشۆڕو ژێردەستیان ئەکا.

(وَشَرائِطُ وَجُوبِ الْجِهادِ) مەرجەکانی واجببوونی غەزا، واتە: (جِهاد)ی چەکدارانە (سَبْعُ خِصالٍ) حەفت مەرجن:

یەکەم: (اَلإِسْــلاَمُ) ئیسلامەتی‌یە، واتە: کافر داوای (جِهاد)ی لێ‌ناکرێ. دووەم: (وَالْبُلُوغُ) بلاوغبوونە. سێیەم: (وَالْعَقْلُ) ژیری‌یە، واتە: غەزا لە سەر منداڵ‌و شێت واجب نیە. چوارەم: (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازاد بێ. پێنجەم: (وَالذُّكُورِيَّةُ) پیاو بێ. شەشەم: (وَالصِّحَّةُ) تەندروستی‌ی باش بێ. حەفتەم: (وَالطَّاقَةُ عَلَى‌الْقِتالِ) توانای جەنگکردنی هەبێ: بە گیان‌و بە ماڵ.

کەواتە: غەزا واجب نیە لە سەر کۆیلەو ئافرەت‌و نەخۆش‌و شەلەو بێ‌دەست‌و بێ‌چەك‌و بێ‌خواردەمەنی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلاَ عَلَى‌الْمَرْضى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَيَجِدُونَ مَايُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَانَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ ئەو کەسانە گوناهی غەزا نەکردنیان لە سەر نیە کە بێ‌هێزن: وەکو منداڵ‌و ئافرەت، یان نەخۆشن، یان ئەرکی جەنگیان دەست ناکەوێ: وەکو چەك‌و خواردن، بەو مەرجەی ئامۆژگاری بکەن بۆ ڕێگای خواو پێغەمبەر ﷺ.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کەسێك توانای (جِهاد)ی نەبێ، واجبە بە دڵ نیازی (جِهاد)کردنی هەبێ ﴿عَنْ أَبِي‌هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ ماتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِهِ مــاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفاقٍ﴾ رواه‌مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك مردبێ‌و غەزای نەکردبێ‌و بە دڵیش نیازی (جِهاد)ی نەبوبێ، ئەوە بە بەشێکی نیفاقەوە ئەمرێ.

## ﴿ باسی ڕۆیشتن بۆ غەزا ﴾

یەکەم: لەو کاتەی (جهاد) (فَرْضُ الْكِفايَةِ)یە، حەڕامە قەرزدار بە بێئیزنی خاوەن قەرزەکەی بڕواتە(جهاد)، بەو مەرجەی قەرزەکە کاتی دانەوەی هاتبێ ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْروٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلاَّ الدَّيْنَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە لە گشت گوناهەکانی شەهید خۆش ئەبێ جگە لە قەرزداری.

هەروەها حەڕامە (جهاد)کردن بە بێئیزنی دایکو باوك بەو مەرجەی موسوڵمان بن ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ :جاءَ رَجُلٌ لِيُجاهِدَ، فَقالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: إِرْجِعْ إِلَى والِدَيْكَ فَإِنْ أَذِنَا لَكَ فَجاهِدْ وَإِلاَّ فَبِرَّهُما﴾ رواه أحمد وابوداود، پیاوێك هات بچێتە غەزا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆوە لای دایكو باوکت، ئەگەر ئیزنیان دای غەزا بکە، ئەگەر نا: خزمەتیان بکە.

دووەم: لەو کاتەی غەزا (فَرْضُ الْعَيْنِ) بێ، پرسی دایكو باوكو خاوەن قەرزی ناوێ.

سێیەم: هەر کاتێك جەنگ دەستی پێکرد، هەڵاتنو وازهێنان لە جەنگ حەڕامە، بەو مەرجەی دوژمنەکەیان بە ژمارەیەکی وەها لە دوو هەندی خۆیان زیاتر نەبێ: کە بەرەوەستی نەکەن، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللهِ وَمَأْواهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ هەر کەسێك لەو ڕۆژەی جەنگ دەست پێئەکا، پشت بداو لە شوێنیخۆی لاچێ -مەبەستیشی فێڵبازی جەنگ، یان یارمەتیی کۆمەڵێکیتر نەبێ- ئەوە خوا غەزەبی لێئەگرێو جێگەی دۆزەخە.

چوارەم: دروستە ئافرەتانو منداڵان بە ئیزنی مێردو دایكو باوکیان بچن بۆ غەزا.

پێنجەم: (رِباط)، واتە: (خۆ ئامادەکردن بۆ غەزاو مەشق کردنو پاسەوانیو مانەوە لە بارەگای سەربازانی ئیسلام)، بەشێکە لە (جهاد)و خێری زۆرە ﴿عَنْ سَلْمانَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: رِباطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيامِ شَهْرٍ وَقِيامِهِ وَإِنْ ماتَ فِيهِ أُجْرِيَ عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كانَ يَعْمَلُ وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ وَأَمِنَ الْفُتَّانَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئامادەبوونی شەو و ڕۆژێك لە بارەگایەکی سەربازانی ئیسلام، خێری زیاترە لە بەڕۆژووبوونی مانگێكو شەونوێژی مانگێك، ئەگەر لە کاتی ئەو مانەوەیەدا بمرێ، خێری ئەو کردەوە باشانەی ئەیکردن هەر بۆی ئەچێو خواردەمەنیەکەشی هەر ئەدرێتێو لە پرسیاری هەردوو فریشتەکانی ناو قەبر ئەمین ئەبێ.

## ﴿ باسی دیلی کافرەکان ﴾

(وَمَنْ أُسِرَ مِنَ الْكُفَّارِ) هەر کەسێك لە کافرەکان بە دیل گیرا (فَعَلَى ضَرْبَيْنِ) ئەکرێتە دوو بەش: (ضَرْبٌ يَكُونُ رَقِيقاً) بەشی یەکەمیان: ئەبنە کۆیلە (بِنَفْسِ السَّبْيِ) تەنها بەوەندەی

وَهُمُ الصِّبْيانُ وَالنِّساءُ، وَضَرْبٌ لاَ يَرِقُّ بِنَفْسِ السَّبْيِ وَهُمُ الرِّجالُ الْبالِغُونَ، وَالإِمامُ مُخَيَّرٌ فِيهِمْ بَيْنَ أَرْبَعَةِ أَشْياءَ: اَلْقَتْلِ، وَالإِسْتِرْقاقِ، وَالْمَنِّ، وَالْفِدْيَةِ بِالْمالِ أَوْ بِالرِّجالِ، يَفْعَلُ مِنْ ذَلِكَ مَافِيهِ الْمَصْلَحَةُ. وَمَنْ أَسْلَمَ قَبْلَ الأَسْرِ أَحْرَزَ مالَهُ، وَدَمَهُ، وَصِغارَ أَوْلاَدِهِ.

---

بە دیل گیراون (وَهُمُ) ئەو بەشەیان: (اَلصِّبْيانُ) منداڵی کافرەکانن (وَالنِّساءُ) هەروەها ژنەکانیانن، وە هیچ جیاوازی نیە: لە نێوان جولەکەو دیانو بت پەرستەکان ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهما قالَ: حارَبَتْ قُرَيْظَةُ فَقُتِلَ رِجالُهُمْ وَقُسِّمَ نِساؤُهُمْ وَأَوْلادُهُمْ وَأَمْوالُهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ رواه‌البخاري، (بَنُوقُرَيْظَة) جەنگیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کرد، جا لە بەر ئەوە، پیاوەکانیان کوژرانو منداڵو ئافرەتو ماڵیان دابەشکرا بە سەر موسوڵماناندا.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو حەدیسەش بەڵگەیە: کە حەرامە ئافرەتو منداڵی کافران بکوژرێن.

(وَضَرْبٌ لاَ يَرِقُّ) وە بەشیدووەمی‌دیلەکان نابنە کۆیلە (بِنَفْسِ السَّبْيِ) بە تەنها دیل بوون: (وَهُمُ الرِّجالُ الْبالِغُونَ) ئەو بەشەیان ئەو جۆرە پیاوانەن کە بلۆغیان بووەو ئازادن (وَالإِمامُ) سەرکردەی موسوڵمانان (مُخَيَّرٌ فِيهِمْ) دەربارەی ئەوان سەرپشکە (بَيْنَ أَرْبَعَةِ أَشْياءَ) لە نێوان چوار کار:

(اَلْقَتْلِ) ئەگەر حەز بکا با بیانکوژێ، بەڵگەش حەدیسەکەی‌رابردووە، بەڵام ئەگەر بونە موسوڵمان دروست نیە بکوژرێن. (وَالإِسْتِرْقاقِ) یان ئەگەر حەز ئەکا با بیانکاتە کۆیلە، وەکو منداڵو ئافرەتەکان. (وَالْمَنِّ) یان ئەگەر حەز بکا دروستە بە خۆڕایی ئازادیان بکا بە بێ هیچ داواکاری‌یەك. (وَالْفِدْيَةِ) یان ئەگەر حەز ئەکا با بیانفرۆشێتەوە خۆیان (بِالْمالِ) واتە: لە بەرانبەر وەرگرتنی شتێك بەرەڵلایان بکا (أَوْ بِالرِّجالِ) یان بیانگۆڕێتەوە بە دیلی موسوڵمانان. (يَفْعَلُ مِنْ ذَلِكَ) سەرکردەکە یەکێك لەو چوارانە ئەکا (مَافِيهِ الْمَصْلَحَةُ) کامەیان بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدا بێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾ کافرەکان پەلبەست بکەن، ئینجا یان بە خۆڕایی ئازادیان بکەن، یان بیانگۆڕنەوە: بە ماڵ، یان بە دیل.

﴿ئاگاداری﴾: ئەمەی باسمان کرد، دەربارەی دیلەکانی‌کافری بنەڕەتی بوو، چونکە ئەو موسوڵمانانەی بونەتە کافر، دیلی ئەوان جیایە هەروەك لە باسی کافربووندا رابرا، هەروەها ئەو موسوڵمانانەی–بۆ دژایەتی ئیسلام– ئەبنە نۆکەری‌کافرەکان، یان لەگەڵ پێشەوای‌موسوڵمانان جەنگ ئەکەن، دیلی‌ئەوانیش جیایە، واتە: لەدوای کۆتایی‌جەنگ ئەبی خۆیانو ژنو منداڵیان ئازاد بکرێن.

(وَمَنْ أَسْلَمَ) هەر کافرێك موسوڵمان ببێ (قَبْلَ الأَسْرِ) پێش ئەوەی بە دیل بگیرێ (أَحْرَزَ مالَهُ) ماڵەکەی خۆی ئەپارێزێ لە تاڵانکردن (وَدَمَهُ) وە خوێنەکەی‌خۆیشی ئەپارێزێ، واتە: لە کوشتن رزگاری ئەبێ (وَصِغارَ أَوْلاَدِهِ) وە منداڵە بچووکەکانیشی ئەپارێزێو

وَيُحْكَمُ لِلصَّبِيِّ بِالْإِسْلَامِ عِنْدَ وُجُودِ ثَلَاثَةِ أَسْبَابٍ: أَنْ يُسْلِمَ أَحَدُ أَبَوَيْهِ، أَوْ يَسْبِيَهُ مُسْلِمٌ مُنْفَرِداً عَنْ أَبَوَيْهِ، أَوْ يُوجَدَ لَقِيطاً فِي دَارِ الْإِسْلَامِ.

---

ناكرێنە كۆیلە ﴿عَنْ صَخْرٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ الْقَوْمَ إِذَا أَسْلَمُوا أَحْرَزُوا دِمَائَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ﴾ رواەابوداود، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كاتێك كافرەكان موسوڵمان بن، خوێنو ماڵیان ئەپارێزن.

كەوابوو: منداڵە گەورەكانیو ژنەكەی بە ئیسلامبوونی وی ناپارێزرێن، واتە: ئەگەر پێش دیلكردن ئیسلام نەبن، ئەكرێنە كۆیلەو مارەبڕینەكەی هەڵئەوەشێتەوە، بەڵام لە فەرموودەیەكی بێهێزدا هاتوە: ژنەكەشی ئەپارێزێ، واتە: ئەیدرێتەوە.

## ﴿ باسی ئیسلامەتی منداڵ ﴾

بزانە: ئەگەر منداڵ كافر ببێ، بڕیاری كوفری لە سەر نادرێ، هەروەها ئەگەر منداڵی كافرانیش موسوڵمان ببێ، بڕیاری ئیسلامەتیی بۆ نادرێ، بەڵام ئیمامی(حنفی) ئەفەرموێ: ئەگەر ئەیزانی ئیسلام چیە؟ ئەوە بڕیاری ئیسلامەتیی بۆ ئەدرێ.

(وَيُحْكَمُ لِلصَّبِيِّ) بڕیار بۆ منداڵ ئەدرێ (بِالْإِسْلَامِ) بە موسوڵمانبوون (عِنْدَ وَجُودِ ثَلَاثَةِ أَسْبَابٍ) ئەگەر یەكێك لەو سێ هۆیانە هاتەجێ:

یەكەم: (أَنْ يُسْلِمَ أَحَدُ أَبَوَيْهِ) ئەگەر یەكێك لە دایكو باوكەكانی خۆی، یان داپیرەو باپیرەكانی موسوڵمان بێ، ئەویش بە موسوڵمان دائەندرێ، كەوابوو: ئەگەر تەنها دایكی، یان تەنها باوكی موسوڵمان بێ، منداڵەكەش موسوڵمانە.

هەروەها ئەگەر دایكیو باوكیی هەردووكیان كافر بن، بەڵام باپیرەیەكی، یان داپیرەیەكی موسوڵمان بێ، ئەویش هەر بە موسوڵمان دائەندرێ.

دووەم: (أَوْ يَسْبِيَهُ مُسْلِمٌ) یان موسوڵمانێك بە دیل بیگرێ (مُنْفَرِداً عَنْ أَبَوَيْهِ) لەو كاتەی لە دایكو باوكی خۆی جیا بوبێتەوە، واتە: ئەو منداڵەش وەكو ئەو موسوڵمانە بە موسوڵمان دائەندرێ.

سێیەم: (أَوْ يُوجَدَ لَقِيطاً) یان منداڵەكە فڕێدرابێو هەڵبگیرێتەوە (فِي دَارِ الْإِسْلَامِ) لە خانەی ئیسلامدا، واتە: ئەو منداڵەش هەر بە ئیسلام دائەندرێ.

## ﴿ پێناسەی (دَارُ الْإِسْلَامِ) و (دَارُ الْكُفْرِ) ﴾

یەكەم: مەبەست بە (دَارُ الْإِسْلَامِ)، واتە: خانەی ئیسلام، ئەو شوێنەیە: كەوتبێتە ژێر دەستەڵاتی ئیسلام، جا دانیشتووەكانی موسوڵمان بوبن، یان هەر لە سەر ئایینی خۆیان مابنەوەو سەرانە بدەن. جا ئەگەر دووبارە كافرەكان داگیری بكەنەوە، ناوی (دَارُ الْإِسْلَامِ)ی لە سەر لاناچێ، كەوابوو: (ئەندەلوس)و (فەلەستین) بە (دَارُ الْإِسْلَامِ)ی داگیركراو ئەناسرێنو ڕزگاركردنیان واجبە.

(فَصْلٌ) وَمَنْ قَتَلَ قَتِيلاً أُعْطِيَ سَلَبَهُ، وَتُقَسَّمُ الْغَنِيمَةُ بَعْدَ ذَلِكَ عَلَى خَمْسَةِ أَخْماسٍ: فَيُعْطَى أَرْبَعَةُ أَخْماسِها لِمَنْ شَهِدَ الْوَقْعَةَ، وَيُعْطَى لِلْفارِسِ ثَلاثَةُ أَسْهُمٍ، وَلِلرَّاجِلِ سَهْمٌ،

---

دووهم: (دارُالحَرْب)، یان (دارُالكُفر)، واته: خانەی جەنگ، ئەو شوێنەیە: كە نەكەوتبێتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلام، جا ئەگەر دانیشتووەكانی لە جەنگدا بن، پێیان ئەگوترێ: (حَرْبِيٌّ)، واتە: كافری جەنگی، وە ئەگەر لە پەیمانی جەنگ وەستاندا بن، پێیان ئەگوترێ: (مُعاهَدْ) پەیمان لەگەڵكراو، هەروەك لە مەودوا باسی ئەكەین.

﴿پاشكۆ﴾: منداڵیكافرەكان كە لە پێش بلۆغبوون ئەمرن، وەكو كافرەكانی گەورە رەفتاریان لەگەڵ ئەكرێ لە دونیادا، بەڵام لە قیامەت، فەرموودەی راستتر ئەمەیە: كە ئەو منداڵانە ئەچنە بەهەشت، والله أعلم.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (غَنيمَة) تاڵان گرتنی كافران ﴾

(پێشەكی): بزانە: مەبەست بەو تاڵانە: مڵكو ماڵی كافری بنەڕەتی‌یە كە لە كاتی جەنگكردن لێیان ئەگیرێ. چونكە گوتمان: مڵكو ماڵی ئەو موسوڵمانانەی كافربوونە، ئەدرێتە (بیت المال)، هەروەها مڵكو ماڵی رێگرانو ئەو موسوڵمانانەی تۆكەری كافرەكانن، لە دوای كۆتایی جەنگ ئەدرێتەوە دەستی‌خۆیان، ئەگەر هی خۆیان بوو، بەڵام ئەگەر هی (بیت المال) بوو، ئەوە هەر لە (بیت المال) دائەندرێتەوە، واتە: بە سەر جەنگاوەراندا بەش ناكرێ.

(وَمَنْ قَتَلَ قَتِيلاً) هەر كەسێك لە مەیدانی جەنگ كافرێك بكوژێ (أُعْطِيَ سَلَبَهُ) كەلوپەلی ئەو كوژراوەی ئەدرێتێ: وەكو چەكو خواردەمەنیو پارەو وڵاغی سواریو جلو بەرگ ﴿عَنْ أَبِي قَتادَةَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ﴾ رواه‌الشیخان، واتەی دیارە. بەڵام ئەگەر لە مەیدانی جەنگ نەیكوژێ: وەك لە دوورەوە گوللەی بۆ بهاوێو بیكوژێ، ئەوە كەلوپەلی نادرێتێ، بەڵكو ئەبێتە تاڵان.

(وَتُقَسَّمُ الْغَنِيمَةُ) تاڵان بەش ئەكرێ (بَعْدَ ذَلِكَ) لە دوای دەركردنی كەلوپەلی‌كوژراوەكە (عَلَى خَمْسَةِ أَخْماسٍ) ئەكرێتە پێنج بەش: (فَيُعْطَى أَرْبَعَةُ أَخْماسِها) چوار بەشی ئەو تاڵانە بە تایبەتی ئەدرێتە (لِمَنْ شَهِدَ الْوَقْعَةَ) ئەو كەسانەی لە جەنگەكەدا ئامادە بونە–بە مەبەستی جەنگكردن– هەرچەند جەنگیشیان نەكردبێ (وَيُعْطَى لِلْفارِسِ) جا ئەدرێتە ئەو كەسەی بە سواری ئەسپ هاتۆتە جەنگ (ثَلاثَةُ أَسْهُمٍ) سێ بەشی ئەدرێتێ: بەشێكی بۆ خۆی، دوو بەشی بۆ ئەسپەكەی (وَلِلرَّاجِلِ سَهْمٌ) ئەو كەسەی بە پیادە هاتۆتە جەنگ، یەك بەشی ئەدرێتێ ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَسَمَ يَوْمَ خَيْبَرَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ وَلِلرَّاجِلِ سَهْماً﴾ رواه‌الشیخان، لە جەنگی خەیبەردا، پێغەمبەر ﷺ دوو بەشی ئەدا ئەسپ، یەك بەشی ئەدا پیادە.

وَلاَ يُسْهَمُ إلاَّ لِمَنْ اسْتَكْمَلَتْ فِيهِ خَمْسَةُ شَرائِطَ: الإسْلاَمُ، وَالْبُلُوغُ، وَالْعَقْلُ، وَالْحُرِّيَّةُ، وَالذُّكُورِيَّةُ. فَإِنْ اخْتَلَّ شَرْطٌ مِنْ ذَلِكَ رُضِخَ لَهُ وَلَمْ يُسْهَمْ، وَيُقْسَمُ الْخُمُسُ عَلَى خَمْسَةِ أَسْهُمٍ: سَهْمٌ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ يُصْرَفُ بَعْدَهُ لِلْمَصَالِحِ، وَسَهْمٌ لِذَوِي الْقُرْبَى وَهُمْ بَنُوهاشِمْ وَبَنُوالْمُطَّلِبِ، وَسَهْمٌ لِلْيَتَامَى، وَسَهْمٌ لِلْمَسَاكِينِ، وَسَهْمٌ لأَبْناءِ السَّبِيلِ.

---

(وَلاَ يُسْهَمُ) ئەو بەشە داناندرێ (إلاَّ لِمَنْ) تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێ کە(اسْتَكْمَلَتْ فِيهِ) تێیدا کۆ ببێتەوە (خَمْسَةُ شَرائِطَ) پێنج مەرج: (الإسْلاَمُ) موسوڵمان بێ. (وَالْبُلُوغُ) بلۆغی بوبێ. (وَالْعَقْلُ) عەقڵی هەبێ. (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازاد بێ. (وَالذُّكُورِيَّةُ) نێرینە بێ.

(فَإِنْ اخْتَلَّ شَرْطٌ مِنْ ذَلِكَ) جا ئەگەر مەرجێك لەو پێنجانە نەبو، واتە: جەنگاوەرەکە کافر بوو و یارمەتی موسوڵمانانی ئەدا، یان منداڵ بوو، یان شێت بوو، یان کۆیلە بوو، یان ئافرەت بوو (رُضِخَ لَهُ) ئەوە بەخشیشیان ئەدرێتێ (وَلَمْ يُسْهَمْ) بەشیان نادرێتێ، کەواتە: ئەبێ بەخشیشەکە لە بەشێك کەمتر بێ ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: كانَتِ النِّساءُ يُحْذَيْنَ مِنَ الْغَنِيمَةِ، وَأَمَّا بِسَهْمٍ فَلاَ﴾ رواەمسلم، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ شتێك لە تالآن ئەدرا ئافرەتان کەمتر لە بەشی پیاوان.

(وَيُقْسَمُ الْخُمُسُ) بەشی پێنجەم لە پێنج بەشەکەی تالآن دابەش ئەکرێ (عَلَى خَمْسَةِ أَسْهُمٍ) بە سەر پێنج بەشیتردا: (سَهْمٌ) بەشێکی ئەو پێنج بەشە، واتە: پێنجێکی پێنجێك (لِرَسُولِ اللهِ ﷺ) بۆ پێغەمبەری خوایە ﷺ (يُصْرَفُ بَعْدَهُ) ئەو بەشەی پێغەمبەر ﷺ سەرف ئەکرێ لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ (لِلْمَصَالِحِ) بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان: وەکو قوتابخانەو مووچەی زانایانو چاکو ئاژووقەی سەربازانی ئیسلامو نەخۆشخانەو ڕێگەو مزگەوتو ئەو جۆرە شتانە. (وَسَهْمٌ) بەشێکیتری ئەو پێنج بەشە (لِذَوِي الْقُرْبَى) بۆ خزمەکانی پێغەمبەرە ﷺ (وَهُمْ بَنُوهاشِمٍ) کە نەتەوەی هاشیمو (وَبَنُوالْمُطَّلِبِ) نەتەوەی موتتەلیبن، ئێستا لە کوردستان پێیان ئەگوترێ: (سەید).

(وَسَهْمٌ لِلْيَتَامَى) بەشێکیتریش بۆ منداڵە یەتیمەکانە (وَسَهْمٌ لِلْمَسَاكِينِ) بەشێکیتریش بۆ گەدلو هەژارانە (وَسَهْمٌ لأَبْناءِ السَّبِيلِ) بەشێکیتریش بۆ ڕێبوارانە بەو جۆرەی لە زەکاتدا باسمان کرد. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ بزانن: هەرچی لە کافران بە تالآنتان گرت، پێنجێکی هی پێنج چینە: هی خواو پێغەمبەری خوایە ﷺ، هی خزمەکانی پێغەمبەرە ﷺ هی یەتیمانەو، هی هەژارانەو، هی ڕێبوارانە. واتە: چوار بەشەکەیتریش گشتی بۆ جەنگاوەرانە.

﴿پاشکۆ﴾: یەکەم: هەر سەربازێك لە گەرمەی جەنگدا شەهید ببێ، هیچ بەشی لە تالآن نیە، بەڵام ئەگەر لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ بمرێ، بەشەکەی وی ئەدرێتە میراتگرەکانی.

(فَصْـــــلٌ) وَيُقْسَـــــمُ مَـــــالُ الْفَـــــيْءِ عَلَـــــى خَمْـــــسِ فِـــــرَقٍ: يُصْرَفُ خُمُسُهُ عَلَى مَنْ يُصرَفُ عَلَيْهِمْ خُمُسُ الْغَنِيمَةِ،

---

دووهم: شاردنەوەی شتێکی تالآن حەرامە، هەرچەند دەرزیو دلوێکیش بێ، ئەبی بیداتەوە دەست سەرکردەی لەشکر ﴿عَنْ عُبادَةَ بن الصَّامت ﷺ: قالَ النَّبيُّ ﷺ: لاتَغُلُّوا فَإنَّ الْغُلُولَ نارٌ وَعارٌ عَلَى أصْحابِهِ فِي الدُّنْيا والآخِرَةِ﴾ رواهأحمد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ شتێك لە تالآن مەشارنەوەو بە دزی مەیبەن، چونكە شاردنەوەی ماڵی تالآنكراو سزای ئاگرو شەرمەزاریيە لە دونیاو قیامەتدا.

سێیەم: دروستە جەنگاوەرەكان لە هەموو جۆرە خواردەمەنی‌یەكی تالآنكراو بخۆنو ئاژەڵی تالآنكراو سەر ببڕنو گۆشتەكەی بخۆن پێش ئەوەی بەش بكرێ ﴿عَنْ عَبْدالله بن أبِي أوْفَى ﷺ قالَ: أصَبْنا طَعاماً يَوْمَ خَيْبَرَ فَكانَ الرَّجُلُ يَجيءُ فَيَأْخُذُ مِنْهُ قَدْرَ مَا يَكْفيهِ﴾ أخرجه ابوداود، (عبدالله) فەرمووی: لە غەزای (خەیبەر)دا خواردنمان بەتالآن گرت، پیاوی وا هەبوو بە ئەندازەی تێربوونی خۆی لە خواردەمەنیەكەی ئەبرد.

چوارەم: دروستە سەركردەی لەشكرەكە بەخشیشێك بداتە ئەو كەسەی چالاكی‌یەك ئەكا بەرانبەر بە دوژمن، جگە لە بەشە تالآنەكەی خۆی، بەڵام ئەبی ئەو بەخشیشە لەو پێنجیێكە دەربكرێ كە بۆ بەرژەوەندی دانراوە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: كانَ النَّبيُّ ﷺ يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ مِنَ السَّرايا لأنْفُسِهِمْ خاصَّةً سِوَى قِسْمَةِ عامَّةِ الْجَيْشِ﴾ رواهالشيخان، پێغەمبەر ﷺ بەخشیشێكی ئەدا چەند كەسێكی ئەو تیپانەی ئەینارد بە جەنگ، جگە لە بەشەكەی خۆیان كە لە بەشكردنی تالآن ئەیاندرایێ.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەش كردنی (فَيْء) ﴾

واتە: ئەو ماڵەی لە كافران دەست (بيت المال) كەوتوە، بە بێ‌جەنگ: وەكو سەرانەی جولەكەو دیانان، ملكو ماڵی ئەو كافرانەی بێ‌میراتگر ئەمرن، ئەو ملكو ماڵەی كافرەكان لە كاتی ماڵگواستنەوە بەجێی ئەهێڵن، ملكو ماڵی(مُرْتَدّ)، واتە: ئەو موسوڵمانەی كافربووەو بە كافری مردوە، یان لە جەنگ كوژراوە...هتد، ئەو جۆرە شتانە.

(وَيُقْسَمُ مالُ الْفَيْءِ) بەش ئەكرێ ماڵی دەستكەوتوو بە بێ‌جەنگ (عَلَى خَمْسِ فِرَقٍ) بە سەر پێنج بەشدا: (يُصْرَفُ خُمُسُهُ) پێنجیێكی، واتە: بەشێك لەو پێنج بەشانە بەش ئەكرێ (عَلَى مَنْ يُصْرَفُ عَلَيْهِمْ خُمُسُ الْغَنِيمَةِ) بە سەر ئەو پێنج چینانەی كە پێنجیێكی تالآنیان ئەدرایێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا أفَاءَاللهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِــذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ هەر ماڵێك لە دانیشتووانی ئەو دێیانە دەست پێغەمبەر ﷺ ئەكەوێ، بۆ خواو پێغەمبەرەو بۆ خزمەكانی پێغەمبەرەو بۆ بەتیمانەو بۆ هەژارانەو بۆ رێبوارانە.

وَيُعْطَـــى أَرْبَعَـــةُ أَخْماسَـــها لِلْمُقاتِلَـــةِ، وَفِـــي مصـــالِحِ الْمُسْـــلِمِينَ.
(فَصْلٌ) وَشَرائِطُ وُجُوبُ الْجِزْيَةِ خَمْسُ خِصالٍ: اَلْبُلُوغُ، وَالْعَقْلُ، وَالْحُرِّيَّةُ، وَالذُّكُورِيَّةُ،

---

ئینجا بزانە: بەشەکەی پێغەمبەرﷺ لە بەرژەوەندی گشتیی موسوڵمانان سەرف ئەکرێ.
(وَيُعْطَى أَرْبَعَةُ أَخْماسِها) وە چوار بەشەکەیتریش دانـدراوە (لِلْمُقاتِلَةِ) بـۆ ئـەو سـەربازانەی ناویـان لـە نووسـینگەی سـەربازیدا نووسـراوە بـۆ (جیهـاد)کـردن، کـەوابوو: بـەگوێرەی پێویستیو ژمارەی خێـزان، مووچـەیان ئـەدرێتێ ﴿قالَ عَوْفُ بنُ مالِكٍ: كانَ النَّبِيُّﷺ إذا أتاهُ الْفَيْءُ قَسَّمَهُ فِي يَوْمِه: فَأَعْطَى الآهِلَ حَظَّيْنِ، وَأَعْطَى الْعَزَبَ حَظّاً﴾ رواه ابـوداود، پێغەمبەرﷺ هەر کاتێ (فَيْء)ی بۆ هاتبا، هەر لە ڕۆژەکەی خۆیدا بەشـی ئـەکرد: ئـەوەی ژنی هەبوو دوو بەشی ئەدایێ، ئەوەی ژنی نەبو بەشێکی ئەدایێ.
جـا ئەگـەر یـەکێك لـە سـەربازەکان مـرد، ئـەبێ بـەگوێرەی پێویسـتی مووچـە بدرێتـە منداڵەکانی تا لە پێویستی دەرئەچن، ئەدرێتە ژنەکەشی تا مێرد ئەکاتەوە.
(وَفِـي مصالِحِ الْمُسْلِمِينَ) وە ئەگـەر ئـەو چـوار بەشـانە لـە سـەربازەکان زیـاد بـون، لـە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف ئەکرێ: پێشەکی لە چەكو کەلوپەلی جەنگ.
ئینجا بزانە: لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ ئەو چوار بەشـانەو پێنجێکی بەشـەکەیتریش گشتی بۆ پێغەمبەرﷺ بوو، بەڵام لە دوای وەفاتی بەم جۆرە بەش ئەکرێ.
جا بزانە: ئەوە مەزهەبی ئیمامی(شافعي)یە، بـەڵام هەرسـێك ئیمامـەکانیتر فەرموویانـە: (فَيْء)، واتە: دەستکەوتووی لە کافرەکان بە بێجەنگ لـە دوای پێغەمبـەرﷺ گشـتی لـە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف ئەکرێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (جِزْيَة) ﴾

واتە: ئەو سەرانەیەی لە کافران وەرئەگیرێو لە(بيت المال) دائەنرێ. جـا ئـەو کافرانـەی سەرانە ئەدەن پێیان ئەگوترێ: (ذِمِّي)، واتە: پەیمان لەئەستۆ.
کەواتـە: بـە هـۆی ئـەو سـەرانەیە پاراسـتنیان ئەکەوێتـە ئەسـتۆی موسـوڵمانان ﴿عَـنِ الْعِرْباض بن سارِيَةَ: عَنِ النَّبِيِّﷺ: إنَّ اللهَ لَمْ يَحِلَّ لَكُمْ أنْ تَدْخُلُوا بُيُـوتَ أَهْـلِ الْكِتابِ إلاَّ بِإذْنٍ وَلاَ ضَرْبُ نِسائِهِمْ وَلاَ أَكْلُ ثِمارِهِمْ إذا أَعْطَوكُمُ الَّذي عَلَيْهِمْ﴾ رواه ابـوداود، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: خـوا ڕێگـای نەداوەتـە ئێـوە: بچنـە مـاڵی جولەکـەو دیانەکان بە بێئیزن، ڕێگای نەداوە لە ئافرەتەکانیان بدەنو لـە میوەجاتەکـەیان بخـۆن، بەو مەرجەی سەرانە بدەن.
(وَشَرائِطُ وَجُوبِ الْجِزْيَةِ) مەرجەکانی واجببوونی سەرانە لێوەرگرتن (خَمْسُ خِصـالٍ) پێـنج مـەرجن: (اَلْبُلُـوغُ) یەکـەم: بلۆغبوونـە. (وَالْعَقْـلُ) دووەم: عاقڵیـە. (وَالْحُرِّيَّـةُ) سـێیەم: ئازادییە. (وَالذُّكُورِيَّةُ) چوارەم: نێرییە. واتە: منـداڵو شـێتو کۆیلـەو ئـافرەت سـەرانەیان

وَأَنْ يَكُونَ مِنْ أَهْلِ الْكِتابِ أَوْ مِمَّنْ لَهُ شُبْهَةُ كِتابٍ. وَأَقَلُّ الْجِزْيَةِ دِينارٌ فِي كُلِّ حَوْلٍ، وَيُؤْخَذُ مِنَ الْمُتَوَسِّطِ دِينارانِ، وَمِنَ الْمُوسِرِ أَرْبَعَةُ دَنانِيرَ، وَيَجُوزُ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَيْهِمُ الضِّيافَةَ فَضْلاً عَنْ مِقْدارِ الْجِزْيَةِ. وَيَتَضَمَّنُ عَقْدُ الْجِزْيَةِ أَرْبَعَةَ أَشْياءَ: أَنْ يُؤَدُّوا الْجِزْيَةَ،

---

له سەر نیەو دروست نیە لێیان وەربگیرێ ﴿عَنْ مُعاذٍ ﷺ: بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ وَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ حالِمٍ دِيناراً أَوْ عِدْلَهُ مَعافِرِيّاً﴾ رواه الترمذي وغيره، (مُعاذ) خوا لێی ڕازی بێ، فەرمووی: پێغەمبەرﷺ منی ناردە (یەمَن)و فەرمانی پێکردم: هەر کافرێکی نێر بێ و بلوغی بوبێ، میسقالێکی زێری لێوەربگرم، یان نرخی میسقالەکە جلو بەرگ.

(وَأَنْ يَكُونَ مِنْ أَهْلِ الْكِتابِ) پێنجەم: ئەو کافرەی سەرانەی لێوەرئەگیرێ خاوەن کتێب بێ، واتە: کتێبیان لە لای خواوە بۆ هاتبێ: وەکو جولەکەو دیان (أَوْ مِمَّنْ لَهُ شُبْهَةُ كِتابٍ) یان بۆنیخاوەن کتێبیان لێبێ: وەکو ئاگرپەرستەکان ﴿عَنْ مُسْلِمٍ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: قالَ سُنُّوا بِالْمَجُوسِ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتابِ﴾ رواه الطبراني، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ڕەفتار لەگەڵ ئاگرپەرستەکان بکەن وەکو ڕەفتاری جولەکەو دیانان.

﴿ئاگاداری﴾: دانیشتووانی هەر شوێنێك سەرانە بدەن، شوێنەکە ئەبێتە (دارُالإِسْلام)، واتە: خانەی ئیسلام. وە لە مەزهەبی ئیمام (مالك)دا دروستە: سەرانە لە هەموو جۆرە کافرێك وەربگیرێ هەرچەند خاوەن کیتابیش نەبێ، بەو مەرجەی (مُرْتَدّ) نەبێ.

(وَأَقَلُّ الْجِزْيَةِ) کەمترین ئەندازەی سەرانە (دِينارٌ) یەك میسقالی زێرە (فِي كُلِّ حَوْلٍ) لە هەموو ساڵێك یەك جار، هەروەها دروستیشە نرخی ئەو میسقالە وەربگیرێ، هەروەك لە حەدیسی(معاذ)دا گێڕاوە. (وَيُؤْخَذُ مِنَ الْمُتَوَسِّطِ) بەڵام دروستە لە پیاوی ناوەنجی زیاتر وەربگیرێ، واتە: (دِينارانِ) دوو میسقال زێری لێوەربگیرێ (وَمِنَ الْمُوسِرِ) وە لە پیاوی دەوڵەمەند (أَرْبَعَةُ دَنانِيرَ) چوار میسقال زێری لێوەربگیرێ، بەو مەرجەی لە سەری ساڵەوە بەو ئەندازەیە لەگەڵیان پێك هاتبێ، ئەگەر نا: دروست نیە زیاتریان لێوەربگیرێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئەبێ گەورەی موسوڵمانان یان جێگری وی پێکهاتنی سەرانە مۆر بکاو لەو پێکهاتنەدا بڵێ: (ڕێگەتان ئەدەم لە خانەی ئیسلامدا نیشتەجێ بن بەو مەرجەی ساڵێ یەك جار ئەوەندە سەرانە بدەن و ملکەچ بن بۆ بڕیارەکانی ئیسلام).

(وَيَجُوزُ) دروستە (أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَيْهِمُ) لەو مۆرکردنەدا بە مەرج دابنێ لە سەر ئەوان (الضِّيافَةَ) میوانداریکردنی موسوڵمانانیڕێبوار (فَضْلاً عَنْ مِقْدارِ الْجِزْيَةِ) ئەو میوانداریکردنە زێدەیە لە سەر ئەندازەی سەرانە، کەوابوو: تەنها ئەبێ دەوڵەمەندەکان و ناوەنجییەکان میوانداری موسوڵمانان بکەن، نابێ بخرێتە سەر هەژارەکان.

(وَيَتَضَمَّنُ عَقْدُ الْجِزْيَةِ) پێکهاتنی سەرانە لە ناو خۆیدا کۆ دەکاتەوە (أَرْبَعَةَ أَشْياءَ) چوار شت: یەکەم: (أَنْ يُؤَدُّوا الْجِزْيَةَ) هەموو ساڵێك سەرانە بدەن.

وَأَنْ تُجْرَى عَلَيْهِمْ أَحْكَامُ ٱلْإِسْلَامِ، وَأَنْ لاَ يَذْكُرُوا دِينَ ٱلْإِسْـــلَامِ إِلاَّ بِخَيْـــرٍ، وَأَنْ لاَ يَفْعَلُوا ما فِيهِ ضَرَرٌ عَلَى ٱلْمُسْلِمِينَ. وَيُعْرَفُونَ بِلُبْسِ ٱلْغِيَارِ وَشَدِّ الزُّنَّارِ، وَيُمْنَعُــونَ مِــنْ رُكُوبِ ٱلْخَيْلِ، وَيُلْجَئُونَ إِلى أَضْيَقِ الطُّرُقِ.

---

دووەم: (وَأَنْ تُجْرَى عَلَيْهِمْ أَحْكَامُ الإِسْلَامِ) ملکەچ بن بۆ گشت بڕیارەکانی ئیسلام کە لە باسی سزای تاوانەکاندا گوتراوە، جگە لە پێنج ڕوکنەکانی ئیسلامو شەڕابخواردنەوە، بەڵام نابێ بە ئاشکرا شەڕاب بخۆنەوەو بیفرۆشن.

سێیەم: (وَألاَّ يَذْكُرُوا دِينَ الإِسْلَامِ) نابێ باسی ئایینی ئیسلام بکەن (إِلاَّ بِخَيْـرٍ) تەنها بە چاکە نەبێ، کەوابوو: ئەگەر جنێو بە ئیسلام، یان بە قورئان، یان بە مزگەوت بدەن، تەمبێ ئەکرێن.

چوارەم: (وَألاَّ يَفْعَلُوا ما فِيهِ ضَرَرٌ عَلَى ٱلْمُسْلِمِينَ) نابێ کارێکی وەها بکەن کە زیانی بۆ موسوڵمانان هەبێ، واتە: نابێ میوانداری سیخوڕو دوژمنانی ئیسلام بکەنو نابێ هەواڵەکانی ئیسلام بگەیەننە کافرەکان، هەروەها نابێ دێرو کەنیسە دروست بکەن لەو شوێنانەی دانیشتووەکانی موسوڵمان بوینە ﴿عَنْ عُمَرَ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاتُبْنَى كَنِيسَةٌ فِي الإِسْلَامِ﴾ رواه ابن عدی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ کەنیسە لە وڵاتی ئیسلامدا دروست بکرێ.

(وَيُعْرَفُونَ) واجبە پەیمان لە ئەستۆکان وا لە خۆیان بکەن کە بناسرێن (بِلُبْسِ الْغِيارِ) بە کردنەبەری بەرگێکی نیشانەکراو (وَشَدِّ الزُّنَّارِ) وە بە بەستنی پشتێندە گەورەکەیان لە سەر جلەکەیان (وَيُمْنَعُونَ) ئەبی قەدەغە بکرێن (مِنْ رُكُوبِ الْخَيْلِ) لە سواربوونی ئەسپو ماین (وَيُلْجَئُونَ) ئەبی پاڵ بدرێن (إِلَى أَضْيَقِ الطُّرُقِ) بۆ لای تەسکایی ڕێگەکان، کە لەگەڵ موسوڵمانان ئەگەنە یەکتر ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لاَ تَبْدَأُوا الْيَهُودَ وَالنَّصارَى بِالسَّلَامِ، وَإِذا لَقِيتُمُوهُمْ فِي طَرِيـقٍ فَاضْـطَرُّوهُ إِلَى أَضْـيَقِهِ﴾ رواه‌مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێوە لە پێشدا سەلام لە جولەکەو دیانەکان مەکەن، وە هەر کاتێك لە ڕێگەیەکدا گەیشتنە ئەوان، پاڵیان بدەنە تەسکایی ڕێگەکە.

## ﴿ باسی گـومـرگ ﴾

زانایانی ئیسلام یەکدەنگن کە حەرامە: گومرگ لە موسوڵمانان وەربگیرێ، بەڵام دروستە دەیەکی بازرگانی لەو کافرانە وەربگیرێ: کە بۆ بازرگانی دێنە (دارُالإِسْلَامِ)، ئەگەر بەو مەرجە ڕێگەی هاتنیان درابێ، هەروەها دروستە لەو کافرانەش وەربگیرێ: کە لە (دارُالإِسْلَامِ)دا نیشتەجێن، ئەگەر لەگەڵ سەرانەدا بە مەرج دانرابێ لە سەریان ﴿عَنْ حَرْبِ بن عُبَيدِاللهِ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّما الْعُشُورُ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصارَى وَلَيْسَ

## (كــتابُ الصَّــيْد وَالــذَّبائِح)

وَمــا قُــدِرَ عَــلَى ذَكَــاتِــه فَـــذَكَــاتُــهُ فِــي حَـــلْقِـــهِ وَلَـبَّــتِــهِ،

---

عَلَى الْمُسْلِمِينَ عُشُورٌ﴾ رواه ابوداود، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەیەکی بازرگانی لە سەر جولەکەو دیانەکانە، لە سەر موسوڵمانان نیە.

ئینجا بزانە: ئەو دەیەکە لە (بیت المال) دائەندرێو، وەکو (فَيْء) سەرف ئەکرێ.

### ﴿ باسی (هُدْنَة) جەنگ وەستاندن ﴾

دروستە کاربەدەستی موسوڵمانان پێکهاتنی جەنگ وەستاندن لەگەڵ کافرەکان مۆر بکا، بەو مەرجەی کافری بنەڕەتی بن، نەك (مُرْتَدّ)، واتە: لە ئیسلامەوە نەگەڕابنەوە سەر کوفر، ئینجا ئەگەر موسوڵمانان بەهێز بونو بەرژەوەندی لە جەنگ وەستاندندا بوو: ئەوە تەنها بۆ ماوەی چوار مانگ دروستە، بەڵگە: (صُلْحُ الْحُدَيْبِيَةِ)یە.

ئینجا بزانە: ئەو جۆرە کافرانەی پێکهاتنی جەنگ وەستاندنیان لەگەڵ مۆر کراوە پێیان ئەگوترێ: (مُعاهَد)=پەیمان لەگەڵکراو، کەوابوو: واجبە وازیان لێبێنین تا ماوەی پێکهاتنەکە کۆتایی دێ، یان تا ئەوان پێکهاتنەکە هەڵئەوەشێننەوە، هەروەها بۆ گشت موسوڵمانێك دروستە کافرێکی جەنگی بپارێزێ بەو مەرجەی ماوەی پاراستنەکە لە چوار مانگ زیاتر نەبێو زیانی موسوڵمانانی تێدا نەبێ، جا ئەو جۆرە کافرەش پێی ئەگوترێ: (مُسْتَأْمَن)= دڵنیاکراو، کەوابوو: بۆ هیچ موسوڵمانێك دروست نیە: زیان لەو کافرە بدا.

### ﴿ کــۆچــکــردن ﴾

ئەگەر موسوڵمان لە (دارُالْكُفْرْ) نەیئەتوانی ئاینی خۆی ئاشکرا بکا، واجبە: کۆچ بکا بۆ (دارُالإِسْلاَمِ)، هەروەها ئەگەر لە (دارُالإِسْلاَمِ)ش گوناه بە ئاشکرایی ئەکران و نەیئەتوانی قەدەغەی بکا، واجبە کۆچ بکا بۆ شوێنێکی باش، بەڵام ئەگەر مانەوەی لە (دارُالْكُفْرْ)، یان لە (دارُالإِسْلاَمِ)ی خراپدا بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدابو، ئەوە دروستە بمێنێتەوە.

ئینجا بزانە: کۆچکردن لە (دارُالإِسْلاَمِ)، یان لە (دارُالْكُفْر) بۆ (جِهاد)کردن، خێری زیاترە لەو دوو بەشانەی باسمان کردن، چونکە کۆچکردن=بەگوێرەی(جِهاد)= ئەبێتە (فَرْضُ الْعَيْن) و (فَرْضُ الْكِفايَةِ).

*　　　*　　　*

### ﴿(كِــتابُ الصَّيْدِ) ئەم پەڕتووکە باسی نێچیر ئەکا ﴾

### ﴿(وَالذَّبائِحِ) وە باسی ئاژەڵو باڵندەی سەربڕاو ئەکا ﴾

(وَما قُدِرَ عَلىذَكاتِهِ) هەر ئاژەڵێكو هەر باڵندەیەك کە بتوانرێ سەری ببڕدرێ (فَذَكاتُهُ) شوێنی کوشتنەوەی، واتە: سەربڕینی (فِي حَلْقِهِ) لە لای سەرەوەی گەردەنیەتی (وَلَبَّتِهِ) یان لە ژێر گەردەنیەتی.

وَما لَمْ يُقْدَرْ عَلَى ذَكاته فَذَكاتُهُ عقْرُهُ حَيْثُ قُدرَ عَلَيْه، وَكَمالُ الذَّكاة أَرْبَعَـةُ أَشْـياءَ: قَطْعُ الْحُلْقُومِ، وَالْمَرِيءِ، وَالْوَدَجَيْنِ. وَالْمُجْزِيءُ مِنْها شَيْئانِ: قَطْعُ الْحُلْقُومِ، وَالْمَرِيءِ.

---

(وَما لَمْ يُقْدَرْ عَلَىذَكاته) وه هەر باڵندەو هەر ئاژەڵێكی نەگونجێ سەر ببڕێ، لە بەر ئـەوەی كێویەو پێی ناگیرێ، یان ڕای كردوەو نایگاتێ، یان كەوتۆتە بیرێك، یان كـەلێنی چیایەك (فَذَكاتُهُ) چۆنیەتی كوشتنەوەی تاكو حەڵاڵ ببێ (عَقْرُهُ) ئەوەیە بریندار بكرێ بـە برینێكـی وەها: كە گیانی لە بەر بباتە دەر (حَيْثُ قُدرَ عَلَيْه) لە هەر شوێنێكی لاشەكەی كە بتـوانرێ برینداری بكا، واتە: بەم كوشتنە حەڵاڵ ئەبێ ﴿عَنْ رافِعِ بن خديج ﷺ قالَ: نَدَّ بَعيرٌ فَرَماهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: إذا غَلَبَكُمْ شَيْءٌ مِنْها فَاصْـنَعُوا بِـهِ هَكَـذا﴾ رواه الشيخان، (رافع) فەرمووی: ووشترێكمان لێڕەویەوەو بۆمان نەگیراوە، ئینجا پیاوێك تیرێكی تێگرتو كوشتی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هـەر كاتـێ یـەكێك لـەو ئاژەڵانـە لـە دەسـتەڵاتی ئێوە دەرچوو، بەم جۆرە بیكوژن، واتە: حەڵاڵ ئەبێ.

(وَيُسْتَحَبُّ) سوننەتە (فِي الذَّكاةِ) لە سەربڕینی ئاژەڵدا تاكو سـەربڕینەكە تـەواو ببـێ (أَرْبَعَـةُ أَشْياءَ) چوار شت:

یەكـەم: (قَـطْعُ الْحُلْقُومِ) بڕینی (قرتاكە)، واتە: بۆڕیەی هەناسـە. دووەم: (وَالْمَـرِيءِ) بـڕینی (سۆریچكە)، واتە: بۆڕیەی خـواردنو خواردنـەوە. سێیەمو چوارەم: (وَالْـوَدَجَيْنِ) بـڕینی هەردوو دەمارەكانی مل.

(وَالْمُجْزِيءُ) جا ئەوەی كوژراوەكەی پێ حـەڵاڵ ئـەبێ (مِنْها) لـەو چوارانە (شَـيْئانِ) تـەنها بڕینی دووانە: (قَطْعُ الْحُلْقُومِ) یەكەم: بڕینی هەموو (قرتاكە)یـە. (وَالْمَـرِيءِ) دووەم: بڕینی هەموو (سورێچكە). واتە: بە بڕینی ئەو دووانە سەربڕاوەكە حەڵاڵ ئەبێ، هەروەك لە مەودوا بە درێژی باسی ئەكەین، إن شاءالله تعالى.

﴿ئاگاداری﴾ یەكەم: بۆ حەڵاڵبوونی سەربڕاوەكە واجبە ئەو گوێزیلـە خـڕەی بـە بۆڕیـەی هەناسەوەیە: هەمووی، یان نەختێكی لەگەڵ سەریەوە بڕوا، چونكە ئەگەر گشـتی لەگـەڵ لاشەیەوە بڕوا، مردار ئەبێ.

دووەم: واجبە بۆڕیەكان هەردووكیان بە تەواوی ببڕدرێن، ئەگەر هەردووكیان بـە تـەواوی نەبڕدران، مردار ئەبێ.

سـێیەم: ئەگەر گورگ نەختێكی ئەو دوو بۆڕیانەی لە ئاژەڵێك بـڕی، ئینجـا موسـوڵمانێك فریای كەوتو بەشەكەیتری بە تەواوی بڕی، حەڵاڵ ئەبێ، بەلام ئەگەر گورگەكە هـەردوو بۆڕیەكانی بە تەواوی بڕیبوون، ئەوە مردار ئەبێو كوشتنەوەی سودی نیە.

چوارەم: ئەگەر باڵندەیەك، یان ئاژەڵێك نەخۆش بو، یان برسی بو، گومـان لـەوەدا نـەبو كە ئەمرێ، ئینجا سەر بڕا، بەم سەربڕینە حەڵاڵ ئەبێ.

وَيَجُوزُ الإصْطِيادُ بِكُلِّ جارِحَةٍ مُعَلَّمَةٍ مِنَ السِّباعِ وَمِنْ جَوارِحِ الطَّيْرِ، وَشَرائِطُ تَعْلِيمِها أَرْبَعَةٌ: أَنْ تَكُونَ إِذا أُرْسِلَتْ إسْتَرْسَلَتْ، وَإِذا زُجِرَتْ إنْزَجَرَتْ، وَإِذا قَتَلَتْ شَيْئاً لَمْ تَأْكُلْ مِنْهُ شَيْئاً، وَأَنْ يَتَكَرَّرَ ذلِكَ مِنْها. فَإِنْ عُدِمَتْ إِحْدَى الشَّرائِطِ لَمْ يَحِلَّ ما أَخَذَتْهُ إِلاَّ أَنْ يُدْرِكَ حَيّاً فَيُذَكِّى،

---

پێنجەم: ئەگەر باڵندەیەك، یان ئاژەڵێك لە شوێنێكی بەرز كەوتە خوارەوە، یان دیوارێكی بە سەردا ڕما، یان گورگ، یان پشیلەو ئەو جۆرە شتانە بریندداریان كرد، یان ورگی دڕێو ڕیخۆڵەی هاتنە دەرەوە، ئەوە پێویستە لە كاتی سەربڕیندا گیانی (جێگیربووی) تێدا مابێ، تاكو حەڵاڵ ببێ.

جا بزانە: نیشانەی ئەو گیانە (جێگیربووە) ئەوەیە: یان خوێنی بە ماسوولكەی لێدەرقوڵێ لە كاتی سەربڕیندا، یان بە توندوتیژی بجولێتەوە، جا ئەگەر ئەوانە هیچیان نەبون، ئەوە مردارەو حەڵاڵ نیە.

## ﴿ باسی نێچیرگرتن ﴾

(وَيَجُوزُ الإصْطِيادُ) نێچیرگرتن دروستە (بِكُلِّ جارِحَةٍ) بە گشت دڕندەیەك (مُعَلَّمَةٍ) بەو مەرجەی دڕندەكە فێرە ڕاو كرابێ (مِنَ السِّباعِ) كە ئاژەڵ بێ: وەكو سەگو تانجیو ئەو جۆرە شتانە (وَمِنْ جَوارِحِ الطَّيْرِ) یان دڕندەكە باڵندە بێ: وەكو بازو هەڵۆ و ئەو جۆرە شتانە، بەو مەرجەی فێرە ڕاو كرابێ.

(وَشَرائِطُ تَعْلِيمِها) مەرجەكانی فێرە ڕاوكردن (أَرْبَعَةٌ) چوارن: (أَنْ تَكُونَ) یەكەم: هەردوو دڕندەكان وەها گوێڕایەڵ بن: (إِذا أُرْسِلَتْ) كاتێ هەیهەیان لێكرا (إسْتَرْسَلَتْ) هەڵبستن بۆ نێچیرەكە ڕا بكەن. (وَإِذا زُجِرَتْ) دووەم: كاتێ وەستەیان لێكرا (إنْزَجَرَتْ) یەكسەر بوەستن. (وَإِذا قَتَلَتْ شَيْئاً) سێیەم: هەر كاتێ نێچیرێكیان كوشت (لَمْ تَأْكُلْ مِنْهُ شَيْئاً) هیچ لە نێچیرەكە نەخۆن، بەڵكو ڕایبگرن تا خاوەنەكەیان ئەگاتێ. (وَأَنْ يَتَكَرَّرَ ذلِكَ مِنْها) چوارەم: ئەو سێ مەرجانەیان تێدا دووبارە بكرێتەوە تا دڵنیا ئەبێ كە فێرە ڕاو بووە.

واتە: ئەگەر ئەو مەرجانە لە ئاژەڵدا، یان لە باڵندەدا هاتنە جێو نێچیرێكیان كوشت، ئەو نێچیرە حەڵاڵە، هەرچەند خاوەنەكەش فریای نەكەوێ بیكوژێتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ﴾ شتی پاك لە ئێوە حەڵاڵەو نێچیری ئەو جۆرە دڕندانەش حەڵاڵە كە فێری ڕاو كراونو گوێڕایەڵن بۆ ئێوە.

(فَإِنْ عُدِمَتْ إِحْدَى الشَّرائِطِ) بەڵام ئەگەر یەكێك لەو مەرجانە نەهاتە جێ (لَمْ يَحِلَّ ما أَخَذَتْهُ) ئەو نێچیرەی كوشتویەتی حەڵاڵ نیە (إِلاَّ أَنْ يُدْرِكَ حَيّاً) مەگەر یەكێك بە زیندوویی فریای كەوێ (فَيُذَكِّى) ئینجا بكوژێتەوە، جا بەم كوشتنەوەیە حەڵاڵ ئەبێ.

**﴿ئاگاداری﴾**: ئەو نێچیرەی دڕندەی فێرکراویش گرتویەتی، ئەگەر خاوەنەکەی بە زیندوویی فریای کەوێو سەری نەبڕێ، حەلاڵ نابێ **﴿عَنْ عديٍّ بن حاتمٍ﷜: عَـنِ النَّبِـيِّ ﷺ: إذا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ، فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيّاً فَاذْبَحْهُ، وَإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قَتَلَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ فَكُلْهُ﴾** رواهالشیخان، پێغەمبەرﷺفەرمووی: هەر کاتێك سەگەکەی خۆت هەڵساند بۆ نێچیر گرتن بڵێ: (بِسْمِ الله)، جا ئەگەر نێچیرەکەی بۆ تۆ گرتو تۆش گەیشتیە نێچیرەکە: ئەگەر زیندوو بوو بەخۆت سەری ببڕە، بەلام ئەگەر نێچیرەکەی کوشتبو و سەگەکەش هیچیی لێنەخواردبو، لێت حەلاڵەو بیخۆ.

**﴿ئاگاداریەکیتر﴾**: هەر نێچیرێك بە هۆی شتێکی بڕندە بکوژرێو فریای سەربڕینی نەکەوێ، حەلاڵە، جا ئەو بڕندەیە شمشێر بێ، یان خەنجەر بێ، یان تیر بێ، بەلام ئەگەر فریای کەوتو گیانی تێدا مابو، ئەبی سەری ببڕێ، ئەگینا: حەلاڵ نابێ.

وە هەر نێچیرێك بە (فاخ) واتە: بە تەلەوە بمرێ، یان لە شوێنێکی بەرز بکەوێتە خوارەوە، یان بخنکێندرێ، یان بە دار، یان بە بەرد لێیبدرێ، یان بە گوللەی تفەنگ لێی بدرێ، ئەوانە هیچیان حەلاڵ نینە، مەگەر بە زیندوویی فریایان بکەوێو سەریان ببڕێ، ئەو کاتە حەلاڵ ئەبن.

ئینجا بزانە: ئەو نێچیرەی بە گوللەی تفەنگ گیانی دەرئەچێ، بۆیێ حەلاڵ نیە: چونکە گوللە بە هێزی ئاگریبارووت دەرئەچێو سۆر ئەبێتەوە، واتە: هێزو گەرمایی ئاگر نێچیرەکە ئەکوژێ، بەلام تیروکەوانو خەنجەر بە هێزی ڕاوچیو بڕندەییخۆیان ئەکوژن، کەوابوو: زۆر لێك جیاوازن، جا تکایە: لەو جیاوازییە ئاگاداربە.

**﴿ باسی سەربڕین-کوشتنەوە ﴾**

(وَتَجُوزُ الذَّكاةُ) سەربڕینی ئاژەڵو باڵندە دروستە (بِكُلِّ ما يَجْرَحُ) بە هەر شتێکی بڕندە بێو گۆشت ببڕێ: وەکو دار، بەرد، ئاسن، شووشە.

(إلاَّ بِالسِّنِّ) تەنها سەربڕین بە ددان دروست نیە (وَالظُّفْرِ) بە نینۆکیش دروست نیە **﴿عَـنْ رافِعِ بن خديجٍ﷜: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ماأَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلْ لَـيْسَ السِّـنَّ والظُّفْرَ﴾** رواهالشیخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر شتێك خوێن بڕژێنێو (بِسْمِ الله)ی لە سەر گوترا، بیخۆ، بەلام خوێن ڕێژەکە ددانو نینۆك نەبێ.

کەواتە: ئەگەر بە دەست سەری پەلدا، یان بە گوللەی تفەنگ، یان بە کێرێکی نەبڕ سەری لێکردەوە، ئەوە مردار ئەبێو حەلاڵ نیە.

**﴿ئاگاداری﴾**: گوتنی(بِسْمِ الله) لە کاتی کوشتنەوەدا سوننەتەو واجب نیە، واتە: بە بێ (بِسْمِ الله)کردن کوژراوەکە هەر حەلاڵە، هەروەها سوننەتە سەربڕاوەکە ڕوو لە قیبلە بکرێو

**وَتَحِلُّ ذَكَاةُ كُلِّ مُسْلِمٍ وَكِتابِيٍّ، وَلاَ تَحِلُّ ذَبِيحَةُ مَجُوسِيٍّ وَلاَ وَثَنِيٍّ، وَذَكَاةُ الْجَنِينِ بِذَكَاةِ أُمِّهِ إِلاَّ أَنْ يُوجَدَ حَيّاً فَيُذَكَّى، وَما قُطِعَ مِنْ حَيٍّ فَهُوَ مَيِّتٌ إِلاَّ الشَّعْرَ.**

---

له سەر تەنیشتی چەپە درێژ بكرێو بە دەستیچەپە سەری بگرێو بە دەستیڕاستە سەری ببڕدرێ، هەروەها سوننەتە كێردەكەی زۆر تیژو بڕندە بێ.

ئینجا كە (سۆرێچك)و (قرتاكە)ی بە تەواوی بڕین، با وازی لێبێنن‌و سەری لێنەكاتەوە تا گیانی دەرئەچێ.

(وَتَحِلُّ) حەڵاڵە (ذَكاةُ كُلِّ مُسْلِمٍ) دەستكوژی گشت موسوڵمانێك: جا پیاو بێ، یان ئافرەت بێ، یان منداڵ بێ، یان شێت بێ (وَكِتابِيٍّ) هەروەها حەڵاڵە دەستكوژی كافری خاوەن كیتاب: وەكو جولەكەو دیان، خوایگەورە فەرموویەتی: ﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ﴾ دەستكوژی خاوەن كیتابەكان بۆ ئێوە حەڵاڵە. بەڵام بەو مەرجە دەستكوژەكەیان حەڵاڵە: كە بزاندرێ باپیرەی پێشوویان پێش گۆڕانی ئایینەكەو پێش ڕەشبوونەوەی ئایینەكە، چوونەتە ناو ئەو ئایینە.

(وَلاَ تَحِلُّ) بەڵام حەڵاڵ نیە (ذَبِيحَةُ مَجُوسِيٍّ) دەستكوژی ئاگرپەرست (وَلاَ وَثَنِيٍّ) هەروەها حەڵاڵ نیە: دەستكوژی بت پەرستو كافرەكانیترو ئەو موسوڵمانەی بووەتە كافر.

(وَذَكاةُ الْجَنِينِ) كوشتنەوەی بێچووی ناو زگی ئاژەڵ (بِذَكاةِ أُمِّهِ) بە سەربڕینی دایكیەتی، واتە: ئەگەر ئاژەڵەكە سەر براو یەكسەر بێچووەكەی لە ناو زگیدا مرد، بێچووەكەش حەڵاڵە ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدالْخُدرِي‌ﷺ: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: ذَكاةُ الْجَنِينِ ذَكاةُ أُمِّهِ﴾ رواەأحمد.

(إِلاَّ أَنْ يُوجَدَ حَيّاً) مەگەر بێچووەكە لە دوای سەر بڕینیدایكی هەر زیندوو بێ، ئەو كاتە (فَيُذَكَّى) واجبە: ئەویش سەر ببڕێ، كەواتە: ئەگەر لە دوای سەربڕینیدایكی نەمردو لە ناو زگیدا هەر ئەجولایەوە، ئەبێ بە زووترین كات بیهێننە دەرەوەو سەری ببڕن، ئەگینا: حەڵاڵ نابێ.

(وَما قُطِعَ مِنْ حَيٍّ) هەر پارچەیەك لە ئاژەڵی زیندوو، یان لە باڵندەی زیندوو ببڕدرێ، واتە: لێی بكرێتەوە (فَهُوَ مَيِّتٌ) ئەو پارچەیەش مردارە، چونكە لاشەكە سەر نەبڕاوە.

(إِلاَّ الشَّعْرَ) تەنها پەڕو خوریو موو مردار نیە ﴿عَنْ أَبِي واقدالَّلْيثِي‌ﷺ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، وَهُمْ يَجُبُّونَ أَسْنِمَةَالإِبِلِ وَيَقْطَعُونَ أَلْيَاتِ الْغَنَمِ، فَقالَ ما قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهِيَ مَيْتَةٌ﴾ رواەابوداود، پێغەمبەرﷺ هاتە (مدینة)و خەڵكی(مدینة) قەپۆزی ووشترو دونگی مەڕیان لێئەكردەوەو ئەیانخوارد، ئەویش فەرمووی: هەر پارچەیەك لە ئاژەڵی زیندوو بكرێتەوە، پارچەكە مردارە.

﴿ئاگاداری﴾: هەر پارچەیەك لە ماسیی زیندوو بكرێتەوە: حەڵاڵە، چونكە سەربڕینی بۆ دانەندراوە.

(فَصْلٌ) وَكُلُّ حَيْوانٍ إِسْتَطابَتْهُ الْعَرَبُ فَهُوَ حَلالٌ إِلاَّ ما وَرَدَالشَّرْعُ بِتَحْرِيمِهِ، وَكُلُّ حَيْوانٍ اسْتَخْبَثَتْهُ الْعَرَبُ فَهُوَ حَرامٌ إِلاَّ ما وَرَدَالشَّرْعُ بِإِباحَتِهِ، وَيَحْرُمُ مِنَ السِّباعِ ما لَهُ نابٌ قَوِيٌّ يَعْدُو بِهِ، وَيَحْرُمُ مِنَ الطُّيُورِ ما لَهُ مِخْلَبٌ قَوِيٌّ يَجْرَحُ بِهِ، وَيَحِلُّ لِلْمُضْطَرِّ فِي الْمَخْمَصَةِ أَنْ يَأْكُلَ مِنَ الْمَيْتَةِ الْمُحَرَّمَةِ ما يَسُدُّ بِهِ رَمَقَهُ.

---

## ﴿ فَصْلٌ: له باسى خواردهمهنىى حهلالْو حهرام ﴾

(وَكُلُّ حَيْوانٍ) ههر بالندهو ههر ئاژهڵێك (اسْتَطابَتْهُ الْعَرَبُ) عهرهب به پاكى بزانن و دڵيان بۆ خواردنى بچێ (فَهُوَ حَلالٌ) ئهو گيانلهبهره به حهلاڵ دادهنرێ، بهو مهرجهى ئهو عهرهبانه دهولهمهند بن و دانيشتووى شارو لادێ بن و دڵو دهروونێكى ئيسلاميان ههبێ (إِلاَّ ما وَرَدَ الشَّرْعُ بِتَحْرِيمِهِ) بهڵام ئهوهى له شهريعهتى ئيسلامدا به حهرام دانراوه، ههر حهرامه ههر چهند عهرهبيش به پاكى دابنێن (وَكُلُّ حَيْوانٍ) وه ههر بالندهو ئاژهڵێك (اسْتَخْبَثَتْهُ الْعَرَبُ) عهرهب به پيسى دابنێن و دڵيان بۆ خواردنى نهچێ (فَهُوَ حَرامٌ) ئهو گيانلهبهره به حهرام دادهنرێ (إِلاَّ ما وَرَدَ الشَّرْعُ بِإِباحَتِهِ) بهڵام ئهوهى له شهرعدا به حهلاڵ دانراوه ههر حهلاڵه ههر چهند عهرهبيش به پيسى دابنێن.

(وَيَحْرُمُ) حهرامه (مِنَ السِّباعِ) له چينى ئاژهڵ (ما لَهُ نابٌ قَوِيٌّ) ههر درندهيهكى ددانى توندوتيژى ههبێ (يَعْدُو بِهِ) كه به هۆى ددانهكانى به سهر ئاژهڵهكانىتردا زاڵ ببێ: وهكو شێرو پڵينگو ورچو سهگو پشيلهو فيلو بهرازو...هتد.

(وَيَحْرُمُ مِنَ الطُّيُورِ) حهرامه له چينى بالنده (ما لَهُ مِخْلَبٌ قَوِيٌّ) ههر بالندهيهكى نينۆكى توندوتيژى ههبێ (يَجْرَحُ بِهِ) كه به هۆى نينۆكهكانى بريندار بكا، وهكو بازو ههڵۆ و كولارهو سيسارك و ئهو جۆره بالندانه ﴿عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ كُلِّ ذِي نابٍ مِنَ السِّباعِ وَكُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ﴾ رواه مسلم، پێغهمبهر ﷺ قهدهغهى كردوه: ئاژهڵى ددان تيژو بالندهى نينۆك تيژ گۆشتيان بخورێ.

ئينجا بزانه: زۆر شت له شهرعدا ناوى به حهرام هاتوهو زۆريش به حهلاڵ، بهڵام لێرهدا ماوهى دياركردنيان نيه.

## ﴿ باسى مردارخواردن ﴾

(وَيَحِلُّ) حهلاڵه (لِلْمُضْطَرِّ) بۆ كهسێكى بێچاره (فِي الْمَخْمَصَةِ) لهو كاتهى مهترسى مردنى ههيه له برسان (أَنْ يَأْكُلَ) بهڵكو واجبه: بخوا (مِنَ الْمَيْتَةِ الْمُحَرَّمَةِ) له گۆشتى مرداربووى حهرام (ما يَسُدُّ بِهِ رَمَقَهُ) ئهندازهيهكى وهها بخوا: كه گيانىخۆى له مردن پێ دهرباز بكا، نهك زياتر، بهو مهرجهش له سهفهرى گوناهكارى نهبێو به هۆى گوناهكارى تووشى برسيهتى نهبوبێ، خواى گهوره فهرموويهتى: ﴿فَمَنْ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾

وَلَنا مَيْتَتانِ حَلالاَنِ: اَلسَّـمَكُ وَالْجَـرادُ، وَدَمـانِ حَـلالاَنِ: اَلْكَبِـدُ وَالطِّحـال. (فَصْلٌ) وَالأُضْحِيَةُ سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ،

---

هەر کەسێك ناچار بوو لە ترسی مردن مردار بخواو، بە هۆی گوناهکاریو دوژمنکاری ئیسلام تووشی برسیبوون نەبوبێ، با بیخوا گوناهی ناگاتێ.

ئینجا بزانە: لەو حەڵاڵیەدا جیاوازی نیە: لە نێوان مرداری کەر و هێستر و مەڕ و بزن و گورگ، بەڵام ئەگەر یەکێکی لەو مرداربووانە دەست کەوت، نابێ سەگو بەراز بخوا، وە ئەگەر سەگی دەست کەوت، نابێ ئادەمیزادیمردوو بخوا، جا ئەگەر هیچ مردارێکی دەست نەکەوت، دروستە خواردەمەنیی کەسێکیتر بخوا، بەو مەرجەی ئەویش وەکو وی ناچار نەبێو تۆڵەی خواردەمەنیەکەیشی بداتێ.

(وَلَنـا مَيْتَتـانِ حَـلالاَنِ) ئێمـەی موسـوڵمان دوو مردوومـان بـۆ حـەڵاڵن: یەکەم: (اَلسَّمَكُ) ماسی، جا هەر بە خۆی بمرێ، یان کەسێکیتر بیکوژێ، جا ئەو کەسە کافر بێ، یان موسوڵمان بێ، هەر حەڵاڵە.

ئینجا بزانە: هەر ئاژەڵێکی تەنها لە ناو ئاودا بژیێ، ئەویش وەکو ماسی حەڵاڵە، بەڵام ئەوەی لە ناو ئاو و لە دەرەوەی ئاو ئەژیێ: وەکو بۆقو قرژاڵو مار، ئەوە حەرامە.

دووەم: (وَالْجَرادُ) کلۆی مردووش حەڵاڵە بخورێ.

(وَدَمانِ حَلالاَنِ) هەروەها دوو خوێنیش بۆ ئێمە حەڵاڵن (اَلْكَبِدُ) یەکەم: جەرگ (وَالطِّحالُ) دووەم: سپڵە، واتە: پاتە ڕەشە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أُحِلَّـتْ لَنـا مَيْتَتانِ وَدَمانِ: اَلسَّمَكُ وَالْجَرادُ وَالْكَبِدُ وَالطِّحالُ﴾ رواه أحمد وابن ماجه، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو مردوو و دوو خوێن بۆ ئێمە حەڵاڵن: ماسیو کلۆ، جەرگو پاتە ڕەشە.

## ﴿ فَصْلٌ: لەباسی (أُضْحِيَة) قوربانی ﴾

قوربانی ئەوەیە: لە جەژنیقورباندا ئاژەڵێك بە نیازی خواپەرستی سەر ببڕێو بیکاتە خێر.

(وَالأُضْحِيَةُ) قوربانیکردن (سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ) سوننەتێکی زۆر گەورەیە: بۆ پیاو و ئافرەتی بالغ ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ماعَمِلَ آدَمِيٌّ مِنْ عَمَلٍ يَوْمَ النَّحْرِ أَحَبَّ إِلَـى اللهِ مِنْ إِهْراقِ الدَّمِ إِنَّها لَتَأْتِي يَوْمَ الْقِيامَةِ بِقُرُونِها وَأَشْعارِها وَأَظْلاَفِها وَإِنَّ الدَّمَ لَيَقَعُ مِنَ اللهِ بِمَكانٍ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ عَلَى الأَرْضِ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە جەژنی قورباندا هیچ کردەوەیەکی ئادەمیزاد خۆشەویستتر نیە لە لای خوای گەورە لە کوشتنەوەی قوربانی، بێگومان لە ڕۆژی قیامەت قوربانیەکە دێتە تەرازوی چاکەکانی: بە قۆچەکانیەوەو بە مووەکانیەوەو بە سمەکانیەوە، خوێنی قوربانی پێش ئەوەی بڕژێتە سەر زەوی، لە لای خوا شوێنی خۆی ئەگرێ.

وَيُجْزِىءُ فِيها: اَلْجَذَعُ مِنَ الضَّأْنِ، وَالثَّنِيُّ مِنَ الْمَعْزِ، وَالثَّنِيُّ مِنَ الْإِبِلِ، وَالثَّنِيُّ مِنَ الْبَقَرِ، وَتُجْزِىءُ الْبَدَنَةُ عَنْ سَبْعَة، وَالْبَقَرَةُ عَنْ سَبْعَة، وَالشَّاةُ عَنْ واحِد. وَأَرْبَعٌ لاَ تُجْزِىءُ فِي الضَّحايا: اَلْعَوْراءُ الْبَيِّنُ عَوَرُها، وَالْعَرْجاءُ الْبَيِّنُ عَرَجُها، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُها، وَالْعَجْفاءُ الَّتِي ذَهَبَ مُخُّها مِنَ الْهُزالِ.

---

(وَيُجْزِىءُ فِيها) ئەو جۆرە ئاژەڵانەی دروستە-مێیەو نێرەیان-بکرێنە قوربانی، ئەمانەن: یەکەم: (اَلْجَذَعُ مِنَ الضَّأْنِ) مەڕی یەك ساڵە، یان زیاتر. دووەم: (وَالثَّنِيُّ مِنَ الْمَعْزِ) بزنی دوو ساڵە، یان زیاتر. سێیەم: (وَالثَّنِيُّ مِنَ الإِبِلِ) ووشتری پێنج ساڵە، یان زیاتر. چوارەم: (وَالثَّنِيُّ مِنَ الْبَقَرِ) ڕەشە ووڵاغی دوو ساڵە، یان زیاتر، جا مانگا بێ، یان گامێش بێ. واتە: جگە لەو چوار جۆرانە هیچ ئاژەڵێکیتر بە قوربانی ناچێ، هەروەها ئەگەر تەمەنیشیان لە تەمەنی دیارکراو کەمتر بێ، نابنە قوربانی.

(وَتُجْزِىءُ الْبَدَنَةُ عَنْ سَبْعَة) دروستە بە حەفت کەسان یەك ووشتر بکەنە قوربانی (وَالْبَقَرَةُ عَنْ سَبْعَة) هەروەها یەك ڕەشەووڵاغیش دروستە حەفت کەس بیکەنە قوربانی ﴿عَنْ جابِرٍ: نَحَرْنا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْحُدَيْبِيَةِ اَلْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَة وَالْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَة﴾ رواه مسلم، (جابر) فەرمووی: لە (حودەیبیە) لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ووشترمان بۆ حەفت کەسان سەربڕی و مانگاش بۆ حەفت کەسان.

(وَالشَّاةُ عَنْ واحِد) بزن و مەڕ-هەر یەکە-بۆ یەك کەس بە قوربانی ئەچێ ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ ثُمَّ ضَحَّى بِهِ﴾ رواه مسلم، (عائشة) فەرمووی: بەرانێکی شاخداریان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، ئەویش کردیە قوربانی.

(وَأَرْبَعٌ لاَ تُجْزِىءُ فِي الضَّحايا) چوار ئاژەڵ هەنە دروست نیە بکرێنە قوربانی: یەکەم: (اَلْعَوْراءُ الْبَيِّنُ عَوَرُها) ئەو ئاژەڵەی چاوێکی کوێر بێ بە ئاشکرایی. دووەم: (وَالْعَرْجاءُ الْبَيِّنُ عَرَجُها) ئەو ئاژەڵەی بە ئاشکرایی بشەلێ. سێیەم: (وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُها) ئەو ئاژەڵەی بە ئاشکرایی نەخۆش بێ. چوارەم: (وَالْعَجْفاءُ الَّتِي ذَهَبَ مُخُّها مِنَ الْهُزالِ) ئەو ئاژەڵەی لە بەر لاوازی مێشکی نەمابێ. کەواتە: ئاژەڵی گێژیش نابێتە قوربانی ﴿عَنِ الْبَراءِ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَرْبَعٌ لاتَجُوزُ فِي الأَضاحِي: اَلْعَوْراءُ الْبَيِّنُ عَوَرُها، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُها، وَالْعَرْجاءُ الْبَيِّنُ عَرَجُها، وَالْعَجْفاءُ الَّتِي لاتُنْقِي﴾ رواه اصحاب السنن، واتەی دیارە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو ئاژەڵەی ئەکرێتە قوربانی نابێ هیچ کەموکوریەکیتریشی تێدابێ: کە ببێتە هۆی گۆشت کەمی، کەوابوو: ئاژەڵی ئاوس و ئاژەڵی گرووـبە خروشت بە قوربانی ناچێ، بەلام لە لای چەند زانایەك دروستە: ئاژەڵی ئاوس بکرێتە قوربانی، بەو مەرجەی ئاوسیەکەی کاری لە گۆشتەکەی نەکردبێ.

وَيُجْزِئُ الْخَصِيُّ وَالْمَكْسُورُ الْقَرْنِ، وَلاَ تُجْزِئُ الْمَقْطُوعَةُ الأُذُنِ وَالذَّنَب، وَوَقْتُ الذَّبْحِ مِنْ وَقْتِ صَلاَةِ الْعِيدِ إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ مِنْ آخِرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ. وَيُسْتَحَبُّ عِنْدَ الذَّبْحِ خَمْسَةُ أَشْيَاءَ: اَلتَّسْمِيَةُ، وَالصَّلاَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَاسْتِقْبَالُ الْقِبْلَةِ، وَالتَّكْبِيرُ، وَالدُّعَاءُ بِالْقَبُولِ. وَلاَ يَأْكُلُ الْمُضَحِّي شَيْئاً مِنَ الأُضْحِيَةِ الْمَنْذُورَةِ،

---

(وَيُجْزِئُ الْخَصِيُّ) ئاژەڵی خەسێندراو بە قوربانی ئەچێ (وَالْمَكْسُورُ الْقَرْنِ) هەروەها ئاژەڵی قۆچ شکاویش بە قوربانی ئەچێ.

(وَلاَ تُجْزِئُ الْمَقْطُوعَةُ الأُذُنِ) بەڵام ئەو ئاژەڵەی کە گوێی لێکراوەتەوە، دروست نیە بکرێتە قوربانی، هەرچەند پارچەیەکی کەمیش بێ، بەڵام ئیمام (أبوحنیفة) فەرموویەتی: ئەگەر لە سێیەکی گوێی کەمتری لێکرابێوە، دروستە بکرێتە قوربانی.

ئینجا بزانە: ئەگەر گوێی بچووك بوو، یان قلێشرابێوەو هیچیشی لێنەکرابێوە، هەر دروستە بکرێتە قوربانی.

(وَالذَّنَبِ) هەروەها دروست نیە ئاژەڵی کلك براو، یان دونگ براو، یان گوان براو بکرێتە قوربانی، هەرچەند کەمیشی لێکرابێتەوە بەڵام ئەگەر زۆربەی ددانەکانی نەمابن و کەمترەکەیان مابن، ئەوە دروستە بکرێتە قوربانی.

(وَوَقْتُ الذَّبْحِ) کاتیکوشتنەوەی قوربانی دەست پێئەکا (مِنْ وَقْتِ صَلاَةِ الْعِيدِ) لە کاتی تەواوبوونی نوێژی جەژنی قوربان، واتە: لەو کاتەی ڕۆژ بە ئەندازەی ڕمێك بەرز ئەبێتەوە (إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ) تا ڕۆژ ئاوا ئەبێ (مِنْ آخِرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ) لە سێیەمین سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنیقوربان، واتە: چوار ڕۆژان ماوەی هەیە ﴿عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِي كُلِّ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ ذَبْحٌ﴾ رواه ابن حبان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرسێك ڕۆژەکانیدوای جەژن ڕۆژی سەربڕینن.

(وَيُسْتَحَبُّ عِنْدَ الذَّبْحِ) سوننەتە لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵ (خَمْسَةُ أَشْيَاءَ) پێنج شت: (التَّسْمِيَةُ) یەکەم: (بِسْمِ الله)ی کردن. (وَالصَّلاَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ)دووهەم: سەلاوات لێدان لە سەر پێغەمبەر ﷺ.(وَاسْتِقْبَالُ الْقِبْلَةِ)سێیەم: ئاژەڵەکە ڕوو لە قیبلە بکرێ. (وَالتَّكْبِيرُ) چوارەم: سێ جار بڵێ (اللهُ أكبَر). (وَالدُّعَاءُ بِالْقَبُولِ) پێنجەم: دوعا بکاو بڵێ: خوایە لێم قبوڵ بکە.

(وَلاَ يَأْكُلُ الْمُضَحِّي) دروست نیە ئەو کەسەی قوربانی ئەکا بەخۆیو منداڵەکانی بخۆن (شَيْئاً) هیچ شتێك (مِنَ الأُضْحِيَةِ الْمَنْذُورَةِ) لەو قوربانیەی کە لە سەر خۆی نەزری کردوە، واتە: گوتبێتی لە سەرم نەزربێ قوربانی بکەم. یان گوتبێتی: لە سەرم بێ ئەم ئاژەڵە بکەمە قوربانی. کەوابوو: ئەبێ پیستەو سەرو پێیەکەشی گشتی بکاتە خێر.

وَيَأْكُلُ مِنَ الأُضْحِيَةِ الْمُتَطَوَّعِ بِها، وَلاَ يَبِيعُ مِنَ الأُضْحِيَةِ شَيْئاً، وَيُطْعِمُ الْفُقَراءَ وَالْمَساكِينَ.
(فَصْلٌ) وَالْعَقِيقَةُ مُسْتَحَبَّةٌ، وَهِيَ الذَّبِيحَةُ عَنِ الْمَوْلُودِ يَوْمَ سابِعِه، وَيُذْبَحُ عَنِ الْغُلاَمِ شَاتانِ وَعَنِ الْجارِيَةِ شاةٌ، وَيُطْعِمُ الْفُقَراءَ وَالْمَساكِينَ.

---

(وَيَأْكُلُ) دروسته بخوا بەخۆیو منداڵەکانی (مِنَ الأُضْحِيَةِ الْمُتَطَوَّعِ بِها) لەو قوربانیەی کە سوننەتە، جا باشتر ئەوەیە: لە جەرگی قوربانیەکە بخواو ئەوی‌تریش گشتی بکاتە خێر، وە ئەگەر زێتریش بخوا هەر دروستە، بەڵام سوننەتە لە سێیەکێکی زیاتر نەخوا.
(وَلاَ يَبِيعُ مِنَ الأُضْحِيَةِ شَيْئاً) دروست نیە هیچ لە قوربانیەکە بفرۆشێ، وە نابێ هیچیش لە قوربانیەکە بە ناوی کرێ بداتە سەربڕەکە، کەوابوو: ئەبی بێچووی قوربانیەکەو پیستەو مووەکانیو سەروپێیەکەی: یان بکاتە خێر، یان بۆ خۆی دابنێ.
(وَيُطْعِمُ الْفُقَراءَ وَالْمَساكِينَ) ئەبی قوربانی بە ناوی‌خێر بە تازی بدرێتە گەداو هەژارانی موسوڵمان، هەروەها دروستە قوربانیی سوننەت بدرێتە دەوڵەمەندان، بەڵام هی نەزرکراو دروست نیە.
﴿پاشکۆ﴾: نیەتهێنانی قوربانی واجبە، کەوابوو: دروست نیە لەجیاتی کەسێکی‌تر قوربانی بکا، تا ئیزنی لێوەرنەگرێ، هەروەها قوربانی‌کردن بۆ مردوو دروست نیە ئەگەر وەسێتی نەکردبێ، جا ئەگەر وەسێتی کردبو قوربانیی بۆ بکرێ، ئەوەی قوربانیی بۆ ئەکا، ئەبی نیەتی لەجیاتی بێنێو نابێ بەخۆی لێی بخواو نابێ بیداتە دەوڵەمەندان.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی (عَقِيقَة) واتە: هۆزەبانەی منداڵ ﴾

(وَالْعَقِيقَةُ) هۆزەبانەی منداڵ (مُسْتَحَبَّةٌ) زۆر خێرە (وَهِيَ) هۆزەبانە ئەمەیە: (الذَّبِيحَةُ) کوشتنەوەی ئاژەڵێکە (عَنِ الْمَوْلُودِ) لە خۆشیی لەدایکبوونی منداڵەکە (يَوْمَ سابِعِه) لە ڕۆژی حەفتەمینی لەدایکبوونەکەی ﴿عَنْ سَمُرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: كُلُّ غُلاَمٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سابِعِه وَيُحْلَقُ وَيُسَمَّى﴾ رواه‌اصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر منداڵێك کە لە دایك ئەبێ، قەدەغە ئەکرێ لە ڕۆژی قیامەت تکا بۆ دایكو باوکی بکا، تا لە ڕۆژی حەفتەمی لە دایکبوونی‌دا هۆزەبانەی بۆ ئەکرێ، هەر لە ڕۆژی حەفتەمیشی سەری ئەتاشرێو ناوی لێئەندرێ.
(وَيُذْبَحُ عَنِ الْغُلاَمِ) سوننەتە ئەو هۆزەبانەی بۆ کوڕ ئەکوژرێتەوە (شاتانِ) دوو مەڕ بن، یان دوو بزن بن، وەکو بزنو مەڕی قوربانی (وَعَنِ الْجارِيَةِ) بۆ هۆزەبانەی کیژ (شاةٌ) یەك مەڕ، یان یەك بزن، وەکو هی قوربانی، بەڵام بۆ نێرینەش تەنها مەڕێك، یان بزنێك هەر دروستە، هەروەها گاجووتێك بۆ حەفت منداڵان ئەکرێتە هۆزەبانە.
(وَيُطْعِمُ الْفُقَراءَ وَالْمَساكِينَ) ئەو هۆزەبانەیە سوننەتە بدرێتە هەژارو گەدایان، هەروەها سوننەتە بە کوڵاویی بیاندرێتێ، بە تازیش دروستە، بەڵام وا باشە: ڕانی ڕاستەی ئاژەڵەکە

—هەمووی—بداتە مامانەکە، هەروەها لە کاتی سەربڕین بڵێ: (بِسْمِ اللهِ)، ئینجا نیەتی مۆزەبانەکە بێنێو بڵێ: ئەوە مۆزەبانەی فلانە منداڵەیە.
جا بزانە: ئەو کەسەی مۆزەبانە ئەکا، ئەبی ئەو کەسە بێ: کە بەخێوکردنیمنداڵەکەی لە ئەستۆیە: وەك باوکو باپیرەو دایکو..هتد، کەوابوو: مۆزەبانەکردنی بێگانە دروست نیە.
هەروەها بزانە: ئەگەر ئەو منداڵە لە پێش ڕۆژی حەفتەمین، یان لە دوای ڕۆژی حەفتەمین بمرێ، مۆزەبانەکەی هەر سوننەتە، هەروەها ئەگەر مۆزەبانچیەکە توانای هەبوو، بەلام دوای خست، ئەوە تا منداڵەکە بلۆغی ئەبێ، ماوەی مۆزەبانەکە هەر ئەمێنێ.
دیسان بزانە: مەبەست لە سەرتاشین ئەوەیە: لە دوای کوشتنەوەی مۆزەبانەکە سەری منداڵەکە بتاشێو بە گرانایی مووەکانی زێڕ، یان زیو بکاتە خێر، وە جیاوازی کیژو کوڕ نیە.
هەروەها مەبەست لە ناو لێنان ئەوەیە: لە ڕۆژی حەفتەمین ناوێکی خۆشی لێبنرێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: تَسَمُّوا بِأَسْمَاءِ الأَنْبِيَاءِ وَأَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلَى اللهِ عَبْــدُاللهِ وَعَبْدُالرَّحْمَنِ﴾ رواهابوداود، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ناوی پێغەمبەران لە خۆتان بنێن، وە خۆشەویسترین ناو لە لای خوا ناوی (عبدالله)و (عبدالرحمن)ە.
هەروەها سوننەتە دەمیمنداڵەکە شیرین بکرێ بە خورما، یان بە شتێکیتر، واتە: مرۆڤێکی خواپەرست ئەو کارە بکا، هەروەها بانگدانیش لە گوێی منداڵەکەدا سوننەتە ﴿عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَذَّنَ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ حِينَ وَلَدَتْــهُ فَاطِمَــةُ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەرﷺ بانگی دا لە گوێی حەزرەتی(حسن) کاتێ لە دایك بوو.
هەندێك زانا فەرموویانە: سوننەتە بانگ لە گوێیڕاستەدا بێ، ئیقامەتیش لە گوێی چەپەدا بکا.

## ﴿سوننەتکردنی منداڵ﴾

ئینجا کە منداڵەکە خۆی گرت، سوننەتە بەخێوکەرەکە سوننەتی بکا، جا ئەگەر بەخێوکەرەکەی سوننەتی نەکردبو، واجبە: کە بلۆغی بوو، خۆی سوننەت بکا، سوننەتکردن ئەمەیە: ئەو چەرمەی سەری ئەندامی میزکردنی نێرینەی داپۆشیوە هەمووی لێبکرێتەوەو، ئەو پۆپیتەی ئەکەوێتە سەرەوەی کونی میزکردنیمێینە نەختێکی لێبکرێتەوە. بەلام لە فەرموودەیەکدا هاتوە: سوننەتکردن لە سەر ئافرەتان واجب نیە، بەڵکو سوننەتە.
﴿پاشکۆ﴾: مۆزەبانەی ئاژەڵیش سوننەتە، واتە: کاتێ مەڕو بزنو مانگا-چێڵەکان دەستیان بە زان کرد، یەکەم بێچوو بە مەبەستی خواپەرستی بکوژێتەوەو بیکاتە خێر، بۆ ئەوەی خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ئاژەڵەکانی.

# (كـــتابُ السَّـــبْقِ وَالرَّمـــي)

**وَتَصِحُ الْمُسابَقَةُ: عَلَى الدَّوابِّ، وَالْمُناضَلَةُ: بِالسِّهامِ، إِذا كانَتِ الْمَســـافَةُ مَعْلُومَـــةً وَصِفَةُ الْمُناضَلَةِ مَعْلُومَةً،**

---

**﴿(كِتابُ السَّبْقِ) ئەم پەرتووكە باسی گرۆی پێشبڕكێی سوارچاكی ئەكا ﴾**

**﴿(وَالرَّمْيِ) وە باسی گرۆی چەك هاویشتن ئەكا ﴾**

(وَتَصِحُ الْمُسابَقَةُ) پێشبڕكێی سوارچاكی دروستەو سوننەتیشە (عَلَىالدَّوابِّ) بە سواری وولاغ: وەكو ئەسپو ووشترو هێسترو كەر.

ئینجا بزانە: شوێنی لێغاردانو شوێنی لێوەستانو وولاغەكانو ماڵە گرێ لەسەركراوەكە، ئەوانە گشتی واجبە دیاری بكرێن ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ﴿: قالَ النَّبِيُّﷺ: لاَسَبْقَ إِلاَّ فِيخُفٍّ أَوْ نَصْلٍ أَوْ حافِرٍ﴾ رواه اصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: گرۆكردنی پێشبڕكێ لە هیچ كاریكدا دروست نیە، تەنها لە سواری وولاغو لە تیر هاویشتندا دروستە.

(وَالْمُناضَلَةُ) هەروەها پێشبڕكێی ئامانجانەش دروستە، واتە: نیشانە پێكاندن (بِالسِّهامِ) بە تیر هاویشتنو بە هەر چەكێكیتر: كە لە جەنگدا بە كار بێ ﴿عَنْ عُقْبَـــةَ﴿: قـــالَ النَّبِيُّﷺ فِي تَفْسِيرِ قَوْلِهِ تَعالَى(وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَااسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِباطِ الْخَيْلِ): أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ﴾ رواهمسلم، خوای گەورە فەرموویەتی: ئامادە بكەن بۆ جەنگی كافرەكان هەتا تواناتان هەیە لە هێزو لە بەخێوكردنی وولاغ، جا پێغەمبەرﷺ سێ جار فەرمووی: مەبەست لەو هێزە: چەك هاویشتنە.

كەوابوو: هەر ئەو حەدیسە بەڵگەیە: كە مەشق كردن بۆ فێربوونی چەكو فێربوونی شۆفێریو هەموو جەنگاوەریەكیتر، واجبە لە سەر موسوڵمان.

(إِذا كانَتِ الْمَسافَةُ مَعْلُومَةً) بەو مەرجەی دووریو نزیكیی ئامانجەكەو شوێنی لێغاردانەكە بزاندرێ (وَصِفَةُ الْمُناضَلَةِ مَعْلُومَةً) وە بەو مەرجەی چۆنیەتی پێكاندنی ئامانجەكەش بزاندرێ، وەكو بڵێ: ئەبی هەر یەكێك لە شەش جاران سێیان لێبدا، هەروەها دیاری بكرێ: كامەیان لە پێشان دەست پێئەكا.

ئینجا بزانە: گرۆكردن لە سەر پێشبڕكێی سوارانیو تیرهاوێشتن دروستەو هەر شتێكی لە گرۆیەكە وەربگرێ حەڵاڵە، جا ئەگەر یەكێكی بێگانە ماڵەكە بخاتە ئەستۆی خۆی، وەك بڵێ: هەر كامەتان پێش كەوت، یان لە ئامانجەكەیدا، ئەوەندەی ئەدەمێ. ئەوە دروستەو ئەبی شتەكە بدا.

هەروەها دروستیشە یەكێك لەو دوو كەسانەی گرۆیەكە ئەكەن، ماڵەكە بخاتە ئەستۆی خۆی، بەم جۆرە:

وَيُخْرِجُ الْعِوَضَ أَحَدُ الْمُتَسابِقَيْنِ: حَتَّى إِنَّهُ إِذا سَبَقَ اسْتَرَدَّهُ، وَإِنْ سُبِقَ أَخَذَهُ صاحِبُهُ، وَإِنْ أَخْرَجاهُ مَعاً لَمْ يَجُزْ إِلاَّ أَنْ يُدْخِلاَ بَيْنَهُما مُحَلِّلاً: فَإِنْ سَبَقَ أَخَذَ الْعِوَضَ، وَإِنْ سُبِقَ لَمْ يَغْرَمْ.

(كِـــتابُ الْأَيْمــــانِ وَالـــنُّذُورِ)

لاَ يَنْعَقِدُ الْيَمِينُ إِلاَّ بِاللهِ تَعَالَى أَوْ بِاسْمٍ مِنْ أَسْمائِهِ أَوْ صِفَةٍ مِنْ صِفاتِ ذاتِهِ،

---

(وَيُخْرِجُ الْعِوَضَ) ماڵەكە دائەنێ (أَحَدُ الْمُتَسابِقَيْنِ) یەكێك لەو دووانەی پێشبڕكێی سوارانێ، یان ئامانجانێ ئەكەن (حَتَّى إِنَّهُ إِذا سَبَقَ) بۆ ئەوەی ئەگەر گرەوەكەی بردەوە، واتە: پێش ئەویتر كەوت، یان ئەو لە ئامانجەكەیدا (اسْتَرَدَّهُ) ماڵەكەیخۆی وەریگرێتەوە (وَإِنْ سُبِقَ) بەڵام ئەگەر دۆڕاندی، واتە: ئەویتر پێش وی كەوت، یان لە ئامانجەكەیدا (أَخَذَهُ صاحِبُهُ) ئەو هاوڕێپێشكەوتووە، ماڵەكەی وی بۆ خۆی ئەباو لێی حەڵاڵە.

(وَإِنْ أَخْرَجاهُ مَعاً) بەڵام ئەگەر هەردووكیان هەندێك ماڵیان داناو هەر یەكە بە ویتری گوت: ئەگەر تۆ پێش كەوتی، یان لە ئامانجەكەت دا، ماڵەكەی من بۆ تۆ (لَمْ يَجُزْ) ئەو گرەوە دروست نیە، چونكە ئەبێتە قومار، قوماریش حەرامە (إِلاَّ أَنْ يُدْخِلاَ بَيْنَهُما مُحَلِّلاً) مەگەر یەكێكی سێیەمین بێننە نێوان خۆیان، تا گرەوەكەیان بۆ حەڵاڵ بكا بەم جۆرە: (فَإِنْ سَبَقَ) ئەگەر سێیەمەكە پێش هەردووكیان كەوت (أَخَذَالْعِوَضَ) ماڵەكەی هەردووكیان بۆ خۆی وەرئەگرێ، وە ئەگەر تەنها پێش یەكێكیان كەوتو لەگەڵ ئەویتریان وەك یەك بون، ئەوە ماڵی دواكەوتووەكە بۆ خۆیان بەش ئەكەن (وَإِنْ سُبِقَ) بەڵام ئەگەر دوا كەوتو ئەوانیتر هەردووكیان بە پێش ئەوی كەوتن (لَمْ يَغْرَمْ) هیچ ناداتە دووەكانیتر، جا ئەو دووانەش ئەگەر هەردووكیان وەك یەك بون، ئەوە هەر كەسەیان ماڵی خۆی بۆ خۆی، وە ئەگەر یەكێكیان پێش ئەویتر كەوت، ئەوە ماڵەكەی خۆیو هاوڕێیەكەی هەردووكی بۆ خۆیەتی.

*　　　*　　　*

﴿(كِتابُ الأَيْمانِ) ئەم پەڕتووكە باسی سوێندخواردن ئەكا﴾

﴿(وَالنُّذُورِ) وە باسی نەزركردن ئەكا﴾

(لاَ يَنْعَقِدُالْيَمِينُ) سوێندخواردن دانامەزرێ، واتە: هیچ سوێندێك لە شەرعدا بە سوێند داناندرێ (إِلاَّ بِاللهِ تَعَالَى) تەنها ئەو سوێندە نەبێ كە بە زاتی خوای گەورە بێ، وەك بڵێ: (واللهِ) ئەم كارە ئەكەم. (أَوْ بِاسْمٍ مِنْ أَسْمائِهِ) یان سوێندەكە بە ناوێكیتر بێ لە ناوەكانی خوای گەورە، وەك بڵێ: بە (ربِّ الْعالمين)، یان (بەو كەسەی گیانیمنی بە دەستە) ئەم كارە ناكەم. (أَوْ صِفَةٍ مِنْ صِفاتِ ذاتِهِ) یان سوێندەكە بە سیفەتێكی خوای گەورە بێ، وەك بڵێ: (بە گەورەییخوا، یان بە قورئان ئەم كارە ئەكەم).

وَمَنْ حَلَفَ بِصَدَقَةِ مالِه فَهُوَ مُخَيَّرٌ بَيْنَ الصَّدَقَةِ وَكَفَّارَةِ الْيَمِينِ، وَلاَ شَيْءَ فِي لَغْوِالْيَمِينِ، وَمَنْ حَلَفَ أَنْ لاَيَفْعَلَ شَيْئاً فَأَمَرَ غَيْرَهُ فَفَعَلَهُ لَمْ يَحْنَثْ،

---

کەوابوو: سوێندخواردن بە پێغەمبەرﷺو بە مزگەوتو بە سەری باوکو بە قەبری فڵان، دانامەزرێو ناپەسەندە، بەڵام بە فەرموودەی ئیمامی(شافعی) دروست نیەو حەرامە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: قَالَ النَّبِيُّﷺ: أَلاَ إِنَّ اللهَ يَنْهاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبائِكُمْ، فَمَنْ كانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئاگادار بن خوا قەدەغەی کردوە: سوێند بە سەری باوکتان بخۆن، هەر کەسێك بیەوێ سوێند بخوا، تەنها با بە خوا سوێند بخوا.

(وَمَنْ حَلَفَ بِصَدَقَةِ مالِهِ) هەر کەسێك سوێند بخوا بە کردنە خێری ماڵی خۆی، یان بە خواپەرستی‌یەکی‌تر، وەك بە شێوەی توڕەیی‌و ڕقەکاری بڵێ: ئەگەر ئەم کارە بکەم لە سەرم بێ بۆ خوا ئەم بزنە بکەمە خێر. یان بڵێ: ئەگەر جارێکی‌تر هاتمە لات ڕۆژووەکم لە سەر بێ (فَهُوَ) ئەو سوێندخۆرە (مُخَيَّرٌ) سەرپشکە (بَيْنَ الصَّدَقَةِ) لە نێوان خێرکردنەکە، یان خواپەرستی‌یەکە (وَكَفَّارَةِ الْيَمِينِ) وە لە نێوان کەففارەتی‌سوێند، واتە: یان با بزنەکە بکاتە خێر، یان کەففارەتی‌سوێند بدا ﴿عَنْ عقبةَ: عَنِ النَّبِيِّﷺ: كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ يَمِينٍ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کەففارەتی‌نەزر وەکو کەففارەتی سوێندە.

(وَلاَ شَيْءَ) هیچ گوناهو هیچ کەففارەت ناکەوێتە سەر سوێندخۆرەکە (فِي لَغْوِالْيَمِينِ) لە سوێندخواردنی سەر زمان، واتە: سوێندەکە لە دڵەوە نەبێ، وەك لە کاتی دەمەچەقە، یان توڕەیی بڵێ: (بەڵێ واللە)، یان بڵێ: (نا واللە). خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الأَيْمَانَ﴾ خوای گەورە لێتان ناگرێ بەو جۆرە سوێندانەی بە سەر زوبانتاندا دێ، بەڵام بەو سوێندە لێتان ئەگرێ کە بە ئاگاداری‌دڵ ئەیخۆن.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کەسێك بڵێ: ئەگەر ئەو کارە بکەم ببمە جولەکە، یان ببمە فەلە. یان بڵێ: بە بێ‌ئیمانی بمرم ئەو کارە ناکەم. یان بڵێ: زینام لەگەڵ دایکی خۆم کردبێ ئەو کارەم نەکردوە. ئەو جۆرە قسانە نابنە سوێندو کەففارەتی تێدا نیە، ئینجا ئەگەر مەبەستی پاکانەی خۆی بێ: کە ئەو کارە ئەکا، یان نەیکردوە، ئەوە پێ کافر نابێ، بەڵام گوناهی ئەگاتێ، کەوابوو: با بڵێ: (أَسْتَغْفِرُ اللهَ). وە ئەگەر مەبەستی ڕازی‌بوون بێ بەو شتانە، ئەوە یەکسەر کافر ئەبێو ئەبێ موسوڵمان ببێتەوە.

(وَمَنْ حَلَفَ) هەر کەسێك سوێندی خوارد (أَنْ لاَ يَفْعَلَ شَيْئاً) کارێك نەکا، واتە: گۆتی (واللە) ئەم خانووەت پێ‌نافرۆشم، یان دەرست پێ‌ناڵێم. (فَأَمَرَ غَيْرَهُ) جا فەرمانی بە کەسێکی‌تر کرد کارەکە بکا (فَفَعَلَهُ) ئەویش کارەکەی لەجیاتی وی کرد (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێ‌ناکەوێو

وَمَنْ حَلَفَ عَلَى فِعْلِ أَمْرَيْنِ فَفَعَلَ أَحَدَهُما لَمْ يَحْنَثْ.
وَكَفَّارَةُ الْيَمِينِ هُوَ مُخَيَّرٌ فِيها بَيْنَ ثَلاثَةِ أَشْياءَ: عِتْقِ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ، أَوْ إِطْعامِ عَشَرَةِ مَساكِينَ كُلُّ مِسْكِينٍ مُدٌّ، أَوْ كِسْوَتِهِمْ ثَوْباً ثَوْباً، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ.

---

کەففارەتی ناکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر لە سوێندخواردنەکەدا مەبەستی ئەوە بێ: کە نە بەخۆیو نە کەسێکیتر ئەو کارە نەکا، ئەوە سوێندی لێتەکەوێ.

(وَمَنْ حَلَفَ) وە هەر کەسێك سوێند بخوا (عَلى فِعْلِ أَمْرَيْنِ) لە سەر نەکردنی دوو کار بە یەکەوە، وەك بڵێ: (واللە) ئەم هەردوو کەوڵیەت پێنافرۆشم. (فَفَعَلَ أَحَدَهُما) ئەویش تەنها یەکێکی کرد، واتە: یەك کەوای پێفرۆشت (لَمْ يَحْنَثْ) سوێندی لێناکەوێ، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوە بێ هەر هیچیانی نەکا: نە بە تەنهاو نە بە یەکەوە، ئەوە سوێندی لێتەکەوێ.

﴿(كَفّارَة)ی سوێند﴾

(وَكَفّارَةُ الْيَمِينِ) کەففارەتی سوێند -کە خوا داینـاوە بدرێ- ئەگەر سوێندخۆرەکە پەشیمان بۆوە، واتە: سوێندخۆرەکە سوێندی لێکەوت (هُوَ مُخَيَّرٌ) ئەو سوێندخۆرە سەرپشکە (فِيها) لەو کەففارەتدانەدا (بَيْنَ ثَلاثَةِ أَشْياءَ) لە نێوان کردنی سێ شت:

(عِتْقِ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ) یەکەم: یان ئازادکردنی کۆیلەکی موسوڵمان. (أَوْ إِطْعامِ عَشَرَةِ مَساكِينَ) دووەم: یان خواردن بداتە دە کەدلو هەژاران (كُلُّ مِسْكِينٍ مُدٌّ) هەر هەژارێك یەك مستە دانەوێڵەی بدرێتێ -هەر مستێك (٦٠٥) گرامە- ئەبی دانەکەش دەنکی ساغ بێ، واتە: نابێ ئەو دانە کرابێتە چێشتو ئینجا بیاندرێتێ. (أَوْ كِسْوَتِهِمْ) سێیەم: یان بەرگ بۆ ئەو دە هەژارانە بکا (ثَوْباً ثَوْباً) هەر هەژارێکی یەك جلی بداتێ، جا کراسێك بێ، یان دەرپێیەك بێ، یان ژێرکراسێك بێ، بەڵام گۆرەویو پێڵاو دروست نینە.

(فَإِنْ لَمْ يَجِدْ) جا ئەگەر هیچی لەو سێیانە دەست نەکەوت (فَصِيامُ ثَلاثَةِ أَيّامٍ) واجبە: سێ رۆژان بە نیەتیکەففارەتیسوێند بەرۆژوو بێ، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْكِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِأَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُأَيْمَانِكُمْ إِذَاحَلَفْتُمْ﴾ راڤەی دیارە.

﴿ئاگاداری﴾: لە لای ئیمامی(حنفي) دروستە: نرخیدانەوێڵەکە، یان نرخیجلەکان بدرێتە دە هەژارەکان، بەڵام ئاگاداریە: کەففارەتیسوێند لە لای ئیمامی(حنفي) نزیکەی دوو کیلۆیە بۆ هەر هەژارێك.

﴿پاشکۆ﴾: سوێندی منداڵو شێتو زۆرلێکراو دانامەزرێ، وە هەر کەسێك لە بیری چوبو: کە سوێندی خواردوەو ئیشەکەی کرد، یان نەیەزانی سوێندی لە سەر ئەو شتە خواردوە، یان ئەیزانی بەڵام بە زۆرلێکردن ئیشەکەیان پێکرد، لەو سێیانەدا لە هیچیان سوێندی لێناکەوێو کەففارەتی ناکەوێتە سەر، کەوابوو: سوێندەکەی هەر بەردەوامەو لە سەری لاناچێ.

(فَصْلٌ) وَالنَّذْرُ يَلْزَمُ فِي الْمُجازاةِ عَلَى مُباحٍ وَطاعَةٍ كَقَوْلِه: إنْ شَفَى اللهُ مَرِيضي فَلِلّـهِ عَلَيَّ أَنْ أُصَلِّيَ، أَوْ أَصُومَ، أَوْ أَتَصَدَّقَ. وَيَلْزَمُهُ مِنْ ذَلِكَ مايَقَعُ عَلَيْهِ الإسْمُ، وَلاَ نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ كَقَوْلِه: إنْ قَتَلْتُ فُلاَناً فَلِلّه عَلَيَّ كَذَا.

---

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی نەزرکردن ﴾

واته: واجبکردنی خوا پەرستیەك كه له سەری واجب نیه. ئینجا بزانه: نەزر دوو جۆره:

یەكەم: (نذرُ اللّجاج) واته: نەزری رقەكاریو تورەیی، وەك بلێ: ئەگەر گفتوگۆت لەگەڵ بكەم له سەرم نەزربێ بەرۆژوو ببم. جا ئەبێ: یان رۆژووەكە بگرێ، یان كەففارەتی سوێندێك بدا، هەروەك له پەرتووكی سوێنددا باسمان كرد.

جا ئەمەش بزانه: ئەو جۆره نەزره مەكروهە، چونكه وەكو سوێند وایه ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَنَّ النَّبِيَّﷺ نَهَى عَنِ النَّذْرِ، وَقَالَ: إِنَّهُ لاَيَأْتِي بِخَيْرٍ وَإِنَّما يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نەزر مەكەن، چونكه نەزر هیچ چاكەتان بۆ ناهێنێ، تەنها ماڵ له دەستی رەزیل دەرئەهێنێ.

دووەم: (نَذْرُالتَّبَرُّرْ) واته: نەزری چاكەكردن، ئەم بەشەیان خێره، خوای گەوره فەرموویەتی: ﴿وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ﴾ با نەزركراوی خۆیان جێبەجێ بكەن.

(وَالنَّذْرُ) نەزركردنی چاكه (يَلْزَمُ) واجب ئەبێ له سەر نەزركەرەكه (فِي الْمُجازاةِ) له پاداشتی بوونی شتێكی باش، یان لاچوونی شتێكی خراپ (عَلَى مُباحٍ) بەو مەرجەی نەزركردنەكه حەڵاڵ بێو (وَطاعَةٍ) نەزركراوەكەش خواپەرستی بێ، واته: ئینجا له سەری واجب ئەبێ (كَقَوْلِه) وەك بلێ: (إِنْ شَفَى اللهُ مَرِيضِي) ئەگەر خوا نەخۆشەكەم چاك بكاتەوە، یان بلێ: ئەگەر خوا كوڕێكی پێبەخشیم (فَلِلّهِ عَلَيَّ أَنْ أُصَلِّيَ أَوْ أَصُومَ) له سەرم نەزربێ بۆ خوا بەرۆژوو ببم، یان له سەرم واجب بێ نوێژێك بۆ خوا بكەم (أَوْ أَتَصَدَّقَ) یان بلێ: خێرێكم له سەربێ بیكەم (وَيَلْزَمُهُ) ئەگەر مرازەكەی هاتەجێ، له سەری واجب ئەبێ (مِنْ ذَلِكَ) لەو شتانەی له سەره خۆی نەزر كردوه (مايَقَعُ عَلَيْهِ الإسْمُ) ئەندازەیەكی وەها: كه ناوی شتەكەی لێبێ، واته: به لای كەمی ئەبێ دوو رەكعەت نوێژ بكا، یان رۆژێك بەرۆژوو بێ، وه شتێكی كەمیش بكاته خێر.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر -لەگەڵ نەزركردنەكە- ئەندازەیەكی دیاری كردبو، وەك بلێ: له سەرم بێ ئەم مەره، یان ده دینار بكەمه خێر، یان مانگێك بەرۆژوو ببم. ئەوه به گوێرەی گوتنی خۆی له سەری واجب ئەبێ.

(وَلاَ نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ) نەزر دروست نیه لەو شتانەی كه گوناهن (كَقَوْلِه) وەك به ناحەق بلێ: (إِنْ قَتَلْتُ فلاناً) ئەگەر فلانكەسم كوشت (فَلِلّهِ عَلَيَّ كَذا) له سەرم بێ ئەم شته بكەم، یان بلێ: له سەرم نەزر بێ فلانكەس بكوژم، یان زینا بكەم ﴿عَنْ عِمْرانَ بِنِ حُصَيْنٍ:

وَلاَ يَلْزَمُ النَّذْرُ عَلَى تَرْكِ مُباحٍ كَقَوْلِه: لاَ آكُلُ لَحْماً، وَلاَ أَشْرَبُ لَبَناً، وَما أَشْبَهَ ذَلِكَ.

قالَ النَّبيُّ ﷺ: لاَ وَفاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةٍ وَلاَ فِيما لاَيَمْلِكُ الْعَبْدُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جێبەجێکردنی نەزری گوناه دروست نیەو نەزرکردنی شتێك کە هی خۆی نەبێ دروست نیە.

﴿ئاگاداری﴾: نەزری چاکە دانەمەزرێو واجب نابێ، هەرچەند بە شتێکیتریشی نەبەستبێ، وەك یەکسەر بڵێ: لە سەرم نەزربێ بەڕۆژوو ببم، یان بڵێ: لە سەرم نەزر بێ قوربانی بکەم.

(وَلاَ يَلْزَمُ النَّذْرُ) نەزر دانامەزرێ (عَلَى تَرْكِ مُباحٍ) لە سەر کردنو نەکردنی شتی حەڵاڵ: کە پەیوەندی بە خواپەرستیەوە نەبێ (كَقَوْلِه) وەك بڵێ: (لاَ آكُلُ لَحْماً) لە سەرم نەزربێ گۆشت ناخۆمو (وَلاَ أَشْرَبُ لَبَناً) شیر ناخۆمەوە (وَما أَشْبَهَ ذَلِكَ) وە هەرچی لەو شێوەیە بێ، وەك بڵێ: لە سەرم نەزربێ ئەخەوم، یان ئەم ترێیە ئەخۆم ﴿عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَنَّ النَّبيَّ ﷺ رَأَى رَجُلاً قائِماً فِي الشَّمْسِ، فَقالُوا: إِنَّهُ نَذَرَ أَنْ يَقُومَ وَلاَ يَقْعُدَ وَلاَ يَسْتَظِلَّ وَلاَ يَتَكَلَّمَ وَيَصُومَ، فَقالَ: مُرُهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی لە بەر ڕۆژ بە پێوە ڕاوەستاوە، گوتیان: ئەمە نەزری کردوە: کە بەڕۆژوو بێو دانەنیشێو نەچێتە بەر سێبەرو گفتوگۆ نەکا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با دابنیشێو بچێتە بەر سێبەرو گفتوگۆ بکاو ڕۆژووەکەشی تەواو بکا.

﴿پاشکۆ﴾: نەزرکردنیماڵی بۆ کەسێکی دیارکراو دروستە بەو مەرجەی گوناهکاری نەبێ، وەك بڵێ: ئەم خانووەم نەزری فڵانکەس کرد، یان بڵێ: نەزری ئەم مزگەوتە بێ. کەوابوو: خانووەکە ئەبێتە ملکی نەزرێکراوەکەو پەشیمانبوونەوەش دروست نیە، بەڵام نەزرکردنی (عبادة)، واتە: پەرستن-جگە لە خوا-بۆ هیچ کەسێکیتر دروست نیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر نەزرکەرەکە مرد، واجبە: پێش بەشکردنی میرات ئەو نەزرەی بۆ جێبەجێ بکرێ، هەروەها ئەگەر نەزرەکە تەنها خواپەرستی بوو، میراتگرەکان بۆی جێبەجێ ئەکەن ﴿عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: اسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبادَةَ النَّبيَّ ﷺ: فِي نَذْرٍ كانَ عَلَى أُمِّهِ تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ؟ فَقالَ: إِقْضِهِ عَنْها﴾ رواه الشيخان، (سَعْد) پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد: دەربارەی دایکی کە نەزری لە سەر بووەو مردوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ بۆی بکە.

ئینجا بزانە: هەر خێر کردنێك-کە نەزری کردبێ- دروست نیە بیداتە دەوڵەمەندان، جیاوازی نەزری زیندووانو مردووان نیە، هەروەها دروست نیە: نە بەخۆیو نە ئەو کەسانەی ئەرکی بەخێوکردنیانی لە سەر ئەوە، لەم نەزرکراوە بخۆن.

* * *

## (كتابُ الأَقْضيَة والشَّهادات)

وَلا يَجُوزُ أنْ يَلِيَ الْقَضاءَ إلاَّ مَنْ اسْتَكْمَلَتْ فيه خَمْسَ عَشَرَةَ خَصْلَةً: اَلإسْلامُ، وَالْبُلوغُ، وَالْعَقْلُ، وَالْحُرِّيَّةُ، وَالذُّكُورةُ، وَالْعَدالَةُ، وَمَعْرِفَةُ أحْكامِ الْكتاب وَالسُّنَّة،

---

﴿(كِتابُ الأَقْضِيَةِ) ئەم پەڕتووكە باسی بڕاندنەوەی كێشەی نێوان خەڵك ئەكا﴾

﴿(وَالشَّهاداتِ) وە باسی شایەدیدان ئەكا﴾

(قازی) ئەو كەسەیە: كێشەی نێوان دوو كەس، یان زیاتر ئەبڕێنێتەوەو بڕیار دەرئەكا بە گوێرەی شەریعەتی‌ئیسلام. خوای‌گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ﴾ داد لە نێوان خەڵكدا بكەو بڕیار بدە بەگوێرەی ئەو یاسایەی خوا ناردویەتی. واتە: (قورئان)و (حەدیس).

ئینجا بزانە: هەبوونی (قازی) (فَرْضُ الْكِفايَة)یە، وە ئەبێ (قازی) دەستەڵاتێكی وەهای بدرێتێ كە بتوانێ ماف بۆ خاوەن ماف وەربگرێ‌و تاوانبار سزا بدا، كەوابوو: ئەگەر شوێنێك (قازی)ی لێ‌نەبو، واجبە: دانیشتووانی ئەو شوێنە بۆ خۆیان پیاوێكی زاناو دادپەروەر بكەنە (قازی)و بڕیارەكانی جێ‌بەجێ بكەن ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: عَنِ النَّبيِّ ﷺ: كَيْفَ تُقَدَّسُ أُمَّـةٌ لاَ يُؤْخَذُ مِنْ شَديدِهِمْ لِضَعيفِهِمْ﴾ رواه‌ابن حبان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چۆن پاك ئەبێتەوە گەلێكی وەها: كە ماڵی بێ‌هێزەكەیان لە بەهێزەكەیان وەرنەگیرێ.

(وَلا يَجُوزُ) دروست نیە: (أَنْ يَلِيَ الْقَضاءَ) ببێتە (قازی) (إلاَّ مَنْ اسْتَكْمَلَتْ فيهِ) تەنها ئەو كەسە نەبێ كە تێ‌یدا كۆ ببێتەوە (خَمْسَ عَشَرَةَ خَصْلَةً) پانزە سیفەت:

یەكەم: (ألأسلامُ) موسوڵمان بێ، خوای‌گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ خوای‌گەورە هیچ ڕێگایەكی نەداوە كافرەكان فەرمان بە سەر موسوڵماناندا بكەن. بەڵام ئیمامی(حنفی) فەرموویەتی: دروستە كافر بكرێتە (قازی) بۆ كافرەكان.

دووەم: (وَالْبُلُوغُ) بلۆغی بووبێ‌و منداڵ نەبێ. سێ‌یەم: (وَالْعَقْلُ) عەقڵی هەبێ. چوارەم: (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازاد بێ. پێنجەم: (وَالذُّكُورَةُ) پیاو بێ ئافرەت نەبێ. ﴿عَنْ أَبِي‌بكرةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً﴾ رواه‌البخاری، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو گەلە بەختەوەر نابێ: كە كاروباریان بدەنە دەست ئافرەت.

شەشەم: (وَالْعَدالَةُ) دادپەروەر بێ، كەوابوو: دروست نیە (فاسق) ببێتە (قازی)، چونكە گومان لێكراوە. حەفتەم: (وَمَعْرِفَةُ أَحْكامِ الْكِتابِ) لە بڕیارەكانی قورئانی پیرۆز شارەزا بێ. (وَالسُّنَّةِ) وە لە بڕیارەكانی حەدیسی پێغەمبەر ﷺ شارەزا بێ، واتە: بزانێ كامە ئایەت‌و كامە حەدیس بڕیارەكانی گشتی‌یەو كامەیان تایبەتی‌یە، كامەیان بێكار بووەو كامەیان بەكارە، ئایا كامە حەدیس بەهێزەو كامەیان بێ‌هێزە.

وَمَعْرِفَةُ الإِجْماعِ، ومَعْرِفَةُ الإِخْتِلافِ، وَمَعْرِفَةُ طُرُقِ الإِجْتِهادِ، وَمَعْرِفَةُ طَرَفٍ مِنْ لِسانِ الْعَرَبِ، وَمَعْرِفَةُ تَفْسِيرِ كِتابِ اللهِ تَعالى، وَأَنْ يَكُونَ سَمِيعاً، وَأَنْ يَكُونَ بَصِيراً، وَأَنْ يَكُونَ كاتِباً، وَأَنْ يَكُونَ مُسْتَيْقِظاً. وَيُسْتَحَبُّ أَنْ يَجْلِسَ فِي وَسَطِ الْبَلَدِ فِي مَوْضِعٍ بارِزٍ لِلنَّاسِ،

---

**هەشتەم:** (وَمَعْرِفَةُ الإِجْماعِ) بزانێ: زانایانی ئیسلام لە سەر کامە بڕیار یەکدەنگەن و (وَمَعْرِفَةُ الإِخْتِلافِ) هەروەها لە کامە بڕیاردا جیاوازن. **نۆیەم:** (وَمَعْرِفَةُ طُرُقِ الإِجْتِهادِ) ڕێگەی (اجتهاد)، واتە: ڕێگای وەرگرتنی بڕیارەکانی خواو پێغەمبەرﷺ لە قورئان‌و حەدیس بزانێ، ئەو ڕێگایە بە زانینی (أصول الفقه) ئەدۆزرێتەوە. **دەیەم:** (وَمَعْرِفَةُ طَرَفٍ مِنْ لِسانِ الْعَرَبِ) بەگوێرەی پێویست ڕێزمانی‌عەرەبی بزانێ: وەك (نَحو، صَرْف، بَلاغة)، وە ئەبی واتەی عەرەبیش تێبگا.

**یانزەم:** (وَمَعْرِفَةُ تَفْسِيرِكِتابِ اللهِ تَعالَى) مانای قورئانی پیرۆز بزانێ بەگوێرەی پێویست.

**دوانزەم:** (وَأَنْ يَكُونَ سَمِيعاً) بیسەر بێ‌و کەڕ نەبێ. **سێنزەم:** (وَأَنْ يَكُونَ بَصِيراً) بینەر بێ‌و کوێر نەبێ. **چواردەم:** (وَأَنْ يَكُونَ كاتِباً) نووسەر بێ، واتە: بزانێ بنووسێ. **پانزەم:** (وَأَنْ يَكُونَ مُسْتَيْقِظاً) هەشیارو چاپوك بێ، نەوەك فێڵی لێبکرێ.

**﴿ئاگاداری﴾:** ئەگەر (قازی) ئەو مەرجانەی لێهاتنە جێ، با بە (اجتهاد)ی خۆی بڕیارەکانی شەرعی لە قورئان‌و حەدیس وەربگرێ‌و داد لە نێوان خەڵکدا بکا، بەڵام هەر کەسێك نەگەیشتبوە پلەی (اجتهاد)—جا (قازی) بێ، یان کەسێکی‌تر—واجبە: بەگوێرەی یەکێك لەم چوار (مَذْهَب)ە ڕەفتار بکا: (حنفي، مالكي، شافعي، حنبلي)؟ چونکە زانایانی ئەو چوار مەزهەبە بە پوختی بڕیارەکانی شەرعیان لە قورئان‌و حەدیس هەڵێنجاوەو لە ناو کتێبەکانی خۆیاندا تۆماریان کردوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ ئێوە پرسیار لە زانایانی قورئان بکەن، ئەگەر نازانن.

کەوابوو: دروست نیە هەر کەسێك قورئانی خوێندو چەند حەدیسێك شارەزا بوو، بچێتە مەیدانی (فتوا)و بڕیارێکی شەرعی دەر بکا، تا لە یەکێك لەو چوار مەزهەبە زانست وەرنەگرێ.

جا بزانە:—جگە لەو چوارانە—مەزهەبی‌تریش هەنە، بەڵام زانایانی ئیسلام بە تێکڕایی هەر لەو چوار مەزهەبانە دڵنیاییان دەربڕیوە، چونکە جێگای باوەڕن‌و، بۆ ئەوەی پەرتەوازەیی ڕوونەدا، ئەوەش بە کارێکی باش دا ئەنرێ، چونکە (عبدالله بن مسعود)ﷺ فەرموویەتی: ﴿مارَآهُ الْمُؤْمِنُونَ حَسَناً فَهُوَ عِنْدَاللهِ حَسَنٌ﴾ رواه‌الإمام مالك، هەر شتێك زانایانی ئاینی ئیسلام بە باشی بزانن، لە لای خودا بە باش دائەنرێ.

(وَيُسْتَحَبُّ) سوننەتە (أَنْ يَجْلِسَ فِي وَسَطِ الْبَلَدِ) (قازی) لە ناوەندی شار دابنیشێ (فِي مَوْضِعٍ) لە شوێنێکی‌وەها (بارِزٍ لِلنَّاسِ) کە دیار بێ‌و گشت کەس پێی بزانێ

وَلا حاجِبَ لَهُ، وَلايَقْعُدُ لِلْقَضاءِ فِي الْمَسْجِدِ، وَيُسَوِّي بَيْنَ الْخَصْمَيْنِ فِي ثَلاثَةِ أَشْياءَ: فِي الْمَجْلِسِ وَاللَّفْظِ وَاللَّحْظِ. وَلايَجُوزُ أَنْ يَقْبَلَ الْهَدِيَّةَ مِنْ أَهْلِ عَمَلِهِ، وَيَجْتَنِبُ الْقَضاءَ فِي عَشَرَةِ مَواضِعَ: عِنْدَ الْغَضَبِ، وَالْجُوعِ، وَالْعَطَشِ، وَشِدَّةِ الشَّهْوَةِ، وَالْحُزْنِ، وَالْفَرَحِ الْمُفْرِطِ، وَعِنْدَ الْمَرَضِ، وَمُدافَعَةِ الْأَخْبَثَيْنِ، وَعِنْدَ النُّعاسِ،

---

(وَلا حاجِبَ لَهُ) نابێ (قازی) دەرگەوانێکی وا دابنێ: کە خەڵکی قەدەغە بکا لە هاتوچۆکردنی لای قازی ﴿عَنْ مُعاذٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ وُلِّيَ مِنْ أُمورِ الْمُسْلِمينَ شَيْئاً فَاحْتَجَبَ عَنْ أُولِي الضَّعْفِ وَالْحاجَةِ احْتَجَبَ اللهُ تَعالَى عَنْهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾ رواه الإمام أحمد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك کارێکی موسوڵمانانی کەوتە دەست، ئەویش خۆی ئەشاردەوە لە بێهێزو خاوەن مافان، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت خۆی لێئەشارێتەوە.

بەڵام دانانی پاسەوان و دەرگەوانێکی وەها: کە خەڵکی ڕێك بخەن و بانگیان بکەن، سوننەتە.

(وَلا يَقْعُدُ لِلْقَضاءِ فِي الْمَسْجِدِ) نابێ (قازی) بۆ دادکردن لە ناو مزگەوت دابنیشێ (وَيُسَوِّي بَيْنَ الْخَصْمَيْنِ) ئەبێ (قازی) یەکسانی بکا لە نێوان داواکارو داوا لێکراودا (فِي ثَلاثَةِ أَشْياءَ) لە سێ شتدا: (فِي الْمَجْلِسِ) یەکەم: لە دانیشگادا، واتە: هەردووکیان وەك یەك دابنیشێنێ، نەك یەك دابنیشێ و ئەویتر بە پێوەبێ، یان یەکێك لە تەنیشت خۆی بێ و ئەویتر لە سەر زەوی. (وَاللَّفْظِ) دووەم: لە گفتوگۆدا، واتە: گوێ لە هەردووکیان بگرێ وەکو یەك. (وَاللَّحْظِ) سێیەم: وەکو یەك تەماشایان بکا. هەروەها ئەبێ بە یەکەوە بچنە ژوورەوەو، سەلام لە هەردووکیان وەربگرێتەوەو توڕەیی و ڕووخۆشی لەگەڵ هەردووکیان بە یەك ئەندازە بێ.

(وَلا يَجُوزُ) دروست نیە، واتە: حەرامە: (أَنْ يَقْبَلَ الْهَدِيَّةَ) (قازی) دیاری وەربگرێ (مِنْ أَهْلِ عَمَلِهِ) لەو کەسانەی کاریان پێی هەیە، جا دیاریەکە بۆ ئەوە بێ: کە بڕیار بە ناهەق بدا، یان بڕیار بە هەق نەدا، یان بۆ ئەوە نەبێ، بەڵام پێش ببێتە (قازی) دیاریی بۆ نەئەهێنا ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ﴾ رواه أصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ لەعنەتی لە بەرتیلخۆرو لە بەرتیلدەر کردوە. جا ئاگاداریە: میوانداری و کار بۆ کردن وەك بەرتیل حەرامە.

(وَيَجْتَنِبُ الْقَضاءَ) ئەبێ (قازی) خۆی بپارێزێ لە بڕیار دەرکردن (فِي عَشَرَةِ مَواضِعَ) لە دە کاتدا: (عِنْدَ الْغَضَبِ) لە کاتی توڕەیی (وَالْجُوعِ) لە کاتی برسیەتی (وَالْعَطَشِ) لە کاتی تێنوویەتی (وَشِدَّةِ الشَّهْوَةِ) لە کاتی دەمار هەڵسان بۆ جیماعکردن (وَالْحُزْنِ) لە کاتی دڵتەنگی (وَالْفَرَحِ الْمُفْرِطِ) وە لە کاتی دڵخۆشی لە ئەندازە بەدەر (وَعِنْدَ الْمَرَضِ) لە کاتی نەخۆشی (وَمُدافَعَةِ الْأَخْبَثَيْنِ) لە کاتی ڕاگرتنی میزو پیسایی (وَعِنْدَ النُّعاسِ) لە کاتی بۆڕژان

وَشدَّةِ الْحَرِّ وَالْبَرْدِ. وَلاَيَسْأَلُ الْمُدَّعَىعَلَيْه إِلاَّ بَعْدَ كَمالِ الدَّعْوَى، وَلاَيُحَلِّفُهُ إِلاَّ بَعْدَ سُؤَالِ الْمَدَّعِي، وَلاَيُلَقِّنُ خَصْماً حُجَّةً، وَلاَيُفَهِمُهُ كَلاَماً، وَلاَيَتَعَنَّتُ بِالشُّهَداءِ، وَلاَيَقْبَلُ الشَّهادَةَ إِلاَّ مِمَّنْ ثَبَتَتْ عَدالَتُهُ، وَلاَ تُقْبَلُ شَهادَةُ عَدُوٍّ عَلَىعَدُوِّه،

---

(وَشِدَّةِ الْحَرِّ وَالْبَرْدِ) له كاتی گەرماو سەرمای بەهێز. هەروەها له كاتی ماندووبوونو له كاتی ترسان. واته: لەو هەموو كاتەنەدا هیچ بڕیارێك نەدا.

## ﴿ چۆنیەتی دادكردن ﴾

(وَلاَ يَسْأَلُ الْمُدَّعَىعَلَيْـه) نابێ (قـازی) هـیچ پرسـیارێك لـه دواليكراو بكا (إِلاَّ بَعْدَ كَمالِ الدَّعْوَى) تا داواكار كۆتایی به داوایەكەی دێنێ، ئینجا به دواليكراوەكه ئەڵێ: وەڵامی ئەم داواكاره بدەوه. جا ئەگەر دواليكراو دانی به مافی داواكاردا مێنـا، ئـەوه مافەكـه ئاشـكرا ئەبێو ئەبی بیداتەوه، پەشیمانبوونەوەش سـودی نیـه ﴿عَنْ عَلِـيٍّ كَرَّمَ اللهُ وَجْهَهُ: قَـالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذا تَقاضَى إِلَيْكَ رَجُلاَنِ فَلاَ تَقْضِ لِلأَوَّلِ حَتَّىتَسْمَعَ كَـلاَمَ الآخَـرِ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرموویه ئیمامی(علي): كاتـێ دوو كـەس دێنـه لات بـۆ دادكـردن، بڕیار بۆ یەكەمیان مەده تا وەڵامی دووەمیش ئەبیسی.

جـا ئەگـەر دواليكراوەكـه دانـی بـه مـافی داواكارەكـەدا نـەمێنا، (قـازی) بـۆی هەیـه بڵێتـه داواكارەكە: ئایا شاهیدت هەیه؟ جا ئەگەر گوتی: شاهیدم هەیه بەڵام ئەمـەوێ سوێندم بـۆ بخوا، ئەوه دروسته، كەوابوو: (وَلاَ يُحَلِّفُهُ) نابێ (قـازی) دواليكراوەكـه سـوێند بـدا (إِلاَّ بَعْدَ سُؤَالِ الْمَدَّعِي) تا داواكارەكه پێی ئەڵێ: سوێندی بده، ئینجا سوێندی ئـەدا، جـا لەمـەودوا باسی بڕاندنەوەی كێشەی نێوان داواكارو دواليكراو ئەكەین، إن شاءالله تعالى.

(وَلاَ يُلَقِّنُ خَصْماً حُجَّةً) دروست نیه (قازی) هیچ بەڵگەیەك نه به دواكارو نـه بـه دواليكراو بڵـێ (وَلاَ يُفَهِمُـهُ كَلاَمـاً) وه دروسـت نیـه چـۆنیەتی گفتوگۆشـیان پـێ بڵـێ، بـەڵكو ئـەبی بێدەنگ بێ، جا ئەگەر لێیان تێنەگەیشت، لێیان دووباره ئەكاتەوه.

## ﴿ باسی شایەدی ﴾

(وَلاَ يَتَعَنَّتُ بِالشُّهَداءِ) نابێ (قازی) دڵی شاهیدەكان بشكێنێ، وەك بڵێ: ئەوه بۆ شایەدی ئەدەی؟ یان بڵێ: تۆ ناترسی ئەو شاهیدییه ئەدەی؟.

(وَلاَ يَقْبَلُ الشَّهادَةَ) نابـێ (قـازی) شـاهیدی لـه هـەموو كەسـێك وەربگـرێ (إِلاَّ مِمَّنْ ثَبَتَتْ عَدالَتُـهُ) تـەنها لـەو كەسـه نـەبێ: كـه دادپـەروەری لـه لای وی ئاشـكرا بـووه، هەروەك باسی ئەكەین.

(وَلاَ تُقْبَـلُ شَـهادَةُ عَـدُوٍّ عَلَـى عَـدُوِّه) شـاهیدی دوژمـن لـه دژی دوژمنیخـۆی وەرنـاگیرێ، مەبەست به دوژمن ئەو كەسەیه: كه ڕقی لەویتر ببێتەوەو پێی خۆش بێ هەردەم تووشـی بەڵا ببێو پێی ناخۆش بێ سودی پێ بگا ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ تُقْبَلُ

وَلاَ شَهادَةُ والد لوَلَده، وَلاَ وَلَد لوالده، وَلاَ يُقْبَلُ كتابُ قاض إلَىَ قاض آخَرَ فيِ الأَحْكام

شَهادَةُ ذيِ غَمَرٍ عَلَى أَخيه﴾ رواه‌ابوداود، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: شاهیدی خاوه‌ن ڕق‌و قین له‌دڵ له‌ دژی برای خۆی وه‌رناگیرێ.

به‌ڵام شاهیدی دوژمن له‌ سودی دوژمن وه‌رنه‌گیرێ، چونکه‌ هیچ گومانی لێناکرێ، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر دوژمنایه‌تی به‌ هۆی ئایین بێ: وه‌ك شاهیدی موسوڵمان له‌ دژی کافر، ئه‌مه‌ش هه‌ر وه‌رنه‌گیرێ.

(وَلاَ شَهادَةُ وَالِدٍ) هه‌روه‌ها شاهیدیی باوك‌و باپیره‌و دایك‌و داپیره‌ وه‌رناگیرێ (لِوَلَدِهِ) بۆ کوڕو کیژو نه‌وه‌یه‌کانیان (وَلاَ وَلَدٍ) هه‌روه‌ها شاهیدیی کوڕو کیژو نه‌وه‌یه‌کان وه‌رناگیرێ (لِوالِدِهِ) بۆ باوك‌و باپیره‌و دایك‌و داپیره‌، چونکه‌ گومانی سود پێگه‌یاندنیان لێئه‌کرێ، که‌وابوو: شاهیدیی گشتیان له‌ دژی یه‌کتری وه‌رنه‌گیرێ:

﴿عَنْ عَلِيٍّ كَرَّمَ اللهُ وَجْهَهُ: أَنَّهُ خاصَمَ يَهُودِياً فِي دِرْعٍ لَهُ فَأَتَى بِابْنِه الْحَسَنِ وَبِمَوْلاَهُ قَنْبَرَ إِلَى الْقَاضِي شُرَيْحٍ لِيَشْهَدا لَهُ، فَرَدَّ الْقَاضِي شَهادَةَ الْحَسَنِ لأَجْلِ الْبُنُوَّةِ وَقَضَى بِالدِّرْعِ لِلْيَهُودِيِّ﴾ رواه ابونعيم، ئیمامی(علي)-خوا لێی ڕازی بێ-له‌ سه‌ر زرێیه‌ك له‌گه‌ڵ جوله‌که‌یه‌ك بووه‌ کێشه‌یان، ئه‌ویش حه‌زره‌تی (حسن)ی کوڕی خۆی له‌گه‌ڵ (قنبر)ی خزمه‌تکاری بۆ شاهیدی هێنانه‌ دادگای(قازی) شوره‌یح، به‌ڵام (قازی) شاهیدیه‌که‌ی حه‌زره‌تی(حسن)ی وه‌رنه‌گرت له‌ به‌ر باب‌و کوڕایه‌تی‌و، زرێیه‌که‌ی دایه‌وه‌ ده‌ست جوله‌که‌که‌، ئینجا جوله‌که‌که‌ گوتی: (والله) ئیمامی(علی) ڕاست ئه‌کاو زرێیه‌که‌ هی‌خۆیه‌تی‌و من بردومه‌، جا مادام ئێوه‌ ئه‌وها دادپه‌روه‌رن، وا من موسوڵمان بوم.

ئینجا بزانه‌: جگه‌ له‌ دایك‌و باوك‌و به‌ سه‌روه‌ترو، کوڕو کیژو به‌ره‌وخوارتر، شاهیدیی گشت خزمه‌کانی‌تر بۆ یه‌کتری وه‌رنه‌گیرێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئه‌بی شاهید داوای شاهیدیی لێبکرێ، ئینجا شاهیدی بدا، به‌ڵام ئه‌گه‌ر که‌سێك مافێکی له‌ ده‌ست ئه‌چوو و نه‌یئه‌زانی کێ شاهیدیه‌تی؟ واجبه‌: ئاگاداری بکاته‌وه‌و بڵێ: من شاهیدی تۆم. بۆ ئه‌وه‌ی داوای شاهیدیدانی لێبکا، هه‌روه‌ها له‌و کارانه‌ی مافی خودان: وه‌کو نوێژو زه‌کاتو...هتد، یان مافێکی خودایان تێدایه‌: وه‌کو ته‌ڵاق‌و سزای تاوانه‌کان، واجبه‌ له‌ کاتی پێویست شاهید خۆی ئاشکرا بکاو شاهیدی بدا، بێ‌داوالێکردن.

ئینجا بزانه‌: دروسته‌ شاهید کرێی هاتوچۆو ئه‌رکی ڕێگه‌ له‌و که‌سه‌ وه‌ربگرێ: که‌ ئه‌چێ شاهیدیی بۆ بدا.

(وَلاَ يُقْبَلُ كِتابُ قاضٍ) نووسراوی هیچ (قازی)یه‌ك وه‌رناگیرێ (إِلَى قاضٍ آخَرَ) که‌ بۆ (قازی)یه‌کی‌تر نووسیویه‌ (فِي الأَحْكامِ) ده‌رباره‌ی بڕیاره‌کان، واته‌: نابێ بڕیاره‌کانی

إلاَّ بَعْـــدَ شَـــهادَةِ شـــاهدَيْنِ يَشْـــهَدانِ بمـــا فيـــه.
(فَصْلٌ) وَيَفْتَقِرُ الْقاسِمُ إلىَ سَبْعَة شَرائطَ: الإسلامِ، والْبُلُـوغِ، والْعَقْـلِ، والْحُرِّيَّـةِ، والذُّكُورِيَّةِ، وَالْعَدالَةِ، وَالْحساب. فَإنْ تَراضَى الشَّريكانِ بمَنْ يَقْسمُ بَيْنَهُما لَمْ يَفْتَقِرْ إلىَ ذَلكَ، وَإنْ كانَ فِي الْقِسْمَةِ تَقْويمٌ لَمْ يَقْتَصِرْ فيه عَلَى أَقَلَّ منَ اثْنَيْنِ، وَإذا دَعـا أَحَـدُ الشَّريكَيْنِ شَريكَهُ إلىَ قِسْمَةِ ما لاضَرَرَ فيه لَزِمَ الآخَرَ إجابَتُهُ.

---

جێبەجێ بکا (إلاَّ بَعْدَ شَهادَةِ شاهِدَيْنِ) تا دوو شاهید ئامادە دەبن‌و (يَشْهَدانِ بِما فِيهِ) بۆ ئەوەی‌شاهیدی بدەن بەو بڕیارەی لە ناو ئەو نووسراوەدایە، وە ئەبێ ئەو دوو شاهیدەش لە لای (قازی)یەکەی‌ترەوە هاتبن.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بەشکردنی ماڵی هاوبەش ﴾

(وَيَفْتَقِرُالْقاسِمُ) ئەو کەسەی لە لای (قازی) داندراوە بۆ دابەشکردن، پێویستی هەیە (إلَـى سَبْعَةِ شَرائِطَ) کەحەفت مەرجی لێ بێتەجێ: (اَلإسلامُ) ئیسلام بێ. (وَالْبُلُوغُ) بلۆغی بوبێ. (وَالْعَقْلُ) عەقڵی هەبێ. (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازاد بـێ. (وَالـذُّكُورَةُ) پیـاو بـێ. (وَالْعَدالَـةُ) داد پـەروەر بێ. (وَالْحِسابُ) ژمارەزان بێ.

(فَإنْ تَراضَى الشَّرِيكانِ) جا ئەگەر هەردوو هاوبەشەکان ڕازی بون (بِمَـنْ يَقْسِـمُ بَيْنَهُمـا) بـە کەسێك کە شتەکەیان بۆ بەش بکا، واتە: نەیانویست بچنە لای (قـازی)و لـە دەرەوە بـۆ خۆیان پێك هاتن (لَمْ يَفْتَقِرْ إلَى ذَلِكَ) بەشکەرەکە پێویست بە گشت مەرجەکان ناکا، بەڵکو تەنها پێویستە: شێت نەبێ‌و منداڵ نەبێ، بەڵام ئەگەر یەکێك لە هاوبەشەکان یـەتیم بـوو، یان شێت بوو، ئەبێ بەشکەرەکە هەر حەفت مەرجەکانی لێبێتە جێ، هەرچـەند نەشچنە لای (قازی).

(وَإنْ كانَ فِي الْقِسْمَةِ تَقْويمٌ) ئەگەر لەو بەشکردنەدا شتێ وا هەبوو: کە نرخی بـۆ دانەنـدرا، ئەو کاتە (لَمْ يَقْتَصِرْ فِيهِ عَلَى أَقَلَّ مِنْ إثْنَيْنِ) دروست نیـە لـە دوو بەشـکەر کـەمتر بەشـی بکەن، چونکە نرخ دانان وەکو شاهیدی وایە، بەڵام ئەگەر هەر بەشکردن بوو—نـرخ دانـان نەبو—یەك کەس بەسە.

(وَإذا دَعا أَحَدُالشَّرِيكَيْنِ شَرِيكَهُ) جا ئەگەر یەکێك لە هاوبەشەکان داوای لـە هاوبەشـەکەی‌تر کـرد (إلَـى قِسْمَةِ مالاَضَـرَرَ فِيـهِ) کـە ماڵـە هاوبەشـەکەی لەگـەڵی بـەش بکـاو زیانیش لـەو بەشکردنەدا نەبو، واتە: لە سود نەئەکەوت، وەك بڵێ: وەرە با ئەم زەوییە، یان ئەم گەنمە بەش بکەین (لَزِمَ الآخَرَ إجابَتُهُ) واجبە ئەوی‌تر وەڵامی بداتەوەو بڵێ: باشە.

جا بزانە: ئەو شتەی ناگونجێ بەش بکرێ: وەکو یەك ئۆتۆمۆبیل، یان یەك تفـەنگ، یـان یەك ووڵاغ، واجبە بۆ خۆیان بە نۆبەت سودی لێوەربگرن، یان بە کرێی بدەن‌و کرێیەکە بەش بکەن، یان ئەبێ بیفرۆشن.

(فَصْلٌ) وَإِذا كانَ مَعَ الْمُدَّعِي بَيِّنَةٌ سَمِعَها الْحاكِمُ وَحَكَمَ لَهُ بِها، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ بَيِّنَةٌ فَالْقَوْلُ قَوْلُ الْمُدَّعَى عَلَيْه بِيَمِينِه،

جا بۆ ئەوەی بزانین کام بەش بدرێتە کامەیان؟ پشکەیان بۆ ئەکەین، واتە: ناوی هاوبەشەکان ئەنووسینو ئەیخەینە ناو شتێك، جا یەکێکی بێلایەن ناوێك دەرئەهێنێ بۆ بەشییەکەم، ناوێکیتریش دەرئەهێنێ بۆ بەشیدووەم، جا بەم جۆرە هەر کەسێك ناوی بۆ بەشێك دەرچوو، بەشەکەی ئەدرێتێ، ئینجا ئەبێ گشتیان بڵێن: بەم بەشکردنە ڕازی بوین.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر یەکێك لە میراتگرەکان بەشەمیراتێکی هاوبەشی لە کەسێك وەرگرتەوە، ئەوە گشت میراتگرەکانیتر لەگەڵی ئەبنە هاوبەش، واتە: بە تەنها نابێتە هی خۆی، بەڵام ئەگەر هاوبەشیەکە بە هۆی میرات نەبو، ئەوە هەر کەسەیان دەتوانێ بەشی خۆی تەنها بۆ خۆی وەربگرێتەوەو ئەوانیتر لەگەڵی نابنە هاوبەش.

جا بزانە: دروست نیە هیچ هاوبەشێك بەشەکەی خۆی -لە ماڵەهاوبەشەکە- ببا، تا بەش ئەکرێ، یان هاوبەشەکەیتر ئیزنی ئەدا، یان یاخی ئەبێ لە بەشکردن، بەو مەرجەش بەشەکان هاووێنەییەکتر بن.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی داواکردنو، بڕاندنەوەی کێشەی داواکارو داوالێکراو ﴾

( **پێناسە** ): داواکار ئەو کەسەیە: وا بێتە بەرچاو کە داوایەکەی ڕاست نیەو ئەگەر ئەو بێدەنگ بێ، وازی لێبهێندرێ. وە داوا لێکراو ئەو کەسەیە: وا بێتە بەرچاو کە وەڵامەکەی ڕاستە، بەڵام ئەگەر بێدەنگ بێ، وازی لێناهێندرێ. بۆ وێنە: ئەگەر ئازاد بڵێ: ئەوزاد تۆ دە دینار قەرزداری منی. ئەوە ئازاد بە داواکار دائەندرێ، چونکە داوایەکەی وا دێتە بەرچاو کە ڕاست نیەو ئەگەر ئەو واز بێنێ، وازی لێئەهێندرێ.

(وَإِذا كانَ مَعَ الْمُدَّعِي بَيِّنَةٌ) هەر کاتێك داواکارەکە شاهیدی هەبوو بۆ داواکراوەکەی (سَمِعَها الْحاكِمُ) واجبە (قازی) شاهیدیەکەیان گوێ بداتێ (وَحَكَمَ لَهُ) وە بڕیار بدا مافەکە هی داواکارەکەیە (بِها) بە هۆی ئەو شاهیدییە.

جا بزانە: جیاوازی نیە لە داواکردنی ماڵیدا: لە نێوان دوو شاهیدو لە نێوان یەك شاهیدی لەگەڵ سوێندی داواکار ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِيَمِينٍ وَشاهِدٍ﴾ رواهمسلم، پێغەمبەرﷺ بە هۆی یەك شاهیدو سوێندیداواکار بڕیاری دا مافەکە بدرێتە داواکار.

ئینجا بزانە: واجبە -لە دوای شاهیدیدانی شاهیدەکە- داواکارەکە لە سوێندەکەیدا بڵێ: شاهیدەکەم ڕاست ئەکاو ئەو شتە مافی منە.

(وَإِنْ لَمْ تَكُنْ بَيِّنَةٌ) جا ئەگەر داواکارەکە هیچ شاهیدی نەبو (فَالْقَوْلُ) ئەو قسەیەی وەرئەگیرێ (قَوْلُ الْمُدَّعَى عَلَيْه) قسەی داوالێکراوەکەیە (بِيَمِينِه) بە هۆی سوێندخواردنی: کە

فَإنْ نَكَلَ عَنِ الْيَمِينِ رُدَّتْ عَلَى الْمُدَّعِي فَيَحْلفُ فَيَستَحِقُّ.

داواكارەكە ڕاست ناكاو هيچ مافى لە سەر نيە، واتە: بەگوێرەى وەلامەكەى سوێند ئەخوا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اَلْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ﴾ رواه البيهقى، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: شاهيد لە سەر داواكارەو سوێند لە سەر داوالێكراوە.

ئينجا بزانە: ئەو سوێندەى داوالێكراوەكە ئەيخوا تەنها لەم دەمەدا كێشەكە ئەبڕێنێتەوەو، ئەگەر بە درۆ بوو ماڵەكەى پێ حەلاڵ نابێ، كەوابوو: ئەگەر-لە دواى سوێندخواردنەكە-داواكارەكە شاهيدى هێنا، ماڵەكەى ئەبێتەوە هى خۆى.

(فَإنْ نَكَلَ عَنِ الْيَمِينِ) جا ئەگەر داوالێكراوەكە سوێندى نەخواردو گوتى: سوێند ناخۆم (رُدَّتْ) ئەو سوێندە ئەگەڕێندرێتەوە (عَلَى الْمُدَّعِي) بۆ سەر داواكارەكە، واتە: (قازى) پێى ئەڵێ: تۆ سوێند بخۆ كە ئەو شتە مافى تۆيە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَدَّ الْيَمِينَ عَلَى طَالِبِ الْحَقِّ﴾ رواه الدارقطني وصححه الحاكم، پێغەمبەر ﷺ سوێندى گەڕاندەوە بۆ سەر داواكار.

كەوابوو: (فَيَحْلِفُ) داواكارەكە ئەو سوێندە گەڕاندراوەيە ئەخوا (فَيَسْتَحِقُّ) جا بەم سوێندە شتە داواكراوەكە ئەبێتە هى خۆى.

﴿ئاگادارى﴾ يەكەم: ئەو سوێندە گەڕاندراوەيە-كە داواكارەكە ئەيخوا- وەكو دانپێدانانى داوالێكراوەكەيە، كەوابوو: ئەگەر داواكارەكە سوێندەگەڕاندراوەكەى خوارد، مافەكەى ئەدرێتێو ئەگەر لەمەودوا داوالێكراوەكە شاهيديش بێنێ بێسوودەو لێى وەرناگيرێ، هەروەها ئەگەر داواكاريش سوێندەگەڕاندراوەكە نەخوا، مافى ئەسووتێو نابێ جارێكيتر داواى ئەو مافە بكا، مەگەر شاهيدى دەست بكەوێ، لەو كاتە بۆى دروستە بەم شاهيدە داوايەكيتر تۆمار بكا.

دووەم: هەر كەسێك مافى ماڵێى لە سەر كەسێكيتر بوو: وەك قەرزو كرێى‌كاركردنو ماڵى‌زەوتكراو و ئەو جۆرە شتانە، جا بۆى نەئەگونجا مافەكەى خۆى بە هۆى دادگا وەربگرێتەوە، ئەوە بۆى دروستە: بە نهێنى، يان بە هەر شێوەيەكيتر-كە تووشى ئاژاوە نەبێ-بە ئەندازەى مافەكەى‌خۆى وەربگرێتەوە، جا ئەگەر لە ئەندازەى مافى‌خۆى زياترى هاتە دەست، ئەبى بە هەر فێلێك بێ، زێدەيەكە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەكەى ﴿عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: إنَّ إمْرَأَةَ أَبِي سُفْيانَ قالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ إنَّ أَبا سُفيانَ لاَ يُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِي إلاَّ ماأَخَذْتُ مِنْ مالِه بِغَيْرِعِلْمِه، فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ﴾ رواه الشيخان، ژنى (ئەبوسوفيان) گوتيە پێغەمبەر ﷺ: (ئەبوسوفيان) بە تەواوى ئەركى بەخێوكردنى خۆمو منداڵەكەم نادات مەگەر بێئاگادارى وى شتێك لە ماڵەكەى ببەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: بە ئەندازەى مافى خۆتو منداڵەكەت لە ماڵى (ئەبوسوفيان) ببە.

وَإِذا تَداعَيا شَيْئاً فَي يَدِ أَحَدِهِما فَالْقَوْلُ قَوْلُ صاحِبِ الْيَدِ بِيَمِينِهِ، وَإِنْ كانَ فِي يَدَيْهِما تَحالَفَا وَجُعِلَ بَيْنَهُما،

---

سێیەم: ئەو شتەی کێشەی لە سەرە: ئەگەر بووە هی داواکارەکە، ئەبی داوالێکراوەکە ئەرکی هێنانی بدا، ئەگەر نا: ئەبی داواکارەکە ئەرکی هێنان‌و بردنەوەی بدا.

﴿ باسی لەکارکەوتنی شاهید ﴾

(وَإِذا تَداعَيا شَيْئاً) هەر کاتێك دوو کەس داوای شتێکیان کرد (فَي يَدِأَحَدِهِما) ئەو شتەش تەنها لە دەستی یەکێکیاندا بوو، بەلام هیچیان شاهیدیان نەبو (فَالْقَوْلُ) ئەو قسەیەی بە ڕاست دائەنرێ (قَوْلُ صاحِبِ الْيَدِ) قسەی خاوەن دەستەکەیە (بِيَمِينِهِ) بەو مەرجەی سوێند بخوا: کە هی خۆیەتی، چونکە خاوەن دەستی نیشانەیەکی بەهێزە بۆ ڕاستی.

جا ئەگەر تەنها یەکێکیان شاهیدی هەبوو، ئەوە ئەدرێتە خاوەن شاهیدەکە، بەلام ئەگەر هەردووکیان وەکو یەکتر شاهیدیان هەبوو، ئەوە شاهیدی خاوەن دەست وەرئەگیرێ، هەرچەند تەنها یەك شاهیدیش بێ، بۆ ئەوەی سوێندی لەگەڵ بخوا، شاهیدەکانی ئەویتر لە کار ئەکەون ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: إِخْتَصَمَ رَجُلَانِ فِي ناقَةٍ وَأَقامَا بَيِّنَةً فَقَضَى بِها النَّبِيُّ ﷺ لِلَّذِي هِيَ فِي يَدِهِ﴾ رواه‌البيهقي والشافعي، دوو کەس لە سەر ووشترێك بووە کێشەیان، هەردووکیش شاهیدیان هەبوو، جا پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا: ووشترەکە هی ئەو کەسەیە: کە ووشترەکەی لە ژێر دەستی‌دایە.

(وَإِنْ كانَ فِي يَدَيْهِما) وە ئەگەر شتەکە لە ژێر دەستی هەردووکیاندا بوو، یان لە دەستی هیچیاندا نەبو و هەردووکیان ئەیانگوت: هی منە. هیچ شاهیدیش نەبو (تَحالَفَا) ئەبی هەردووکیان سوێند بخۆن: کە هی خۆیەتی (وَجُعِلَ بَيْنَهُما) ئینجا شتەکە ئەدرێتە هەردووکیان بە نیوەیی ﴿عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ: أَنَّ رَجُلَيْنِ إِخْتَصَما فِي دابَّةٍ وَلَيْسَ لِواحِدٍ مِنْهُما بَيِّنَةٌ، فَقَضَى بِها النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُما نِصْفَيْنِ﴾ رواه‌النسائي، دوو پیاو لە سەر وولاغێك بووە کێشەیان و هیچ شاهیدیان نەبو، جا پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا: هەر یەکە نیوەیان هەبێ. هەروەها ئەگەر هەردووکیان وەك یەك شاهیدیان هەبێ، هەر بۆیان ئەبێتە نیوە.

جا بزانە: ئەگەر دوو کەس داوای شتێکیان کرد، کە لە دەست کەسێکی‌تردا بوو، هەردوو داواکارەکەش شاهیدیان هەبوو، ئەوە شاهیدی هەردووکیان لە کار ئەکەون، کەوابوو: بۆ هەر یەکێك لەو دووانە سوێندێك ئەخوا: کە هیچ مافی نیە، بەلام ئەگەر بۆ یەکێکیان دانی پیدا بێنێ، ئەبێتە هی ئەو.

﴿ئاگاداری﴾: خاوەن دەستی لەو کاتەدا بە نیشانەی ڕاستی دائەنرێ: کە نەزانرێ ئەو کەسە بە ڕێگایەکی‌ناشەرعی دەستی کەوتۆتە سەر ئەو شتە، ئەگینا: هەر خاوەنی پێشوو بە خاوەن دەست دائەنرێ.

وَمَنْ حَلَفَ عَلَى فِعْلِ نَفْسِهِ حَلَفَ عَلَى الْبَتِّ وَالْقَطْعِ، وَمَنْ حَلَفَ عَلَى فِعْلِ غَيْرِهِ: فَإِنْ كانَ إِثْباتاً حَلَفَ عَلَى الْبَتِّ وَالْقَطْعِ، وَإِنْ كانَ نَفياً حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ.

هەروەها بزانە:-لە شاهیدیدا-دوو پیاو، یان پیاوێكو دوو ئافرەت لەپێشترن لە پیاوێكو سوێندخواردن، بەڵام لە خاوەن دەستیدا بە پێچەوانەیە، واتە: پیاوێكو سوێندخواردنیخاوەن دەست، لەپێشترە لە دوو پیاو.
هەروەها ئەو شاهیدەی زیاتر زانستی لە لایە، ئەو لەویتر لەپێشترە، وەك بڵێ: من ئاگام لێبو ئەمڕۆ ئەم مەڕەی لە تۆ كڕی بە سەد دینار.

## ﴿ باسی سوێندخواردن ﴾

(وَمَنْ حَلَفَ عَلَى فِعْلِ نَفْسِهِ) هەركەسێك لە سەر كردەوەی خوی سوێند بخوا (حَلَفَ عَلَى الْبَتِّ وَالْقَطْعِ) ئەبی بە شێوەی بێگومانی سوێند بخوا، جا هەبوون بێ، وەك بڵێ: (وَالله من ئەم كارەم كردوە). یان نەبوون بێ، وەك بڵێ: (وَالله من ئەم كارەم نەكردوە).
﴿ئاگاداری﴾: كردەوەی ئاژەڵەكانیخۆی وەك هی خۆی وایە، كەوابوو: ئەبی بڵێ: (والله ئاژەڵەكەم ئەو كارەی نەكردوە).
(وَمَنْ حَلَفَ عَلَى فِعْلِ غَيْرِهِ) هەر كەسێك سوێند لە سەر كرداری كەسێكیتر بخوا (فَإِنْ كانَ إِثْباتاً) ئەگەر ئەو كردارە هەبوون بوو (حَلَفَ عَلَى الْبَتِّ وَالْقَطْعِ) سوێند لە سەر بێگومانی ئەخوا، واتە: ئەڵێ: (والله فلان ئەو كارەی كرد).
(وَإِنْ كانَ نَفياً) بەڵام ئەگەر كارەكە نەبوون بوو (حَلَفَ عَلَى نَفْيِ الْعِلْمِ) سوێند لە سەر نەزانین ئەخوا، واتە: ئەڵێ: (والله نەمزانیوە فلان ئەو كارەی كردبێ).
﴿پاشكۆ﴾: لە دادگادا سوێندی بە پێچەو پەناو سوێندی بە درۆ، لە گوناهدا یەكسانن ﴿عَنْ أَبِي أُمامَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِىءٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ فَقَدْ أَوْجَبَ اللهُ لَهُ النَّارَ وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَإِنْ كانَ قَضِيباً مِنْ أَراكٍ﴾ رواەمسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك بە هۆی سوێندیخۆی ماڵی موسوڵمانێك بپچڕێنێ، خوای گەورە ئەیباتە دۆزەخو بەهەشتی لێقەدەغە ئەكا، هەرچەند ماڵەكەش شوڕكە دارسیواكێك بێ.
هەروەها بزانە: بڕیاری (قازی) تەنها كێشەی دونیای پێ ئەبڕێتەوە، بەڵام بۆ قیامەت حەرامی پێ حەڵاڵ نابێو حەڵاڵی پێ حەرام نابێ ﴿عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّما أَنا بَشَرٌ وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ مِنْ بَعْضٍ بِحُجَّتِهِ فَأَقْضِي لَهُ عَلَى نَحْوِ ما أَسْمَعُ، فَمَنْ قَطَعْتُ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْئاً فَلاَ يَأْخُذْهُ فَإِنَّما أَقْطَعُ لَهُ قَطْعَةً مِنَ النَّارِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منیش وەك ئێوە ئادەمیزادم، وە ئێوە كێشەی خۆتان دێننە لای من، جا پیاوی وا هەیە بەڵگەو زوبانی بەهێزترە، منیش

(فَصْلٌ) وَلاَ تُقْبَلُ الشَّهادَةُ إِلاَّ مِمَّنْ اجْتَمَعَتْ فِيهِ خَمْسُ خِصالٍ: اَلإِسلامُ، والْبُلُــوغُ، والْعَقْلُ، والْحُرِّيَّةُ، وَالْعَدالَةُ.

---

چیم بێته بەر گوێ، وەها بڕیار ئەدەم، جا هەر یەکێك بڕیارم بۆدا مافی ئەویتر هی ئەوەو له ڕاستیشدا هی ئەو نەبو، باوەڕی‌پێنەکرێ، چونکه بەم بڕیارەم پارچە ئاگرێکی دۆزەخی بۆ بڕیار ئەدەم. واتە: بەم بڕیارە لێی حەلاڵ نابێ.

هەروەها بزانە: ئەگەر داواکارەکە، یان داوا لێکراوەکە منداڵ بوو، یان شێت بوو، دروست نیە سوێند بدرێ، چونکە سوێندی شێتو منداڵ دانامەزرێ.

﴿ فَصْلٌ: له باسی شایەدیدان ﴾

واتە: ئاشکراکردنی ئەوەماڵەی لە لایەتی، بۆ ئەوەی خاوەن ماف بگاتە مافی خۆی. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾ شایەدی بدەن له بەر خاتری خوا. کەوابوو: شاردنەوەی شایەدی گونامە، خوای‌گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَتَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ﴾ شایەدی مەشارنەوە.

هەروەها شایەدی‌دانی بە درۆش گونامە ﴿عَنْ خُرَيْمٍ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: قَــالَ عُــدِلَتْ شَهادَةُ الزُّورِ بِالإِشْراكِ بِاللهِ، ثَلاَثَ مَــرَّاتٍ﴾ رواه‌الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شایەدی بە درۆ وەك هاوبەش دانان بۆ خودا وایە، سێ جار وای‌فەرموو.

(وَلاَ تُقْبَلُ الشَّهادَةُ) شایەدی له هیچ کەسێك وەرناگیرێ، واتە: کاری پێ‌ناکرێ (إِلاَّ مِمَّنْ) تەنها لەو کەسە نەبێ (اجْتَمَعَتْ فِيهِ) کەتێی‌دا کۆ ببێتەوە (خَمْسُ خِصالٍ) پێنج مەرج: یەکەم: (اَلإِسلامُ) موسوڵمان بێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَشْــهِدُوا ذَوَيْ عَــدْلٍ مِنْكُمْ﴾ دوو کەسی دادپەروەر له خۆتان—واتە: له موسوڵمانان—بکەنە شاهید.

کەوابوو: شاهیدی کافر وەرناگیرێ، بەڵام ئیمامی(حنفی) ئەفەرموێ: شاهیدی کافر له دژی کافر وەرئەگیرێ.

دووەم: (وَالْبُلُوغُ) بلۆغی بوبێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَــهِيدَيْنِ مِــنْ رِجَالِكُمْ﴾ دوو پیاو بۆ شاهیدی بگرن. بەڵام ئیمام(مالك) فەرموویەتی: شاهیدی‌دانی منداڵان له دژی یەکتری لەو جەنگو شکەستانەی له نێوانیاندا ڕوو ئەدا، پێش لێکجیابوونەوەیان وەرئەگیرێ.

سێیەم: (وَالْعَقْلُ) عەقڵی هەبێ. چوارەم: (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازادبێ. پێنجەم: (وَالْعَدالَةُ) دادپەروەر بێ. چونکە خوای‌گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَوَيْ عَدْلٍ مِــنْكُمْ﴾ کەوابوو: شاهیدی له فاسق وەرناگیرێ، بەڵام چەند زانایەك ئەو فەرموودەیان هەڵبژاردوە: ئەگەر دادپەروەری نەماو فاسقی بڵاو بۆوە—له بەر ناچاری— شاهیدی له فاسقی کەم گوناهتر وەرئەگیرێ.

وَلِلْعَدالَةِ خَمْسَةُ شَرائِطَ: أَنْ يَكُونَ مُجْتَنِباً لِلْكَبائِرِ، غَيْرَ مُصِرٍّ عَلَى الْقَلِيلِ مِنَ الصَّغائِرِ، سَلِيمَ السَّرِيرَةِ، مَأْمُونَ الْغَضَبِ، مُحافِظاً عَلَى مُرُوءَةِ مِثْلِهِ.
(فَصْلٌ) وَالْحُقُوقُ ضَرْبانِ: حَقُّ اللهِ تَعالى، وَحَقُّ الآدَمِيِّ، فَأَمّا حُقُوقُ الآدَمِيِّينَ فَثَلاثَةُ أَضْرُبٍ: ضَرْبٌ لاَ يُقْبَلُ فِيهِ إِلاَّ شاهِدانِ ذَكَرانِ وَهُوَ مَا لاَيُقْصَدُ مِنْهُ الْمالُ وَما يَطَّلِعُ عَلَيْهِ الرِّجالُ،

---

(وَلِلْعَدالَةِ خَمْسَةُ شَرائِطَ) داد پەروەری پێنج مەرجی هەنە: (أَنْ يَكُونَ مُجْتَنِباً لِلْكَبائِرِ) یەکەم: خۆی لە گشت گوناهە گەورەکان بپارێزێ. (غَيْرَ مُصِرٍّ عَلَى الْقَلِيلِ مِنَ الصَّغائِرِ) دووەم: نابێ سوور بێ لە سەر کەمێك لە گوناهە بچووکەکان.

( **پێناسە** ): هەر تاوانێك ببێتە نیشانەی کەم بایەخی بە ئایین: جا لە دونیادا سزای بۆ داندرابێ، یان هەڕەشەیقیامەتی لە سەر هاتبێ، یان لەعنەت، یان غەزەبیخوا، ئەوانە گشتی بە گوناهی گەورە دادەنرێن، (ابن عبّاس) ئەفەرموێ: ژمارەیان لە حەفتا گوناه نزیکترە.

کەوابوو: هەر کەسێك گوناهێکی گەورەی هەبێ، شاهیدیی لێوەرناگیرێ، تا تۆبە ئەکاو ساڵێك بە سەر تۆبەکردنیدا ئەڕوا، هەروەها ئەگەر گوناهی بچووکی هەبوو خواپەرستیەکەی بە سەر گوناهەکاندا زاڵ نەبو، دیسان هەر بە شاهید ناچێ.

(سَلِيمَ السَّرِيرَةِ) سێیەم: بیروباوەڕی بێگەرد بێو ئایینی ئیسلام بە بەرنامەی ژیان دابنێو جنێو بە سەحابەی پێغەمبەرﷺ نەداو بانگەوازی نەکا بۆ کۆمەڵێکی دژ بە ئیسلام.

(مَأْمُونَ الْغَضَبِ) چوارەم: لێی دڵنیا بین کە لە کاتی توڕەییدا درۆ ناکاو شایەدی بە درۆ نادا. (مُحافِظاً عَلَى مُرُوءَةِ مِثْلِهِ) پێنجەم: پیاوەتیو ڕەووشتی هاووێنەکانی خۆی بپارێزێ، واتە: لە بەر چاوی خەڵك ژنی خۆی ماچ نەکاو، بەردەوام گاڵتەو قسەی پڕو پووچ نەکاو، گۆرانی نەڵێو هەڵپەڕکێ نەکا.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی ژمارەی پێویست لە شاهیدیدان ﴾**

(وَالْحُقُوقُ) ئەو مافانەی شاهیدییان پێ ئەدرێ (ضَرْبانِ) دوو جۆرن (حَقُّ اللهِ تَعالَى) یەکەمیان: مافی خوایە. (وَحَقُّ الآدَمِيِّ) دووەمیان: مافی ئادەمیزادە:

(فَأَمّا حُقُوقُ الآدَمِيِّينَ) جا مافی ئادەمیزادان (فَثَلاثَةُ أَضْرُبٍ) سێ جۆرن: (ضَرْبٌ) جۆرییەکەم: (لاَ يُقْبَلُ فِيهِ) هیچ جۆرە شاهیدیەکی بۆ وەرناگیرێ (إِلاَّ شاهِدانِ ذَكَرانِ) تەنها شاهیدیی دوو پیاو نەبێ، واتە: لەو جۆرە مافەدا شاهیدیی ئافرەتو سوێندخواردن وەرناگیرێ (وَهُوَ مالاَ يُقْصَدُ مِنْهُ الْمالُ) ئەمەشیان ئەو جۆرە مافەیە: کە هیچ ماڵی دونیای تێدا مەبەست نەبێ: وەکو کوشتنی بە قەسدیو بوختانکردنو ئەو جۆرە شتانە (وَمَا يَطَّلِعُ عَلَيْهِ الرِّجالُ) هەروەها ئەو جۆرە مافانەی کە پیاو پێ ئاگادارن: وەکو ئیسلامبوونو مارەبڕینو تەڵاقدانو مردنو وەکیلایەتیو سەروەسیێتیو کەفالەتو هاویەشیو ئەو جۆرە شتانە ﴿قالَ الزُّهْرِيُّ: مَضَتِ السُّنَّةُ مِنْ رَسُولِ اللهِﷺ أَنَّهُ لاَ تَجُوزُ

وَضَرْبٌ يُقْبَلُ فِيه شاهدان أَوْ رَجُلٌ وَامْرَأَتان أَوْ شاهدٌ وَيَمِينُ الْمُدَّعِي وَهُوَ ماكانَ الْقَصْدُ مِنْهُ الْمالَ، وَضَرْبٌ يُقْبَلُ فِيه رَجُلٌ وَامْرَأَتان أَوْ أَرْبَعُ نِسْوَةٍ وَهُوَ ما لاَ يَطَّلِعُ عَلَيْه الرِّجالُ. وَأَمّا حُقُوقُ الله تَعالى: فَلاَ تُقْبَلُ فِيها النِّساءُ، وَهِيَ ثَلاَثَةُ أَضْرُب: ضَرْبٌ لاَ يُقْبَلُ فِيه أَقَلُّ مِنْ أَرْبَعَة وَهُوَ الزِّنا، وَضَرْبٌ يُقْبَلُ فِيه إثْنان وَهُوَ مَا سِوَى الزِّنا مِنَ الْحُدُود،

---

شَهادَةُ النِّساء فِي الْحُدُودِ وَلاَ فِي النِّكَاحِ وَلاَ فِي الطَّلاَقِ﴾ رواه‌الإمام مالك، لە پێغەمبەرەوە ﷺ تا ئێستا وا هاتوە: کە شاهیدیی ئافرەتان بۆ سزای تاوانەکانو مارەبڕینو تەلاقدان وەرناگیرێ.

(وَضَرْبٌ) جۆری‌دووەم: (يُقْبَلُ فِيهِ شاهِدانِ) شاهیدیی دوو پیاوی تێدا وەرئەگیرێ (أَوْ رَجُلٌ وَامْرَأَتانِ) یان شاهیدیی پیاوێکو دوو ئافرەتی تێدا وەرئەگیرێ (أَوْ شاهِدٌ وَيَمِينَ الْمُدَّعِي) یان شاهیدیی پیاوێکو سوێندی‌داواکاری تێدا وەرئەگیرێ (وَهُوَ ما كانَ الْقَصْدُ مِنْهُ الْمالَ) ئەوەش ئەو جۆرە مافەیە کە مەبەست لەوی‌دا ماڵ بێ: وەکو کوشتنی بە هەڵەو قەرزو کڕینو فرۆشتنو بەکرێدانو وەقفو پێکهاتنو وەسێتو زەوتکردنو گەردەن ئازادکردنو ئەو جۆرە شتانە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ﴾ دوو پیاو لە خۆتان بکەنە شاهید، جا ئەگەر دوو پیاو نەبون، پاوێکو دوو ئافرەت بکەنە شاهید.

(وَضَرْبٌ) جۆری‌سێیەم: (يُقْبَلُ فِيهِ رَجُلٌ وَامْرَأَتانِ) شاهیدیی پیاوێکو دوو ئافرەتی تێدا وەرئەگیرێ (أَوْ أَرْبَعُ نِسْوَةٍ) یان شاهیدیی چوار ئافرەتی تێدا وەرئەگیرێ، واتە: سوێندخواردن لەو مافەدا کاری پێناکرێ (وَهُوَ مالاَ يَطَّلِعُ عَلَيْهِ الرِّجالُ) ئەوەش ئەو جۆرە مافەیە کە بە زۆری پیاو لێی ئاگادار نین: وەکو حەیزو کچێنیو منداڵبوونو شیردانی منداڵو ئاوسبوونو ئەو جۆرە شتانە ﴿قالَ الزُّهْرِيُّ: مَضَتِ السُّنَّةُ: بِأَنَّهُ تَجُوزُ شَهادَةُ النِّساءِ فِيما لاَيَطَّلِعُ عَلَيْهِ غَيْرُهُنَّ مِنْ وِلاَدَةِالنِّساءِ وَعُيُوبِهِنَّ﴾ رواه ابن ابی‌شیبة، لە پێغەمبەرەوە ﷺ وا هاتوە: کە شاهیدیی ئافرەتان لەو جۆرە شتانەدا دروستە، کە بە زۆری هەر ئەوان پێ ئاگادارن: وەکو منداڵبوونو کەموکورییەکانی ژێر بەرگ.

(وَأَمّا حُقُوقُ الله تَعالى) هەرچی مافی‌خوای‌گەورەیە (فَلاَ تُقْبَلُ فِيهاالنِّساءُ) شاهیدیی ئافرەتانو سوێندخواردنی تێدا وەرناگیرێ (وَهِيَ ثَلاَثَةُ أَضْرُبٍ) مافی خوای‌گەورە سێ جۆرن: (ضَرْبٌ لاَ يُقْبَلُ فِيهِ أَقَلُّ مِنْ أَرْبَعَةٍ) جۆری‌یەکەم: لە چوار پیاو کەمتر بە شاهید وەرناگیرێ (وَهُوَ الزِّنا) ئەو جۆرە مافە زیناکردنە، واتە: ئەبی هەر چواریان بڵێن: (أشهد بالله بە چاوی خۆمان بینیمان هێنەکەی خۆی بردبوە ناو هێنەکەی).

(وَضَرْبٌ) جۆری‌دووەم: (يُقْبَلُ فِيهِ إِثْنانِ) شاهیدیی دوو پیاوی تێدا وەرئەگیرێ (وَهُوَ ما سِوَى الزِّنا) ئەو جۆرەش ئەو مافانەیە کە زینا نینە (مِنَ الْحُدُودِ) لە سزای

وَضَرْبٌ يُقْبَلُ فِيهِ واحِدٌ وَهُوَ هِلالُ رَمَضانَ. وَلاَ تُقْبَلُ شَهادَةُ الأَعْمَى إلاَّ فِي خَمْسَةِ مَواضِعَ: اَلْمَوْتِ، وَالنَّسَبِ، وَالْمِلْكِ الْمُطْلَقِ، وَالتَّرْجَمَةِ، وَما شَهِدَ بِهِ قَبْلَ الْعَمَى، وَعَلَى الْمَضْبُوطِ. وَلاَ تُقْبَلُ شَهادَةُ جارٍّ لِنَفْسِهِ نَفْعاً وَلاَ دافِعٍ عَنْها ضَرَراً.

---

تاوانەکانیتر: وەکو مەیخواردنەوەو کافربوونو ڕێگریو دزیو ئەو جۆرە شتانە.

(وَضَرْبٌ) جۆریسێیەم: (يُقْبَلُ فِيهِ وَاحِدٌ) یەك پیاو بە تەنها بە شاهید وەرئەگیرێ (وَهُوَ هِلاَلُ رَمَضانَ) ئەو جۆرە مافەش دیتنی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانە.

ئینجا بزانە: شاهیدیی یەك پیاو بۆ ئاشکرابوونیمانگ تەنها دەربارەی بەڕۆژووبوون وەرئەگیرێ، نەك دەربارەی شتێکیتر، جا لە بەر ئەوە زۆر لە زانایان ئەم فەرموودەیان بەهێز کردوە: کە شاهیدیی یەك پیاو بۆ مانگی (رَجَب)و (شَعْبان)و (شَوَّال)و (ذِيالْحِجَّة) وەرئەگیرێ: دەربارەی ڕۆژوو و ئیحرامو عالفەو وەستانیعەرەفە.

(وَلاَ تُقْبَلُ شَهادَةُالأَعْمَى) شاهیدیی مرۆڤیکوێر وەرناگیرێ (إلاَّ فِي خَمْسَةِ مَواضِعَ) تەنها لە پێنج شوێندا نەبێ (اَلْمَوْتِ) یەکەم: شاهیدیدان بە مردنی کەسێك. (وَالنَّسَبِ) دووەم: شاهیدیدان بە نەژادی کەسێك، واتە: بڵێ: فلان کوڕی فلانکەسە. (وَالْمِلْكِ الْمُطْلَقِ) سێیەم: شاهیدیدان بە ملکایەتی بە بێئەوەی چۆنیەتی بڵێ، چونکە ئەو سێیانە بە دەنگو باسی بڵاوبووەوە ئەزاندرێنو پەیوەندییان بە دیتنەوە نیە.

(وَالتَّرْجَمَةِ) هەروەها لە گۆڕینی زمانێك بۆ زمانێکیتر باوەڕ بە کوێر ئەکرێ، چونکە پەیوەندیی بە چاوەوە نیە. (وَما شَهِدَ بِهِ قَبْلَ الْعَمَى) چوارەم: ئەو شتەی پێش کوێربوون دیتوویەتی دروستە بە کوێربوویی شاهیدی دەربارە بدا. (وَعَلَىالْمَضْبُوطِ) پێنجەم: شاهیدیدان لە سەر ئەو کەسەی بە دەستی خۆی گرتویەتی، واتە: بڵێ: ئەمە ئەو قسەیەی کرد.

(وَلاَتُقْبَلُ) وەرناگیرێ (شَهادَةُ جارٍّ لِنَفْسِهِ نَفْعاً) شاهیدیی کەسێك، کە بە هۆی شاهیدیەکەی سود بەخۆی بگەیەنێ (وَلاَ دافِعٍ عَنْها ضَرَراً) هەروەها شاهیدیی ئەو کەسەش وەرناگیرێ کە بە شاهیدیەکەیخۆی زیانێك لە سەر خۆی لابدا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَتَجُوزُ شَهادَةُ ذِيالظِّنَّةِ وَلاَ ذِيالْحِنَةِ﴾ رواهالحاكم على شرط مسلم، شاهیدیی گومان لێکراو و دوژمن وەرناگیرێ. هەروەها شاهیدیی ئەو کەسەش وەرناگیرێ کە زۆر بە هەڵەدا ئەچێو شتی لە بیر ئەچێتەوە.

**﴿ باسی زمانشاهیدی ﴾**

واتە: شاهیدیدان لەجیاتی کەسێکیتر. بزانە: زمانشاهیدی بەو مەرجانە دروستە: یەکەم: زمانشاهیدەکە شاهیدیەکە وەریگرێ بەم شێوەیە: شاهیدەکە پێی بڵێ: (تۆ شاهید بە: کە من شاهیدم بۆ فلانە شتە). یان بڵێ: (شاهیدی لە سەر

## (كـــتابُ الْعـــتْقِ)

وَيَصِحُ الْعِتْقُ مِنْ كُلِّ مالكٍ جائزِالتَّصَرُّفِ فِيمِلْكِه، وَيَقَعُ بِصَرِيحِ الْعِتْقِ، وَالْكِنايَةِ مَعَ النِّيَّةِ،

---

شاهيديەكەی من بـدە). يان گوێی لێبێ: كە شاهیدەكە لە لای دادوەر شاهیدی ئەدا، یـان گوێی لێبێ هۆیەكە بڵێ، وەك بڵێ: (من شاهیدم ئەو شتە هی فلانە لە فلانی كڕیوە).

دووەم: زمانشـــاهیدەكە نـــاوی شـــاهیدەكەو چـــۆنیەتی وەرگرتنیشـــاهیدیەكە بڵـــێ.

سێیەم: ژمارەی زمانشاهیدەكان بە لایكەمی دوو پیـاو بـن، جـا ئەگـەر دوو پیـاو ببنـە زمانشاهیدی دوو پیاویتر، یان هی پیاوێكو دوو ئافرەت، ئەوە دروستە.

چوارەم: نابێ زمانشاهیدی لە سزای ئەو تاوانانـە بـێ: كـە مـاڵی خـوای گەورەنـە، بـەڵام لەوانەی ماڵی ئادەمیزادن دروستە.

پێنجەم: ئامادەكردنیشاهیدەكە نەگونجێ: لە بەر مردنی، یان لە بەر نەخۆشی، یان لە بەر دووری، بەڵام ئەگەر لە بەر هۆیەكیتر شاهیدیەكە وەرنەگیرا، زمانشاهیدیش وەرناگیرێ.

* * *

### ﴿ كِتابُ الْعِتْقِ: ئەم پەڕتووكە باسی ئازادكردنی كۆیلە ئەكا ﴾

( **پێناسە** ): كۆیلە بەو ئادەمیزادە ئەگوترێ: كە لـە ژێـر ملكایـەتی ئادەمیزادێكیتردایـە، واتە: بەخۆی هیچ دەستەڵاتی بەسەرخۆیدا نیە. جا ئەوەش بێنەوە یادی خۆت: كە ئـەو ئافرەتو منداڵانەی لـە جـەنگیكافرەكان بـە دیـل ئـەگیرێن، ئەبنـە كۆیلـەو، ئافرەتـەكان پێیان ئەگوترێ: (جارية)، شەرعی ئیسلام حەرامی كردوە بكوژرێن، جـا موسـوڵمان بـبن، یان نا، هەروەها بزانە: ئازادكردنی كۆیلە خێری زۆرە، بەڵام ئەگـەر كۆیلەكـە موسـوڵمان بێ، خێـری زیـاترە ﴿عَنْ أَبِيهُرَيْرَةَ ﷺ: قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّماامْرِىءٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ إِمْرَأً مُسْلِماً اسْتَنْقَذَاللهُ بِكُلِّ عُضْوِمِنْهُ عُضْواًمِنْهُ مِـنَ النّـارِ﴾ رواەالشيخان، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: هەر موسوڵمانێك كۆیلەیەكی موسوڵمان ئازاد بكـا، خـوای گـەورە بـەهۆی هـەر ئەندامێكیكۆیلەكە، ئەندامێكی وی ئازاد ئەكا لە ئاگری دۆزەخ.

(وَيَصِحُ الْعِتْقُ) ئازادكردنی كۆیلە دروستە (مِنْ كُلِّ مالِكٍ) لـە هـەر خـاوەن ملكێكـی (جـائِزِ التَّصَرُّفِ) كە دروست بێ بە خۆی دەستكاری بكا (فِي مِلْكِهِ) لە ملكو مـاڵی خـۆی، واتـە: هیچ كەس ناتوانێ كۆیلەی كەسێكیتر ئازاد بكا بە بێئیزن، هەروەها منداڵو شێتو ئـەو كەسەی حیجری لەسەر دانراوەو ئەو كەسەی بە ناهەق زۆری لێكراوە، ئەوانەش هیچیان كۆیلە ئـازاد كردنیـان دروسـت نیـە (وَيَقَـعُ) كۆیلـە ئـازاد ئـەكرێ (بِصَـرِيحِ الْعِتْـقِ) كـە بـە گوتەیەكی ئاشكرا بڵێ: وا ئازادم كرد، یان وا ئازادم كردی (وَالْكِنايَـةِ) هـەروەها بەگوتـەی نائاشكراش ئازاد ئەبێ (مَعَ النِّيَّةِ) كە نیـازی نـاو دڵـی وابـێ: ئـازادی بكـا، وەك بڵـێ: مـن هیچیتر گەورەی تۆ نیم، یان بڵێ: وازم لە تۆ هێنا.

وَإِذَا أَعْتَقَ بَعْضَ عَبْدٍ عَتَقَ عَلَيْهِ جَمِيعُهُ، وَإِنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ وَهُوَ مُوسِرٌ سَرَى الْعِتْقُ إِلَى بَاقِيهِ وَكَانَ عَلَيْهِ قِيمَةُ نَصِيبِ شَرِيكِهِ، وَمَنْ مَلَكَ وَاحِداً مِنْ وَالِدِيهِ أَوْ مَوْلُودِيهِ عَتَقَ عَلَيْهِ.

---

(وَإِذَا أَعْتَقَ بَعْضَ عَبْدٍ) هەر کاتێ یەکێك بەشێکی کۆیلەی خۆی ئازاد کرد، وەك بڵێ: وا دەستێکی تۆم ئازاد کرد، یان بڵێ: وا نیوەی تۆم ئازاد کرد (عَتَقَ عَلَيْهِ جَمِيعُهُ) کۆیلەکە هەموو لەشی ئازاد ئەبێ، نەك تەنها دەستو تەنها نیوەکە ﴿عَنْ سَمُرَةَ: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ شِقْصاً فِي مَمْلُوكٍ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هُوَ كُلُّهُ فَلَيْسَ لله شَرِيكٌ﴾ رواه احمد، پیاوێك بەشێکی لە کۆیلەیەکی خۆی ئازاد کرد، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو کۆیلەیە گشتی ئازادە، خوای گەورە هاوبەشی نیە لەم کۆیلەدا.

(وَإِنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ) هەروەها ئەگەر بەشەکەی خۆی ئازاد بکا لەو کۆیلەیەی کە هاوبەشە لە نێوان وی و یەکێکیتر (وَهُوَ مُوسِرٌ) ئەو ئازادکەرەش دەیتوانی نرخی بەشەکەی هاوبەشەکەی بدا (سَرَى الْعِتْقُ إِلَى بَاقِيهِ) ئەو ئازادکردنەی وی ئەچێتە بەشەکەی هاوبەشەکەی، واتە: کۆیلەکە گشتی ئازاد ئەبێ و (وَكَانَ عَلَيْهِ قِيمَةُ نَصِيبِ شَرِيكِهِ) ئەبێ ئازادکەرەکە تۆڵەی بەشی هاوبەشەکەشی بدا بەگوێرەی نرخی ئەو ڕۆژە، بەڵام ئەگەر ئازادکەرەکە هەژار بوو، واتە: توانای نرخی بەشی هاوبەشەکەی نەبوو بیدا، ئەوە تەنها بەشەکەی خۆی ئازاد ئەبێ و بەشەکەیتر هەر بە کۆیلەیی ئەمێنێتەوە، جا ئەو جۆرە کۆیلە پێی ئەگوترێ: (مُبَعَّض)، واتە: بەشکراو ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ قُوِّمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ عَدْلٍ فَأُعْطِيَ شُرَكَائُهُ حِصَصَهُمْ وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ وَإِلاَّ: فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك بەشەکەی خۆی لە کۆیلەیەکی هاوبەش ئازاد بکاو بە ئەندازەی کۆیلەکەش ماڵی هەبێ، بە دادپەروەری کۆیلەکەی لەسەر ئەقرسێندرێ و نرخی بەشەکانیتر ئەدرێتە هاوبەشەکانی و کۆیلەکە گشتی ئازاد ئەبێ، بەڵام ئەگەر هیچی نەبوو، ئەوە تەنها بەشەکەی خۆی ئازاد ئەبێ.

(وَمَنْ مَلَكَ وَاحِداً مِنْ وَالِدِيهِ) هەر کەسێك باوكو باپیرەو دایكو داپیرەی بکەوێتەناو ملکی خۆی، واتە: بیانکڕێ، یان بە شێوەی میراتگرتن دەستی بکەوێ (أَوْ مَوْلُودِيهِ) یان کوڕو کیژەکانی خۆی، یان نەوەیەکانی بکەوێتە ژێر ملکی خۆی، بەو شێوەی باسمان کرد (عَتَقَ عَلَيْهِ) یەکسەر ئازاد ئەبن، هەرچەند ئازادیشیان نەکا، کەواتە: ناگونجێ دایكو باوكو داپیرەو باپیرەو کیژو کوڕو نەوە ببن بە کۆیلەی خۆی، بەڵام خوشكو براو مامو خاڵو برازاو مامۆزا ئەبن بە کۆیلەی خۆی.

(فَصْلٌ) وَالْوَلاَءُ مِنْ حُقُوقِ الْعِتْقِ، وَحُكْمُهُ حُكْمُ التَّعْصِيبِ عِنْدَ عَدَمِهِ، وَيَنْتَقِلُ الْوَلاَءُ عَنِ الْمُعْتِقِ إِلَى الذُّكُورِ مِنْ عَصَبَتِهِ، وَتَرْتِيبُ الْعَصَبَاتِ فِي الْوَلاَءِ كَتَرْتِيبِهِمْ فِي الإِرْثِ، وَلاَ يَجُوزُ بَيْعُ الْوَلاَءِ وَلاَ هِبَتُهُ.
(فَصْلٌ) وَمَنْ قَالَ لِعَبْدِهِ: إِذَا مُتُّ فَأَنْتَ حُرٌّ، فَهُوَ مُدَبَّرٌ يَعْتِقُ بَعْدَ وَفَاتِهِ مِنْ ثُلُثِهِ، وَيَجُوزُ لَهُ أَنْ يَبِيعَهُ فِي حَالِ حَيَاتِهِ وَيَبْطُلُ تَدْبِيرُهُ.

---

### ﴿ فَصْلٌ: لەباسی (وَلاء) خزمایەتیی ئازادکردن ﴾

واتە: ئەو خزمایەتی‌یەی بە هۆی ئازادکردنی‌کۆیلە پەیدا ئەبی. (وَالْوَلاَءُ) خزمایەتی ئازادکردن (مِنْ حُقُوقِ الْعِتْقِ) یەکێکە لە مافەکانی کۆیلە ئازادکردن، چونکە بە هۆی ئەو ئازادکردنە پەیدا ئەبی (وَحُكْمُهُ) بڕیاری ئەو خزمایەتی‌یە (حُكْمُ التَّعْصِيبِ) وەکو بڕیاری خزمایەتی لە پشتیِ وایە (عِنْدَعَدَمِهِ) لەو کاتەی خزمی لە پشتیِ نەمێنیِ، واتە: بەم خزمایەتی‌یە میرات وەرئەگیرێو، ژن مارە ئەبڕێو، خوێنی کوژراو وەئەگریِ، هەروەك باسمان کردن. (وَيَنْتَقِلُ الْوَلاَءُ) مافی ئەو خزمایەتی‌یە ئەگوازرێتەوە (عَنِ الْمُعْتِقِ) لە ئازادکەرەکەوە–جا پیاو بیِ، یان ئافرەت بیِ– لە دوای مردنی (إِلَى الذُّكُورِ مِنْ عَصَبَتِهِ) بۆ خزمە نێرینەکانی، واتە: لە دوای مردنی ئازادکەرەکە مافی ئەو خزمایەتی‌یە بەمیرات ئەبێتە هی خزمە نێرینەکانی‌خۆی.
(وَتَرْتِيبُ الْعَصَبَاتِ) ریزی ئەو خزمە نێرینانە (فِي الْوَلاَءِ) لە خزمایەتی ئازادکردندا (كَتَرْتِيبِهِمْ فِي الإِرْثِ) وەك ریزی خزمەکانە لە وەرگرتنی میراتدا کە باسمان کرد (وَلاَ يَجُوزُ بَيْعُ الْوَلاَءِ) دروست نیە فرۆشتنی خزمایەتی ئازادکردن (وَلاَ هِبَتُهُ) هەروەها بەخشینیشی دروست نیە ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اَلْوَلاَءُ لُحْمَةٌ كَلُحْمَةِ النَّسَبِ لاَيُبَاعُ وَلاَيُوهَبُ﴾ رواه الشافعي وغيره، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خزمایەتی ئازادکردن تێکەڵبوونێکە وەکو تێکەڵبوونی خزمایەتی لە پشتیِ، نافرۆشرێو نابەخشریِ.

### ﴿ فَصْلٌ: لەباسی (مُدَبَّر) کۆیلەی چاوەڕوانکراو ﴾

(وَمَنْ قَالَ لِعَبْدِهِ) هەر کەسێك بە کۆیلەکەی خۆی بڵیِ: (إِذَا مُتُّ فَأَنْتَ حُرٌّ) هەر کاتێك من مردم تۆ ئازادی (فَهُوَ) ئەو کۆیلەیە (مُدَبَّرٌ) پیِی ئەگوتریِ: (مُدَبَّرٌ)، واتە: چاوەڕوانکراو: ئایا ئازاد ئەبیِ، یان نا؟ (يَعْتِقُ بَعْدَ وَفَاتِهِ) ئەو کۆیلە لەدوای مردنی گەورەکەی خۆی ئازاد ئەبیِ، بەو مەرجەی هەر لە ژێر ملکایەتی ویدا مابیِ (مِنْ ثُلُثِ مَالِهِ) وە ئازادبوونیشی لە سێیەکی ماڵی ئەژمێردریِ، کەواتە: ئەگەر جگە لەو کۆیلەیە هیچی‌تری نەبوو بدرێتە خاوەن قەرزەکان، ئەوە قەرزەکان بەم کۆیلەیە ئەدرێنەوە.
(وَيَجُوزُ لَهُ) دروستە بۆ گەورەکە (أَنْ يَبِيعَهُ) ئەو کۆیلە چاوەڕوانکراوە بفرۆشیِ (فِي حَالِ حَيَاتِهِ) تا بە خۆی زیندووە (وَيَبْطُلُ تَدْبِيرُهُ) جا چاوەڕوانکردنەکەی تێك ئەچیِو، بە هۆی

وَحُكْمُ الْمُدَبَّرِ فِي حَالِ حَيَاةِ السَّيِّدِ حُكْمُ الْعَبْدِ الْقِنِّ.
(فَصْلٌ) وَالْكِتَابَةُ مُسْتَحَبَّةٌ إِذَا سَأَلَهَا الْعَبْدُ، وَكَانَ مَأْمُوناً مُكْتَسِباً، وَلا تَصِحُّ إِلاَّ بِمَالٍ مَعْلُومٍ، وَيَكُونُ مُؤَجَّلاً إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ: أَقَلُّهُ نَجْمانِ، وَهِيَ مِنْ جِهَةِ السَّيِّدِ لازِمَةٌ، وَمِنْ جِهَةِ الْمكاتَبِ جائِزَةٌ، فَلَهُ تَعْجِيزُ نَفْسِهِ وَفَسْخُهَا مَتَى شاءَ،

---

مردنی وی ئازاد نابێ ﴿عَنْ جابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ غُلامًالَهُ عَنْ دُبُرٍ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ فَباعَهُ النَّبِيُّ ﷺ﴾ رواه‌الشيخان، پیاوێك كۆیله‌یه‌كی‌خۆی ئازاد كرد به چاوه‌ڕوانی‌مردن، هیچ ماڵی‌تریشی نه‌بوو، پێغه‌مبه‌ر ﷺ كۆیله‌كه‌ی وی فرۆشت. (وَحُكْمُ الْمُدبَّرِ) هه‌موو ده‌ستكارییه‌كی كۆیله‌ی چاوه‌ڕوانكراو (فِي حالِ حَياةِ السَّيِّدِ) له‌و ماوه‌یه‌ی گه‌وره‌كه‌ی زیندووه (حُكْمُ الْعَبْدِ الْقِنِّ) وه‌كو ده‌ستكاری ئه‌و كۆیله‌یه كه باسی‌ئازادكردنی له‌گه‌ڵ نه‌كرابێ.

﴿ فَصْلٌ: له باسی (كِتابَة) نووسراوپێدان ﴾

وه‌كو گه‌وره‌كه بڵێته كۆیله‌كه‌ی‌خۆی هه‌ر كاتێ ئه‌وه‌نده پاره‌یه‌ت بۆ هێنام به‌وه‌نده ماوه‌یه، تۆ ئازادی. جا ئه‌و جۆره كۆیله‌یه پێی ئه‌گوترێ: (مُكاتَبْ)، واته: نووسراو پێدراو. (وَالْكِتابَةُ) نووسراوپێدانی‌كۆیله (مُسْتَحَبَّةٌ) خێره (إِذا سأَلَها الْعَبْدُ) هه‌ر كاتێك كۆیله‌كه بۆ خۆی داوا بكا (وكانَ مَأْموناً) به‌و مه‌رجه‌ی كۆیله‌كه ئه‌مین بێ‌و ماڵی به فیڕۆ نه‌دا (مُكْتَسِباً) توانای كاركردنیشی هه‌بێ، خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی: ﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا﴾ ئه‌و كۆیلانه‌ی داوای نووسراوپێدانتان لێ‌ئه‌كه‌ن، نووسراویان بده‌نێ ئه‌گه‌ر بزانن كاریان پێ ئه‌كرێ.

(وَلا تَصِحُّ) نووسراوپێدان دروست نیه (إِلاّ بِمالٍ مَعْلومٍ) ته‌نها به ماڵێكی زانراو نه‌بێ، واته: ئه‌بی خۆی‌و كۆیله‌كه بزانن: ماڵه‌كه چه‌نده‌و چۆنه‌و چی‌یه؟ (وَيَكونُ مُؤَجَّلاً) وه ئه‌بی هێنانی ئه‌و ماڵه دوا بخرێ (إِلى أَجَلٍ مَعْلومٍ) بۆ ماوه‌یه‌كی زانراو، واته: دروست نیه ده‌موده‌ست داوای هێنانی ئه‌و ماڵه بكا (أَقَلُّهُ) كه‌مترین ماوه بۆ هێنانی ئه‌و ماڵه (نَجْمانِ) دوو كاته، واته: دروست نیه له‌یه‌ك كاتدا گشتی لێوه‌ربگیرێ.

(وَهِيَ) ئه‌و نووسراوپێدانه (مِنْ جِهَةِ السَّيِّدِ) له ڕووی گه‌وره‌كه‌وه (لازِمَةٌ) له ملی ئه‌چه‌سپێ، واته: دروست نیه په‌شیمان ببێته‌وه، جا هه‌ر كاتێك كۆیله‌كه ماڵه‌كه‌ی هێنا، ئازاد ئه‌بێ (وَمِنْ جِهَةِ الْمُكاتَبِ) به‌ڵام له ڕووی كۆیله نووسراوپێدراوه‌كه‌وه (جائِزَةٌ) نه‌چه‌سپاوه (فَلَهُ تَعْجِيزُ نَفْسِهِ) كه‌واته: كۆیله‌كه بۆی دروسته خۆی بێ‌ده‌سه‌ڵات بكا، واته: بڵێ: من توانام نیه ئه‌و ماڵه بده‌م، نه‌یدا (وَفَسْخُها مَتى شاءَ) هه‌روه‌ها بۆیشی دروسته نووسراوپێدانه‌كه هه‌ڵبوه‌شێنێته‌وه هه‌ر كاتێ پێی خۆش بێ.

﴿ئاگاداری﴾: ئه‌گه‌ر كۆیله‌كه بۆ ماوه‌ی دیاركراو ماڵه‌كه‌ی پێ‌نه‌هات، گه‌وره‌كه‌ش ئه‌توانێ هه‌ڵیبوه‌شێنێته‌وه.

وَلِلْمَكاتَبِ اَلتَّصرُّفُ فِيما فِي يَدِهِ مِنَ الْمالِ، وَيَجِبُ عَلَى السَّيِّدِ أَنْ يَضَعَ مِنْ مالِ الْكِتابَةِ، ما يَسْتَعِينُ بِهِ عَلى أَداءِ نُجُومِ الْكِتابَةِ، وَلا يَعْتِقُ إِلاَّ بِأَداءِ جَمِيعِ الْمالِ.
(فَصْلٌ) وَإِذا أَصابَ السَّيِّدُ أَمَتَهُ فَوَضَعَتْ ما تَبَيَّنَ فِيهِ شَيْءٌ مِنْ خَلْقِ آدَمِيٍّ حَرُمَ عَلَيْهِ بَيْعُها وَرَهْنُها وَهِبَتُها، وَجازَ لَهُ التَّصَرُّفُ فِيها بِالإِسْتِخْدامِ وَالْوَطْءِ،

---

(وَلِلْمَكاتَبِ) نووسراوپێدراوەکە بۆی هەیە (اَلتَّصرُّفُ فِيما فِي يَدِهِ مِنَ الْمالِ) بە هەموو شێوەیەك دەستکاری ئەو ماڵە بکا کە لەبەر دەستیدایەو بە خۆی وەدەستی هێناوە (وَيَجِبُ عَلَى السَّيِّدِ) واجبە: لەسەر گەورەی کۆیلەکە (أَنْ يَضَعَ عَنْهُ) کە نەختێك بارگرانی لابدا لەسەر کۆیلەکە (مِنْ مالِ الْكِتابَةِ) لەو ماڵەی کە دیارکراوە بیهێنێ (ما يَسْتَعِينُ بِهِ) ئەندازەیەکی وای لەسەر لابدا: کەببێتە پاڵپشت (عَلى أَداءِ نُجُومِ الْكِتابَةِ) بۆ تەسلیمکردنی گشت بەشەکانیتری ماڵەکە، واتە: لەو ماڵەی لەسەری پێك هاتوون، واجبە: یان نەختێکی لێخۆش ببێ، یان بەخۆی نەختێك ماڵی بداتێ بۆ ئەوەی زوو ماڵەکە تەولو بکا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ﴾ لەو ماڵەی خوا داویەتیە ئێوە، نەختێك بدەنە کۆیلە نووسراوپێدراوەکان.
(وَلا يَعْتِقُ) ئەو کۆیلە نووسراوپێدراوە ئازاد نابێ (إِلاَّ بِأَداءِ جَمِيعِ الْمالِ) تا گشت ئەو ماڵەی لەسەری پێك هاتوون ئەیدا ﴿عَنْ عمرو بن شعَيب عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: اَلْمُكاتَبُ عَبْدٌ ما بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ مُكاتَبَتِهِ دِرْهَمٌ﴾ رواه ابوداود، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نووسراوپێدرلو هەر کۆیلەیە تا دیرهەمێکی لەسەر مابێ.
﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر گەورەکە لەو ماوەیەدا مرد، کۆیلەکە ماڵەکە ئەداتە میراتگرەکانی گەورەکەو، ئازاد ئەبێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (أُمُّ الْوَلَد) دایکیمنداڵ ﴾

واتە: ئەو کۆیلە مێیەی پێی ئەگوترێ: دایکی منداڵ. (وَإِذا أَصابَ السَّيِّدُ أَمَتَهُ) هەر کاتێ گەورە جیماعی لەگەڵ (جارية)کەی خۆی کردو ئاوس بوو (فَوَضَعَتْ ما) جا ئەو (جارية) ئاوسە پارچە گۆشتێکی وای دانا (تَبَيَّنَ فِيهِ) کە تێیدا دیاربوو (شَيْءٌ مِنْ خَلْقِ آدَمِيٍّ) وێنەی ئادەمیزادێك، واتە: ئەگەر (جارية)کە منداڵێکی تەواوی ببێ، یان پارچە گۆشتێکی وای لێبێتە دەرەوە: کە وێنەی ئادەمیزادی لێدروست کرابێ، ئەوە ئەبێتە (أُمُّ الْوَلَد)، واتە: دایکیمنداڵ، کەوابوو: (حَرُمَ عَلَيْهِ بَيْعُها) حەرامە گەورەکە ئەو (جارية)یە بفرۆشێ (وَرَهْنُها) وە حەرامە بەبارمتەی دابنێ (وَهِبَتُها) وە حەرامە بیبەخشێ (وَجازَ لَهُ التَّصَرُّفُ فِيها) وە گەورەکە بۆی دروستە: دەستکاری ئەو دایکەیمنداڵە بکا (بِالإِسْتِخْدامِ) بەو شێوەیەی خزمەتی خۆی پێ بکاو (وَالْوَطْءِ) جیماعیشی لەگەڵ بکا.

وَإذا مـاتَ السَّـيِّدُ عَتَقَـتْ مِـنْ رَأسِ مالِـهِ قَبْـلَ الـدُّيُونِ وَالْوَصـايا، وَوَلَدُها مِنْ غَيْرِهِ بِمَنْزِلَتِهـا، وَمَـنْ أصـابَ أَمَـةَ غَيْـرِهِ بِنِكـاحٍ فَالْوَلَـدُ مِنْهـا مَمْلُوكٌ لِسَيِّدِها، وَإنْ أصابَها بِشُبْهَةٍ فَوَلَدُهُ مِنْها حُرٌّ نَسِيبٌ وَعَلَيْـهِ قِيمَتُـهُ لِلسَّـيِّدِ، وَإنْ مَلَكَ الأَمَةَ الْمُطَلَّقَةَ بَعْدَ ذَلِكَ لَمْ يَصِرْ أُمَّ وَلَدٍ لَهُ بِالْوَطْءِ فِي النِّكاحِ،

---

(وَإذا ماتَ السَّيِّدُ) جا هەر كاتێ گەورەكەی مرد (عَتَقَتْ) ئەو دایكەیمنداڵە یەكسەر ئازاد ئـەبێ (مِنْ رَأسِ مالِهِ) لە سەرمایەی ماڵەكـەوە (قَبْـلَ الـدُّيُونِ) پـێش ئـەوەی قـەرزەكانی مردووەكـە بدرێنەوە (وَالْوَصايا) پێش ئـەوەی وەسێتەكانی جێبەجێ بكرێن، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿أيُّما إمْرَأةٍ وَلَدَتْ مِنْ سَيِّدِها فَهِيَ مُعْتَقَةٌ عَنْ دُبُرٍ مِنْهُ﴾ رواهأحمـد وصـححه الحـاكم، هـەر ئافرەتێك منداڵێكی لە گەورەكەیخۆی ببێ، لە دوای مردنیگەورەكەی ئازاد ئەبێ.

ئینجا بزانـە: منداڵی ئەو (جارية)یە كە لە گەورەی خۆی ئەیبێ، بە ئازادی ئـەبێ، نـەك بـە كۆیلەیی، چونكە بە هۆی ئازادیی ئەو منداڵە، دایكەكـەی ئـازاد ئـەبێ، بـەڵام (وَوَلَدُها مِـنْ غَيْرِهِ) منداڵەكانیتری ئەو (جارية)دایكەیمنداڵەیە: كـە لـە پیـاوێكیترن جگـە لـە گـەورەی خۆی (بِمَنْزِلَتِها) ئەوانیش هەر وەكو خۆی كۆیلەن، بەڵام نابێ بفرۆشرێنو نابێ ببەخشـرێنو هەر كاتێك گەورەكە مرد، ئەوانیش وەكو دایكیان ئازاد ئەبن، بەو مەرجەی ئەو منداڵانـە لـە دوای بوونی بەدایكیمنداڵ بوبن، جا بە حەڵاڵی بوبن، یان بە حەرامی.

(وَمَنْ أصابَ أمَةَ غَيْرِهِ بِنِكاحٍ) هەر كەسێك جیماع لەگـەڵ (جاریـة)ی كەسـێكیتر بكـا، بـە مارەكراوی، واتە: (جارية)ی كەسێكیتری لە خۆی مارە كردبو ئاوسی كـرد (فَالْوَلَـدُ مِنْهـا) ئەو منداڵەی لەو (جارية) مارەكراوە ئەبێ (مَمْلُوكٌ) ئـەویش ئەبێتـە كۆیلـە (لِسَيِّدِها) بـۆ گەورەی (جارية)كە، واتە: بەئازادی نابێو ناشبێتە كۆیلەی باوكیخۆی.

(وَإنْ أصابَها بِشُبْهَةٍ) بەڵام ئەگەر بە هەڵە جیماع لەگەڵ (جارية)ی كەسێكیتر بكـا، واتـە: بە ژنیخۆی تێكەیشتبو (فَوَلَدُهُ مِنْها) ئەو منداڵەی لەو (جارية)یە ئـەبێ (حُـرٌّ) بـە ئـازادی ئەبێ، چونكە بە هەڵە دایكی ئاوس كراوە (نَسِيبٌ) ئەبێتە كوڕی باوكیخۆی، واتە: كـوڕی ئـەو پیاوەیـە كـە بـە هەڵـە جیماعەكـەی كـردوە، كـەوابوو: (وَعَلَيْـهِ قِيمَتُـهُ) ئـەبی باوكـە بەهەڵەداچـووەكە نرخەكـەی وی بـژمێرێ (لِلسَّـيِّدِ) بـۆ گـەورەی(جاریـة)یەكـە؟ چـونكە كۆیلەیەكی زەرەر لێداوە.

(وَإنْ مَلَكَ الأمَةَ الْمُطَلَّقَةَ) ئەگەر(جارية)یە تەڵاقدراوەكەیخۆی كەوتە ملكیخۆی (بَعْدَ ذلِـكَ) لە دوای منداڵبوونی بـەمارەكردن، واتـە: (جاریـة)ی كەسـێكیتری لـە خـۆ مـارە كردبـو و جیماعی لەگەڵ كردبو و ئاوسی كردبو و منداڵێكی كۆیلەی لێبوو، ئینجا تـەڵاقیدا، ئینجـا چوو ئەو (جارية)یەی كڕی (لَمْ تَصِرْ أُمَّ وَلَدٍ) ئـەو (جاریـة)یـە نەبۆتـە دایكـی منـداڵ (لَـهُ) بۆ ئەو پیاوە (بِالْوَطْءِ) بە هۆی ئـەو جیماعـەی كـە منـداڵی لێپەیـدا بـووە (فِـي النِّكـاحِ)

وَصارَتْ أُمَّ وَلَد لَهُ بالْوَطْءِ بالشُّبْهَةِ عَلَى أَحَدِ الْقَوْلَيْن.

له مارەکردنەکەیڕابردوودا، چونکە لەو کاتیدا گەورەی (جارية)کە نەبووە، بەڵکو مێردی بووە، منداڵەکەشی بە کۆیلەیی بووە (وَصارَتْ أُمَّ وَلَدٍ) بەڵام ئەو (جارية)یە ئەبێتە دایکی منداڵ (لَهُ بِالْوَطْءِ بِالشُّبْهَةِ) بۆ ئەو پیاوەی کە بە هەڵە جیماعی لەگەڵ کردبو (عَلَى أَحَدِ الْقَوْلَيْنِ) لە فەرموودەیەکی ئیمامی(شافعی)دا، بەڵام لە فەرموودەی بەهێزتر: ئەمەشیان هەر نابێتە دایکیمنداڵ؟ چونکە بە هەڵە جیماعی کردوەو هی خۆیشی نەبوە...کۆتایی هات:

لە شەوی شەممە (٢٧)ی بیستوحەفتی مانگی ڕەمەزان ساڵی (١٤١٣) هەزارو چوارسەدو سێزدەی کۆچی، بە ئاوات گەیشتمو نامیلکەی(غاية الإختصار)م وەرگێڕاو ڕوونم کردەوە بە زمانی شیرنی کوردی، ئینجا خودایە لێت ئەپاڕێمەوە: کە منی تاوانبارو بێچارە: (عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی)، بەندەی بەندکراو بە داوی گوناهباری، ئازاد بکەی وەك ئەو کەسانەی لە مانگی ڕەمەزان ئازادیان ئەکەی. وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ وَالْحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمِين وَلاَحَوْلَ وَلاَقُوةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيم، آمين.

هەولێر- کوردستان

٢٧ی ڕەمەزان ١٤١٣یکۆچی.

٢٩ی ڕەشەمە ٢٦٩٢یکوردی.

٢٠ی ئازاری ١٩٩٣یزایینی.

دەربارەی شەریعەتی ئیسلام:

١-خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ﴾ (التوبة:١٢٢)، واتە: دەبوا لە هەر هۆزێکی موسوڵمانان کۆمەڵێك ڕاپەڕیبان بۆ (جهاد)کردن و کۆمەڵێکیش بۆ خوێندن، تاکو لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن.

٢- پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ﴾ رواه البخاري و مسلم، واتە: هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێ چاکەی بداتێ، لە (شەریعەتی ئیسلام) تێیئەگەێنێ.

٣-ئیمام(عمر بن الخطاب ﷺ) دەفەرموێ: ﴿تَفَقَّهُوا قَبْلَ أَنْ تُسَوَّدُوا، فَمَنْ سَوَّدَهُ قَوْمُهُ عَلَى فِقْهٍ كانَ حَيَاةً لَهُ وَلَهُمْ﴾ رواه الدارمي، واتە: لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن پێش ئەوەی بکرێنە گەورە، چونکە هەر کەسێك (شەرع) بزانێ و گەلەکەی خۆی بیکاتە گەورە، ئەبێتە هۆی ژیانێکی خۆش بۆ خۆیو بۆ ئەوان.

٤- ئیمام(الأعمش) دەفەرموێ: ﴿يَامَعْشَرَ الْفُقَهاءِ أَنْتُمُ الأَطِبَّاءُ وَنَحْنُ الصَّيادِلَةُ﴾ رواه الصيمري، واتە: ئەی چینی (شەرعزانان) ئێوە پزیشکن، ئێمەی (حەدیس گێڕەوەش) دەرمانناسی دەرمانخانەین.

٥- ئیمام(الشافعي) دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَفِظَ الْفِقْهَ عَظُمَتْ قِيمَتُهُ وَمَنْ تَعَلَّمَ الْحَدِيثَ قَوِيَتْ حُجَّتُهُ﴾ رواه ابن حجر الهيتمي، واتە: هەرکەسێك لە (شەریعەتی ئیسلام) شارەزا بێ، نرخی بەرز ئەبێتەوە، هەر کەسێك (حەدیس) فێر ببێ، بەڵگەی بەهێز دەبێ.

٦-ئیمامی(البخاري) دەفەرموێ: ﴿هُوَ-أَيِ الْفِقْهُ- ثَمَرَةُ الْحَدِيثِ، وَلَيْسَ ثَوابُ الْفَقِيهِ دُونَ ثَوابِ الْمُحَدِّثِ﴾ رواه القسطلاني، واتە: (شەریعەتی ئیسلام) بەرهەمی حەدیسە، پاداشتی (شەرعزان) کەمتر نیە لە پاداشتی (حەدیس گێڕەوە).

# ناوەڕۆكی ڕۆژی پڕشنگدار

# ناومڕۆکی ڕۆژی پڕشنگدار

# ناوەڕۆکی ڕۆژی پڕشنگدار

# ناوەڕۆکی ڕۆژی پڕشنگدار

